# مێشەکەرانە



ئێتێل لیلیان ڤینیچ

و: محەمەد ئەدیبی





# میشەهەرانە



## ئێتل لیلیان ڤینیچ

وەرگێڕانی

محەمەد ئەدیبی






وەزارەتی رۆشنبیری ولاوان بەریوەبەرایەتی گشتی رۆژنامەنووسی و چاپ و بلاوکردنەوە
بەریوەبەرایەتی بلاوکردنەوەی هەولێر

دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی

● مێشەکەرانە (رۆمان)

● نووسینی: ئیتێل لیلیان ڤینیچ

● وەرگێرانی بۆ فارسی: خوسرەو هومایون پوور

● وەرگێرانی لە فارسییەوە: محەمەد ئەدیبی

● نەخشەسازی ناوەوە: رەسوول سوڵتانی

● بەرگ: چیمەن

● چاپی یەکەم: ٢٠١١

● تیراژ: ١٠٠٠ دانە

● نرخ: ٤٠٠٠ دینار

● چاپخانە: وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان

● لە بەریوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی٧٠٤ ی ساڵی ٢٠١١ پێدراوە.

زنجیرەی کتێب (٥١٩)

ئەم کتێبە و کتێبەکانی وەزارەتی
رۆشنبیری لەسەر ئەم ماڵپەرە بخوێنەوە
www .Kurdchap.com

ماڵپەر: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# پێشەکی

## (مێشەکەرانە) و نووسەرەکەی

مێشەکەرانە (گێدفلای) بەرهەمی «ئێتل لیلیان‌ڤینیچ» نووسەری ئینگلیزی کە بۆ هەوەڵین جار لە ساڵی دا لە ئەمریکا و بریتانیا چاپ کرا.

لەوە بەولاوە مرۆڤە کتێب‌دۆستەکان دەیانخوێندەوە و دیسانیش دەیانخوێندەوە و شەوانە بە مستی بەرز کراوەوە بە سەریدا دەگریان و بەیانیان بە چاوی سوور و بە دڵێکی ئاگرینەوە ئامادەی پێشوازیکردن لە مەرگ دەبوون و سەبارەت بە ئازادیی گەلەکەی خۆیان ڕۆژیان نوێ دەکردەوە.

ڕۆمانی «مێشەکەرانە» سەبارەت بە هەڵسووڕانی ڕێکخراوی «ئیتالیای لاو»دا دەدوێ کە لە دەیەی سی و چلی سەدەی نۆزدەهەمدا لە گەڕدا بوون. ئەوکات دوای تێکشکانی سوپای ناپلیۆن؛ ئیتالیا کرایە هەشت وڵاتی جیاواز و بە تەواوەتی کەوتە ژێردەستی سوپای نەمساوە. سەرۆک کلیسای کاتۆلیک پاپای ڕۆم پشتیوانیی لە داگیرکەرە نەمساییەکان دەکرد. بەو پێیە گەلی ئیتالیا لە ژێر دوو کۆیلەتیدا دەیانناڵاند و زوڵم و زۆریان لێ‌دەکرا. خەڵکی ئیتالیای پێشڕەو خوازیاری یەکگرتوویی ئەو هەشت وڵاتە بوون لە ژێر ئاڵای حکومەتێکی نەتەوەییدا. و سەبارەت بە سەربەخۆیی نەتەوەیی دژ بە نەمساییەکان خەباتیان دەکرد.

لە ساڵی دا «ژۆزێف مازینی» شۆڕشگێڕی بە ناوبانگی ئیتالیا کە لە وڵاتی خۆی شاربەدەر[1] کرابوو ڕێکخراوی «ئیتالیای لاو»ی دامەزراند.

---

1 ـ شاربەدەر: دوورخراوە، ڕەتێنراو

«ئیتالیای لاو» کە بە داییم لە بگرەوبەندی پۆلیسدا بوو، ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە بزووتنەوەی گەلی ئیتالیادا کە لە ساڵی دا توانیی وڵاتێکی یەکگرتوو دامەزرێنێت.

دەسپێکی ڕووداوەکانی ئەم ڕۆمانە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی . ئەو ساڵە لە شوێنە جیاجیاکانی ئیتالیادا، خەڵک شۆڕشی چەکدارانەیان دەست پێ کردبوو.

نەمساییەکان بە هاریکاریی دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان ئەو شۆڕشانەیان بێبەزەییانە سەرکوت دەکرد.

بەڵام لەم ڕۆمانەدا ئێمە هێمایەکی بەرچاو لە بزووتنەوەی گەلی و شۆڕشی چەکدارانەمان نایەتە بەرچاو هە رچەند ئەوە بۆخۆی خاڵێکی بەهێزی بزاڤی ئازادیخوازانەی ئەوکاتی گەلی ئیتالیا بوو. بە ڕواڵەت هەموو سەرنجی نووسەر بەسراوەتەوە بە ڕۆلی کارئەکتەری پاڵەوان و تاکە کەسێکی شۆڕشگێڕ.

گەورەترین قارەمانییەتیی «مێشەکەرانە» لە تێکهەڵچوونەکانی ئەو لەگەڵ ژاندارمەکان دایە، یانی دژوارترین بەشی شۆڕش لەو جێگایە دایە، کە تێکۆشەرێک لە پشتیوانیی هاورێیانی خوی بێبەش دەبێ و تاکەچەکی دەستی وی ورەی بەرز و خۆڕاگریەکەیەتی.

ئەو تێکۆشەرەی کە لە ڕاپەڕینێکی چەکدارنەدا بەشدار دەبێ، هەر کە پشتیوانیی هاورێیانی خۆی هەست پێدەکات لە تێکۆشانی ئازایانەی ویدا ڕەنگ دەداتەوە. هەرچەند لەخۆبردوویی و مەردایەتییەک کە لە بەندیخانەکاندا ڕوو دەدا شاراوەیە، بەڵام تێکۆشەرێکی گەل خۆشەویست لەو قەیرانە سەخت و دژوارانەشدا بێئەوەی چاوەڕوانی خەڵات بێ بە ئیمان و ڕێگای خۆی وەفادار دەمێنت.

ڤینیچ بە خوڵقاندنی ڕوخساری تێکۆشەرێکی قارەمان و هەر لەو کاتەشدا بە تین و توانایەکی بەرینەوە دەمامکی خۆ بەپاکزانین لە ڕوخساری خزمەتکارانی کلیسا لادەدا.

«ئارتور»ی لاو وای بیردەکردەوە کە کلیسا ڕێنمای مرۆڤایەتیە. بەلام لە ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕاستیەکاندا درۆبوونی ئەو بیرۆکەیەی لەناخەوە هەست پێ کرد. ڤینیچ بە لێزانینێکی زۆر باش ڕوخسارێکی شکۆداری لە قارەمانێک خوڵقاند و ئەوی لە بەرامبەر سیمای مەسیحدا دانا و پێی‌داگرت کە ئەو بەرزوبەڕێزترە لە مەسیح.

نووسەر ڕۆمانی خۆی لە سەر بنەمای فکری فانتزی و هەواڵی ڕۆژنامەکان داناڕێژێت بەڵکوو ڕوخسارێکی زیندوو گەش دەئافەرینێت. تەواوەتی ڕۆمانەکە پڕاوپڕە لە ئەوین و خۆشەویستی سەبارەت بە مرۆڤایەتی.

روخساری «مێشەکەرانە» پاکترین و درەوشاوەترین ڕوخساری تێکۆشەرێکی ڕاستەقینەیە لە سەرتاسەری ئەدەبیاتی جیهاندا.

ئێستا با بزانین نووسەری ئەم بەرهەمە ئەم مۆمەداگیرساوە کە پتر لە نیو سەدە دڵی مرۆڤە ئینساندۆستەکانی هەژاند کێیە.

ئیتل‌لیلیان‌ڤینیچ لە ماڵی «جۆرج‌پول» یەکێ لە پسپۆڕانی گەورەی بریتانی لە مانگی مای ١٨٦٤دا لە دایک بوو. باوکی پرۆفسۆری بیرکاری بوو. دایکی سەبارەت لەبارەی کۆمەلایەتییەکانەوە وتاری دەنووسی. «جۆرج‌ئێڤێرێست»ی مامی دایکی جوگرافی‌زانێکی بە ناوبانگ بوو و بەرزترین لوتکە چیاکانی دنیا لە سەر لێکۆڵینەوەکانی ئەو لە زنجیرە چیای هیمالیا «ئێڤێرێست»ی نێو لێ‌نرا.

ئیتل لە منالیەوە لەگەڵ هەژاری و نەبوونیدا ئاشنا بوو. هێشتا ساڵ‌ونیوێک لە تەمەنی تێنەپەڕیبوو کە باوکی مرد. دوای مردنی باوکی پێ‌گەیاندنی ئەو و چوار خوشکەکەی کەوتە سەرشانی دایکی. دایکیشی بە گوتنەوەی وانەی بیرکاری بە زەحمەت ئەو خێزانە گەورەی بەڕێوە دەبرد. نیشانەی نووسەربوونی ئیتل زۆر زوو بە دیار کەوت. ئەو خەریکی خوێندنی فەلسەفە و ئەدەبیات و موسیقی بوو.

لەو بەینەدا موسیقی زیاتر لە هەموویان سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی ڕاکێشا.

سەرەتا بەرهەمەکانی «ویلیام بلیک» شاعیری ئینگلیزیی پێ خۆش بوو. دوایە بەرهەمەکانی شکسپیر و دیکێنز لە ژیانی ئەودا جێگای خۆیانیان کردەوە.

سالی میراتێکی کەمی پێبڕا و خێرا خۆی گەیاندە بەرلین. سێ سال لەوێ دەرسی خوێند. لە ئاکادیمیای خوێندنی پیانۆی تەواو کرد. هەر لەو سالانەدا بوو کە کێشە کۆمەلایەتییەکان سەرنجی ئەویان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا و تێکۆشانی ئینسانەکان بۆ بەدەستهێنانی ئازادی ئاگرێکی بەرینی لە دەرونیدا هەلگیرساند:

ئەی ئازادی! دە لێگەڕێ با خەلک ئیمانیان بە تۆ نەبێت
بەلام من تاکوو دواهەناسەم
باوەڕو ئیمانم بە تۆ هەر دەمێنێ!

ئیتل لە بەهاری دا سەفەرێکی کرد بۆ ڕوسیا و لە گەڕانەوەیدا بۆ نیشتیمان لەتەک «میخائیل ڤینیچ»دا کە شۆڕشگێڕێکی پۆلۆنی بوو و هەلاتبوو بۆ بەریتانیا زەماوەندی کرد. لە سالی دا دەستی کرد بە وەرگێڕانی بەرهەمی کاشین، گوگول، داستایوسکی، شچێدرین، ئۆسپێنیسکی و چەند نووسەرێکی دیکەی ڕوس پاشان هەوەلین ڕۆمانی خۆی بە نێوی «مێشەکەرانە» چاپ کرد سێ سال دوای بلاوبوونەوەی «مێشەکەرانە» ڕۆمانێکی‌تری بە ناوی «جەک دیمۆند»ی لە چاپ هاتە دەرێ، ئیتل لەم کتێبەی دواییشیدا فریو و دووڕوویی و بێبەزەیی خزمەتکارانی کلیسای بە هەموان نیشان دا.

لە سالی ٤دا سێهەمین بەرهەمی ئەو بە ناوی (ئێلیوبالتام)ی بلاو کردوەوە لە سالی دا ڕۆمانێکی‌دیکەی بە ناوی(هاوڕێیەتیەکی لێک هەلبڕاو)ی نووسی. ئەم ڕۆمانە سەبارەت بە ژیانی مێشەکەرانەیە لە ئەمریکای باشووردا. لە سالی دوای چەند سالێک چەند بەرهەمێکی

لورمـانتوفی شـاعیری ئـوکراییی بـه زمـانی ئینگلیـزی وەرگێـڕاو بـڵاوی کردەوە.

ڤینیچ لە موسیقاشدا بەهرەمەند بوو. چەند سەمفۆنییەکی بەرهـەم هێنا کە (ئوراتوریویی) ئەو بە نێوی (بابیلیون) زۆر بەرز و دڵگیرە. سـەبارەت بە کارەکانی‌دیکەی وەرگێڕانی نامەکانی (شوپێن) موسیقی‌زانی بە نێوبانگی پۆلۆنیایی.

ئەو نووسەرە هەشتا ساڵەیە لە ساڵی ٤٤دا ڕۆمـانێکی تـازەی خـۆی بـە نێوی (پێڵاوەکەت داکەنە)ی تەواو کرد. ئەو لەم بەرهەمەشدا جارێکی‌دیکە سەبارەت بـە (مێشەکـەرانـە) دەنووسێ. ئـەم ڕۆمانـە لـە پێوەنـدی لـەگـەڵ باوباپیرانی دایکی (مێشەکەرانە)وە نووسراوە.

لە ئێوارەی ی ژوئیـەی ٦دا، ئیتل لیلیان‌ڤینیچ لـە تـەمـەنی ٦سـاڵیدا بـۆ هەمیشە ماڵاوایی لە ژیان کرد.

(مێشەکەرانە) تاکوو ئێستا وەرگێڕدراوەتـە سـەر زمانگـەلی هولـەندی، ئاڵمانی، پۆلۆنی، عیبری، ڕوسی، فەڕانسەیی، چینی، مەجارستانی، ژاپۆنی، فارسی و پتر لە بیست زمانی دیکەی دنیا.

ئێستاش وەرگێڕدراوە کوردییەکەی ئەم بەرهەمە بەنرخـە پێشکەش بـە هەموو کوردێکی وشیار و هەستیار دەکەین.

لە کۆتاییدا سپاسی خـۆم ئاراستەی کـاک محـەمـەدئەمـین شاسـەنەم و دادە رووبار بوداغی و مریەم شاسەنەم دەکەم کە بۆ پیتچنیی ئـەم کتێبـە زەحمەتێکی زۆریان کێشا.

# بەشی یەکەم

## ١

ئارتور لە کتێبخانەی سمیناری زانستە ئاینییەکانی* پیزا** دانیشتبوو و برێک لە مەوعیزە و ئامۆژگارییە دەستنووسەکانی ئەم بارەوبار دەکرد. شەوێک لە شەوە گەرمەکانی ژووئەن بوو. پەنجەرەکان بە تەواوەتی کرابوونەوە و پەردەکرکرەییەکان بۆ فێنکبونەوەی هەوا دادرابوونەوە.

کانون*** مونتانلی پاپا و بەرپرسی خوێندنگای ئایینی بوو، ساتێک دەستی لە نووسین راگرت و بە چاوێکی دڵسۆزانەوە ڕوانییە سەری ئارتورم کە قژەکانی ئاڵۆزکاو و شۆڕ ببوونەوە بە سەر قاقەزەکاندا: «کارینۆ**** ئەتوانی بیدۆزیتەوە؟ قەیناکە دەبێ دووبارە بینووسمەوە ڕەنگە دڕابێ و من لە خۆڕا تۆم لێرە ڕاگرتووە».

دەنگی مونتالی لە سەرەخۆ، بەڵام گەورە و بوغور بوو. تۆنی دەنگی زۆر خۆش بوو. ئەو تۆنی دەنگە قسەکانی خۆشتر و لەبەردڵانتر دەکرد. لەرەی دەنگی وەک کەسێک وابوو کە زگماک وێژەر بووبێ و پڕاوپڕ لە نووسراوە بێ و هەرکاتێ کە لەگەڵ ئارتوردا دەدوا وتەکانی دڵسۆزانە بوو.

---

* ـ خوێندنگای فەقێ مەسیحییەکان

** ـ شارێکی کەونارای ئیتالیا

*** ـ ئەو کەسەی کاروباری ئایینی بەڕێوە دەبات

**** ـ لە زمانی ئیتالیادا ناوی کوڕێک، کە زۆر خۆشەویست بێ

نـا پاپـا دەبێ بیدۆزمـەوە دڵنیـام کـە هـەر لێرە بـەجێمهێشتووە، تـۆ ئیتـر ناتوانی وەک خۆی بینووسییەوە.

مونتالی هەروا درێژەی بە کارەکەی خۆی دا. قالۆنچەیەکی باڵ نەخشین لە دەرەوەی پەنجەرەکە باڵەفڕەی بوو. دەنگی بڵێند و خەماویی میوەفرۆشێک لـە شـەقامـەکـەدا دەنگـی دەداوە، «فراکـولا! فراکـولا!*ـ دۆزیمـەوە، سـەبـارەت بـە چاکبوونەوەی نەخۆشیی گولییە.** ئارتور دیوەکەی بـە هـەنگاوە نـەرمـەکـانی دەپێوا کە ئەو ڕەوتە بە دایمە خێزانی تووڕە دەکرد. بەژنی ئـەو قوڵـەخڕە و باریکەڵە بوو، زیـاتر وەک لاوێکی ئیتالیایی سـەدەی شـانزدەهـەم دەچوو. لـە گەنجێکی بەریتانیای چینیی مـامنـاوەنـدی دەیـەی سێهەمـی سـەدەی نۆزدەی باوخۆشـتر دەنوانـد. ئـەنـدامێکی ڕێـکوپێکـی هـەبـوو، بـرۆی درێـژ و جـوان، دەمووددانـی سـەدەفـی و دەسـتوپێـی خڕپلانـە و لـەبـار بـوون. هـەرکـە بـە ئارامییـەوە دادەنیشت لـەگـەڵ کچێکی زۆر جوان کە هاتبێتـە سـەر شـێوازی پیاوان لێت دەگۆڕدرا، بەڵام کاتێ کە دەڕۆیشت بە چالاکی و بە زیپیکوزاکون وەک پڵنگێکی دەستەمۆی بێچنگت دەهاتە بەر زەین ـ ڕاست خۆیەتی؟ ئارتور مـن بـەبێ تۆ چـم بکردایە؟ هـەمیشە شتەکـانم ون دەبـوون. باشـە ئیتر هـیچ نانووسم. با بڕۆین بۆ ناو باخ هەڵەکانت ڕاست کەمەوە. کام خاڵت نەزانیوە؟

هـەردووکیـان چوونـە باخـە بێدەنـگ و نیسارەکـەی کلیساوە. سـمیناری نوێژگـەیـەکـی دێرینـی دومینیـیـەکـانی*** لـە ژێـردەسـت دابـوو. حـەسـارە چوارگۆشەکەی کلیسا لە دووسەدساڵ لەوە پێش نۆژەن کرابووەوە. داربـەڕو و دارگوێزەکان بنچیان لێک توند کردبوو و بەقەد باڵای شمشادێک سـەریـان وەدەر نـابوون. ئێستا ئیتر ڕاهێنـەرە ئاییننیـە سپیپۆشـەکان، کە ئاگاداریـیـان لەوانە دەکرد مردوون و لەبیر چوونەتەوە، بەڵام ئەم گیا و گوڵە بۆنخۆشـانە، ئـەگـەرچـی ئیتـر کـەس گوڵـەکانیـان وەک داوودەرمـان لـێناکاتـەوە، بـەڵام

---

* ـ لە ئیتالیا بە مانای تووت فەرەنگیە

** ـ سەبارەت بە ئەفسانەکانی ئینجیلە کە مەسیح دەست بە سەر گوڵێکدا دێنێ و چاکی دەکاتەوە.

*** ـ لقێکی ئایینی تایبەتیە کە بە هۆی شەڕ لەگەڵ لادەرانی ئاینی بە سەرۆکایەتی کەسێک بەناوی دومینیکەوە لە سەدەی سێزدەهەمدا دامەزرا.

دیسانەوە لەم شەوە گەرمەی نیوەڕاستی هاویندا گوڵەکانیان دەپشکوین.
چەپکچەپک جەعفەری (مەعدەنووس)ی کێوی و گوڵی تانجبەسەر ڕێڕەوی بەردچنی ڕێگاکەیان پڕ کردبوو. چاڵاوی حەساریێ پڕ ببوو لە قەوزە و گوڵی هەمیشە بەهاری. گوڵاڵەسوورەی خۆڕسک لە ڕێڕەوەکەدا بڵاو ببوونەوە. لە قەراغ دارە شمشادەکەوە، مێلاقەی سوور و گەورە دەدرەوشانەوە و دیژیتاڵە بڵێندەکان بەرەو چیمەنی چروپڕ شۆڕ ببوونەوە.

ڕەزە پیر و بێبەرەکە، خۆی بە لقێکی دار بەڕووەکەوە هەڵواسیبوو و سەر لقی دارەکەی بە ئارامی دەبزواند.

لە قوژبنێکی باخەکەدا دارە "بی"ێکی ئەستووری هاوینیی لێبوو، برجێک لە لقوپۆپی دارەکانەوە ڕەش دەچۆوە، کە بە گوڵخونچەی سپییەوە نەخشێندرابوو. مونتانلی لە سەر کۆنە کورسییەک کە بە دارەکەوە نرابوو دانیشت.

ئارتور لە زانکۆ فەلسەفەی دەخوێند. ئێستاش بۆ تێگەیشتن لە گرفتی کتێبەکەی هاتبوە لای پاپا. سەرەڕای ئەوەی کە لە سمیناریدا نەیدەخوێند، بەڵام ئەو وەکوو فەرهەنگێکی زانستی چاوی لە مونتانلی دەکرد.

دوای ئەوەی کە گرفتەکەی جێبەجێ بوو وتی: « ئەگەر کارێکت بە من نییە باشتر وایە بڕۆم.»

- ئەمرۆ ئیتر نامەوێ کار بکەم، بەڵام پێمخۆشە ئەگەر وەختت هەبێ برێکی دیکەش لێرە بی.

ئارتور پاڵی دا بەدارەکەوە لە نێوان لقوپۆپی دارەکەوە ڕوانییە ئەو ئەستێرە کەم نوورانەی، کە لە ئاسماندا بە هێوری چاوەترووسکەیان بوو. ئەم چاوەشینە خەیاڵاویانە کە لە ژێر چەتری مژۆڵە ڕەشەکاندا بوون میراتی دایکی (کرون والی)*یا بوون. مونتانلی بۆ ئەوەی ئەم چاوانە نەبینێت ڕووی وەرگێڕا.

- کارینۆ دەڵێی ماندووی.

---

* . cronuall . پارێزگایەک لە باشووری ڕۆژئاوای ئینگلیز

- چبکەم. کە مونتالی بە جوانی گوێی هەڵخست، ماندوویەتی بە دەنگییەوە پێوە دیار بوو.
- نەدەبوو ئاوا زوو بچیتە کۆلێژ، بەو هەموو پەرەستاری و شەونەخونییە هەر دەفەوتای. واباش بوو پێش ئەوەی لێگهۆڕن بەجێ بێڵی بە زۆریش بوایە دەبوو پشوویەکی باش بدەی.
- پاپا بە کاری چی دێ! دوای مردنی دایکم ئیتر نەمتوانی لەم خەمخانەیەدا بمێنمەوە. جولیا شێتی دەکردم.
جولیا ژنی زڕبرا گەورەکەی ئارتور بوو، کە زۆر لەگەڵی ناکۆک بوو. مونتانلی زۆر بە هیواشی وەڵامی داوە: من پێم خۆشنەبوو لە لای خزمەکانت بمێنیەوە. دڵنیا بووم بۆ تۆ زۆر ناخۆش بوو، بەڵام پێمخۆش بوو بە قسەی ئەو ڕەفیقەت کە دوکتورێکی بەریتانیایە، بکردایە و ئەگەر مانگێک لە ماڵی ئەودا بوایەی باشتر ئامادە دەبووی بۆ خوێندنەکەت.
پاپا، نا بە ڕاستی نەمدەتوانی. وارێنەکان زۆر باش و دلۆڤانن، بەڵام زۆر شت تێناگەن ئەویش ئەو کاتەیە کە بەزەییان پێمدا دێتەوە - بە جوانی ئەو شتە لە ڕوخسارییاندا بەدی دەکەم - هەوڵ دەدەن باسی دایکم بکەن و سوکنایيم بدەن هەڵبەتە جما وا نییە. ئەو هەمیشە و تەنانەت کاتێ کە منداڵ بوو دەیزانی، کە چ شتێک نابێ بڵێ، بەڵام خەڵکی ئاوا تێناگەن. خۆ هەر ئەوە نییە...
- کوڕم ئەی چییە؟
ئارتور چەند خونچەیەکی لە گوڵە دیژیتاڵەکە لێ کردەوە و بە تووڕەیەوە لە نێو دەستیدا هەڵی پرواند. کەمێک ڕاوەستا و گوتی: «من تاقەتم نەماوە لەو شارەدا بمێنمەوە. لەوێ ئەودەمی منداڵ بووم، دایکم لەو دووکانانە شتی یاریکردنی بۆ دەکڕیم. سەیرانگایەکی کەنار ئاوی لێیە، تا پێش قەیرانی نەخۆشیەکەی هەمیشە دەمبرد بۆ ئەوێ. بۆ هەر کوێ بچم هەروایە. هەر کە کچێکی گوڵفرۆش دێ بۆ لام دەڵێی ئێستاش پێویستم بەو گوڵانەیە، قەبرستانی کلیساکەش لەوێیە. ناچار بووم ئەو شارە بەجێبێڵم! بە دیتنی ئەوێ دڵم دەگیرا....»
لە بێدەنگبوونی خۆیدا دەستی کرد بە وردکردنی گوڵە دتژیتاڵیەکان. بێدەنگیەکە وا درێژخایەن بوو، کە پاپا بە سەرسوورمانەوە لێی دەڕوانی.

کەش و هەوا لە ژێر لق وپۆپی دارەکاندا وردەوردە بەرەو تاریکایی دەڕۆیشت. هەموو شتێک ڕەش و تاریکی دەنواند، بەڵام بە حاستەم ڕووناکاییەک هەبوو کە لەودا دەکرا ڕەنگ پەڕیوییەکەی مونتانلیت بەدی بکردایە. وردە وردە سەری دانەواند. بە دەستی ڕاستی کورسیەکەی توند گوشی.

ئارتور بە نیگایەکی گومانـاوی و تێکەڵ بە ڕێزلێنانەوە سەری وەرسووڕاند وەک کەسێکی نابەڵەدی لێهاتبوو کە ڕوو لە وڵاتێکی پیرۆز دەکات. لە دڵی خۆیدا گوتی:خودایە! «لە بەرانبەر ئەودا چەندە بچووک و خۆبەزلزانم! ئەگەر ئێش و ئازاری من لە دڵی ئەودا بوایە ئاوا بە باشی هەستی پێنەدەکرد»

مونتانلی خێرا سەری هەڵهێنا و بە دەوروبەری خۆیدا ڕوانی و بە شێوەیەکی دڵسۆزانە گوتی: «ئەگەر وایە زۆرت لێناکەم کە بێیتەوە، بەڵام دەبێ بەڵێنیم پێبدەی، کە لە پشوودانی هاوینیدا پشوویەکی باش بدەی. بە بڕوای من باشتر وایە کاتەکانی هاوینێت لە دەوروبەری لێگهۆرن بەسەر ببەی. من ڕێگە بەوە نادەم کە سلامەتی و لەشساخیی تۆ بکەوێتە مەترسیەوە».

- پاپا دوای تەواوبوونی دەرسەکانی سمینار، بۆ کوێ دەچی؟

- وەکوو جاران دەبێ قوتابییەکان بەرم بۆ کوێستان بۆ گەڕان و ئاگام لێیان بێت کە لە وێدا بە باشی دامەزرێن، بەڵام جێگرەکەم تا نیوەی مانگی ئووت دەگوزەرێ لە پشودان دەگەڕێتەوە و هەوڵ ئەدەم بۆ گۆڕینی کەش‌وهەواش بێت بچم بۆ کێوەکانی ئالپ لەگەڵ من دێی؟ دەتوانم بتبەم بۆ کەژەوانییەکی درێژخایەن. پێم‌وایە ناخۆشت لێناگوزەرێ کە لێکۆڵینەوە و موتالا بکەی لە سەر گژوگیاو گوڵەبەردینەکانی ئالپ، بەڵام ئەگەر تەنیا لەگەڵ من بیت پێم‌وایە بڕێک ناخۆشت بۆ بگوزەرێ.

- پاپا!

ئارتور دەستەکانی توند گوشی بە جۆرێک کە جولیا ئەو کارەی ناو نابوو «خۆڕانانێک بە شێوەی بیانییەکان و گوتی: «پێمخۆشە هەرشتێکی کە لە

دونیادا هەمە بیبەخشمەوە بە شەرتێکی کە لەگەڵ تۆدا بێم. هەرچەندە... کە دڵنیا نیم لەوەی....»
قسەکەی خۆی بڕی.
- پێتوایە کە ئاغای بێرتین ئیزنت بدات؟
- بێشک ئەو، ئەم کارەی پێ خۆش نابێت. بەڵام زەحمەتە بتوانێ پێشم بگرێ. ئێستا من هەژدە ساڵم تەمەنە و هەر کارێکی پێمخۆش بێت دەتوانم بیکەم. جگە لەوەش، خۆ ئەو تەنیا زڕبرای منە، پێویست ناکات هەموو شتێکم بە قسەی ئەو بێت. ئەو قەت زگی بە دایکم نەسووتا.
- بەڵام ئەگەر بەراستی نە یهێشت، بە بڕوای من، باشتر وایە لە بەرانبەریدا توندوتیژی نەنوێنی. چونکە بۆی هەیە لە ماڵێدا بەرەوڕوی کارەساتێکی زۆر خراپتر ببیەوە...
ئارتور قسەکەی بڕی و لێبڕاوانە گوتی: قەت خراپتر نابێت! ئەوان هەمیشە لە من بێزار بوون و بێزاریش دەبن... ئەو کارەی کە من دەیکەم کاریگەرییەکی وەهای نابێ. دوای ئەوە جیمز چۆن دەتوانێ نەهێڵێ بێم بۆ لای تۆ؟
- ئەوەت لە بیربێت کە ئەو پرۆتێستانییە. باشتر وایە برووسکەیەکی بۆ بنێری و ئێمەش تا هاتنەوەی بیروڕای ئەو چاوەڕوان دەبین، بەڵام کوڕم تۆ دەبێ لە سەرەخۆ و دانبەخۆداگر بی. ئەوەی بەلای منەوە گرنگ و جێی بایەخە کردەوەی تۆیە، جا خەڵکی لە تۆ بێزار بن یان خۆشیان بوێی ئەوە شتێکی دیکەیە.
ئەو ئاماژەکردنە هێند بە نەرمی و سانایی بەیان کرا کە ئارتور تەنیا بڕێک سوور هەڵگەڕا و هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی داوە: «بەڵێ دەزانم زۆر سەخت و چەتوونە».
مونتانلی لە پڕێکدا مژاری قسەکەی گۆڕی و گوتی: « لەوەی کە سێشەممۆ عەسرەکەی نەتتوانی بێی بۆ لام زۆر بە داخ بووم پاپا (ئارزو)ش لێرە بوو پێمخۆش بوو دیدارێکت لەگەڵ ئەو هەبێ».

- قەولم بە خوێندکارێک دابوو کە بۆ کۆبوونەوەیەک بچم بۆ ماڵی ئەو، کە لەوێ چاوەڕوانم بوون.
- چ کۆبوونەوەیەک؟
ئارتوو بەو پرسیارە شڵەژا و بە تێکەڵی و پێکەڵیەوە گوتی: « لە ڕاستیدا... کۆ... بوونەوەیەک... نە... بوو. خوێندکارێکی زانکۆ لە جێنوا*وە هاتبوو و قسەی بۆ ئێمە دەکرد. وەک... وەکوو کۆبوونەوەیەکی دەرسی و یانەیی وا بوو.
- سەبارەت بە چی دوا؟
ئارتور دوو دڵ بوو: «پاپا ناوەکەیم لێ مەپرسە؟ چونکی بەڵێنیم داوە کە...»
- هیچت لێ ناپرسم، هەڵبەت ئەگەر بەڵێنی نهێنیکارییەکت داوە نابێ هیچ شتێک بە من بڵێی، بەڵام پێموایە ئێستە ئێتر دەتوانی باوەڕت بە من هەبێ.
- پاپا هەڵبەتە کە بڕوام بە تۆ هەیە. وتارەکەی ئەو سەبارەت بە... ئێمە و بەرپرسیارەتی ئێمە، سەبارەت بە خەڵک... سەبارەت بە خۆمان و ئەوەی کە دەبێ یارمەتی بدەین بە...
- یارمەتیی کێ؟
- کۆنتا دینی**... و....
چی کەش؟
- ئیتالیا.
بێدەنگیەکی درێژخایەن باڵی بە سەریاندا کێشا.
مونتانلی ڕووی کردە ئەو و زۆر بە بڕشتەوە گوتی: ئارتور پێمبڵێ، لە کەنگێوە ئەو بیرۆکەیەت لە مێشک دایە؟»
- لە زستانی ڕابردووەوە.
- لە پێش مردنی دایکتەوە؟ دایکت ئاگاداری ئەوباس و خواسە بوو؟
نا من ئەو کات... زۆرم بیر لێ نەدەکردەوە.
- بەڵام ئێستا... زۆری سەرنج دەدەیێ؟

---

* . Genoa . شارێکی قەراغ دەریای ساردنی ئیتالیا
** . contadini چینی وەرزێر لە ئیتالیادا

ئارتور چنگێکی لە گوڵە دیژیتاڵیەکانی لێ کردەوە و کاتێ لە ئەرزی دەڕوانی گوتی: «پاپا، کارەکە ئاوا بوو کە: لە پاییزی ڕابردوودا، کاتێ کە خۆم بۆ تاقیکردنەوەکانی ناو زانکۆ ئامادە دەکرد لەگەڵ زۆر لەو خوێندکارانە ئاشنا بووم، لە بیرتانە؟ بەڵێ، بڕێک لەوانە لەگەڵ من دەستیان کرد بە پەیڤین سەبارەت بە... هەموو شتێک و بڕێک کتێبیشیان پێدام، بەڵام من زۆر سەرنجم نەدایە سەر ئەو بابەتانە. هەمیشە لە بیری ئەوە دابووم زوو بگەڕێمەوە ماڵێ بۆ لای دایکم. دەزانی ئەو لەو ماڵە جەهەندەمیەدا تەنیا بوو و تەنیا زمان و قسەی جولیا بەس بوو بۆ کوشتنی ئەو. دوایە لە زستانێدا کە زۆر پیس نەخۆش کەوت، ئیتر خوێندکارەکان و کتێبەکانم لە بیر خۆم بردەوە و دوای ئەوەش هەر وەک دەزانن ئیتر پیزام بە یەک جارەکی بەجێهێشت. ئەگەر ئەو بابەتانە لە مێشکمدا مابان، دایکمم ئاگادار دەکردەوە، بەڵام ئەوانەم یەکجارەکی لە بیرچوو بوەوە. دوایە زانیم کە دایکم مردنەکەی زۆر نزیکە - دەزانی تا دوا هەناسەی ژیانی لە لای ئەو بووم، زۆرتری شەوەکان بەخەبەر بووم. - جماوارێن بە ڕۆژدا دەهات تا من بتوانم وچانێک بدەم و سەرخەوێک بشکێنم. بەڵێ بە درێژایی ئەو شەوانە بوو کە ئەو کتێبانە و وتەی ئەو خوێندکارانەم کەوتەوە یاد. لە دڵی خۆمدا دەمگوت ئایا بیروبۆچوونی ئەوان ڕاست و دروستە و بڵێی بیرورای مەسیح لەو بارەوە چۆن بێ».

- ئەو داوایەت لای ئەو دەربڕی؟ وتەی مونتانلی زۆر بە دڵنیایەوە نەبوو.

- بەڵێ زۆر کات پاپا، لە ئاستانەی ئەودا پاڕامەوە کە یان ڕێنوێنیم بکات یان لێگەڕێ لەگەڵ دایکمدا بمرم، بەڵام هیچ وەڵامێکم پێنەگەیشت.

- قەتیش تاقە وشەیەکت لەو بارەوە بە من نەگوت. ئارتور من ئەو چاوەڕوانییەم لە تۆ هەبوو کە بڕوات بە من هەبێ.

- پاپا خۆت دەزانی کە بڕوام بە تۆ هەیە! بەڵام شتی واهەن کە پیاو ناتوانێ لە لای کەس بیاندرکێنێ. پێموابوو کەس ناتوانێ یاریدەم بدات. نە تۆ و نە دایکیشم. من دەبێ وەڵامی خۆم ڕاستەوخۆ لە لایەن خوداوە بە دەست بێنم. دەزانی ئەمە لەگەڵ ژیان و ڕۆحی من تێک هەڵپێچراوە.

مونتـانلی ڕووی وەرگێڕا و ڕوانییـە تاریکـایی نـاو لـقوپـۆپی دارەکـان. خۆرئاوا ئەوەندە لێڵبوو، کە جەستەی ئەو لە نێوان چڕی دارەکاندا وەکوو داوەڵێکی ڕەشوتار لەبەر چاو ون دەبوو.

لە دواییدا بە دڕدۆنگیەوە لێی پرسی: «دوای ئەوە؟»

ـ دوای ئەوە ... دایکم مرد. دەزانی من ئەو سێ شەوەی ئاخری تەمەنی تا بەیانی لە پەنایدا بەخەبەر بووم و نەدەنوستم...

بێدەنگ بوو و بڕێک مات بوو، بەڵام مونتانلی لە جێگای خۆی نەبزوا.

ئارتور زۆر لە سەرەخۆ درێژەی بە قسەکانی دا: «دوو ڕۆژ پێش ناشتنی تەواو حەپەسا بووم. دوای ناشتنی دایکم نەخۆش کەوتم. لە بیرتانە کە نەمتوانی بۆ تەڵقینەکەیشی لەوێ بم؟»

ـ بەڵێ لە بیرمە.

ـ بەڵێ ئەو شەوە لە جێگادا هەستام و چوومە ژوری دایکم هەر تەواو چۆڵ بوو، تەنیا خاچە گەورەکە لە شانشیندا بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: بەشکم خودا یاریدەم بدات بە ئەژنۆوە لە سەر ئەرز دانیشتم و ئەو شەوە تا بەیانی هەر چاوەڕوان بووم بەیانی هەر کە وەخۆ هاتمەوە... پاپا بێفایدەیە لێگەڕێ ناتوانم شی بکەمەوە، توانای ئەوەم نییە ئەوەی دیتوومە بۆتانی بگێڕمەوە... بۆ خۆشم زەحمەتە کە بە تەواوەتی بزانم چیم دیتووە، بەڵام دەزانم کە خودا وەڵامی داومەتەوە، و ناوێرم لە کاری ئەو خۆم لادەم.

هەردووکیان بۆ ساتێک بە بێدەنگی لە تاریکاییدا دانیشتن. پاشان مونتانلی گەڕاوە و دەستی نایە سەرشانی ئارتور وتی: «خودا نەکا کە بڵێم ئەو لەگەڵ ڕۆحی تۆدا نەدواوە. ڕواڵەتی خۆت لە کاتی ڕوودانی ئەو کارەدا وەبیر بێنەوە، بەڵام خەمباری و نەخۆشی و غایلەیی دڵت لەگەڵ بانگهێشتنی بەراستی ئەوت بە هەڵە لێتێک نەچێت. ئەگەر بەراستی ویستی خودا ئەوە بووە کە لە تاریکایی مەرگدا وەڵامی تۆ بداتەوە، سەرنج بدە و ئاگادار بە، خراپی لێک نەدەیتەوە. ئەوە چ کارێکە کە بە تەمای جێبەجێی بکەی؟»

ئارتور هەستایە سەرپێ دەتگوت پرسیار و وەڵامێکی ئایینی دووپاتە دەکاتەوە بە متمانەیەکی تەواوەوە وەڵامی داوە: «کە ژیانم لە پێناو ئیتالیادا

بەخت ئەکەم. هەوڵ ئەدەم بۆ ڕزگاریی وڵاتەکەم لە دەست ژێرچەپۆکەیی و چارەڕەشی و کردنە دەرەوەی نەمساییەکان، تا بەشکم وڵاتەکەم وەکوو کۆمارێکی ئازادی لێبێت و مەسیح تاقانە شای ئەو بێت.

- ئارتور ساتێک لەوەی کە گوتت بیری لێبکەوە! تۆ تەنانەت ئیتالیاییش نیت.

- تەوفیری نییە، من خۆم ئەو خەونەم دیتووە و دەبێ خۆم بەختی ئەم ڕێبازە بکەم.

بێدەنگییەکی دیکە دایگرتن.

مونتانلی بە ڕامانێکەوە وتی: «هەر ئێستە لە سەر قسەکانی مەسیح دەدوای...»، بەڵام ئارتور پەڕیە نێو قسەکانییەوە: «مەسیح دەڵێ کەسێکی کە ژیانی بەختی ڕێگای من بکات دیسان دەژێتەوە.» مونتانلی شانی بە لقێکی دارەکەوە دا و دەستێکی بە چاوەکانییەوە گرت و لە دوایەدا گوتی: «کوڕم چەند ساتێک دانیشە!»

ئارتور دانیشت، پاپا هەر دوو دەستی ئەوی لە نێو دەستە گەورە و بە تواناکانی خۆیدا گرت و گوتی: «ئەمشەو ناتوانم زیاتر لەوە لەگەڵ تۆدا بدوێم. چونکە چەند جارێکی دیکەش لەگەڵ ئەم کێشەیەدا ڕووبەڕوو بوومەتەوە ـ تا ئێستا لێکم نەداوەتەوە ـ دەبێ مەودا هەبێ تا فکری لێبکەمەوە دوایە پتری قسە لە سەر دەکەین، بەڵام ئێستا داوات لێدەکەم کە شتێکت لە بیر بێ ئەگەر لە سەر ئەم بیروباوەڕە تووشی کێشەیەک بی یان بمری، بە جارێ دڵی من تێکدەشکێنی.»

- پاپا...

- نا، لێمگەڕێ ئەو شتەی کە دەمهەوێ بیڵێم با تەواوی کەم. جارێکم بە تۆ گوتووە کە لەو دونیایەدا هەر تۆم هەیە. پێموایە مانای ئەم قسەیە باش تێناگەی. لاوێکی وەک تۆ باش ئەم وتەیە تێناگات. منیش کاتێ لە تەمەنی تۆدا بووم باشی لێ حاڵی نەبووم. ئارتور تۆ بۆ من وەکوو... وەکوو .. کوڕی خۆم وای. حاڵی دەبی؟ تۆ بینایی چاو و ئاواتی دڵی منی، من حازرم گیانی خۆم دانێم تا تۆ هەنگاوێکی هەڵە هەڵنەهێنییەوە و ژیانت نەکەوێتە

خەتەرەوە، بەڵام من هیچ کارێکم پێناکرێ من بە تۆ ناڵێم کە قەول و بەڵێنییەکم پێبدەی، تەنیا ئەو شتەم لە تۆ دەوێت و لە بیرت بێت کە بە تەواوەتی ئاگات لە خۆت بێ پێش ئەوەی هەنگاوێکی مەترسیدار هەڵێنییەوە - ئەگەر خاتری دایکیشت لەبەر چاو نییە کە لەو دونیایەی دیکە دایە، لەبەر خاتری من پتر ئاگات لە خۆت بێ - باش بیر لە ئەم کارەت بکەوە و جوان تێفکرە.

بیر دەکەمەوە.... و... پاپا بۆ من و بۆ ئیتالیا بپارێوە.

لەو بێدەنگیەدا چۆکی دادا. مونتانلیش دەستی خستە سەرسەری ئارتور کە داینەواندبوو. لەدوایەدا ئارتور هەستایە سەرپێ. دەستی ئەوی ماچ کرد و بە هێوری بە درێژایی چیمەنەکەدا کە شەونمی لە سەر نیشتبوو کەوتە ڕێ. مونتانلی بە تەنیایی لە ژێر دارەکەدا دانیشت و ڕوانییە تاریکاییەکەی بەردەمی خۆی.

لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەوە تۆڵەسەندنەوەی خودایە کە بەسەر مندا باریوە، هەر وەکوو بەسەر داود*دا باری. من کە ئەو جێگا پاک و بێگەردەم گلاو کرد و جەستەی ئەوم بەو دەستە پیسانەم گرتووە. هەرچەند ئەو بەسەبر و بەزەبر بووە و ئێستاش سەبر و لێبوردەیی تەواو بووە.

ئەگەرچی تۆ ئەو کارەت لە نهێنیدا کرد، بەڵام من ئەو کارەم لەبەر چاوی هەموو ئیسرائیلەکاندا وەکوو ڕۆژ نیشان دا. منداڵێکی کە لە تۆ لەدایک دەبێ دڵنیابە دەمرێ**.

---

* - پاشای ئیسرائیل کە خودا غەزەبی بەسەردا باراند چونکە نامرۆیی لەگەڵ ئەفسەرێکی خۆی کرد و هاوسەرەکەی لێ فریودا (ئینجیل)

** - برگەیەک لە کتێبی ئایینی و ئاسمانی.

## ٢

ئاغای جیمز بێرتێن ڕای زڕبراکەی پەسند نەکرد کە «لەگەڵ مونتالی بە دوری سویسرادا بسوورێنەوە». ئارتور ئەو دژایەتیە توندەی ئەوی زۆر زاڵمانە دەدیت لەمەڕ سەیاحەتێکی گیاناسی و بێخەتەردا، ئەویش لەگەڵ مامۆستایەکی پیری ئایینیدا، کە هیچ هۆیەکی بۆ ئەو دژایەتیە نەدەدیت. هەر لەو کاتەدا، ئەو کارەی ئەوی لە سەر کار تێکردنی دەمارگرژیی ئایینی یان ڕەگەزی دەزانی؛ بەڵام بێرتێنەکان گوێیان بەو قسانە نەدەبزوت و بە ڕابردووی ڕۆشنبیرانەی خۆیان دەنازین.

هەموو ماڵباتی بێرتێن و کوڕەکانی هەر لە کاتی دروستبوونی شەریکەی خۆیانەوە خاوەنی پاپۆڕەکانی نێوان لەندەن و لیگهۆرن بوون، کە پتر لە سەدەیەک بەسەر تەمەنی ئەو شەریکەیەدا تێدەپەڕی. ئەوان پرۆتستانییەکی وەفادار و کۆنەپارێز بوون. لە سەر ئەو بڕوایە بوون کە جەنتەلمەنێکی بەریتانیای تەنانەت لەگەڵ لایەنگرانی پاپاش دەبێ هەڵسوکەوتێکی باشی هەبێ. گەورەی ماڵێ کاتێ زانی ناتوانێ بە ڕەبەنی هەڵکات. ژیانی هاوبەشی لەگەڵ مامۆستای منداڵەچکۆلەکانی خۆی کە ژنێکی زۆر جوان و کاتۆلیک بوو پێکهێنا. دوو منداڵە گەورەکەی بە ناوی جیمز و توماس بە بوونی زڕدایکیان کە تۆزێک لەوان گەورەتر بوو زۆر خۆشحاڵ نەبوون، بەڵام بە نابەدڵی و بە ناچاری شانیان دایە بەر قەزاوقەدەری خودایی.

دوای مردنی باوکیان ژنهێنانی برا گەورەکەیان ئەو کەشوهەوایەی ماڵێی لێ ئاڵۆزتر کردن، بەڵام هەردوو براکە زۆر پیاوانە هەوڵیان دابوو تا گلادیس ماوە، لە بەرانبەر جولیادا پشتیوانیی لێ بکەن و سەبارەت بە ئارتوریش بەرپرسیارەتییەکەی خۆیان بەجێ بێنن. ئەوان دڵسۆزی بوون و هەر

سەرزارەکی خۆشیان نەدەویست. سەبارەت بە وی دڵئاوا و لێبوردنیان هەبوو. بە گشتی پووڵ و پێداویستیەکانی ژیانی ئەویان ئامادە دەکرد و لە گەڕان و کاری دڵخوازی خۆشیدا ئازاد بوو.

هەر بەو بۆنەیەوە ئارتور لە وەڵامی نامەکەی خۆیدا "چەک"ێکی بەنکی بۆ هاتبوو. بۆ خەرج و مەخاریج ئیزنیشی پێدرابوو چۆنی پێی خۆشە بە دڵی خۆی کەڵک لە پشووەکەی وەرگرێ. ئەو ناوەی پووڵەکەی دانا بۆ کڕینی کتێبی گیاناسین و ئەلبۆمی ڕەگ و ڕیشەی وشککراوی گیاکان و لەگەڵ پاپا چوو بۆ هەوەڵین گەشت و سەیاحەتی خۆی لە ئاڵپ.

لە ناوچەی ئاڵپدا مونتانلی لە جاران زۆر خۆشحاڵتر بوو لەوەی کە ئارتوری لەگەڵ دایە بە هۆی وتوێژی ئەوان لە باخەکەدا، خۆی تەکاند و وردە وردە هێورتر بووە وە و ئامادەتر بوو تاکو پتر سەرنج بداتە مژار و وەزعەکە.

ئارتور لاوێکی تازە پێگەیشتوو و کەمئەزموون بوو وهەروا بە ئاسانی لە تەمای خۆی پاشەگەزنە دەبووەوە، بەڵام بێگومان هێشتا دەرفەتی ئەوە هەبوو کە بە نەرمی بیدوێنی و بە بەڵگەوە ڕازیی بکەی لەو ڕێگا پڕ مەترسیەی کە تازە هەنگاوی بەرەو ئەوێ هەڵێنابوو بکشێتەوە.

هەردووکیان تەمایان وابوو چەند ڕۆژێک لە ژینێڤدا بگەڕێن، بەڵام ئارتور هەوەڵین جار بوو ئەو شەقامە ڕووناکانەی دەدیت و ئەو سەیرانگا خۆش و پڕ لە توریستانەی شاری دەبینی بڕێک مات بوو. مونتانلی بەدەم پیاسەکردندا ئەوی لە ژێرچاوەدێریدا بوو.

کارینۆ ئێرەت پێخۆش نییە؟

ـ نازانم لەوەی کە لە زەینی خۆمدا لە بەر چاوم گرتبوو فەرقی زۆرە. بەڵێ گۆلاوێکی زۆر جوانە و وێنەی ئەو تەپکانەم خۆش دەوێ.

ئەو دوورگەیەی کە ئەوانی لێ بوون ناوی «ڕوتو» بوو. ئارتور ئاماژەی کرد بۆ لێواری دووردورودرێژی دەریا و گوتی: «بەڵام شار لێوالێو لە زریقە و بریقە دایە شێوەی ژیانی پرۆتستانی و لەخۆڕازی بوونی پێوە دیارە. نا - ئێرەم پێخۆش نییە. بە دیتنی ئێرە دەکەومەوە یادی جولیا».

مونتانلی پێکەنی: «فەقیرە، چەند دڵتەنگە! خۆ ئێمە هاتووینەتە ئێرە بۆ سەیران. دەی کەوایە بۆ لێرەدا بمێنینەوە، چاکوایە ئەمڕۆکە بەو لۆتکە بەرکەنە* سەیرانێکی سەر ئەم گۆلاوە بکەین و سبەینێ بەیانیش بەرەو کوێستان هەڵزنێین؟»
- بەڵام پاپا خۆ تۆ دەتویست لێرە بمێنییەوە!
- رۆڵەی ئازیزم من ئێرەم زۆر دیتووە. دڵخۆشی من و سەیرانی من شادیی تۆیە بۆ کوێت پێخۆشە با بڕۆین؟
- ئەگەر بەراستی فەرقێکی بۆ ئێوە نییە، پێم‌باشە بە سەر لێواری ئەم چۆمەدا هەتا سەر سەرچاوەکەی بڕۆین.
- ڕێن؟
- نەخێر ئاژۆ، چۆمەکە زۆر خوڕێنە.
- کە وایە بۆ شامۆنێکس دەچین. پاش‌نیوەڕۆ بەو لۆتکە بادەوەکە کورتە سەیرانێکیان کرد. گۆلێکی جوان بوو. ئاوە لێڵ و مەندەکەی گۆلەکە کەمتر کاریگەریی لە سەر هەستی ئارتور هەبوو. ئەو پەروەردەیدەم دەریای نێوەڕاست بوو، بە شەپۆل و پێلی شینی ئەوێ ڕاهاتبوو، بەڵام ئاوی سەرکێش و خوڕێنی زۆر خۆش دەویست و خوڕێنی و بە تەوژمی ئەو ئاوە سەهۆڵاوەیە یەکجار کەیف خۆشی دەکرد. دەیگوت: «بە هەموو توانای خۆیەوە بەرەو پێش دەڕوات».
سبەینێ دەمەدەمی بەیانی بەرەو شامۆنێکس کەوتنەڕێ. هەر کەوتنە ڕێ لە دەرەوەی شار ئارتور بە دیتنی ئەو مەزرا سەرسەوز و بە پیت‌وبەرەکەتانە کە لە شیوودۆڵێکدا بوو زۆر خۆشحاڵ بوو.
بەڵام هەرکە بەرەو ڕێگا پێچەڵاو پێچەکان هەنگاویان نا کە لە نێوان تەپکە گەورە و بچوکەکاندا بوو و بێدەنگ بوو و قیت‌وقۆز و بە بڕشت ملی ڕێگای بڕی لە سێنت‌مارتین بەولاوە وردەوردە لە دۆڵەکە هاتنە سەرێ. بۆ پشوودان دەچوونە خانوەدارینەکانی قەراخ ڕێگا یان دەچوونە ئەو دێهاتە چکۆلە کوێستانیانە. دوایە حەزیان لە کوێ بوایە بەرەو ئەوێ وەڕێ دەکەوتن.

---

* - بادەوەی گەمی و لۆتکە

ئارتور بە جوانیی سرووشت و دیمەنەکە زۆر شاد و بە کەیف ببوو. هەرکە تووشی هەوەڵین تاڤگە بوو، ئەوەندە کەیفخۆش و خۆشحاڵ بوو هەر کەسێک بیدیبایە پڕاوپڕی شادی دەبوو، بەڵام هەر کە لە لووتکە بەفراویەکان نزیک دەبوونەوە، ئەو خۆشحاڵی و شاگەشکەییەی تەواو دەبوو و دەکەوتە ماڵی فکرەوە ئەم حاڵەتە لە لای مونتانلی زۆر نوێ و تازە بوو. دەتگوت پێوەندییەکی قورس و قایمی هەیە لەگەڵ کوێستانەکان. مەودایەکی چەند کاتژمێری لە جەنگەڵە تاریک و پڕ ڕەمز و رازەکەی سنۆبەرەکاندا کە دەنگی دەداوە بێ‌هەست و خوست دادەنیشت و لە کەلێنی ڕاست و بڵێندی سنۆبەرەکانەوە دەیڕوانییە تیریێژی زێڕینی خۆر، کە دەکەوتە سەرکوڵمی ڕەوەز و شاخەکان. مونتانلی بە نارەحەتی و خەمۆکیەوە چاوی لێ‌دەکرد. ڕۆژێکیان مونتانلی کە سەری لە سەر کتێبەکە هەڵبڕی سەیری کرد ئەوە ئارتور سەعاتێک زیاترە کە هەروا لە سەر سەوزەڵانییەکە لە پەنای ئەوەوە ڕاکشابوو و بە چاوی کراوەوە دەڕوانێتە بەرینایی ئاسمانە ساماڵ و ڕووناکەکە.

پێی‌گوت: «کارینۆ، خۆزگە هەر شتێکی تۆ دەیبینی پێشانی منیشت دابایە».

بۆ حەسانەوە لایاندا دێیەکی ئارام کە لە نزیک تاڤگەی دیوز بوو. ڕێگا تایبەتیەکەیان ون کردبوو و ئێستاش کە لە ئاسمانی ساماڵ و بێ‌گەرددا ڕۆژ ئاوا دەبێ، بە هیوای دیتنی تیشکی جوانی سەر ئالپ بەرەو لوتکەکانی ئەوێ و دوندی مین‌بیلان و نزارێکی کە بە داروەوەن و سنۆبەر تەنرابوو هەڵزنان. ئارتور کە لە چاوانیدا ڕامان و سەیروسەرسووڕمان دەباری بەرەو لوتکەی دەڕوانی.

- چ دەبینم پاپا؟ زیندەوەرێکی گەورە و سپی‌پۆش کە لە شینایی ئاسماندا زەق دەکاتەوە کە نە لە دروستبوونی ئاگادارین و نە لە کۆتاییشی.

دەیبینم و لێی حاڵیم کە لە مێژ ساڵە چاوەڕوانی بینینی ڕوحی خودایە. هەروەکوو ئەوەی کە لە پشت شوشەیەکی لێڵەوە دەیبینم.

مونتانلی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «منیش سەردەمانێک ئەو شتانەم دەدیت.»

- ئێستا ئیتر ئەوانە نابینیت؟
- نا ئیتر ئەوانە نابینم. چونکە من دەزانم کە ئەوانە هەن، بەڵام بە چاو ناتوانم بیانبینم، من زۆر شتی دیکە دەبینم.»
- شتی دیکە چین کە دەیانبینی؟
- من، کارینۆ؟ ئاسمانی شین و لووتکەی پڕلە بەفر - ئا ئەمەیە هەمووی ئەو شتانەی کە من لەم بەرزاییەدا دەیبینم، بەڵام لە خوارێدا شتی دیکەش هەیە.
ئاماژەی بە دۆڵەکەی خوارێ کرد. ئارتور ئەژنۆی داداو، لە سەر لێواری ڕەوەزە گەورەکە ڕوانییە خوارێ، دارە سنۆبەرە گەورەکان کە لە تاریکایی درەنگانی ئێوارێدا ڕەش و تار دەچوونەوە، وەکوو پاسەوانێک، بە درێژایی لێواری ڕووبارەکە قیت ڕاوەستابوون. ئەوەندەی پێنەچوو کە ڕۆژ وەکوو سکڵێکی ئاگرین لە پشت کێوێکی مشاریی بڕگەبڕگەوە ڕۆچوو و بە دوای خۆیدا ڕووناکییەکەشی داکێشا، دەتگوت ژین لە سەر سنگی سروشت کۆچی کردوە. هەر لەو کاتەدا زیندەوەرێکی ڕەش و مرومۆچ و ترسناک بە کۆشێکی پڕ لە چەکی خەیاڵییەوە لە سەر دۆڵەکەدا بەدەرکەوت. شاخی تیژوبڵێندی کێوە وشکەکانی ڕۆژئاوا لە ددانی دێوودرنجێکی گەورە دەچوون کە لە بۆسەی نێچیرێکدایە و خۆی مەڵاس داوە تا نێچیرەکەی بەرەو قووڵایی دۆڵەکە ڕاکێش بکات، ئەو دۆڵەی کە بە تاریکایی جەنگەڵەکەو زیقە و هەرا داپۆشرابوو. سنۆبەرەکان کە وەک لێوی تیژی خەنجەر بە ڕیز ڕاوەستابوون و نەرم دەدوان: «بەسەر ئێمەدا خۆت فڕێدە!» سێلاویش لە قووڵایی تاریکە شەوەکەدا دەیگوڕاند و دەیلووراند و شڵەژاو لە ناهومێدییەکی درێژخایەندا بوو. بە داییم خۆی بە ئەم بەروئەوبەری دیوارەکانی زیندانەکەی دادەکوتا.
ئارتور بە ترسێکەوە هەستا سەر پێ و لە لێواری ئەو تاشەبەردە گەورانەوە چوە ئەولاوە و وتی: «پاپا! وەکو دۆزەخ وایە».
مونتانلی بە هێوری وەڵامی داوە: «نا کوڕم، ئەوەش وەکوو ڕۆحی ئینسان وایە»
- وەک ڕوحیانەتی ئەو کەسانەی لە تاریکایی و ژێرسێبەری مەرگدا دادەنیشن؟

- وەکوو ڕوحی ئەو کەسانەی کە هەموو ڕۆژێ لە شەقام بە تەنیشتتدا رادەبرن.

ئارتور بە دیتنی سێبەرەکان لەرزی. تەپ و مژێکی لێڵ لەبەینی دارەکاجەکاندا پیاسەی دەکرد. وەکوو ڕوحێکی ئاوارە، کە بە هیچ شتێک سوکنایی نەدەهات. دەیڕوانییە هەوڵی بێئاکامی لافاوەکە.

لە پڕێکدا ئارتور گوتی: «چاولێکە ئەو خەڵکەی کە لە تاریکاییدا کەوتوونە ڕێ، ڕوشنایەکی گەورەیان دیتووە».

لووتکە بەفراویەکان لە نێوان گڕکانی سووری خۆرئاوابووندا دەسووتان. ئەو کاتەی کە درەوشانەوەی تیشکی سوور لە سەر لووتکەکان بێڕەنگ بوو، مونتانلی ڕووی خۆی وەرگێڕا و دەستی نایە سەرشانی ئارتور و هەڵیساندە سەرپێ:

- وەرە کارینو، ئیتر تیشکی خۆر تەواو بوو، ئەگەر زیاتر لەوە ڕاوەستین لە تاریکاییدا ڕێگاکە ون دەکەین.

ئارتور سەری وەرگێڕایە سەر لوتکە بەرز و بەفراویەکە کە لەبەر زەردەی کزی ڕۆژئاوا دەدرەوشانەوە و گوتی: «وەکوو جەستەیەکی مردوو وایە.»

هەردووکیان بە وردی بە نێو تاریکایی دارەکاندا هاتنە خوارێ، چوونە نێو ئەو کۆختەیەی کە قەرار وابوو شەوێ لەوێ بمێننەوە. مونتانلی دوای ئەوەی چۆوە ئەو ژوورەی کە ئارتور لە سەر مێزی شێوخواردن چاوەڕیی دەکرد ئارتوری دیت کە خۆی لە بەندی خەیاڵەکان دەرهێناوە و تەواو بۆتە کوڕێکی دیکە.

- ئای، پاپا وەرە ئەو سەگە چاولێکە! لە سەر پاشووی سەما دەکات.

چەندە شەیدای ئەو خۆرئاوا سوورهەڵگەڕاوە ببوو، ئەوەندەش شەیدای کارە هونەریەکەی سەگەکە ببوو. خانە خوێیەکەیان بە بەرهەڵبێنەی سپی و بە بازۆڵەی قەڵەو و گۆشتنییەوە دەستی لە کەلەکەی نابوو، کاتێ کە ئارتور کایەی لەگەڵ سەگەکە دەکرد لێو بە بزە لەو لاوە ڕاوەستابوو و بە زمانی خۆماڵیی خۆیان بە کچەکەی گوت: «بەم کارەی کە ئەو دەیکات، هەر کەس بیبینێت پێیوایە ئیتر هیچ فکر و خەیاڵێکی دیکەی نییە، ئەم کوڕە چەند جوانیشە.»

ئارتور وەکوو کچۆڵەیەکی قوتابخانە بەو قسەیە سوور هەڵگەڕا، و ژنە ،خانەخوێیەکە دیتی لە قسەکەی ئەو تێگەیشتووە بەو شڵەژاوییەی ئەو پێکەنی و چووە دەرەوە. لە کاتی شێوخواردندا ئارتور هەر باسی کەژەوانی و سەیرانی گیاناسینی کرد. بێگومان ئەو فکر و خەیاڵانە کاریگەریی لە سەر هەست و خواردنی ئەو دانەنابوو.

سبەینێ بەیانی کاتێ کە مونتانلی لە خەو هەستا، ئارتور لەوێ نەمابوو. ئەو پێش تاوهەڵات چووبووە ئەو لەوەڕگە و بەرزاییانە تا«یاریدەی گاسپار بدات بۆ ئەوەی بزنەگەلەکە بەرەو بەرزاییەکان ببات»، بەڵام تازە مێزی خواردەمەنی بەیانییان ئامادە کردبوو، کە ئەو لە کاتێکدا کچێکی سێ ساڵانەی ئەو دێیەی لە سەر قەڵاندۆشی دانابوو، بە چەپکە گوڵێکی مەزراوە بە بێکڵاو زۆر بەپەلە خۆی کرد بە ژووورێدا. مونتانلی لێو بە بزە سەری هەڵێنا. ئارتوری ئێستا جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ ئارتوری ئارام و لە سەرەخۆی پیزا و لێگهۆرن.

ـ هەتیوە شێتە لە کوێ بووی؟ بە گەدەی بەتاڵەوە لەو کێوانە دەگەڕێی؟

ئای پاپا، زۆر خۆش بوو! چیاکان کاتی تاو هەڵاتن زۆر پڕ شکۆن و تنۆکی شەونمەکانیش زۆر جوانن! چاو لێکەن چەکمە تەڕ و قوڕاوییەکەی هەڵێنا.

ـ بڕێکمان نان و پەنیر لەگەڵ خۆمان بردبوو، لە مەزراش شیری چەند بزنێکمان دۆشی، ئای چەندە پیس بوو! بەڵام هێشتا برسیمە. بڕێکیشم بۆ ئەم کچۆڵەیە دەوێ... ئانێت هەنگوین دەخۆی؟

کچەکەی لە سەر ئەژنۆێ خۆی دانابوو، پێکەوە گوڵەکانیان ڕێک و پێک دەکرد. مونتانلی ڕەخنەگرانە وتی: نا، نا! نەخۆشکەوتنی تۆ، من نارەحەت دەکات. خێرا بڕۆ جلوبەرگە تەڕەکانت بگۆڕە. ئانێت وەرە بۆ لای من. لە کوێوە ئەم کچۆڵەیەت هێناوە؟»

ـ لای گەڕەکی سەرووی دێوە، کچی ئەم پیاوەیە کە دوێنێ دیتمان . پینەچی دێیەکەشە، چاوەکانی زۆرجوانە، کیسەڵێکی لە گیرفان دایە ناویشی ناوە کارولین.

ئارتور دوای گۆڕینی گۆرەوییە تەڕەکانی، کاتێ بۆ خواردنی نانی بەیانی هاتە ژورەوە، دیتی کە کچەکە لە باوەشی پاپا دایە، سەبارەت بە کیسەڵەکە کە بە دەستە قەڵەوەکانی بەرزی کردبووەوە چەنەوەڕی بۆ پاپا دەکرد تا «ئاغا» کیسەڵەکەی پێ جوان بێت کە خێرا خێرا لاقەکانی دەبزواند.

کیژەکە بە ئاخافتنی خۆماڵی و ناوچەییەوە کە لە زۆر شتی تێنەدەگەیشت گوتی: «ئاغا چاو لە پۆتینەکانی کارولینو کەن!»

مونتانلی کەوتە کایەکردن لەگەڵ منداڵەکە. دەستی بەسەروقژی داهێنا، کیسەڵە ئازیزەکەی ئەوی پێ جوان بوو. حەقایەتی خۆشی بۆ دەگێڕاوە، خانەخوێیەکە کاتێ بۆ کۆکردنەوەی سفرەی سەر مێزەکە هاتە ژوورەوە، بە سەرسووڕمانەوە دیتی کە ئانێت گیرفانەکانی ئاغای مونێر کە جلوبەرگی مەلایانەی لەبەر دابوو، دەر دەکێشێ و دەیپشکنێ.

ژنەکە گوتی: «خودا منداڵەکان فێردەکات کە چۆن مرۆڤە باشەکان بناسن. ئانێت هەمیشە لە غەریبەکان دەترسا، بەڵام لە لای جەنابتان غەریبی ناکات. شتێکی سەیر نییە! ئانێت بە ئەژنۆوە لەبەر دەم ئاغادا دانیشە - تا نەڕۆیشتوون - دوعای خێر و چاکەی لێ بخوازە، بەختەوەرت دەکات».

دوای چەند کاتژمێرێک کاتێ لە مەزرا بەرڕۆژەکاندا پیاسەیان دەکرد ئارتور ڕووی لە پاپا کرد و گوتی: «پاپا تا ئێستا نەمدەزانی دەتوانی ئاوا بە هێوری لەگەڵ منداڵەکاندا یاری بکەی. کچۆڵەکە لەو کاتەدا چاوی لە تۆ هەڵنەدەبڕی. دەزانی، بە بڕوای من....»

- چی؟

- تەنیا دەمویست بڵێم کە... زۆر جێگای داخە کە کلیسا ناهێڵێت قەشەکان هاوسەریان هەبێ. باش نازانم بۆچی. پەروەردەکردنی منداڵ کێشەیەکی زۆر هەستیارە، ئەگەر منداڵ هەر لە هەوەڵەوە کاریگەریی کردەوە باشەکانی لە سەربێ، لە ژیانیدا ڕەنگدانەوەی باشی دەبێ بە بڕوای من، پیاوێک کە ژیانی پڕاوپڕ بێ لە کاروکردەوەی باش و شیاو، دیارە زۆر شیاوی ئەوەیە ببێتە باوک، ئەمن دڵنیام ئەگەر ئێوە بەڵێنیتان نەدابایە... ئەگەر ژیانی هاوبەشیتان پێکهێنابایە... منداڵەکانتان زۆر...»

- سس!

ئەم وشەیە ئەوەندە خێرا بەیان کرا کەوا دیار بوو ئەو بێدەنگیەی دوایی زۆردرێژخایەنتر دەبوو. ئارتور بە دیتنی ڕوخساری تێکچووی مونتانلی شڵەژا و درێژەی بە قسەکەی دا: «پاپا بە بڕوای ئێوە من لە هەڵە دام؟ هەڵبەتە ڕەنگە وا باشتر بێ ، ئەو جۆرەی کە من پێم وایە سروشتیە دەبێ وردبینانەتر لێی بکۆڵمەوە».

مونتانلی لە سەرەخۆ وەڵامی داوە: «پێموایە باش لە مانای ئەوەی گوتت تێناگەی. چەند ساڵێکی دیکە کە دابێ بیروڕایەکی جیا لەمەت دەبێ. ئێستا باشتر وایە پێکەوە باسی شتێکی دیکە بکەین.»

ئەم کەلێنە یەکەم جیاوازیی بیروڕای نێوانیان بوو کە لەم پشوودانەدا باڵی دەکێشا بە سەر ئاسایش و مەندی و ئارامیی نێوانیان.

شامۆنێکسیان بەجێ هێشت و لە ڕێگای تێت ـ نوورا بەرەو مارتینی کەوتنە ڕێ. بە هۆی گەرما تاقەت پڕوکێنەکەوە لە مارتینی بۆ پشوودانێک لایان دا.

کە نانی نیوەڕۆیان خوارد لە بەر سێبەری فێنکی هوتێلەکە دانیشتن کە دوور بوو لە گەرمای هەتاو و دەیڕوانییە هەموو دیمەنی کوێستانەکە. ئارتور قوتووی گیاکانی*دەرهێناو کەوتە وتووێژێکی گەرمی گیاناسی بە زمانی ئیتالیا.

لە ساباتی هوتێلەکە دوو بەریتانیایی‌یشی لێبوو ـ یەکێکیان خەریکی وێنە کێشانەوە بوو و ئەوی دیکەشیان بێسەرنجدان بە دەورووبەری خەریکی چەنەوەڕی بوو بێ ئەوەی بە بیری‌دا بێت کە ئەم دوو نەفەرە بیانییەی پەنایانەوە زمانی بەریتانیای دەزانن یان نا.

ـ ویلی لە ڕەنگکردنی ئەم تابلۆیە دەست ڕاگرە. وێنەی ئەم کوڕە ئیتالیایە بکێشەوە کە شەیدای لەت و کوتکراوەی ئەو دارەی پەنایەتی، ڕێک چاو لە خەتی برۆکانی کە! تەنیا بەجێی ئەم زەڕەبینە، خاچێک و بە جێگای ئەو کۆتوشەڵوارە قوڵەیە، تۆگایەکی** ڕۆمی دانێ تا وێنەی مەسیحێکی چاخی ئێمپراتووری ڕۆم نیشان بدات.

---

* ـ ئەو قوتووەی کە گیا جۆراوجۆرەکانی تێدا ڕادەگیرێ.

** ـ لیباسێکی هاودامێنی درێژی ڕۆمیە.

مەسیحەکانی دەورەی ئیمپراتوری ڕۆم هەر بڕوا و نەیەتەوە. کاتی خواردنی فراوێن لە پەنای ئەو لاوە دانیشتم. چەندە دڵخوازی ئەو بژاری پیسی گیاکان ببوو، هەرئەوەندەش شەیدای ئەو مریشکە سوورەوە کراوە بوو، بڕێک جوانە، ڕەنگێکی زەیتوونی جوانیشی تێدا دیارە، بەڵام ناگاتە قەدەر باوکی.

- کێی؟

- باوکی کە ڕێک ڕووبەڕووی تۆ دانیشتووە، یانی تۆ ئەوت وەبەر چاو نایە؟ زۆر شکۆدار و بەڕێزە.

- بەڵێ پەیکەرێکی پیرۆزە! یانی کاتێک قەشەیەکی کاتۆلیک دەبینی نایناسی؟

- قەشە؟ تۆخودا ئەمە قەشەیە! ڕاست ئەکەی. لە بیرم چووبووەوە.

سوێند و دروشمێکی داوێنپاکی و ئا لەم جۆرە شتانە ئیتر، جاکەوایە بە دڵێکی پاکەوە لێیدەڕوانم و گریمان کە برازای ئەوە.

ئارتور بە چاوی گەشاوەوە چاوی هەڵێنا و لە ژێر لێوەوە گوتی: «ئەو خەڵکە چەندە بێعەقڵن!، بەڵام زۆر دلۆڤانن کە دەڵێن منیش وەکوو تۆ وام؛ خۆزگە بە ڕاستی برازای تۆ بام - پاپا چ باسە ڕەنگتان تێکچووە!»

مونتانلی بەسەر پێوە ڕاوەستابوو و بە دەنگێکی زۆرهێور لە گەرووداگوتی: «سەرم لە گێژەوە دێ. پێموایە ئەمڕۆ بەیانی زۆر لەبەر تاو مامەوە. کارینو من دەچم ڕادەکشێم هیچ نییە گەرما کەمێ گێژی کردووم.

ئارتور و مونتانلی پاش ئەوەی دوو حەوتوو لە لێواری گۆمی لومیراندا مانەوە، لە ڕێگای گەردەنەی «سێنتگتارد»وە گەڕانەوە بۆ ئیتالیا. لە کاتی سەیران و گەشتەکەیاندا کەش و هەوا لەبار بوو، هەر بۆیە زۆر سەیاحەتێکی خۆشیان لەم لاو ئەولادا کردبوو.

بەڵام ئێستا وەک هەوەڵێ کەیفخۆش و سەریحاڵ نەبوون. مونتانلی زۆر جار خۆی دەدزیەوە لە ترسی«وتوویژێکی زۆرتر» ئەگەرچی لەو پشوودانەدا هەولێکی باشی بۆ هەڵکەوتبوو. لە دۆڵی ئاژۆدا کە لە ژێرداری بەڕوو دانیشتبوون بە ئەنقەست خۆی لەو ئاخافتنانە دەبوارد. پێیوابوو شیرنایی و تامەزرۆیی دیتنی سروشتی ئاڵپ بەو وتوویژانە تاڵ و ناخۆش

دەبێ بە تایبەت کە هەستی ناسک و هونەرمەندانەی ئارتوری دەهەژاند جا بۆیە ئەو کارەی لا زۆر زاڵمانە بوو.

لەو ڕۆژەوە کە لە مارتینی بوون هەموو جارێ بە خۆی دەگوت: «ئەمڕۆکە قسەی لەگەڵ دەکەم» و هەموو شەوێکیش دووپاتی دەکردەوە «بەیانی دەیدوێنم.»

ئیتر وردە وردە سەیران و گەشت بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت و دیسانیش ئەو دووپاتی دەکردەوە: «بەیانی، بەیانی» وا هەست دەکرا دۆستایەتییەکەیان وەک جاران گەرم و گوڕنەبوو ـ وادیاربوو پەرژینێکی نادیار کەوتبووە نێوانیانەوە ـ هەر ئەو هۆیانە مونتانلی لە بێدەنگیدا ڕاگرتبوو، تا ئەوەی کە لە دوایین شەوی مانەوەی گەشتەکەیاندا واتێگەیشت کە ئەگەر بە تەمای قسە کردن لەگەڵ ئارتور دایە دەبێ هەر ئێستا دەست پێبکات. بڕیاڕ وابووکە شەوێ لە لۆگانۆ بمێننەوە و بەیانی زوو بەرەو پیزا بکەونە ڕێ. لانیکەم ئەو دەبوو ئەوەندەی لێحاڵی بوایە کە ڕێگای پڕ لە کەند و کۆسپ و هەوراز و نشێوی ڕامیاری ئیتالیا چەندە جگەرگۆشەکەی بە دووی خۆیدا کێشاوە.

دوای ڕۆژئاوابوون بە ئارتوری گوت: کارینو، باران تەواو بووە و ئەوە دەرفەتێکی باشە بۆ دیتنی گۆلەکە (دەریاچە) بابچینە دەرێ دەمهەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.

بە درێژایی کەناری ئاوەکەدا بە پیاسەکردن چوونە جێیەکی چۆڵ و بێدەنگ. لە سەر دیوارێکی بەردی ئەوێ دانیشتن. لە پەنایاندا گوڵێکی شیلان ڕوابوو کە بە میوەی سووری دارێکی سەرووی خۆیەوە داپۆشرابوو، دووسێ دانە گوڵخونچەی نەپشکووتووی ڕەنگ ژاکاو. بە لقی سەروویەوە شۆڕ ببۆوە، بە هۆی قورسایی تنۆکی باراێ مات و ژاکاو بەم لاوئەولادا دەکەوەت ـ لۆتکەیەکی چکۆلە بە سەوڵی سپی و جوانەوە لە سەر ئاوی شینی گۆمەکە بە هێوری بە دەم شنەی فێنکی شەوەوە لە جووڵەدا بوو و ئەوەندە ڕووناک و وردیلە و جوان بوو کە دەتگوت دەنکە زێوینەکانی گوڵێکی بابردەڵەن کە بە سەر ئاوەوە هەڵوەدا بوون. پەنجەرەی ماڵە شوانێکی کە لە سەر کێوی «سالواتور»دا بوو. چاوەزێڕینەکانی خۆی هەڵهێنا. گوڵە

سوورەکان لە ژێر چەتری هەورە کپ و بێجووڵەکانی مانگی سپتامبردا سەریان دانەواندبوو و خەوتووبوون. ئاوی نەرمی گۆم لە سەر خیزەلانی قەراغ گۆماوەکە بە دەم حەیرانی نەرمی شنەی باوە بە ئەسپایی لەگەڵ وشکانیدا دەدوا. مونتانلی وتی: ئەمە تەنیا دەرفەتێکە و دەتوانم لەگەڵ تۆدا بدوێم. چونکە تا کاتێکی زۆر دوور نات‌بینمەوە. چونکە تۆ دەگەڕێیتەوە سەر ئیشی زانکۆ و لای هاوڕێیانت. منیش لەم زستانەدا بە کاروباری زۆرەوە سەرقاڵ دەبم. ئێستا زۆر بە ڕوونی دەمەوێ بزانم هەڵوێستی ئێمە لە بەرانبەر یەکتردا دەبێ چۆن بێ. جا کەوایە...» بڕێک ڕاوەستاو دوایە بە ئارامی درێژەی بە قسەکانی دا: «ئەگەر پێت‌وایە کە دەتوانی وەکوو ڕابردوو متمانەت بە من هەبێ. داوات لێدەکەم لە سەر ئەو مژارەی ئەو شەوەی کە لە باخی سیمیناریدا گوتت زۆرتر لە سەری بدوێی. پێم‌بڵێی تا چەندە تێکەلاوی ئەم بیرۆکەیە بووی.»

ئارتور چاوی لە ئاوەکە کرد بە بێدەنگی گوێی دایە و قسەی نەکرد.

مونتانلی درێژەیدا «ئەگەر دەکرێ پێم‌بڵێ کە ئایا تۆ خۆت پابەند بە بڕیارێک کردوە و یان... بە هەر شێوەیەک.»

ـ پاپای خۆشەویست شتێکی وانییە پێت‌بڵێم من خۆم بە شتێکەوە نەبەستووەتەوە! بەلام پێبەندی قەول و بەڵێنییک هەم.

ـ تێناگەم....

پەیمان و بەڵێنییەکان چ قازانجێکیان هەیە، خۆ ئەوە پەیمان نییە کە ئەو خەڵکەی لێک نزیک کردوەتەوە. ئەگەر مرۆڤ سەبارەت بە شتێک هەستێکی تایبەتی هەبێت، ئەم هەستە ئەبێتە پردی پێوەندی تۆ و مەبەستەکەت، بەلام ئەگەر وەها هەستێک لە دەروونی ئەودا نەبێت هیچ هەودا و پەیمانێک ناتوانێت ئەو پێوەندی و پردەت بۆ هەڵبەستێت.

ـ یانی مەبەستت ئەوەیە کە ئەم شتە ـ ئەم هەستە ـ هیچ پەشیمانییەکی لە دوا نییە؟ ئارتور ئەو شتەی کە دەیڵێی بیرت لێ کردۆتەوە؟

ئارتور گەڕاوە و ڕێک چاوی بڕیە چاوی مونتانلی.

- پاپا لە منت پرسی ئاخۆ دەتوانم متمانەم بە تۆ هەبێت. ئایا ئێوە دەتوانن متمانەتان بە من هەبێت؟ بە ڕاستی ئەگەر بابەتێک هەبایە حەتمەن پێمدەگوتی، بەڵام پەیڤین لە سەر ئەم بابەتە بێفایدەیە، ئەوەی ئەو شەوە پێت گوتم هەر لە بیرمە، قەتیش لە بیرم ناچێتەوە، بەڵام من دەبێ ڕێوشوێنی خۆم بدۆزمەوە وبە شوێن ئەو تیشکەدا بڕۆم کە دەیبینم.

مونتانلی خونچەیەکی لە گوڵە شیلانەکە لێ کردەوە و هەموو پەڕەکانی هەڵوەراند و خستیە ئاوەکەوە.

- کارینو تۆ ڕاست دەکەی. بەڵێ ئیتر لە سەر ئەم مەبەستە نادوێین، واوێدەچێ کە بەراستی وشەکان کۆڵن - زۆرچاکە، زۆرچاکە با بڕۆینەوە ماڵێ.

# ٣

پایز و زستان بهبێ هیچ ڕووداو و پێشهاتێک تێپەڕی. ئارتور خەریکی موتاڵاکردن بوو و کاتی بێکاری و بۆشی زۆر کەم بوو. ئاخرەکەی کارەکانی خۆی وا ڕێکوپێک کرد تا لە حەوتوویەکدا چەند جارێک ئەگەر بۆ چەند چرکەیەکیش بووبێ مونتانلی ببینێت. جارجار دەهاتە لای تا سەبارەت بە کتێبێک یان کێشەیەک یاریدەی بدات، بەڵام لەو کاتەدا سەرنجیان دەچووە سەر مژارێکی تایبەتی و هەمیشەیی خۆیان.

مونتانلی پێش ئەوەی لەمپەری چکۆلە و نادیاری نێوانیان ببینێت، کەمتاکورتێک هەستی پێ کردبوو و هەربۆیە لە زۆرکار خۆی دەپاراست تا نزیکایەتییە گەرموگوڕەکەی جارانیان کاڵ بێتەوە چونکە

هاتوچۆیەکانی ئارتور بەجێی ئەوەی خۆشحاڵی بکات پەرێشانی دەکرد. هەر بۆیە هەوڵی دەدا هەمیشە لەو بارەوە زۆر لە سەرەخۆ بێ و خۆی وا نیشان بدات کە بڵێ هیچ شتێک فەرقی نەکردوە.

ئارتور هەستی بەو گۆڕانکارییە زانایانەی مونتانلی کردبوو، کە بە زەحمەت توانیی بەسەریدا زاڵ بێت، بە جۆرێ هەستی کردبوو کە ئەم گۆڕانە لەگەڵ کێشەی«بیری‌نوێ»دا تێکەڵە کەپاپای ئازاردەدا و لە وەبیر هێنانەوەی ئەم مژارە کە فکروزکری ئەوی بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو خۆی دەپاراست، بەڵام ئەو قەت مونتانلی ئەوەندە خۆش نەویستبوو، ئەم هەستە ناڕازیبوونە دێرینەیە کە لە بۆشایەکی ڕۆحدا قەتیس مابوو، بۆ کپکردن و خامۆشکردنی لە ژێر باری قورس و گرانی ئایین و مەزهەبدا لە تێکۆشان و بەرخوداندا

بوو، که ئێستا به هۆی پێوەندییەکی کەم لەگەڵ «ئیتالیای لاو»*دا تەفروتونا ببوو.

ئیتر لەو هەموو خەیالات و وەهمە نەخۆشینانە هیچ نەمابوو کە هەمووی بە هۆی تەنیایی و ئاگاداری لە ژووری نەخۆشەوە سەریان هەڵدەدا. بێئەوەی پێویستی بە پاڕانەوە و هەڵاواردنی شەیتانەکان بێ لەبەین چووبوون، بە هەلایسانی مەشخەلانێکی دەروونی نوێ، بە تێڕوانینێکی ئایینی ڕوشنتر و نوێخوازانەتر (چونکە بە بڕوای ئەو ڕووناکایی جوڵانەوەی خوێندکاران زۆر باشتر و چالاکتر بوو لە باشتر بوونی ئاستی ڕامیاری) بە مانای هێوربوونەوەیەکی تەواو و بە مانای باڵکێشانی ئاشتی بەسەر زەویدا و چاکەکاری سەبارەت بە مرۆڤایەتیە. لەم کاتە ترسناکە و لەو هەلە ناسکەدا هەموو دونیای لە نێو کەوانی ڕووناکیدا دەدیت. ئەو تەنانەت ئەو کەسانەی کە بە چاوێکی ڕق و نەفرەتاویەوە دەدیت خاڵێکی نوێی پڕ لە خۆشەویستی لەواندا بەدی دەکرد. مونتانلی کە پێنج ساڵ قارەمانی ڕووگەی ئاواتەکانی بوو، ئێستا لەبەر چاوی ئەو بەرز و بەڕێزتر خۆی دەنواند وەکوو پێغەمبەرێکی گەورە ئیمان و بیری نوێی لێدیار بوو. بە چاوێکی تازەو گوێی ئاواڵەترەوە سەرنجی دەدایە ئامۆژگارییەکانی. هەوڵی دەدا کە لە نێوان فکری ئەو و ئاواتی پێکهاتنی کۆماردا یەکگرتنێکی دەروونی بدۆزێتەوە. بیری لە ئینجیل دەکردەوە. چێژی لە دێموکراسیخوازیی مەسیح وەردەگرت کە لە ناخ و ڕیشەی ئەودا بوو لە ڕۆژێکی مانگی ژانویەدا چوو بۆ سمیناری تا کتێبێک کە بە ئەمانەت وەریگرتبوو بیداتەوە. هەر کە زانی پاپا چووەتە دەرەوە، چوو بۆ ژووری تایبەتی کارکردنەکەی ئەو و کتێبەکەی لە جامخانەکە لە سەر جێگاکەی خۆی داناوە. کە ویستی لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە، چاوی بە کتێبێک کەوت کە لە سەر مێزەکە دانرابوو.

ئەم کتێبە دیمۆنارشیا* لە نووسینی دانتێ بوو. دەستی کرد بە خوێندنەوەی و خێرا وا گیرۆدەی بوو کە دەنگی کرانەوە و پێوەدرانی دەرگاکەی نەبیست، بەڵام بە بیستنی دەنگی مونتانلی وەخۆ هاتەوە.

---

* ـ ڕێکخراوێکی چکۆلەی شۆڕشگێڕە کە لە ساڵی  پێک هات ئامانجەکەی ڕزگاریی ئیتالیا لە ژێر چنگی بیانیەکان و پێکهاتنی ئیتالیایەکی یەکگرتوو بۆ حکومەتێکی کۆماری بوو.

پاپا کە چاوی لەکتێبەکە دەکرد گوتی: «ئەورۆکە چاوەڕوانت نەبووم، دەمویست هەر ئێستە کەسێک بنێرم بە شوێنتدا و داوات لێبکەم ئەمشەو لە لای من بمێنییەوە».

شتێک ڕوی داوە؟ ئەمشەو قەرارە کەسێک ببینم، بەڵام ئەگەر...

- نا بەیانیش دەکرێ، دەمویست بتبینم، چونکە پێنجشەمە دەڕۆم، بانگیان کردووم بچم بۆ ڕۆم.

- بۆ ڕۆم؟ زۆرت پێدەچێ؟

- لە نامەکەدا نووسراوە تا دوای جێژنی پاک. ئەو برووسکەیە لە لایەن ڤاتیکانەوە هاتووە. دەمویست زۆر زوو ئاگادارت کەم، بەڵام سەرقاڵی کاروباری قوتابخانە و دامەزراندنی بەرپرسێکی نوێ بووم.

- دەی باشە پاپا، سمیناریشیان دەخەیتە بەردەست؟

- بڕیار وایە بیاندەمێ، بەڵام دوای ماوەیەکیتر خۆم دێمەوە بۆ پیزا.

- سمیناریان بۆ دەخەیتە بەردەست؟

- ئەم باسە هێشتا تەواو مسۆگەر نەبووە، بەڵام بەرپرسایەتی ئۆسقۆفیان پێ پێشنیار کردووم.

- پاپا! کوێ؟

- هەر بەو هۆیەوەیە کە دەبێ بچم بۆ ڕۆم، هێشتا مەعلووم نەبووە کە دەبمە ئۆسقۆفی ئاپنێن یان وەک جێگری ئۆسقۆف هەرلێرە دەمێنمەوە.

- ئێستا بەرپرسی تازە دیاری کراوە کێیە؟

- پاپا «کاردی»یان داناوە و سبەینێش دێت بۆ ئێرە.

- وەک بڵێی لە پڕێکدا ئەو کارە نەکراوە؟

- بۆچی، بەڵام کار و فەرمانەکانی ڤاتیکان تا دوایین سات بڵاو ناکرێتەوە.

- بەرپرسی تازە دەناسی؟

---

* . سەبارەت بە «مۆنارشی» بەرهەمی دانتە هونەری گەورەی ئیتالیا ( . ٦٥ز) کە لەو کتێبەدا ئیتالیایەکی یەکگرتوو و بەهێز پێشنیار دەکات و دژ بە زۆرداریەتی پاپ و کارگێڕانی کلیسا ڕاوەستا. ئەم کتێبە لە سەدەی نۆزدەهەمدا پاپ دەستی بەسەر داگرت.

ــ لــه نزیکــەوە، نــا، ناینناســم، بــەڵام دەڵــێن زۆر بــەڕێزوحورمــەتــە «مینسی‌نیوربلێنی»* ئەو نامەی بۆ نووسیوم، دەڵێت ئەو پیاوێکی زۆر پسپۆڕ و هێژایە.

- ڕۆیشتنی ئێوە خەسارێکی گەورەیە بۆ سمیناری.

- بۆ سمیناری نازانم، بەڵام کارینو دڵنیام کە بە ڕۆیشتنی من تۆ نـاڕەحـەت دەبی. وەک ئەوەی کە من لە دووری تۆ دڵمەند دەبم.

- بەراستی زۆر دڵتەنگ دەبم، بەڵام لە بابەتێکیشەوە خۆشحاڵ دەبم.

- بەراستە؟ پێم‌وایە کە من خۆم بەو کارە خۆشحاڵ نیم.

ـ دەم و چـاوی دەتگوت ئـاو و دۆت پێدا ڕژانـدوە، کـوا ئـەوە ڕوخساری پیاوێکە کە چاوەڕوانی پلەوپایەیەکی باڵاترە. لە پشت مێزەکە دانیشت و دوای بـێ‌دەنگییـەک گـوتی: «ئـارتور دوانیـوەڕۆ کـارت هـەیـە؟ ئـەگـەر بـێ‌کـاری، پێمخۆشــە زۆرتـر لـە لام بمێنییـەوە، وادیـارە ئـەمشـەو نـاتوانی بێـی بـۆ لام، پێم‌وایە حاڵم زۆر باش نییە. واباشترە پێش ئەوەی بکەومە ڕێ زیاتر بتبینم.

- زۆر چاکە، بەڵام ناتوانم زۆر بمێنمەوە شـەشـی ئێـواری قـەرار وایـە بچم بۆ جێگایەک.

- یەکێ لە کۆبوونەوەکانتانە؟

ئارتور بـە سـەری وتـی بـەڵێ، مونتـانلی خێراباسـەکـەی گـۆڕی: «دەمـەوێ سـەبـارەت بـە خـۆت لـەگـەڵتـدا بـدوێم، کـاتێ مـن لێـرە نـیم پێویـستیت بـە دان‌پێدانانی* دیکە دەبێ».

ـ دوای ئـەوەی کـە گـەڕایتـەوە هـەر لـە لای خـۆت دان بـە هـەمـوو شـتێک دادەنێم، ئێزنم پێ‌دەدەی؟

- کوڕم، ئەو پرسیارە بۆ دەکەی؟ تەنیا سەبارەت بەو سێ‌چوار مانگەی کە لێـرە نـیم لـەگـەڵـت دەدوێـم. پێـتخۆشــە بچـی بـۆ لای یـەکـێ لـەو پاپـا سانتاکاترینایانا**؟

---

* ـ وشەیەکی ئیتالیایە، کە بۆ ڕێزگرتن لە ئیسقوفێکی کاتولیک دەیڵێن.

* ـ دان‌پێدانانی ئاینییە کە خاچپەرستەکان لە لای قەشەیەک باس لە تاوان و کردەوەی خۆیان دەکەن (و)

تۆزێکیان باسی کێشە جۆراوجۆرەکان کرد، دوایە ئارتور لە جێگای خۆی هەستا. ـ پاپا دەبێ بڕۆم. خوێندکارەکان با چاوەڕوان نەبن.

جارێکی دیکە ڕوخساری مونتانلی خۆفی لێنیشت.

ـ هەر ئێستا؟ بۆ چەند ساتێ خەم و پەژارەت لە بیر بردبوومەوە. زۆرچاکە، ئەگەروایە خودات لەگەڵ بێ.

ـ لە سەر ئێزنت، سبەینێ حەتمەن دێمەوە بۆلات .

ـ هەوڵ بدە زووتر بێی تا زۆرترت قسە لە گەڵ بکەم. پاپا کاردیش لێرە دەبێ، ئارتور کوڕە خۆشەویستەکەم کاتێ من لێرە نیم ئاگات لە خۆت بێ، لانیکەم تا من نەگەڕاومەتەوە کارێکی خراپ و ناشیاو نەکەی. نازانی چەند دڵتەنگی دووری تۆ دەبم.

ـ پاپا پێویست بەو قسانە نییە، هەموو شتێک هێور و لە سەرەخۆیە، هەروا کەمتاکورتێک دەخایەنێ.

لە پڕێکدا مونتانلی وتی: «خودات لەگەڵ.» دانیشت و سەرقاڵی نووسین بوو.

ئارتور هەر کە چووە ژووری کۆبوونەوەی خوێندکاران هەوەڵ کەس کە چاوی پێیکەوت ئاواڵەکەی کاتی منداڵیی بوو. کچەکەی دوکتور وارێن. ئەو لە لای پەنجەرەکەوە دانیشتبوو و بە ڕوخسارێکی دڵڕفێن و بە تامەزرۆییەوە گوێی شل کردبوو بۆ قسەکانی یەکێ لە «هەڵسووڕێنەران» کە لاوێکی باڵابەرزی خەڵکی لەمباردی کە کۆتێکی کۆنی لەبەردابوو. جما بە درێژایی چەند مانگی ڕابردوودا بە ڕواڵەت نەگۆڕدرابوو و زۆریش گەورە ببوو. ئێستاش سەرەڕای ئەوەی کە پەلکە ڕەشەکانی کە هێشتا بە شێوەی کچێکی قوتابخانە لە پشت سەریەوە شۆڕی کردبووەوە بە شێوە وەک ژنێکی لاو و جوان دیار بوو، جلوبەرگەکانی سەرتاپا ڕەش بوو و بە هۆی سەرما و ساردی ژوورەکە شاڵ گەردنە ڕەشەکەی بەسەر خۆیدا دابوو. لقەدارێکی «سەوڵ» کە دیاردەی ئیتالیای لاو بوو لە سەر سنگی داینابوو. کۆرگێڕ بە هەستێکی پرسۆزەوە بەشمەینەتی وەرزێرانی شی دەکردەوە ئەو لە کاتێکدا

** ـ قەشەکانی کلیسای سانتاکاترینا لە شاری پیزا.

چەناگەی نابووە سەر دەستێکی و چاوی لە ئەرز بڕیبوو بێدەنگ، گوێی ڕاگرتبوو. لەبەر چاوی ئارتور ئەو بەشێک لە سیمای ماتەمینی ئازادی بوو کە پەرۆشی نەبوونی کۆماری دەکرد. (ئەگەر جولیا لێرە دەبوو، ئەوی وەک کچێکی زوو پێگەیشتووی چەنەوەر بە لووتێکی ناڕێک و ڕەنگ و ڕووی پەڕیوی دەدیت کە جلوبەرگێکی کۆنە و زۆر کورتی لەبەردابوو)

کاتێکی کە کۆڕگێڕیان بانگ کرد بۆ ئەو سەری ژوورەکە، ئارتور هاتە لایی و گوتی: «جیم، تووئێرە!» جیم، کورت کراوەی نێوی جنیفێر بوو، بەڵام هاوقوتابیە ئیتالیایەکانی ئەویان بە «جما» بانگ دەکرد.

جما بە دەنگی ئارتور داچڵەکی و گوتی: «ئارتور، نەمدەزانی کە تۆش لەگەڵ جەماوەری ئەم گرووپەدای!»

- جیم منیش باوەڕم نەدەکرد، لە کەیەوە...؟

جما خێرا کەوتە نێو قسەکەیەوە و وتی: «نازانی! من لەگەڵیان نیم. ئەمە تەنیا لەبەر یەک دوو کارێکی چکۆلەیە کە جێبەجێم کردووە. دەزانی من «بینی»م دیت - کارلو تۆ بینی دەناسی؟

- بەڵێ دەیناسم.

بینی بەرپرسی شانەبەندی لێگهۆڕن بوو. هەموو هەڵسوڕاوانی ئیتالیای لاو دەیانناسی.

- بەڵێ ئەو لە سەر ئەو کێشانە لەگەڵ من دەدوا و منیش داوام لێ کرد بمبا بۆ یەکێ لەو کۆبوونەوە خوێندکاریانە. ڕۆژێک نامەیەکی بۆ ناردم لە فلۆرانس - نەتدەزانی کە پشووودانی کریسمەس لە فلۆرانس بوو؟

- زۆر کات لەماڵەوە بێخەبەرم.

- ئەودەم من لە ماڵی ڕایتەکاندا بووم. (ڕایتەکان هاوپۆلی ڕابردووی ئەوبوون و ئێستا ماڵیان لە فلۆرانس)ە ئەو کات بینی بۆی نووسیم لە گەڕانەوەمدا بۆ ماڵی سەرێکیش لە پیزا هەڵێنم تا لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداری بکەم. ئەها دەیانەوێ دەست پێبکەن.

کۆنفرانسەکە سەبارەت بە کۆمارێکی ئازاد و دیموکراسیخواز بوو و ئەرکی بەرەی لاویش ڕچەشکێنی بۆهاتنی ئەو کۆمارەیە. تێگەیشتنی گوێگر

له مژاری ویژەر برێک گران بوو، بەڵام ئارتور له ناخی دڵەوه گوێبیستی بوو. ئەولەو تەمەنەی ژیانیدا، بە جۆرێکی سەرسوورهێنەر هەموو شتێکی وەردەگرت بە بێ ڕەخنەگرتن. هەر بیرێکی نوێی ئەخلاقی کە وەردەگرت بێئەوەی تۆزقاڵێک شک و گومانی لێبکات بە دڵ دەیقۆزتەوە. کاتی کۆنفرانسەکە بە لێکدانەوەیەکی زۆرەوە، کۆتایی هات و خوێندکارەکان وردەوردە بڵاوەیان کرد. وردەوردە لە جما نزیک بووەوە کە لە قەراغ پەنجەرەکە دانیشتبوو.

- جیم دەکرێ لەگەڵتدا بێم، ماڵەکەت لەکوێیە؟

- لای مارینا.

- کابانەکەی پێشووی باوکت؟

- بەڵێ ماڵەکەی زۆر دوورە.

کات کەمێک بە بێدەنگی گوزەرا. لە پڕێکدا ئارتور پرسی «ئێستە حەڤدە ساڵتە وانییە؟»

- مانگی ئۆکتۆبەر بوومە حەڤدە ساڵ.

- من پێم وابو تۆ وەکوو کچانی دیکە گەورە نابێ و سەما و ئەو جۆرە کۆبوونەوانەت پێخۆش نابێ. ئازیزم جیم، زۆر جار بیرم لەوە دەکردەوە کە ئایا ڕۆژێک تۆش دێیتە ڕیزی ئێمەوە؟

- منیش هەروام بیردەکردەوە.

- گوتت کە برێک کارت بۆ بینی جێبەجێ کردوە، نەمدەزانی کە ئەو دەناسی.

- بۆ بینی نەبوو بۆ کەسێکی دیکە بوو.

- ئەی کێ بوو؟

- بوولا - ئەوەی کە ئەمشەو لەگەڵ من قسەی دەکرد.

ئارتور کەمێ ئێرەیی پێبرد و گوتی: «دەتناسی؟»

بوولا هۆیەک بوو بۆ پەرێشانکردنی ئارتور. لەوە پێش کۆمیتەی ئیتالیای لاو کارێکی بە بوولا سپاردبوو و بە هۆی تازەلاوی و کەم ئەزموونیی ئارتورەوە بەویان نەسپاردبوو ئەوەش ببوە هۆی ململانێی نێوان هەردووکیان.

- زۆر باش ئەو دەناسم، یەکجار زۆرم خۆش دەوێ، ماڵی لە لێگهۆڕن بوو.
- دەزانم، لە نوامبردا چوو بۆئەوێ....
- سەبارەت بە پاپۆڕانە هەڵمییەکان بوو، ئارتور، بە بڕوای تۆ بۆ ئەوکارە ماڵی ئێوە لە ماڵی ئێمە ئەمین‌تر نییە؟ کەس شکی ناچێتە سەر بە ماڵی ئێوە چونکە ماڵی ئێوە پاپۆڕ و سەروەتی زۆرتان هەیە. دوای ئەوە تۆ هەموو ئەنبارداره‌کانی ئەوێ دەناسی....
- سس ئازیزم، ئەوەندە دەنگت هەڵمەهێنە! ئەو کتێبانەی کە لە مارسەیەوە هات لە ماڵی ئێوە شاردرابووەوە؟
- تەنیا ڕۆژێک، ئاە! پێم‌وابێ نەدەبوو بە تۆم گوتبایە.
- بۆچی؟ خۆ تۆ دەزانی من لەگەڵ ئەو ڕێکخراوەیەم جما، ئازیزم، هیچ شتێک لەم دونیایەدا بە قەدەر ئەندامبوونی تۆ بە ئێمەوە ئەمن خۆشحاڵ ناکات
- تۆ و پاپا.
- پاپای تۆ! مەگەر ئەو...
– نا! بیروڕای ئەو جیاوازە، بەڵام جارجار لە خەیاڵمدا دیتوومە... کە...هیوادارم کە... نازانم».
- بەڵام ئارتور! ئەو قەشەیە.
- دەیجا چیە؟ لەم ڕێکخراوەی ئێمەدا قەشەشی تێدایە - دوو نەفەریان لە ڕۆژنامەکەدا بابەت دەنووسن. بۆچی وانەبێت؟ ئەمە ئەرکی پێگەی قەشەکانە کە ڕێنمابن بۆ جیهان بۆ گەیشتن بە ئامانجی بەرز و بەرینی مرۆڤایەتی. مەگەر ئاوات و ئامانجی ڕێکخراوەکەی ئێمە جیا لەوەیە؟ دوای ئەوە لایەنی ئایینی و ئەخلاقی ئەم کێشەیە لە لایەنە ڕامیاریەکەی زۆرترە. ئەگەر ئاستی بیروئەندێشەی خەڵکی بگاتە ئەو جێگایەی کە ئازاد و بەرپرسی خۆیان بن، هیچ کەس توانایی ئەوەی نییە ئەوان لە کۆت و بەندا ڕاگرێت.
جما نێوچاوانی تێکنا و گوتی: «ئارتور من باش لەو لێکدانەوەی تۆ نەگەیشتم قەشە مامۆستایەکی ئایینییە. من تێناگەم ئەمە چ پێوەندییکی هەیە لەگەڵ ڕزگاری لە ژێردەستی نەمساییەکاندا».

- قەشەیەک فێری مەسیحیەت دەبێ و مەسیحیش لە هەموو شۆڕشگێڕێک شۆڕشگێڕتر بوو.

- دەزانی چییە، ڕۆژێکیان سەبارەت بە قەشەکان لەگەڵ بابم قسەم دەکرد، ئەو گوتی....

- جما باوکت پڕۆتستانییە.

جما دوای کەمێ بێدەنگ بوو و چاوێکی ماناداری لێ کرد و گوتی: «چاولێکە باشتر وایە ئەم باسە وەلا نێین، هەموو جارێ بە دەمارگرژیەوە باسی پڕۆتستانەکان دەکەی»

- من نەمدەویست خۆم دەمارگرژ نیشان بدەم، بەلام بە بڕوای من، پڕۆتستانەکان دایمودەرهەم بە دەمارگرژیەوە باسی کاسۆلیکییەکانیان کردووە».

- پێموابێ تا ئێستا چەند جارێکیکەش سەبارەت بە کێشەێک کە بایەخێکی وای نییە قسەمان تێک گیراوە. دەی زۆر چاکە، ڕات چییە سەبارەت بە کۆنفڕانسەکە؟

- زۆرم پێخۆش بوو - بە تایبەت بەشە کۆتایەکەی، ئەو بەشەی کە بە بڕشتەوە لێی دەدوا سەبارەت بەپێوەندیولێکگرێدان و تێک هەڵشێلانی ژیانی کۆمەڵگا بە ئامانجی گەشی کۆمارەوە،کە دەبێ بە کردەوەو تێکلاو بوون بێ نەوەک لە چوارچێوەی خەیاڵوقسەی گەرمی دیوەخاناندا. وەکوو وتەی عیسا وایە کە دەڵێ: «پانتایی ئاسمان لە دەرونی تۆدایە».

- ڕاست ئەو بەشەی کە بە دڵم نەبوو، زۆر خاڵی بەرچاوی دەسنیشان کرد کە دەبێ لێیان تێفکرین و هەستیان پێبکەین و بە کردەوە بیسەلمێنین، بەلام بە داخەوە ڕێچکەو ڕێگا ستراتژیکەکانی ڕوون نەکردەوە.

- کاتی هاتنی قەیرانوشڵەژانەکان، ئیشوکارێکی زۆرمان بۆ دێتە پێشەوە، بەلام دەبێ ئەودەم لە سەرەخۆ بین. ئەو گۆڕانکاریە گەورانە لە ڕۆژوشەوێک دا ناگەنە ئەنجام.

- هەرچەندە کارێکی کەدرێژخایەنبێ هۆکاری درەنگ دەسپێکردنەکەشی ڕوون و ئاشکرایە، سەبارەت بە لێهاتوویی دەدوای لە مەڕ دەستەبەرکردنی

ئازادی. ئایا کەست پێشک دێ بە قەدەر دایکت شایانی ئازادی بێ؟ ئەو هەمووە کارە چاکانەی بە کوێ گەیاند؟ تا ئەو ڕۆژەی مرد هەر کۆیلە بوو، ئازار چێشتووی دەستی جیمزی برات و ژنەکەی بوو. ئازاری دەچێشت و بۆختانی دەبیست. ئەگەر ئەوەندە هێور و لە سەرەخۆ نەبوایە ژیانی باشتر دەبوو و قەتیش نەیاندەتوانی بە ناشیرینی لەگەڵیدا بجوڵێنەوە سەبارەت بە ئیتالیاش کارەکە هەر بەو جۆرەیە، پێویستیمان بە لە سەرەخۆیی و لە خۆبردوویی نییە ـ پێویستیمان بە کەسانێک هەیە کە بڕاسێن و پارێزگاری لە خۆیان بکەن....

جیم، ئازیزم ئەگەر توندوتیژی بیتوانیایە ئیتالیا ڕزگار کات زۆر لەوە پێشتر ئازاد دەبوو، ئیتالیا پێویستی بە قین و تووڕەیی نییە، ئەو پێویستی بە ئەوین و خۆشەویستی هەیە. بە گوتنی وشەی ئەوین سوورایی شەرم بە تەوێڵیدا هات و تێپەڕی. جما هەستی بەوە نەکرد. چونکە نێوچاوانی تێکنابوو و ددانەکانی بە توندی بەسەر یەکدا دادەنا و ڕێک چاوی بڕیبووە نێوچاوانی.

کەمێ بێدەنگ بوو و گوتی: «ئارتور بە بڕوای تۆ من لە هەڵە دام، بەڵام قسەی من ڕاستترە و ئەو ڕۆژە دێو تۆ بە چاوی خۆت دەیبینی. گەیشتینە ماڵێ، دێیە ژووری؟»

ـ نا دڕەنگە شەو باش ئازیزم!

لە بەر دەرگا وێستا و دەستی جمای لە نێو هەر دوو دەستی خۆیدا توند گوشی:

ـ لە ڕێگای خودا و خەڵکی....

جما ئارام و بە جەختەوە وتەکەی ئەوی ڕاست کردەوە:

ـ بۆ ئێستا و بۆ هەمیشە.

دوایە دەستی کێشاوەو هەڵاتە ژووری. کاتێ کە دەرگای ماڵێ داخرا، ئارتور دانەویو لقە سەوڵەکەی کە بە سنگی جماوە بوو و کەوتبووە خواری هەڵیگرتەوە.

## ٤

ئارتور، کە شایی لە دڵیدا دەگەڕا، گەڕاوە ژوورەکەی خۆی بێ خەم و بەختەوەر. لە کۆبوونەوەکەدا ئاماژە بە شۆڕشێکی چەکدارانە کرابوو. ئێستا ئیتر جما وەک هاوڕێبازێکی ئەو وا بوو. ئەوان دەیانتوانی پێکەوە کار بکەن و تەنانەت لە ڕێگای وەدیهاتنی کۆماردا پێکەوە گیانیان بەخت کەن. کاتی پشکووتنی گوڵی هیواکانیان بوو پاپا دەبوو ببیینێت و باوەڕیشی پێی هەبێت.

سەبینی بەیانی بە فکرێکی ئارامترەوە لە خەو هەستا و هاتەوە بیری کە جما بەچی بۆ لیگهۆڕن و پاپاش تەمای چوون بۆ ڕۆمی هەیە.

جانیوەر، فێبریوەر، مارس، ئەو سێ مانگە درێژە هەتا جێژنی پاک! بەڵام ئەگەر جما لە ماڵی کاریگەری «پرۆتستانەکان»ی لە سەر بێ (لە قامووسی ئارتوردا «پرۆتستانەکان» دوا کەوتوو بێ فەرهەنگ بوون)... نا قەت جما وەکو کچانی بەریتانیای لیگهۆڕن نییە کە خۆی بادا و بەپێکەنین و جیفرکلێدان لە بەرانبەر گەرۆکان و خاوەن پاپۆڕەکاندا خۆی سووک کات، ئەو لە چینێکی باش و تێگەیشتووە، بەڵام شایەدیش لاری بڕوا، چونکە تازە لاوە وهاوڕێی واشی نییە و لە نێوان مرۆڤانی مێشک ویشکدا تەواو تەنیایە، بریا دایکم ئێستا زیندوو بایە.

عەسر چوو بۆ سمیناری، لەوێ مونتانلی دیت کە میوانداریەتیی بەرپرسی تازە دەکات لە ڕوخساریدا ماندوویەتی و ناڕازی بوونی لێ دەباری. مونتانلی بە جێگەی ئەوەی بە دیتنی ئارتور وەکوو جاران بگەشێتەوە، ڕووتاڵتر بوو.

بە نارەحەتی و بە سرپوساردیەوە ئارتوری پێناساند: «ئەمە ئەو خوێندکارەیە کە سەبارەت بە وی لەگەڵتدا دووام، ئەگەر ئیزنی بدەی لە کتێبخانەکە کەڵک وەرگرێت زۆرت سوپاس دەکەم».

پاپا کاردی قەشەیەک بوو پیر و بە ڕواڵەت خێرخواز بوو. خێرا لە سەر بارودۆخی زانکۆ و ژیانی ئەوێ سەری قسەی لەگەڵ ئارتوردا کردەوە، قسە و باسەکەیان خێراکێشرایە سەر چۆنییەتی بەڕێوە بەری زانستگا و کێشە بەرچاوەکانی کۆمەڵگا.بەرپرسی تازە بە هەڵخەڵەتاندنی هەستی خۆشحاڵی لە ئارتوردا، دژ بە ڕێورەسمی قەبووڵ کراو لە لایەن بەرپرسان و کارگێڕانی زانستگاوە گوتی ئەوانە لەمپەر و بێناوەرۆکن و دەبنە هۆی سەرەگێژە و ناڕەحەتی خوێندکارەکان چەنەی گەرم بوو و زمانیش بە شوێنیدا.

ـ من لە ڕێنمایی گەنجەکاندا ئەزموونێکی زۆرم هەیە، یاسای من ئەوەیە کە تا بەڵگەی پتەوو باوەڕ پێ کراوت نەبێ، نابێ کەس لە سەر کاری خۆی لابرێت. ئەگەر سەرنج بدەیتە ویست و داخوازی لاوان و بە چاوێکی دڵسۆزانەوە لێیان بڕوانی کەم واهەیە ببنە هۆی سەرێشە و کۆسپ دروستکردن، لە بیرمان نەچێ ئەگەر ئێمە هەوساری هێدیترین ئەسپەکانیش بکێشین ئاخرەکەی جووتە دەهاون.

ئارتور زۆری پێسەیر بوو ئەو قەت باوەڕی نەدەکرد کە بەرپرسی نوێ داخوازی خوێندکارەکان قەبووڵ بکات.

مونتانلی لە وتووێژەکەیاندا بەشداری نەکرد، بە ڕواڵەت باسەکەی پێخۆش نەبوو، ڕوخساری دەتگوت ئاو و دۆت پێدا کردووە، کە لە پڕێکدا پاپا کاردی قسەکەی خۆی بڕی و پێیگوت: «بمبوورە کە ئەوەندە ماندووم کردووی. بەڕێز بمبوورە زۆرم قسە کرد، من زۆر تامەزرۆی ئەم جۆرە باسانەم و زۆر جاریش ئاگاداری ئەوە نیم کە شایەد ئەوانیتر ماندوو بن».

ـ نا نا پێمخۆشە.

مونتانلی عادەتی بە بەخێرهێنانی ویشک و فەرمییانەی نەبوو بۆیە ئارتور زۆری پێسەیر بوو.

کاتێ کە پاپا کاردی چووە ژوورەکەی خۆی. مونتانلی کە ئەو شەوە تەواو ژاکاو و لە فکر دابوو، ڕووی کردە ئارتور و بە هێواشی پێی‌گوت: «ئارتور، کوڕە ئازیزەکەم دەمەوێت شتێکت پێ‌بڵێم».

«دەبێ هەواڵێکی ناخۆشی پێبێ» ئارتور کە بە پەرێشانی و دڕدۆنگیەوە دەیڕوانییە ڕوخساری تێکچووی ، ئەو فکرە بە مێشکیدا هات.

بێ‌دەنگییەک دایگرتن.

مونتانلی دیسان لێی پرسی: «بەرپرسە نوێەکەت پێ‌باشە؟»

ئەوەندە لە پڕێکدا ئەو پرسیارەی کرد کە ئارتور بۆ چەند ساتێ نەیزانی چ بڵێ.

- زۆر... زۆر باشم هاتە پێش چاو، لانی کەم... نا، بە تەواوەتی دڵنیا نیم کە خۆشمدەوێت یان نا. چونکە وەڵامی ئەو پرسیارە بە یەکجار دیتن، بڕێک ئەستەمە.

مونتانلی دانیشت و ئارام بە دەستی لە دەسکی کورسیەکەی دەکوتا، لە کاتی پەرێشانیدا ئەوە عادەتی ئەو بوو.

دیسان دەستی پێ کردەوە: «سەبارەت بەو سەفەرەم بۆ ڕۆم، ئەگەر پێت‌وایە کە چکۆڵەترین... باشە... ئارتور، ئەگەر پێت‌خۆشە، نامەیەک دەنووسم و ڕادەگەیەنم کە ناتوانم لێرە بڕۆم».

- پاپا! ئەی ڤاتیکان...؟

- ڤاتیکان نەفەرێکی دیکە دادەنێت دەتوانم قەبووڵی نەکەم.

- بۆچی؟ من تێ‌ناگەم.

مونتانلی نێوچاوانی سڕییەوە و گوتی: «من نیگەرانی تۆم، زۆر شت هەن کە خەریکە مێشکم دەتەقێنن ـ بێجگە لەوە هیچ پێویست نییە کە من بڕۆم.

- بەڵام ئەرکی تازەی ئۆسقوفی بوونت.....

- حەیە حەیە ئارتور! بە دەستەوەگرتنی ئەرکی ئۆسقوفایەتی هیچ قازانجێکی بۆ من نابێ ئەگەر...

قسەکەی خۆی بڕی. ئارتور قەت ئەوی ئاوا نەدیتبوو. هەر بۆیە زۆر نیگەران بوو.

- پاپا من تێناگەم، خۆزگە باشتر شیبکەیتەوە، باش بۆم ڕوون بکەوە با بزانم چ فکرێکە بۆت هاتوتە پێشەوە و بیری لێ دەکەیتەوە.

- بیری لێناکەمەوە، - ترسێکی گەورە وەک دۆڵپا دەستبەردارم نابێ، پێمبڵێ کارەساتێکی تایبەت لە ئارا دایە؟

ئارتور بە وەبیرهێنانەوەی پاشاگەردانی سەبارەت بە شۆڕشێکی گەلاڵە رێکخراو لە دڵی خۆیدا وای بیر دەکردەوە: «شتێکی بیستووە».

بەڵام ئەو ئیزنی درکاندنی ئەو نهێنییەی نەبوو. لە وەڵامدا تەنیا ئەوەی گوت: «چ ڕووداوێکی تایبەتی دەبێ لە ئارادا بێ!»

دەنگی مونتانلی ڕەگی تووڕەیی پێوە دیار بوو: «پرسیارم لێ مەکە، وەڵامم بدەوە! ئایا ئازار و مەترسییەکت لە پێشە؟ من نامەوێ بزانم نهێنییەکانت چیین، تەنیا ئەوەم پێبڵێ».

- پاپا هەموومان لەبەردەست خودا داین، هەمیشە بۆی هەیە ڕووداوێک ڕوو بدات، من هیچ هۆ و هۆکارێک بۆ ئەوە نابینم کە دوای گەڕانەوەی ئێوە من دەبێ ساخ و سلامەت نەبم.

- لە گەڕانەوەی مندا، گوێت لێبێ کارینو! من ئەوە دەخەمە بەردەستی خۆت و بیر لێکردنەوەی خۆت، پێویست ناکا بەڵگە و بیانووم بۆ بێنیەوە، هەر ئەوەندەم پێمبڵێ «بمێنەوە» .ئیتر منیش بۆ ئەو سەفەرە ناچم، لەم کارەی مندا کەس ئازار نابینێت. منیش ئەگەر تۆم لێ نزیک بی لە ئاسایش و سلامەتیی تۆ زۆرتردڵنیام.

ئەو جۆرە فکرە خەیاڵیە لە مونتانلی بەدوور بوو. هەر بۆیە ئارتور بە نیگەرانییەکی زۆرەوە لێیڕوانی و وتی: «پاپا، دڵنیام کە تەندروستیت باش نییە، حەتمەن دەبێ بچی بۆ ڕۆم و لەوێ هەوڵ بدەی بە باشی بحەسێیتەوە و خۆت لە چنگ بێ خەوی و سەرئێشەکان ڕزگار کەی».

مونتانلی وەک ئەوەی کە لەو باسە ماندوو ببێ پەڕیە نێو قسەکەیەوە : «زۆر باشە. بەیانی زوو بە هەوەڵین عارەبانە، دەکەومە ڕێ».

ئارتور مات بوو و لێی ڕووانی و گوتی: «دەتویست شتێکم پێبڵێی؟»

- نا،نا ئیتر نا، بە هەندی مەگرە.

نیگەرانی و خۆف ڕوخساری تەواو داگرتبوو.

چەند ڕۆژێک لە ڕۆیشتنی مونتانلی گوزەرا بوو کە ئارتور بۆ وەرگرتنی کتێبێک چوو بۆ کتێبخانەی سمیناری و لە سەر پلیکانەکاندا تووشی پاپا کاردی بوو. بەرپرسە تازەکە بە ڕامانێکەوە گوتی: «ئای ئاغای بێرتێن! ڕاست ئەو کەسەی دەمویست ببینم، تکایە وەرە ژووری لەو دەردیسەریە نەجاتم دە».

دەرگای ژووری موتالا کردنی کردەوە و ئارتور بە نابەدڵیەوە کەوتە شوێنی. دیتنی کەسێکی بێگانە لە ژووری تایبەتی کاری پاپای خۆشەویستی زۆر ناخۆش و قورس و گران بوو.

بەرپرسەکە گوتی: من سەیر گیرۆدەی کتێبم، لێرە کاری سەرە کی من ڕێکوپێککردنی کتێبخانەکە بوو، بەڵام لە پۆلین کردنەکەیدا هەر تەقەی سەرم دێ و بۆم جێبەجێنابێ.

- ڕیزی نێوەکان تەواو نییە، زۆرێک لەو کتێبە باشانە تازە بۆی هاتووە.

- دەکرێ لەبابەت پۆلین کردنی ئێرەوە نیو کاتژمێر شروبەم بۆ بکەی؟

هەردووکیان چوونە کتێبخانەکە و ئارتور پێڕستی کتێبەکانی بۆ شی کردەوە کاتێ بۆ هەڵگرتنی کڵاوەکەی لە جێی خۆی هەستا، بەرپرسەکە بە بزەیەکەوە پێشی گرت و گوتی: «نا، نا نایەڵم ئاوا بە پەلە لێرە بڕۆی، ئەمڕۆ شەممۆیە و تا دووشەممۆ ئازاد و بێکاری، ئێستا کە ئەوەندم لێرە ڕاگرتووی دەبێ شێوم لەگەڵ بخۆی من تەنیام و پێمخۆشە هاودەمێکم لەگەڵ بێ».

هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئەوەندە باش و ساکار بوو کە ئارتور لە لای ئەو هەستی بە ئارامی دەکرد. پاش باس و خواسی جۆراوجۆر، بەرپرسەکە لە چۆنییەتی و دۆستایەتیەکەی ئەو و مونتانلیی پرسی.

- حەوت ساڵێک دەبێ. دوازدە ساڵانە بووم کە ئەو لە چین گەڕاوە.

- ئاها بەڵێ! هەر لەوێ بوو کە وەک وێژەرێکی ئایینی ناوبانگی دەرکرد، دوای ئەوە بوویە قوتابیی ئەو؟

- ساڵێک دواتر، دوای هەوەڵین دانیشتن لەمەڕ درکاندنی نهێنییەکانی خۆم ماموستایەتی منی قەبووڵ کرد. لەو دەمەوە کە چوومە زانستگە تا ئێستە، لە سەر هەر بابەت و کێشەیەکی جیا لە دەرس و یانە یاریدەدەرم بووە، پیاوەتییەکی زۆری لەگەڵ کردووم، ئەوەندە زۆر کە زەحمەتە بتوانم بەیانی کەم.

زۆر باش لێت حاڵیم، مونتانلی کەسێکە کە پیاو ناتوانێ بە چاکە لە سەری نەدوێ. - بەرز و بەڕێز و تەبیعەت پیاوە. ئەو قەشانەم لە نزیکەوە دیتووە کە لە چین لەگەڵی بوون. ئەوان دەیانگوت زمانی ئێمە لە حاست گەرم و گوڕی و ئازایەتیی ئەودا کۆڵ و کۆڵەوارە، لە بەرانبەر ئێش و ئازار و هەروەها گیانبازی و ورەی بەرزیدا دەستەوەستان بوون.

تۆ شانسێکی چاکت بووە کە لە سەرەتای لاویەتیتەوە هاوڕێیەک و ڕێنمایەکی ئاوا باشت بۆ پەیدا بووە، ئەو باسی بۆ کردووم کە باوک و دایکت نەماون.

- بەڵێ باوکم کاتێک کە منداڵ بووم مردووە و دایکیشم ساڵێک لەوە پێش مرد.

- خوشک و برات هەیە؟

- نا، دووسێ زڕبرام هەیە، کاتێ کە من لە بەرمەمکان بووم کاری بازەرگانیان دەکرد.

- کە وایە دەورانی منداڵیت بە تەنیایی تێپەڕیوە، هەر دەبێ بەو هۆیەشەوە بێ کە بایەخێکی زۆرتر دادەنێی بۆ دڵسۆزیەکانی پاپامونتانلی. لە نەبوونی پاپامونتانلیدا قەشەیەکت هەڵبژاردووە تا ئاکاری خۆتی لا بدرکێنی و پێیان لێبنێی؟

- لە فکری ئەوەدا بووم کە بچم بۆلای یەکێ لە قەشەکانی سانتاکاترینا. هەڵبەتە ئەگەر تۆبەکاری زۆریان لە لا نەبێ.

لە لای من تۆبە ناکەی؟

ئارتور زۆری پێسەیر بوو.

- بەڵێ - زۆریشم پێخۆشە، تەنیا...

- بەرپرسێکی زانستە ئایینییەکان تەنیا تۆبەی مەلا ئایینییەکان وەردەگرێ! ئەوە ڕاستە، بەڵام من دەزانم کە کانوون مونتانلی سەرنج و نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ تۆ هەبوو.

پێموایە برێک پەرۆشی تۆی بێ - ئەگەر منیش ناچاربم قوتابییەکی تایبەتی خۆم بە جێ بێڵم نارەحەت دەبم. هەڵبەت ئەگەر بزانێ کە تۆ لە ژێر کاریگەریی ڕێنوێنییەکانی هاوکارێکی خۆی دای، خۆشحاڵ دەبێ. کوڕم

ڕێکوراست با پێت بڵێم کە خۆشمەدەویی وهەر جۆرێک کە بتوانم یاریدەدەرت بم خۆشحاڵ دەبم.

- ئەگەر بیروڕای ئێوە ئاوایە، بەراستی سوپاسی ڕێنوێنییەکانت دەکەم.

- دەی مانگی داهاتوو دێی بۆ لام؟ زۆر چاکە کوڕم هەر شەوێک کە پێت کرا وەرە بۆ لام.

لە پێش جێژنی پاکدا مونتانلی بە فەرمی بوو بە ئۆسقوفی بریزیگولا لە ناوچە کوێستانییەکانی (ئاپنین)* مونتانلی لە نامەیەکدا کە لە ڕۆمەوە ناردبووی و نیشاندەری تەواوبوونی خەم و پەژارەی بوو و بە دڵێکی شاد و دەروونێکی ئارامەوە بۆ ئارتوری نووسی:«دەبێ ڕۆژانی پشوو بێی بۆ دیدەنیم. منیش زۆر زوو دێم بۆ پیزا، هیوادارم کە بە زوترین کاتی پێویست بتبینم».

دوکتور وارن داوای لە ئارتور کرد لە کاتی پشوودانی جێژنی پاکدا بە جێی ئەوەی لەو کۆشکە کونە پڕ لە مشک و دڵتەنگەدا بێ کە ئێستا جولیا بە سەری ڕا دەگات باشتر وایە لەگەڵ ئەو و منداڵەکانی بێت. لە کەلێنێکی نامەکەدا دەست نوسێکی نارێک و منداڵانەی تێدا بوو کە لەودا جما داوای لە ئارتور کردبوو کە بانگهێشتنی باوکی قەبووڵ بکات: «چونکە دەمەوێ لە سەر تەوەرێک لەگەڵت بدوێم».

پاشاگەردانییەک لە زانستگەدا دەمبەدەم لە نێو خوێندکارەکاندا دەگەڕا، کە لە هاندانی ئەودا ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو، بڕیار وابوو هەر کەسێک خۆی سازدات بۆ ڕووداوەکانی دوای جێژنی پاک.

هەموو ئەو ڕووداوانە ئارتوری والێ کردبوو تا گەشبین بێ بە داهاتوو.

تەواوی ئەو شتە دوور لە زەین و نامۆیانەی کە خوێندکارەکان ئاماژەیان پێدەکرد ئەو پێی سروشتی بوو وپێی وابوو لە دوومانگی داهاتوودا هەمووی مسۆگەر دەبێ.

ئارتور ڕۆژی پێنج شەممە لە حەوتەی پیرۆزدا چووەوە بۆ ماڵی خۆیان تا چەند ڕۆژی هەوەڵی پشوودانی لەوێ ڕابوێرێ. چونکە لە سەریەک دیتنی

---

* . ئەو کێوانەی کە سنووری ڕۆژهەلاتی تووسکانی پێک دێنی

وارنەکان و شیرنایی دیداری جما و بەجێهێنانی کاری ئایینی کە کلیسا لە هەموولایەنگرانی خۆی دەویست بە گشتی پێکەوە جوان و شیاو نەبوو.

برووسکەیەکی بۆ جما نووسی و بەڵێنی دا، کە ڕۆژی دووشەممە جێژنی پاک دەکەوێتە ڕێ . لە شەوی چوارشەممەدا بە ڕۆحێکی ئارامەوە چووە ژووری نووستنی خۆی و لەبەردەم خاچدا ئەژنۆی دادا. پاپا کاردی قەولی دیداری سبەینێ بەیانی پێدابوو و چونکە ئەمە دواین توبە و پێلێنانی ئەو بوو پێش هاتنی جێژنی پاک. دەبوو خۆی ئامادە کات بۆ دوعا و پاڕانەوەیەکی پاک و درێژخایەن. پەنجەکانی لێک گرێ دابوو و سەری شۆڕ کردبووەوە سەر سینگی و ئەژنۆی دادابوو. مانگەکانی ڕابردووی هێنایەوە یاد، پێداگربوو لە سەر گوناهە بچووکەکان وەکوو گوێڕایەڵ نەبوون و لە سەرخۆ نەبوون و توورەیی کە ڕەنگ ڎانەویەکی کەمی لە سەر پاکی و بێگەردی ڕوح و دەروونی دانابوو. بێجگە لەم گوناحانە کردەوەیەکی ناشیرینی دیکەی نەدۆزیەوە چوونکە لەم مانگەدا ئەوەندە دڵخۆش و بە کەیف بوو کە دەرفەتی گوناح کردنی نەبوو، خاچێکی لە سەر سینگی خۆی کێشا، هەستایە سەرپێ و دەستی کرد بە داکەندنی جلوبەرگەکانی.

کاتێ دوگمەی کراسەکەی دەکردەوە کاغەزێکی چکۆلە لە ژێر کراسەکەیەوە خزی و بە باڵەفڕێ کەوتە سەرزەوی. ئەوە نووسراوەی جما بوو کە ئەو ڕۆژە لە سەر سینگی ڕایگرتبوو، لە سەر ئەرز هەڵیگرتەوە و هەرچەندە دەستنووسەکە خەت ناخۆش بوو، بەڵام ماچی کرد. بەو کارەی خۆی پێکەنینی هات و دوایە قەدی کردەوە، کاتی قەد کردنی قاقەزەکە لە پشتەوە ڕستەیەکی خەت ناخۆشی تیا نووسرابوو کە تازە دیبووی ڕستەکە ئاوا بوو: «دەبێ زۆر زوو بێی، چونکە پێمخۆشە دیدارێکت لەگەڵ بوولا هەبێ، ئەو بەینێکە لێرەیە و ئێمە هەموو ڕۆژێ پێکەوە موتاڵا دەکەین».

بە خوێندنەوەی نامەکە ڕق و قینێکی سەیر دایگرت.

هەمیشە بوولا! دیسان لە لێگهۆڕنە؟ چیدەکا لەوێ؟ جما بۆ دەیویست لەگەڵ ئەو موتاڵا بکات؟

بڵێی بەو خۆشاردنەوانە جمای فریو نەدابێ؟ لە کۆبوونەوەکەی مانگی ژووەندا بە باشی دیار بوو کە ئاشقی جمایە. هەر بەو هۆیەوە بوو کە لە پروپاگەندە و لە

قسەکانیدا هەڵسووڕاو گورجوو گۆڵ خۆی نیشان دەدا. ئێستاش ئەوە لە لای ئەوە
. هەموو ڕۆژێکیش لەگەڵ ئەو موتاڵا دەکات. لە پڕێکدا نامەکەی فڕێ دا ئەو لاوە،
دیسان لە بەرانبەر خاچەکەدا ئەژنۆی دادا. ئەمە ئەو ڕوحە ئامادەیە بوو کە
خوازیاری لێبوردن و ڕێورەسمی جێژنی پاک بوو. ئەو ڕوحەی کە لەگەڵ خودای
خۆی و هەموو جیهاندا لە ئاشتی ڕایدەبوارد! ڕوحێکی کە تێکەڵاو بوو لەگەڵ شک
و گومان و ڕق و قین و دوژمنی و نەخۆشی، ئەویش دژ بە هاوڕێیەک!
ڕوخساری شەرمنی خۆی خستە ناو دوو لەپی دەستیەوە.

تەنیا پێنج چرکە لەوەپێش شەهیدبوونی لە خەیاڵیدا دەدیت، بەڵام ئێستە بە
هۆی بیری نابار و چەوتی گوناحبار ببوو.

بەیانی پێنجشەممە، کاتێ کە چووە نوێژگەی قوتابخانە، پاپاکاردی بە تەنیایی
لەوێ بوو، دوای دوعای پێش پێلێنان، خێرا کەوتە شرۆبەکردنی گوناحی شەوی
ڕابردوو: «پاپا من بە هۆی گوناحی ئێرەیی بردن و شک و گومان دژ بە کەسێک
کە هیچ خراپەیەکی دژبە من نەبووە خۆم بە تاوانبار دەزانم». پاپاکاردی باش
دەیزانی کە لەگەڵ چ جۆرە توبە کارێک ڕووبەڕوویە. هەروا بە هێورییەکەوە گوتی:
«ڕۆڵە گیان هەموو شتێکت بە من نەگوت».

ـ پاپا، ئەو پیاوەی کە من سەبارەت بە وی فکرێکی باش و خاچپەرەستیم
نەبووە، کەسێکە کە دەبێ وەک ئەرکێک خۆشم بوێ و ڕێزی بۆ دانێم.

ـ ئایا پێوەندی نێوان تۆ و ئەو بە هۆی خزمایەتی و هاوخوێنی بوونەوەیە؟

ـ لەوەش نزیکتر.

ـ دۆستایەتی.

ـ دۆستایەتی لە چیدا؟

ـ لە کارێکی گەورە و پیرۆزدا.

ساتێ بێدەنگی.

ـ ڕق و توورەیی و ئێرەیی سەبارەت بەم... هاوڕێیەت بە هۆی
سەرکەوتوویەکی زیاتری ئەوە لە کارێکدا؟

ـ من... بەڵێ، بڕێک، من ئێرەیی بە ئەزموون... و کارە باشەکانی ئەودەبەم و ئەو
کات... وامدەزانی... دەترسام... ئەو کچەی کە من خۆشم دەوێ لێم هەڵگێڕێتەوە.

ـ ئەو کچەی کە خۆشت دەوێ، کچی کلیسای پیرۆزە؟

- نا، کچێکی پروتستانییه.
- کافرێک؟
ئارتور دەستەکانی خۆی بە نارەحەتییەکی زۆرەوە گوشی و دووپاتی کردەوە «بەڵێ، کافرێک ئێمە لەگەڵ یەک گەورە بووین، دایکمان لەگەڵ یەک ڕەفیق بوون و من... ئێرەییم پێبرد، چوونکە دیتم کە ئەویش ئەو کچەی خۆش دەوێت... چونکە... چونکە...»
پاپاکاردی پاش بێدەنگییەک، قورس و قایم دەستی کرد بە قسە کردن: «ڕۆڵە، هێشتا هەموو شتێکت پێنەگوتوم، یانی بارستای قورسایی ئەو گوناهە لە سەر ڕوحت هەست پێ دەکەی».
پاپا من... (زمانی گرتی و قسەکەی بڕی).
قەشە بە بێدەنگی گوێ بیستی بوو.
- ئێرەیی بردنەکەی من، بۆ ئەرکی ڕێکخراوەییە - ڕێکخراوی ئیتالیای لاو - کە من ئەندامی ئەوم...
- دەی؟
- ڕێکخراو کارێکی بە ئەو سپارد کە دەمویست... بە منی بسپێرێت، چونکە خۆم تەواو شیاوی ئەو کارە دەدیت.
- کارەکە چبوو؟
- هێنانی کتێب - کتێبی سیاسی - لەو پاپۆڕانەی کە دەیانهێنا... دۆزینەوەی شوێنێک بۆ شاردنەوەی ئەو کتێبانە... لە شاردا....
- ڕێکخراویش ئەو ئەرکەی سپارد بە غەنیمەکەی تۆ؟
- بە بوولا و منیش ئێرەییم پێبرد.
- بەڵگەیەکیشی بۆ ئەم هەستەی تۆ نەخستووەتە ڕوو؟ تۆ بوولا بە هۆی جێبەجێ نەکردنی ئەو ئەرکە تاوانبار دەکەی؟
- نا، پاپا، پڕ بە دڵ و زۆر بوێرانە کاری دەکرد. ئەو گەلدۆستێکی بە بڕشت و پاک ڕەوشتە. کە بە بڕوای من تەنیاوتەنیا شایانی ڕێز و خۆشەویستی و مەزنایەتییە.
پاپاکاردی کەوتە فکرەوە.

ـ کوڕم ئەگەر ڕۆشنایيەکی تازە دەبینی، ئەگەر دەتهەوێ سەبارەت کارێکی گەورە بۆ هاوبیرەکانی خۆت بکەی، کە ببێتە هومێدێک بۆ سووککردنی باری قورسی بەشمەینەتییەکانیان، دەبێ سەبارەت بە باشترین نیعمەتەکانی خودا سەرنجێکی تایبەتت هەبێ! تەواوی شتە چاکەکان لە لایەن ئەوەوە هاتووە. هەر لە لایەن ئەویشەوەیە کە خوێنێکی تازە لە ڕەگدا دەگەڕێ، ئەگەر ڕێگای گیانبەختکردن ئامانجەکەی بە ڕزگاری و ئاشتی گەیشتنە ، ئەگەر بە تەمای ڕچەشکێنی و ڕێنیشاندەری ڕێگای ڕزگاریت بۆ هاوڕێ هاوڕێبازەکانت ،کە لە دەروونەدا بۆ گەل دەناڵێنن، دەبێ ڕوح و گیانت لە بەندی ڕکەی ڕق و ئێرەیی ئازاد بکەی. دڵت وەکوو میحرابێک وابێت کە مەشخەڵانی پیرۆزی خاچپەرستی تیا باییسێ. لەبیرت نەچی کە ئەمە خاڵێکی بەرز و پیرۆزە دڵێکی کە ئەمەی لا پەسەندە نابێ هیچ باییخێک بە بیر و ئەندێشەیێکی چەوت و خۆبەزلزانانە بدات. ئەو کارە وەکوو ئەرکێکی پیرۆزی قەشەکان وایە، ئەمە تەنیا لەبەر ئەوینی ئافرەتێک یان خۆش ڕابواردنی ساتێک نییە، بەڵکوو لە ڕێگای خودا و مرۆڤە بۆ ئێستا و بۆ هەمیشە.

«ئای!» ئارتور داچڵەکی و دەستەکانی خۆی توووند گوشی، بە بیستنی ئەم دروشمە ئەوەندەی نەمابوو دەست بکاتە گریان.

ـ پاپا ئێوە قەبووڵ کردنی کلیسامان پێڕادەگەیەنن! مەسیح و خاچ هاوڕێی ئێمەن...

قەشە بە شێوەیەکی بوغور و شکۆدارەوە گوتی: «ڕۆڵە، عیسا هەموو پووڵپەرەستانی لە کلیسا کردە دەرەوە. چونکە دەیەویست ماڵی خودا، ماڵی پارانەوە و ڕەجا بێت، ئەم دنیا پەرەستانە ئەو ماڵەیان کردبووە مەکۆی جەردەکان.

دوای بێدەنگییەکی زۆر، ئارتور بە ئەسپایی لە ژێر لێوەوە گوتی: «دوای کردنە دەرەوەی ئێوە ئیتالیاش دەبێتە پەرستگەی خودا...».

قسەکەی بڕی و ئەو وەڵامەی کە بە نەرمی گوترا بە گوێی گەیشت: «خوداوەند دەڵێت: زەوی و هەموو بوون و غەنیمەتەکانی بۆ منە». *

---

* ـ بڕگەیەک لە کتێبی پیرۆز

# ٥

دوا نیوەڕۆی ئەورۆژە، ئارتور هەستی کرد کە پێویستی بە گەڕیانێکی زۆر هەیە. ئەسبابەکانی سپارد بە هاوپۆلێکی خۆی و بە پیاسەکردن کەوتە ڕێ بەرەو لێگهۆڕن، کەش‌وهەوا هەوروهەلا بوو، بەلام هەست بە سەرما نەدەکرا. بەشی تەختایی شار لە جاران جوانتر بەدی دەکرا، لە نەرم و نمی چیمەنی ژێر پێی، بە دیتنی چاوی شەرمێون و زەقی گوڵە سروشتیە بەهاریەکان کە لە قەراخ شەقام وڕێگا ڕوابوون هەستێکی شادی تیا تێ‌دا دەبزاوت باڵندەیێک لە نێوان ئەقاقیایەکدا خەریکی دروستکردنی هێلانە بوو لە سەر لقەدارێکی باریک.

کاتێکی کە ئارتور لە پەنایەوە دەگوزەرا بە سامناکی جریواندی و باڵە بۆرەکانی لێکدا و کەوتە فڕین: ئارتور هەوڵیدا کە بیروڕای خۆی لە سەر ئەندێشەی پاکی ئایینی داهاتوو ڕاگرێت، بەلام یادی مونتانلی و جما ئەوەندە بە سەر ئەو فکرەدا زاڵ بوو، کە ناچار بوو دەستی لێ‌بکێشێتەوە و خەیالاتی خۆی ئازاد کرد تا لە سەر خاڵە بەرز و پیرۆزەکانی ڕاپەڕینە گشتیەکەی داهاتوو بیر بکاتەوە و ڕۆڵێکی کە بۆ هاوڕێکەی خۆی لەم ڕاپەڕینەدا دایناب‌وو، پاپا دەبێ ڕێبەر و پێغەمبەرێک بێت کە هەموو هێزی تاریکی لە بەرانبەر ڕقی پیرۆزدا ڕێگای نەمان بگرنە پێش و لاوانی لایەنگری ئازادی و لەبەر دەمیدا ئایین و چەمکە پیرۆزە دێرینەکان بە مانا و تێکبستی نوێوە تێک هەڵکێشێکی نوێی لێ فێر بن.

ئەی جما؟ ئەها جما لە باریکادەکاندا شەڕ و بەربەرەکانی دەکا. سروشتی ئەو لە قاڵبی گڵێنەی ژنانە قارەمانەکاندا داڕێژراوە. جما هاوڕێیەکی تەواو و

کچێکی پاک و ئازا و بوێر دەبێ. لەو کچانەیە کە ئیلهامدەری شێعری شاعیرانە و، هەوێن و بزوێنەری خەیاڵیانە. جما لە پەنای ئەو و شان بە شانی ئەو هەڵوێست ئەگرێ. خۆ دەسپێرنە پێڵی شەپۆلانی مەرگێکی سەربەرزانە بە سەر ڕۆڵمدا و یان لە کاتی سەرکەوتن و پیرۆزیدا پێکەوە گیان بەخت کەن بۆشۆڕش و بۆ سەرکەوتن، چونکە بێگومان سەرکەوتن نزیکە و دەگاتێ، لە ئەوینی خۆی ئەو ئاگادار ناکات و هەر شتێک کە ڕۆحی ئارامی ئەو بشڵەژێنێ و شووشەی دۆستایەتی نێوانیان بچرژێنێ خۆی دەپارێزێ. لای ئەو جما زیندەوەرێکی ڕێزدار و پیرۆز و قۆچی قوربانییەکی پاکە، کە دەبێ لە ڕێگای ڕزگاری مرۆڤەوە قوربانیی سەر ئاگر بێ، ئەوە کێ بوو کە دەیویست هەنگاو بنێتە میحرابی پاکژی ڕۆحەوە، کە تەنیا لەگەڵ ئەشقی خودا و ئەشقی ئیتالیادا ئاشنا بوو.

تەنیا ئەشقی خودا و ئیتالیا. کاتێ چوونە لەو ماڵە گەورە و دڵتەنگەی «شەقامی کۆشکەکان» وەژوور کەوتن، لەپڕێکدا هاتنە خوارێی تنۆکێک بارانی هەست پێ کرد.

خزمەتکارەکەی جولیا، خاوێن و ئارام وەک هەمیشە بە ڕێزگرتنێکی زۆرەوە لە سەر پلیکانەکان بوو.

ـ ئەم کاتەت باش گنیونیز، براکانم لێرەن؟

ـ ئاغای توماس و خاتوو بێرتێن لەوێن و لە ژووری میوانان دانیشتوون. ئارتور بە نابەدڵی چووە ژوورێ ـ ئەم ماڵە چەند دڵتەنگە! دەتگوت سێڵاوی ژیان لە پەنایەوە تێدەپەڕێ و قەتیش لە ئامێزی ناگرێت. قەت گۆڕانکاریی تێیدا بەدی نایە، نە لە دانیشتوانی ماڵێدا و نە لە ڕەسمی خێزانیاندا و نە لە موبلە کاڵەوەبووەکاندا نە لە حاجەت و کەوچکی کۆن و ناحەز و کەلوپەل و ڕوخساری بێدیمەنی ژوورەکە. تەنانەت کوڵەکەکانی ژوورەکەش وەکوو گوڵە دەست کردە ئاسنینەکان دەچوون کە بە دەست ڕەنگ کرابێتن، دەتگوت بۆنوبەرامەی ڕۆژە گەرمە بەهاریەکانیان نەچێشتووە. جولیا بۆ خواردنی فراوێن جلوبەرگی لەبەر کردبوو و لە ژووری خواردن کە وەکوو ناوەندی ماڵەکە دەچوو چاوەڕوانی میوانانی دەکرد. ئەو بەو بزە دەروونییەی و بەو

کراس و دامەنە کورتەیەوە دەیتوانی ببێتە مودێلێکی جلوبەرگ. بەخێرهاتنێکی ساردی کرد و گوتی: «حاڵت چۆنە؟ ئارتور؟ (بەسەری پەنجەی تەوقەی لەگەڵ کرد دوایە دەستی بەسەر کۆتە هاوریشمیەکەی داهێنا کە لەگەڵ ڕەنگی دامەنە کورتەکەی ڕێک کەوتبوون).

هیوادارم حاڵت زۆر باش بێ و سەرکەوتنێکی باشت لە زانکۆدا مسۆگەر کردبێ».

ئارتور بە وتەیەکی ساکار و هێواش وەڵامی داوە و بێدەنگییەکی ناخۆش دایگرت و گیانی داهێزرا، هاتنی جیمز بە قەڵافەتێکی لەخۆباییەوە، لە کاتێکدا کە نوێنەرێکی پیر و لەخۆبایی پاپۆڕەوانیی لەگەڵ بوو ، هەلومەرجەکەی لەبارتر نەکرد، بەڵام کاتێکی کە گنیوێتز گوتی خواردنی شێو حازرە، ئارتور لە دڵەوە هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵکێشا.

- جولیا برسیم نییە شێوناخۆم، ئەگەر لێم گەڕێی دەچمە ژوورەکەی خۆم.

توماس گوتی: «کوڕی باش تۆ سەبارەت زۆر پارێز لە خواردنی دەکەی دڵنیام کە خۆت نەخۆش دەخەی».

- قەیناکە شەو باش.

ئارتور خزمەتکارێکی لە کاڵیدۆرەکە دیت و داوای لێ کرد کاتژمێر شەشی بەیانی لەخەو هەڵیبستێنێ.

- سینیورینۆ* دەچی بۆ کڵیسا؟

- بەڵێ، شەو باش تێرزا.

چووە ژوورەکەی خۆی، ئەم ژووره جاران هی دایکم بوو، شانشینەکەی ڕوو بە پەنجەرەکە، کە لە کاتی نەخۆشیە درێژخایەنەکەیدا وەک نوێژگەیەکی تایبەتی دابین کرابوو. لە مێحرابەکە خاچێکی گەورەی لێ بوو کە پێیەکانی ڕەش بوو. ڕووبەرووی ئەویش چرایەکی ڕۆمیی چکۆلە هەڵواسرابوو. لەو ژوورەدا بوو کە دایکی کۆچی دوایی کرد. ڕەسمەکەی بە دیواری سەر قەرەوێڵەکەوە هەڵواسرابوو گوڵدانێکی چینی کە زەمانێک هی ئەو بوون لە سەر مێزەکە دانرابوو، پڕ لە گوڵە وەنەوشەیەکان کە ئەو زۆری

---

* - خزمەتکارەکان کوڕە ئاغا و دەوڵەمەندەکانیان بەو نێوە بانگ دەکرد.

خۆشدەویستن. ڕاست ساڵێک بەسەر مردنیدا تێپەڕیبوو، بەڵام هێشتا خزمەتکارە ئیتالیاییەکان ئەویان فەرامۆش نەکردبوو.

ئارتور ڕەسمێکی لە چوارچێوەگیراوی لە جانتاکەی خۆی دەرهێنا کە زۆر بە جوانی پێچرابووەوە ڕەسمێک کە بە پێنووسێکی ڕەش کێشابوویانەوە و هی مونتانلی بوو کە لە ڕۆمەوە چەند ڕۆژ لەوەپێش هاتبوو. لەو کاتەدا کە سەرگەرمی کردنەوەی ئەو خەزێنەیە بوو، خزمەتکاری تایبەتی جولیا بە سینییەک خواردەمەنییەوە هاتە ژووری. چێشتلێنەرە ئیتالیایەکەوە ئەم سینییە پێخۆرەی ناردبوو کە تا پێش هاتنی کەیبانووە تازە و مرچ و مۆنەکە، خزمەتی گلادیسی دەکرد.

چێشتلێنەرەکە هەموو جۆرە پێخۆرێکی خۆشی بو کوڕی ئەربابە خۆشەویستەکەی دانابوو کە هەموو حەڵاڵو پەسندی کلیسا بوون.

ئارتور هەر لەتێک نانی خوارد. پێشخزمەتەکە کە خوشکەزای گنیۆنیز بوو و تازە لە بەریتانیاوە گەڕابووەوە بە بزەیەکی مانادارەوە سینییەکەی بردە دەرێ. ئەو پێشخزمەتەش تێکەڵ بە تیپی پرۆتستانییەکان لە ژووری خزمەتکارەکان ببوو.

ئارتور چووە شانشین، لە بەرانبەر خاچەکەدا چۆکی دادا و هەوڵی دا زەینی خۆی ئارام و ئامادە بکات بۆ پاڕانەوە و هزری ئایینی، بەڵام باش بۆی جێبەجێ نەبوو، هەروەکوو توماس گوتی، زۆری پارێز کردبوو لە خواردن و هەر ئەم نەخواردنانە وەکوو شەڕابێکی خەست، کاریگەریی لە سەر مێشکی دانابوو، موچڕکێ بە پشتیداهات، چاوی لێڵ بوو و خاچەکەی باش نەدەدی. دوای دوای هەڵێتوپەڵێتێکی زۆر توانیی فکری سەرگەردانی خۆی لە سەر ڕازونهێنی کاری ئایینی بگیرسێنێتەوە. ئاخرەکەی ماندووبوونی لەشی بەسەر شێواوی مێشک و سەرئێشەکەیدا زاڵ بوو.ئەوجار بە زەینێکی ئارام و ئاسودەوە خەوی لێکەوت.

لە غوڕابی خەوێدا بوو، کە بە توندی لە دەرگاکەیان دا، لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئاە، تەرزا!» بە تەپلۆسیەوە وەرسووڕا.

دیسان لە دەرگاکەیان داوە و لە پڕێکدا لە جێگای خۆی دەرپەڕی و هەستا، پیاوێک بە زمانی ئیتالیایی نەڕاندی: «سینیورینۆ! سینیورینۆ! تۆ خودا هەستە!»

ئارتور لە قەرەوێڵەکەوە خۆی فڕێدا و گوتی: «چی بووە؟ کێیە؟»
- منم، جان‌باتیستا، هەستە زووکە، بۆخاتری حەزرەتی مریەم هەستە!
ئارتور بە پەلە جلوبەرگی لەبەر کرد و دەرگای کردەوە، هەر وا کە بە پەرێشانییەوە دەیڕوانییە ڕوخساری ترساو و ڕەنگپەڕیوی عارەبانەچیەکە، دەنگی هەنگاوەکان و تەقەتەقی ئاسن بە درێژایی کالیدۆرەکە دەنگی دەداوە، لە پڕێکدا شتەکەی بۆ مەعلووم بوو لە سەرەخۆ پرسی: «بە شوێن منەوەن؟»
- بە شوێن ئێوەوەن! حەیەحەی، سینیورینۆ، زووکەن! شتێکت هەیە بیشارەوە، چاولێکە من دەتوانم....
- هیچم نییە بیشارمەوە، براکانم دەزانن؟
هەوەڵ کەس کە یۆنیفۆڕمی لەبەردا بوو لە سووچی کالیدۆرەکەوە دەرکەوت - سینیورییان دەوێ. بە داخەوە دانیشتوانی ماڵی هەموویان بە خەبەرن! چ ڕۆژە ڕەشییەک... چەندە سامناکە! ئەویش لە ڕۆژی پاکدا! هۆ خواوەند و کەسایەتیە پیرۆزەکان ڕەحممان پێبکەن!
جان‌باتیستا کەوتە گریان. ئارتور دووسێ هەنگاو چووە پێشەوە، چاوەڕوانی جەندەرمەکان بوو کە بە هەراوهۆریاوە نزیک دەبوونەوە، ڕاوەستا. چەند خزمەتکارێک بە جلوبەرگێکی شپرێوەوە دەلەرزین و بە شوێن جەندەرمەکانەوە بوون، دووای ئەوەی سەربازەکان دەوری ئارتوریان‌دا ، ئاغا و خاتوونی خاوەن ماڵ، بە شوێن ئەم دەستە و گرووپە سەیرەدا گەیشتنە ئەوێ. ئاغا پیژامەی لەبەردا بوو و دەمپێییش(نەعل)ی لە پێدا. خانمیش تەنوورەیەکی درێژی لەبەر کردبوو. پرچیشی لە کاغەزی فێرەوە پێچابوو.
بە دیتنی ئەو قەڵافەتە سەیروسەمەرانە ئارتور لە پڕێکدا ئەو وتەیەی بە زەین گەیشت: «بێشک شەپۆلێکی دیکەمان لەپێشدایە، ئەم ژن و مێردانە بەرەو لای پاپۆڕەکە دێن! ئەمەش جووتە حەیوانێکی زۆر سەیرا!»

پێکەنینی دەهات، بەڵام جێگای نەبوو . ئێستا دەبوو سەرنج بداتە شتە بایەخدارەکان، لە ژێر لێوێـەوە گـوتی «Ave Maria ReGina cali»* سەری وەرسووڕاند تا کاغەزە فێرەکانی سەری جولیا نەبینێت نەوەکوو کاری نابەجێ بکات، ئاغای بێرتێن لە ئەفسەرە جەندەرمەکە نزیک بووەوە و گوتی: «تکایە پێم بڵێن بزانم هاتنی ئێوە ئاوا بۆ ماڵی ئێمە چ مانایەکی هەیە؟ دەبێ پێتانی ڕابگەیەنم ئەگەر بە باشی بۆم شیـنەکەنەوە ناچارم لە لای باڵوێزی بەریتانیا شکایەتتان لێبکەم.»

ئەفسەرەکە فەرمانێکی لە مەڕ گرتنی ئارتوربێرتێن خوێندکاری فەلسەفە دەرهێنا و دایە دەستی جیمز و بە تووڕەییەوە گوتی: «پێموابێ ئەو فەرمانە بەڵگەیەکی زۆر باشە بۆ ئێوە و بۆ باڵوێزی بەریتانیایش» و بە ناقایلیەوە گوتی: «ئەگەر خوازیاری ڕوونکردنەوەیەکی زۆرتری، باشتروایە خۆت بێی بۆلای سەرۆکی پۆلیس».

جولیا نامەکەی لە دەست مێردەکەی دەرهێنا. چاوێکی لە نامەکە کرد و دوایە وەک ژنێکی مۆدێرن بە تووڕەیەوە بۆ ئارتوری فڕێدا و گوڕاندی: «ئەوە تۆی کە بوویە هۆی سەرشۆڕیی ماڵێ! کارێکی وات کردووە کە لەوشارەدا هەرکەس هەڵدەستێ بە سەیروسەمەرەوە لێمان دەڕوانن وەک ئەوەی چووبێتنە دیتنی شانۆ، لەگەڵ ئەو هەمووە دینداریەت بویتە خۆراکی زیندان! ئەوە ڕاست ئەو چاوەڕووانییەیە کە لە کوڕی ژنە کاتۆلیکییەکمان هەبوو...»

ئەفسەرەکە چووە ناو قسەکەیەوە و گوتی: «خانم لەگەڵ کەسێکی گیراو نابێ بە زمانی بێگانە قسە بکەی، بەڵام ئەو دژایەتیە نەیتوانی هەراوهوریای جولیا بێدەنگ کات کە بە زمانی بەریتانیای دەدوا بە تەوسەوە گوتی: «ڕاست ئەو شتەی کە چاوەڕوانی بووین! دەی دەی ئا ئەمە بوو کە خۆی لە ژێر ڕۆژوەوانی و دوعا و هزری ئایینیدا شاردبووەوە! دەبوو بمزانیبا کە هەموو ئەو کارانە کۆتایەکی ئاوایان هەیە».

* . ماریا دڵخۆش بژی ئەی مەلەکەی ئاسمانەکان (لاتین) ئەمە لە سەرەتای دوعا کردنی کاتۆلیکەکاندا کەڵکی لێ وەردەگرێ.

دوکتور وارن جارێکیان گوتبووی کە جولیا وەکوو سالاد(زەلاتە)ێک وایە کە چێشتلێنەرەکە یەک شووشە سرکەی بە سەردا کردبێ.

ئارتور لە داخی دەنگە تیژەکەی جولیا ددانەکانی لە چیرەوە برد، لە پڕێکدا ئەو بەراوەردەی هاتەوە یاد: «ئەم قسانە ئاکامێکیان نییە، نایەوێ لە خۆڕایی بترسێن، هەموو کەس دەزانێ کە هەمووتان بێتاوانن، کاکە پێموابێ دەتانەوێ شتەکانم بگەڕێن، هیچ شتێکی وام نییە کە بیشارمەوە». کاتێکی کە جەندەرمەکان دیوەکەی دەگەڕان، نامەکانیان دەخوێندەوە، پەڕتووکەکانی زانکۆێ ئەویان ئەم بارەوبار دەکرد، دۆلاب و چەکمەجەکانی دەگەڕان، ئارتور بە کەمێک دڵەڕاوکێوە لە سەر قەرەوێڵەکەی دانیشتوو چاوەڕوان ماوە، بەڵام هیچ پەرێشان و نارەحەت نەبوو ئەو پشکنینە نەیشڵەژاندبوو، هەمیشە ئەو نامانەی کە بۆنی گیران و خراپەی بۆ کەسێک لێوە هاتبایە دەیسووتاند، هەر لەبەر ئەوە تەنیا چەند شیعرێک کە کەمتاکورتێک شۆڕشگێڕی و ئایینی بوون و لەگەڵ دووسێ ژمارە ڕۆژنامەی ئیتالیای لاو لەو گەڕان و پشکنینەدا کەوتنە دەستی پشکێنەران.

جولیا دوای بەربەرەکانێیەکی زۆر، ئیتر پێبەندی خواستی هێوەرەکەی بوو، لە کاتێکدا جیمز خواجە خولامێ* بوو و کەوتبووە شوێنی، بە جیفڕک لێدانێکی لەخۆباییانەوە بە خێرایی لە پەنا ئارتورەوە بە خێسەێکەوە گوزەرا و چووە ژووری نووستنەکەی خۆی.

کە ئەوان ژوورەکەیان بەجێ هێشت. توماس هەروا بێ ڕاوەستان ئەمسەروئەوسەری ژوورەکەی دەکرد، هەوڵی دەدا کە لە سەرەخۆ بێ. لە ئەفسەرەکە نزیک بۆوە و ئیزنی لێ خواست تا لەگەڵ ئارتور قسە بکات. دوای ئەوە کە ئەفسەرەکە بە ئاماژەی سەری گوتی باشە، چوو بۆ لای ئارتور و بە دەنگێکی ماندوو و بڕێک نووساوەوە دەستی بە قسە کرد: «گوێ بدەیە ڕووداوێکی ناخۆشە، من بەش بە حاڵی خۆم زۆر بەداخم». ئارتور ئارام و لەسەرەخۆ وەکوو گزنگی بەربەیانی هاوینان سەری هەڵێنا و

---

* ـ خواجەخولام بوون: لێپاڕانەوە

گوتی: «ئێوە هەمیشە لەگەڵ من دلۆڤان بوون، نیگەرانیش مەبن، ئەوندەش جێگای مەترسی نییە».

توماس سمێڵی خۆی توونـد کێشا و لە پڕێکدا پرسی: «چاوڵیکە ئارتورا ئایا... ئەم کارەی تۆ پێوەندیی بە... پارەوە هەیە؟ چونکی ئەگەر وابێ، من...»

پێوەندی لەگەڵ پارە! سەیرە نا! چ پێوەندیکی هەبێ....

- ئەی لەو کارە سیاسییە بێئەقڵانەیە؟ وام فکربۆی دەچوو، زۆر چاکە، ورەت بەر نەدەی... زۆر گوێت بە قسەکانی جولیاش نەبزوێت. ئەو تەنیاو تەنیا زمان پیسە و دم شڕە، ئەگەر پێویستیت بە پارەیە... یان شتێکی‌تر پێم‌ڕابگەیەنە، پێمدەڵێی؟

ئارتور بە بێدەنگی دەستی بۆ مالاوایی بردە پێشێ، توماسیش زۆر لێزانانە وەک ئەوەی کە شتێک ڕووی نەدابێ ڕووتاڵ و دڵڕەق ژوورەکەی بەجێ هێشت.

لەوکاتەدا جەندەرمەکان پشکنینی خۆیان تەواو کردبوو. ئەفسەری بەرپرسیش داوای لە ئارتور کرد کە جلوبەرگەکانی لەبەر کات، ئەویش خێرا بە قسەی کرد و کاتێ کە دەیویست ژوورەکەی بەجێبێڵێ، بە دوو دڵیەوە ڕاوەستا، پێیوابوو مالاواییکردن لە نوێژگە چکۆلەکەی دایکی لە پێش چاوی جەندەرمەکان کارێکی قورس و گرانە.

پرسی: «ئەگەر دەکرێ و دەتوانن بۆ چەند ساتێ لەو ژوورە بچنە دەرێ؟ دەزانن کە ناتوانم هەڵێم و هیچیشم نییە کە بیشارمەوە».

- بمبوورە کەسێکی دەستبەسەرکراو گیراو ناتوانێ بە تەنیا بێ؟

- زۆر چاکە، قەی ناکە،

چووە شانشینەکە، چۆکی دادا و لاق و پێی خاچەکەی ماچ کرد و بە نەرمی و لە ژێر لێوەوە گوتی: «خوداوەندە هەتا ماوم دین و ئیمانی خۆمم پێ ببەخشە».

کاتێکی کە هەستا، ئەفسەرەکە کە لە پەنای مێزەکە ڕاوەستابوو و چاوی لە وێنەی مونتانلی دەکرد پرسی: «خزمتە؟»

ـ نا، متمانەی تۆبە و پێ‌لێنانی گوناحەکانمە، ئۆسقۆفی نوێی بریزیگولایە (BrisiGella) لە سەر پێپلیکانەکان خزمەتکارە ئیتالیایەکان ڕاوەستابوون. بە نیگەرانی و بە داخەوە لەووەزعەیان دەڕوانی. ئەوان، هەموو ئارتوریان لەبەر خۆی و بە خاتری دایکی، خۆش دەویست. هەموو دەورەیان دابوو، بە پەرۆشییەوە دەست و جلوبەرگەکەیان ماچ دەکرد. جان‌باتیستا لەولاوە ڕاوەستابوو، فرمێسک بەسەر سمێڵە سپیەکەیدا دەهاتە خوارێ . هیچ کام لە بێرتینەکان بۆ خوداحافیزی نەهاتنە دەرێ. سرپوساردی و دڵڕەقیی ئەوان خزمەتکارەکانی ئەوەندەی دیکەش دلۆڤان و خەمخۆر کردبوو. ئارتور کاتی تەوقکردن و ماڵاوایی لەگەڵ پێشخزمەتەکان خەریکبوو بەلادا بێ و بکەوێ.

خوداحافیز جان‌باتیستا، لە لایەن منەوە منداڵەکانت ماچ کە، خوداحافیز تێرزا، هەموو شەوێ دوعام بۆ بکە، خوداتان لەگەڵ بێ! خوداتان لەگەڵ بێ! خوداتان لەگەڵ بێ! بەپەلە لە پلیکانەکان هاتە خوارێ و بەرەو دەرگای دەرەوە ڕۆیی، کەمێ کە گوزەرا تەنیا کۆمەڵێک پیاوی بێ‌دەنگ و ژنی چاوبەفرمێسک لەبەر دەرگا ڕاوەستابوون و چاویان لە عارەبانەکە دەرکرد کە دوور دەکەوتەوە.

# ٦

ئارتوریان بردە قەلایەکی گەورە کە هی سەدەکانی نێوەراست بوو، کە لە زارکی بەندەرێکدا بوو ئەو توانیی خۆی ڕابێنێ لەگەڵ ژیانی زیندان، ژوورە تاکە کەسیەکەی زۆر شێدار و تاریک بوو، گەرچی ئەو لە کۆشکێکی لای ڤیابورا*دا گەورە ببوو، هەوایەکی خەفە، مشک، بۆنی پیس هەمووی ئەوانە بۆ ئەو شتێکی تازە بوون، خۆراکیش خراپ و کەم بوو، بەڵام جیمز خێرا ئیزنی خواست و هەموو پێداویستیەکانی ژیانی بۆ نارد. ئەویان لە بەندی تاکە کەسیدا ڕاگرتبوو. بۆی دەرکەوت کە ئەو چاوەدێریە توندەی کەچاوەڕوانیی دەکرد لە زینداندا نەبوو. سەرەڕای ئەوەش بۆی ڕوون نەبووەوە کە لە سەر چی گیراوە.

دوای ئەوە لە کاتی گیرانییەوە هەتا ئێستا کە لە قەلا دایە هەروا لە سەرەخۆ و ئارام و هێدی بوو. چونکی ئیزنی کتێبخوێندنەوەیان پێنەدەدا کات و ساتی خۆی بە پاڕانەوە و دوعا و باری ئایینییەوە ڕادەبوارد. بێ ئەوەی شڵەژاو و نیگەران بێ، خۆی دابووە دەستی ڕووداوەکان و پێشهاتەکانی ئێستا و داهاتوو. ڕۆژێک یاساوڵێک دەرگای بەندەکەی کردەوە و بانگی کرد: «تکایە لەم ڕێگایەوە وەرە!» دوای بیستنی دووسێ پرسیار کە وەڵامەکانی تەنیا «حەقی قسە کردنت نییە» بوو. لە ڕووی ناچاریەوە قەبووڵی کرد. بە شوێن یاساوڵەکەدا لە حەسارە پێچڵاوپووچەکان و کالیدۆرو پلیکانەکانەوە کە کەم و زۆر شێدار و بۆنی ناخۆشیان لێدەهات، چوونە ژوورێکی ڕووناک و گەورە.

---

* Via Borra _

لەم ژوورەدا سێ نەفەر بە بەرگی عەسکەریەوە لە پشت مێزێکی گەورە دانیشتبوون کە ڕووپۆشێکی سەوز بە سەر مێزەکە دادرابوو و بە بڕێکی زۆرکاغەزەوە بە بێتاقەتیەوە باسی بابەتی جۆراوجۆریان دەکرد. هەر کە هاتە ژوورەوە هەر سێکیان قەلافەتێکی گرژ و لەخۆباییان بە خۆیانەوە گرت. یەکێکیان کە پیرتر دیار بوو و بڕێک بە خۆی ڕاگەیشتبوو، ڕەنگ گەنمی و ڕیشی شانە کراو کە بەرگی سەرهەنگی** لەبەردا بوو. بە ئەنگوستی ئاماژەی بە کورسیەکەی ئەوبەری مێزەکەوە کرد کە دانیشێ و دەستی کرد بە لێپرسینەوە.

ئارتور چاوەڕوانی تووڕەیی و هەڕەشە و جنێو بوو، هەر بۆیە بە ئارامی بەبیر لێکردنەوەوە دەیویست وەڵام داتەوە، بەڵام خەونەکەی وەڕاست نەگەڕا سەرهەنگ لە سەرخۆ و کڵێشەیی پرسیاری لێ کرد. پرسیارەکان لە سەر ناو، تەمەن، ڕەگەز، ئیش و لەو بابەتانە بوو وئەویش وەلامی داوە. بە تەواوەتیش لە سەر کاغەز دەنووسرا، خەریک بوو تاقەتی بەسەر دەچوو کە سەرهەنگ پرسی: «دەی ئاغای بیرتێن، سەبارەت بە ئیتالیای لاو چ دەزانی؟»

- ئەوەندە دەزانم کە بزافێکی ڕێکخراوەییە کە لە مارسەی ڕۆژنامەیەک دەردەکەن و لە ئیتالیادا بڵاوی دەکەنەوە، بەو هیوایەی کە بتوانن خەڵکی بۆ شۆڕشێکی گەورە هان بدەن تا سوپای نەمسا لەو وڵاتە وەدەرنێن.

- پێموایە ڕۆژنامەکەیانت خوێندبێتەوە.

- بەڵێ، پێمخۆشە

- کاتێکی کە ئەوت دەخوێندەوە، پێتوانەبوو کە کارێکی دژە یاسایی دەکەی؟

بەڵێ دەمزانی.

- ئەو ڕۆژنامانەی کە لە ژوورەکەت دا دۆزراوەتەوە لە کوێوە پێتگەیشتووە؟

- ناتوانم ئەوەتان پێبڵێم.

---

** - دەرەجەیەکی ئەفسەری

- ئاغای بێرتێن تۆ ناتوانی لێرەدا بە ئیشتیای خۆت قسە بکەی، تۆ لە سەرتە وەلامی پرسیارەکانی من بدەیتەوە.

- زۆرچاکە ئەگەر ئەو جۆرە وەلامدانەوەی منتان پێناخۆشە دەلێم: «پێتان نالێم».

سەرهەنگ گوتی: «لە کردەی خۆت پەژیوان دەبیتەوە، ئەگەر بەم شێوەیە بدوێی». ئارتور بێدەنگ بوو و ئەویش درێژەی پێدا: «دوای ئەوە دەبێ پێتان بلێم بەلگەمان بەدەستەوەیە کە نیشان ئەدا، پێوەندی ئێوە لەگەل ئەو ڕێکخراوەیە زۆر نزیکتر و قایمتر بووە لە موتالای ڕۆژنامەیەکی بە نهێنی دەرکراو، تا زووتر بیدرکێنی و پێی‌لێ‌بنێی بە قازانجتە، ڕاستی و دروستی ئەو کارە زوو ڕوون دەبێتەوە و دەشبینی کە خۆ هەلاواردن ئاکامێکی نییە.

- من شتێکم نییە کە بیشارمەوە، ئێوە دەتانەوێ چی بزانن؟

- لەپێشدا - چۆنە ئێوە کە کەسێکی بیانین خۆتان ئاوێتەی ئەو کارە کردووە؟

- زۆرم بیر لەوە کرددووەتەوە و هەلمسەنگاندووە، هەرچییەکی گیرم کەوتووە خوێندوومەتەوە و کەلکی پێویستم لێوەرگرتووە.

- بۆ چوونە ناو ئەو ڕێکخراوەیەوە کێ هاندەرتان بووە؟

- هیچ کەس - ویست و داخوازی خۆم بووە.

سەرهەنگ بە توورەییەوە گوتی: «ژوورم پێدەکەی» بە قسە کردنەکەیدا ئێتر لە سەرەخۆ نەبوو.

- بە تەنیایی و لەخۆڕاوە کەس ناتوانێ تێکەلی ڕێکخراوەیەک یا جەماوەرێک بێ. ئەو بیرۆکەیەت لەگەل کێدا هێنایە ئاراوە؟

- [بێدەنگی]

- ئەرێ دەکرێ وەلامم بدەیەوە؟

- تا ئەو کاتەی پرسیارەکانت بەو شێوەیە بێ، نا،

ئارتور بە ڕوو گرژیەوە قسەی دەکرد. وردە وردە تووڕەبوونێکی سەیر بە سەریدا زال دەبوو. تا ئێستا زانیبووی کە خەلکێکی زۆریان لە لیگهۆڕن و پێزادا گرتووە، هەرچەند لە بەرینایی شەپۆلی گیراوەکان بێئاگا بوو. هەر

ئەوەندەی بیستبوو، بۆیە نیگەرانی سلامەتیی گیانی جما و هاورێکانی بوو. دلۆڤانی درۆیینی ئەفسەرەکان و هێرش و بەرخودانێک کە ماندووی کردبوو پرسیار و وەلامە درێژەکان کەساسیان کردبوو. دەنگی هەنگاوی پاساوڵەکە کە لە دەرەوەی ژوورەکەدا ئەم بەرەوئەوبەری دەکرد بە شێوەیەکی زۆر ناخۆش لە گوێیدا دەنگی دەداوە. دوای ئەوەی ئەفسەرەکان برێک لەگەڵ یەک دووان سەرهەنگ پرسی: «دەبێ پێمان بڵێی دووایین جار کە جووانی بوولات دیت کەی بوو؟ ڕاست ئەو کاتەی بوو کە پیزا بەجێ بێڵی وانییە؟»

- من کەسێک بەو ناوە ناناسم.

- چۆن جووانی بوولا؟ ئەو هەر دەناسی - لاوێکی باڵا بەرزە کە ڕیشی سێ‌تیخ دەکرد، هاوپۆلی خوت بوو.

- لە زانکۆدا زۆرم ئەو قوتابییانەی من نایانناسم.

- بەڵام حەتمەن بوولا دەناسی؟ چاولێکە ئەوە دەسخەتی ئەوە، دەبینی ئەو ئەتۆ بە باشی دەناسێ.

سەرهەنگ نامەیەکی بە ڕوو تاڵیەوە دا بە دەستیەوە کە بە سەردێڕی «تێکستی کۆبوونەوە» و ئیمزای «جووانی بوولا»وە بوو، ئارتور بە تێڕوانینێکی خێرا چاوی بە ناوی خۆی کەوت بە ڕامانێکەوە سەری هەڵێنا و پرسی: «دەبێ ئەوە بخوێنمەوە؟»

- بەڵێ، دەبێ بیخوێنییەوە چونکە سەبارەت بە تۆیە.

کاتێک کە ئەفسەرەکان بێ‌دەنگ دانیشتبوون و لە ڕوخساری ئەویان دەڕوانی، دەستی کرد بە خوێندنەوەی برووسکەکە. ئەم بەڵگەیە واوێدەچوو سەبارەت بە وەلامی برێک پرسیار بووبێ. وادیار بوو بوولاش گیرابوو. ئەم بەڵگەیە سەبارەت بە تایبەتمەندیە ئاساییەکان بوو. بە دوای ئەودا ڕوونکردنەوەیەکی کورت بوو لەمەڕ پێوەندی بوولا لەگەڵ ڕێکخراو و بلاڤۆکە نایاساییەکەی لێگهۆڕن و کۆبوونەوە خوێندکاریەکان. دوایە گەیشتە ئەم برگەیە: «لە نێو ئەو کەسانەی کە هاتنە ڕیزی خەباتی ئێمەوە، لاوێکی بەریتانیایشی تێدایە کە ناوی ئارتورە و منداڵی خێزانێکی دارا و خاوەن پاپۆڕە».

لە تووڕەییدا خوێن بەر چاوی گرتبوو. بوولا ئەوی بە دەستەوە دابوو! بوولایەکی کە بەرپرسیارەتییەکی گەورەی هەڵسووڕاوانی لە ئەستۆدا بوو، بوولایەکی کە جمای لە دین لادابوو، بوولایەکی کە شەیدای جما بوو! بڕووسکەکەی لە سەر مێزەکە دانا و چاوی بڕیە زەوی.

سەرهەنگ بە دڵۆڤانییەوە گوتی: «پێموایە ئەم بەڵگە چکۆلەیە زەینی تۆی خستبێتە گەڕ».

ئارتور سەری بادا: «من کەسێک بەو ناوە ناناسم». بە دەنگێکی گیراو و تووڕەوە گوتی: «دەبێ هەڵەیەک کرابێ».

- هەڵە؟ زۆر بێمانایە! ئاغای بێرتێن سەرنج بدەن! چ خێروبێرێکی بۆ ئێوە هەیە کە لە سەر بروکراتی و پێچوپەنای ئیداری و لەبەر خاتری پیاوێک کە خۆفرۆشی کردووە و ئێوەی بە دەستەوە داوە، خۆتان بخەنە قەیران و داهاتووی خۆت وێران بکەی.

ڕەگێکی بێڕەنگی قین و بوغز لە دەنگی سەرهەنگدا جێی خۆش کردبوو، ئارتور تەکانێکی خوارد و سەری هەڵێنا، بیرێک لە مێشکیدا بزووت.

گوڕاندی: «درۆیە؛ ئەم بەڵگەیە دەستکردە! ئەوە لە ڕوخسارتاندا بە جوانی دیارە، ناپیاو ـ تۆ دەتهەوێ گیانی چەند زیندانی بخەیتە مەترسیەوە یان دەتەوێ من بخەیتە داوێکەوە تۆی ساختەچی و درۆزن و بێشەڕەف...»

سەرهەنگ بە تووڕەیەوە دەرپەڕیو نەڕاندی «بێدەنگ! لەو کاتەدا دوو هاوڕێکەشی هەستان، ڕووی کردە یەکێ لەو دوو نەفەرە و گوتی: «ملازم توماس، تکایە زەنگ لێدە و یاساوڵەکە بانگ کە، ئەم هەتیوە لاوە چەند ڕۆژێک بیخەنە ژووری ئەشکەنجەوە، پێموایە پێویستی بە دەرس دادان هەیە، تا بێتەوە سەر ئەقڵ».

ژووری تاکە کەسی ئەشکەنجە، کونێکی تاریک و شێدار و پیس بوو و بە جێگای ئەوەی ئارتور ئاقڵتر کات ئەوی تووڕەتر کرد. ژینی پڕ لە خۆشی و نازی ماڵەوە ئەوی سەبارەت بە پاک و خاوێنی زۆر هەستیار کردبوو، هەربۆیە دیوارە لینچق و پڕ لە جڕوجانەوەر و ئەرزێکی پڕ لە پیسی و پۆخڵی، بۆنی ناخۆشی کارگە گولانە و داری شێدار کاریگەریەکی زۆر

خراپیان لە سەر ئارتور دانابوو هەر بۆیە سەرهەنگە توورەکە تەواو ڕازی ببوو، کاتێ کە فڕێیان دایە ناو ژوورەکەوە و دەرگاکەیان گاڵەدا، دەستەکانی لێک کردەوە و بە ترسەوە سێ هەنگاوی هەڵێناوە و هەرکە قامکەکانی لاقی لە لێنچقی دیوارەکە کەوت، لە داخانا لەرزی، هەوڵی دا لەو تاریکیە ئەنگوستە چاوەدا بە دەستەکوتە جێگایەک بۆ دانیشتن بدۆزێتەوە کە بڕێک خاوێن بێ.

ئەو ڕۆژە درێژە لە تاریکایی و بێدەنگیدا تێپەڕی. شەویش هەر وەکوو ڕۆژ وابوو وردە وردە لەو بۆشایە دڵتەنگەدا کە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ دەرەوە نەبوو، گوزەرانی ڕۆژ و شەوی لێ تێکچوو. سبەینێ بەیانی کاتێ دەنگی کلیلی کردنەوەی دەرگاکە هات و مشکەکان بە ترس و جیکە جیکەوە بە پەلە بە تەنیشتیدا هەڵدەهاتن، بە ترسەوە لە جێگای خۆی دەرپەڕی! دڵەکوتەیەکی سەیر دایگرت و قیژ و واژێکی تووند لە گوێیدا دەنگی داوە، دەتگوت بە جێی چەند کاتژمێر، چەند مانگە لە دیتن و بیستنی نوور و دەنگ بێبەرییە.

دەرگا کراوە و بە دوای شەوقی کزی لەنتەرێکدا ـ کە لەبەر چاوی ئارتور شەپۆلێکی گەورەی تیشک و تیرێژ بوو بەرەو چاوی هروژمیان هێنا و چاویان بە شەوارە خست ـ وەردیانەکە بە نانێک و جەڕەیەک ئاوەوە هاتە ژوورەوە، ئارتور هەنگاوێکی بەرەو پێشەوە هەڵێناوە، ئەو تەواو دڵنیا بوو کە ئەو کابرایە هاتووە ڕزگاری کات. پێش ئەوەی قسە بکات، پیاوەکە نان و جەڕە ئاوەکەی دابە دەستیەوە، بێئەوەی قسەیەک بکات سووک چووە دەرەوە و دیسان دەرگاکەی داخست.

ئارتور لاقی بە ئەرزیدا دەکوتا، بۆ هەوەڵین جار لە ژیانیدا وەکوو شێت و هارێک توورە ببو و، بەڵام بە تێپەڕینی کات، زەمەنی زیاتر لێتێک چوو، تاریکاییەکە سنووری نەبوو، دەتگوت ژیانی لە جووڵە کەوتووە، شەوی سێهەمین ڕۆژ کاتێ کە دەرگاکە کراوە و بەرپرسی بەندەکە لەگەڵ سەربازێک لەبەر دەرگادا دیار بوون، ئارتور کە گێژ ببوو بە نابەدڵیەوە سەری هەڵێنا، چاوەکانی خۆی لە شەوقی نوورەکە دەشاردەوە، لەوەی کە نەیدەزانی چەند کاتژمێر یان چەند حەوتووە لەو گۆڕەدا ماوەتەوە سەرگەردان و پەرێشان بوو.

دەنگی ناخۆش و قیژەونی بەرپرسی بەندەکە هات: «هەستە با بڕۆین»
ئارتور هەستا سەر پێ، بە خۆکێشکردن وەکوو مەستێک کە بەم لاوئەولادا دەکەوت کەوتە ڕێ. لەوەی کە بەرپرسەکە ویستی یاریدەی بدات تا بە پلیکانە باریک و ڕژدەکاندا سەر بکەوێ ناڕەحەت بوو، بەڵام هەر کە گەیشتە دوایین پلیکان سەری وا لە گێژەوە هات کە ئەگەر بەرپرسەکە شانی نەگرتبایە خلۆر دەبووەوە.

دەنگێکی سەرخۆشانە هاتە گوێی: «هیچ نییە ئێستا چاک دەبێتەوە، زۆربەیان کاتێ کە دێنە هەوای ئازاد، هەروا بێهێز دەبن».

دوای ئەوەی کە لاوێچێک ئاویان بە سەروچاویدا کرد، هەناسەیەکی هەڵکێشا، واوێدەچوو کە لەبەر چاوی ئەو تاریکایی پەردە وردە ورد دەبوو و تێکدەشکا. لە پڕێکدا بە وشیارییەوە هەستایە سەرپێ. دەستی بەرپرسی بەندەکەی لادا، کالیدۆر و پلیکانەکانی بە هەنگاوی قورس و قایم پێوا. لەبەر دەرگایەک کەمێ ڕاوەستان، دوایە دەرگا کراوەو بێ ئەوەی بزانێ بۆکوێی دەبەن. دیتی لە ژووری زۆر ڕووناکی لێپرسینەوەیە، بەسەیرێکەوە ڕوانییە مێز و بڕووسکەکان و ئەو ئەفسەرانەی کە لە جێگای جاری دیکەدا دانیشتبوون.

سەرهەنگ گوتی: «ئای، ئاغای بێرتێن! هیوادارم ئێستە باشتر بتوانین لەگەڵ یەکدا قسە بکەین دەی ژوورە تاکە کەسیە تاریکەکە چۆن بوو؟ هەڵبەتە بە قەدەر هۆڵی خواردەمەنیی براکەت جوان و ڕازاوە نییە، هەروانییە؟ ها؟»

ئارتور چاوی لە ڕوخساری لێو بە بزەی سەرهەنگ کرد. خوێن بەرچاوی گرتبوو. ئەو پیاوەی کە هەردوو گونای کوڵکەی ڕەش و سپی لە سەر بوو، پێی خۆش بوو بە ددان گەردنی ونجڕونجڕ کات، لە ڕوخساریدا ئەو توورەییە بە جوانی بەدی دەکرا. چونکە سەرهەنگ خێرابە شێوەیەکی نەرمتر گوتی: «ئاغای بێرتێن دانیشە و کەمێ ئاو بخۆوە، ڕقت هەستاوەو دڵەکوتێتە».

ئارتور پەرداخە ئاوەکەی کە بۆ لای ئەو هات لایدا، دەستەکانی بە مێزەکەوە گرت.

نێوچاوانی لە سەر دەستێکی دانا و هەوڵی دا تا فکری هێور کاتەوە. سەرهەتنگ بە وردی لێی ڕوانی و سەرنجی دایە سەر دەست و لێوی لەرزۆکی و قژی تەڕ و چاوی خەوتووی کە نیشانەی ماندوویەتی لەش و ڕوح و دەروونی بوو، دوای کەمێک گوتی: «دەی ئاغای بێرتێن جاری دیکە لە کوێدا قسەکانمان تەواو کرد هەر لەوێوە دەست پێدەکەینەوە و چونکە نارەحەتییەک کەوتە بەینمانەوە، من بەش بە حاڵی خۆم لێت دەبوورم. تۆ ئەگەر ڕاست و ئاقڵانە بجووڵێیتەوە دڵنیات دەکەم کە ئێمە سەبارەت بە تۆ قەد کردەوەیەکی شەڕاژۆیانە و توند و تیژیمان نابێ».

- دەتانەوێ چی بکەم؟

ئارتور توند و گرژ قسەی دەکرد و ماندوویەتیی پێوە دیار بوو و لەگەڵ شێوە قسەکردنێکی ئاسایی بە دوور بوو .

- هەر ئەوەندەم دەوێ کە بێ گرێ و گۆڵ و شەڕافەتمەندانە، هەر شتێکی لە سەر ئەو بزووتنەوە و هەوادارەکانی دەیزانی پێمانی بڵێی. لە پێش هەموو شتێکدا بڵێ لە کەنگێوە بوولا دەناسی؟»

- ئەوم بە درێژایی تەمەنم نەدیتووە، هیچ زانیارییێکیشم لەسەری نییە.

- بەراستە؟ زۆرچاکە دوای کەمێکی دیکە دەگەڕێینەوە سەر ئەم باسە، پێموایە پیاوێکی لاو بە ناوی کارلوبینی دەبێ بناسی؟»

- قەتم ئەو ناوە نەبیستووە.

- زۆرسەیرە ئەی فرانچێسکونێری*؟

- ئەو نێوەشم قەت نەبیستووە،

بەڵام ئەو نامەیە بە قەڵەمی تۆ و بە دەستی تۆ نووسراوە و سەبارەت بە ئەوە، چاو لێبکە!

ئارتور هەروا چاوێکی لێ کرد و نایە ئەو لاوە.

- ئەم برووسکەیە دەناسی؟

- نا.

- قەبووڵی ناکەی کە برووسکە کە بە دەستی تۆ نووسراوە؟

---

FranceGco Neri . *

- شتێک ڕەتناکەمەوە، هیچم نایەتەوە یاد.
- ئەمەت خۆ دەبێ لەبیر بێ؟
- برووسکەیەکی دیکەی پێدا. ئەو برووسکەیەی لە پاییزدا بۆ یەکێک لە هاوپۆلەکانی نووسیبوو.
- نا.
- ئەوەش ناناسی کە برووسکەکەی بۆ نووسراوە ؟
- ئەو کەسەش ناناسم.
ئاوەز و زەینی ئێوە زۆر لاوازە.
- ئەمە کەم و کووڕیەکە کە هەمیشە بە دەستیەوە ناڵاندوومە.
- سەیرە!، بەڵام من چەند ڕۆژ لەوە پێش لە زمانی مامۆستایەکی زانستگەوەم بیستووە کە تۆ نە تەنیا هیچ کەم کووڕییەکت نییە بەڵکوو زۆریش وشیاریت.
- بێگومان ئێوە وشیاری بە پێوەری پۆلیسیەوە دەپێون، بەڵام مامۆستایانی زانستگە بە جۆرێکی دیکە لێی دەڕوانن.
تووڕەیی ئارتور هەر دەهات و زیاتر دەبوو ئەوەش لە تۆنی دەنگیدا بە جوانی دیار بوو. ئەو بە هۆی برسیەتیەوە و بۆنی پیس و بێخەوی ماندوو ببوو و هەموو ئێسکی لەشی ژانیان دەکرد، دەنگی سەرهەنگ وەکوو بڕبەند بە سەر مێشکیدا بێنی وابوو، هەر کە سەرهەنگ دەدوا ددانەکانی بە تووڕەیەوە لە سەر یەک دادەنا.
سەرهەنگ لە سەر کورسیەکە پاڵی داوە و بە بزشتەوە گوتی: «ئاغای بێرتێن، دیسان خۆتت لە بیر چووەوە، جارێکی دیکە وشیارت دەکەمەوە، ئەو جۆرە دواندنە قازانجێکی بۆ تۆ نییە، بێشک لەو ژوورە تاکە کەسیەدا زۆرت دەرد و ژان دیتووە و ئیتر ناتەوێ بگەڕێیتەوە ئەوێ، با ڕێک و ڕاست پێت بڵێم، ئەگەر ئەو نەرم و نیانییەی ئێمە ئاکامێکی نەبێ، ناچارین توندوتیژی بەکار بێنین. جوان سەرنج بدە من بەڵگەم هەیە - بەڵگەی باش و ئەرێنی - کە بڕێک لە لاوەکان بە دزیەوە بڵاڤۆکی قاچاخیان هێناوەتە ئەم

بەندەرە و تۆش لەو کەین و بەینەدا هاودەستیان بووی. ئێستا ئایا لەو پێوەندیەدا ئەوەی دەیزانی پێم دەڵێی؟»

ئارتور زۆرتر سەری شۆڕکردەوە. وردە وردە ڕق و تووڕەیی وەکوو گیان لەبەرێکی کوێرو بێ ئیحساس وابوو کە سەرتاپای دەروونی داگیر دەکرد. ئەو لەوە دەترسا کە نەتوانێ خوددار و لە سەرەخۆ بێ. تازە لێی حاڵی ببوو کە لە دەروونی مرۆڤدا چ هێز و تواناییەک لە ژێر هێوری و سەنگینی جێنتەڵمەنێک یان کەسێکی خاچ پەرەستدا خۆی شاردۆتەوە، تەنانەت ئەو لە خۆشی زۆر دەترسا.

سەرهەنگ گوتی: «مەحتەلی وەڵام دانەوەی تۆم».

- وەڵامێکم نییە کە بیڵێم.

- بە تەواوەتی لە وەڵامدانەوە خۆ دە بوێرێ. ها؟

- قەت هیچ شتێکتان پێناڵێم.

- ناچارم فەرمان بدەم بتگەڕێننەوە بۆ ژووری ئەشکەنجەکە و تا ئەو کاتەی بیرورڕات نەگۆڕی لە وێدا دەمێنییەوە. ئەگەر زەحمەت و دەردیسەریشمان بۆ دروست کەی دەڵێم کۆت و زنجیرت کەن.

ئارتور سەری هەڵێنا، هەموو گیانی دەلەرزی بە هێواشی گوتی: «چیتان پێخۆشە بیکەن، با بزانین ئایا باڵوێزی بەریتانیا ئەم حیلەبازیەی ئێوە سەبارەت بە هاووڵاتییەکی ئەو وڵاتە بەکاری دێنن قەبوول دەکا ، ئەوە لە کاتێک دایە کە من خۆم بە دوور لە هەر تاوانێک دەزانم لە بیرتان نەچێ ئێوە بەرپرسی تەواوی ئەم کارە قیزەونانەن».

ئاخرەکەی ئارتوریان بردەوە بۆ ژوورە تاکە کەسیەکەی. لە وێدا خۆی دا بەسەر پێخەفەکەیدا و تا سبەینێ خەوت، بە زنجیر نەیانبەستەوە و ئێتر ژوورە تاریک و سامناکەکەی نەدیتەوە، بەڵام دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتیی نێوان ئەو و سەرهەنگ بە دووای هەر لێپرسینەوەیەکدا قووڵتر دەبوو.

لە ژوورە تاکە کەسیەکەیدا لەخودا پاڕاوە یاریدەی بدات تا بە سەر خواستی شەیتانی خویدا زاڵ بێت و یان ئەوەی کە نیوەی هەر شەوێک بتوانێ بیر لە سەبر و دانبەخۆداگرییەکەی مەسیح بکاتەوە، بەڵام بێئاکام و بێسوود بوو.

هەر وەختێ دەیانهێنایە ئەو ژوورە گەورە و چۆڵەی کە تەنیا مێزێکی داپۆشراوی لێبوو، بە دیتنی سمێڵی بسکەداری سەرهەنگ، دەروونی پڕ دەبووەوە لە توند و تیژی و دەستی دەکرد بە گوتنی قسەی بەرز و نەوی و وەڵامی سەرزارەکی. هێشتا مانگێکی تەواو نەبوو کە لە زینداندا بوو کە ڕق و تووڕەیی وەها بەربینگی هەردووکیانی گرتبوو کە هیچیان نەیاندەتوانی بە ئارامی و بە هێوریەوە بڕوانە ڕوخساری ئەوی دی. زەختی ئەم شەڕە دەندووکێیە وردە وردە کاریگەرییەکی یەکجار زۆری لە سەر هەستەدەمارەکان دانابوو. لەوەش ئاگادار بوو کە بە توندی چاوەدێری دەکەن و چوار چاو دەیدۆزن، دەنگۆیەکیش هەبوو کە گوایا بە دزیەوە دەرمانی بلادۆنا دەرخواردی زیندانی دەدەن تا لە خەودا قسە بڕەوێنێ و چاوەدێرانی بەندیش ئاگاداری بن، هەر بۆیە وردە وردە لە خواردن و خەوتنی خۆشی دەترسا، ئەگەر کاتی شەوێ مشکێک بە پەنایدا تێپەریبایە لەپڕدا وا دەردەپەڕی سەرتاپێی کەیلی ئارەقەیەکی سارد دەبوو ، لە ترسانا دەلەرزی و وەهم و خەیاڵ دایدەگرت کە کەسێک لە ژوورە تاکە کەسیەکەیدا خۆی مەڵاس داوە تا لە کاتی خەودا گوێی لە قسەکانی بێت.

جەندەرمەکان تێدەکۆشان بە هەر فێڵ و تەڵەیەک بێت قسەی لێدەرکێشن، تا بە دەستی ئەو بوولا بخەنە گیر، خۆفی کەوتنەداوی ئەوان وەک دۆڵپایەک وەها لە سەرشانی قورسایی دەکرد کە ترسی ئەوە هەبوو بکەوێتە قەیرانی ڕوحی و دەروونییەوە. نێوی بوولا شەو و ڕۆژ لە گوێچکەیدا دەزرینگایەوە، تەنانەت لە نوێژەکانیشیدا لەگەڵی بوو، بە جێگای نێوی مریەم بە زۆر جێگای خۆی لە کەلێنی تەسحیبەکەیدا کردبووەوە، بەڵام لە هەمووي خراپتر ئەوە بوو کە واوێدەچوو دینەکەشی وەکوو دنیای ئازادی دەرەوە وردە وردە لێی دوور دەکەوتەوە.

بە خیلەسەرییەکی زۆرەوە چەند کاتژمێرێک لە سەر لاق و بەپێوە ڕادەوەستا بۆ دوعا و پاڕانەوە و بیر و هزری ئایینی، بەڵام بیری هەر لە لای بوولا بوو، دوعا و پاڕانەوەکانی هەر سەرزارەکی و ڕواڵەتیانە بوو.

دڵی هەر بە بەرپرسی بەندەکە خۆش بوو، هەر ئەو بوو دڵخۆشی دەداوە، ئەو پیرەمێردێکی قوڵەخڕەی قەڵەوە و سەر ڕووتاوە بوو، کە لە هەوەڵەوە زۆری هەوڵ دا تووڕە و تۆسن بێ، بەڵام پیاوچاکیی ئەو بە سەر ئەرکی نالەباریدا زاڵ بوو ئەوەشی لەو لێو بە بزەیەیدا بەدەرکەوت لەوە بە دواوە هەواڵ و پەیامی زیندانییەکانی لەم ژۆورەوە بۆ ئەو ژوور دەگەیاند.

لە پاش نیوەڕۆدا، خزمەتکارە پیرەکە بە بیچمێکی شێواو و ڕووگرژییەوە هاتە ژوورە تاکە کەسیەکەی ئارتور و بە سەیرێکەوە لێیڕوانی.

بە سەرسووڕمانەوە لێی پرسی: «سەیرە ئێنریکو ئەوڕۆکە بۆ وا شڵەژاوی؟»

ئێنریکو بە تووڕەیەوە گوتی: «هیچ» چوو بۆ لای پێخەفەکەی ئارتور، قالیچەیەک کە هی ئارتور بوو لە ژێر پێخەفەکەی دەرهێنا.

- چتداوە لەو شتانەی من؟ دەبێ بچمە ژوورە تاکە کەسیێکی دیکە؟

- نا ئازاد دەبی.

- ئازاد؟ چی - ئەمڕۆکە؟ بە یەکجاری؟ ئێنریکو!

ئارتور لە خۆشیانە باسکی پیاوە پیرەکەی توند گرت، بەڵام ئێنریکو بە تووڕەیەوە باسکی بەردا.

ئێنریکو! چی ڕووی‌داوە؟ بۆ قسە ناکەی؟ هەموومان ئازاد بووین؟

وەلامەکەی تەنیا بۆڵە بۆڵێکی بە سووک زانین بوو.

ئارتور بە بزەیەکەوە دیسان قۆڵی گرت: «چاولێکە؟ نێوچاوانت لە من تێکمەنێ کە هیچ خێروبێرێکی بۆ تۆ تێدانییە، چوونکی دڵگیرنابم، پێمخۆشە ئاگادارییەکم لە ئەوانی دیکەش پێبدەی» ئێنریکو لە پڕێکدا کە کراسەکەی قەد دەکرد داینا و بە بۆڵە بۆڵێکەوە گوتی: «کامانە ئەڵێی؟ پێم‌وانییە بوولا بڵێی؟»

- هەڵبەت بوولاش و ئەوانی دیکەش، ئێنریکو چی بووە و بۆ وادەکەی؟

- زۆر چاکە دەیڵێم، وەختایەک کە کەسێک هاوڕێکەی خۆی پێوەدەکات و وادیارە بەو زووانەش ئازاد ناکرێ فەقیرە، وەئیش!

ئێنریکو دیسان کراسەکەی بە تووڕەیەوە هەڵگرت.

چاوەکانی ئارتور لە ترسانا زەق ببوونەوە: «ئەویان بە گرتن‌داوە؟ هاوڕێیەک؟ ئای چەند ناخۆش و سامناکە!»

ئێنریکو توند سەری وەرگێڕا: «یانی تۆ نەبووی؟»

- من؟ پیاو مەگەر شێت بووی؟ من؟

ــ هەر چۆنێک بووبێ، دوێنێکە لە لێپرسینێکدا وایان پێ گوتووە. زۆرم پێخۆش دەبێ تۆ ئەو کارەت نەکردبێ، چونکە هەمیشە دەمگوت تۆ لاوێکی زۆر بەشەرەف و پاکی. ئا لێرەوە وەرە! ئێنریکو بە کالیدۆرەکەدا کەوتە ڕێ و ئارتوریش بە شوێنیدا، ژیلەمۆیەک لە مێشکی پەرێشانیدا گەشاوە.

- بە بوولایان گوتووە کە من ئەوم پێوە کردووە؟ هەڵبەتە کە وادەڵێن! ئێنریکو سەیرە بە منیشیان گوتووە کە بوولا ڕاستی منی گوتووە، حەتمەن بوولا ئەوەندەی تێگەیشتوویی هەیە کە باوەڕ بەو قسە قۆڕانە نەکات.

ئێنریکو لەبەر پێپلیکانەکەدا ڕاوەستا و بە سەرنجەوە لە ئارتوری ڕووانی کە لەبەر ئەو هەواڵە تەنیا شانی لێهەڵتەکانت.

- یانی بە ڕاستی ئەو قسەیە درۆیە؟

- شک لەوەدا نییە کە درۆیە.

ــ زۆر چاکە زۆر خۆشحاڵم کوڕم کە ئەوە دەبیستم، بوولاش ئاگادار دەکەمەوە، بەڵام دەزانی چییە ئەوان بەویان گوتووە کە تۆ بە هۆی... ئەتپ لە ئێرەییدا لەوت تێپەڕاندووە، هەر دووکتان ئاشقی کچێک بوون.

ئارتور بە پەلە و بە هانکەهانک لە سەریەک دەیگوتەوە: «درۆیە!» لە پڕێکدا ترسێکی ئاویتەی لەرزین هەموو لەشی داگرت.

- کچێک... ئێرەیی! چۆنیان زانیوە... چۆنیان زانیوە؟

- کوڕم کەمێ بیر کەوە.

ئێنریکو لەو کالیدۆرەدا کە دەگەیشتە ژووری لێپرسینەوەکە ڕاوەستا و گوتی: «باوەڕت پێدەکەم، بەڵام تەنیا ئەم شتەم پێبڵێ، من دەزانم تۆ کاسۆلیکی، ئایا لە تۆبە و پێلێنانەکانتدا شتێکت گوتووە...»

- درۆیە!

ئارتور وای لێهاتبوو کە خەریک بوو پڕ بە گەروو هاوار بکات، بەڵام ئێنریکو شانی گرت و توند ڕایوەشاند و کەوتنە ڕێ.

- هەڵبەتە تۆ خۆت باشتر دەزانی، بەڵام بزانە بە تەنیا هەر تۆ نیت کە ئاوا ساویلکانە فریوت خواردووە، هەر ئێستە لە پیزا دەنگۆیەکی زۆر بڵاو بووەتەوە سەبارەت بە قەشەیەک. ئەمە هاوڕێیەکی ئێوە بەم شتەی زانیوە، ئەوان بڵاڤۆکێکیان چاپ کردووە و لەودا نووسیویانە کە ئەو قەشەیە سیخوڕە.

دەرگای ژووری لێپرسینەوەی کردەوە کە دیتی ئارتور ڕاوەستاوە و بە ڕامانێکەوە لە ڕووبەڕووی خۆی دەڕوانی، بە هێواشی لە دەرگاکەوە بردیە ژوورەوە. سەرهەنگ بە لێوی بەبزەیەوە کە ددانەکانی بەدەرکەوتبوون گوتی: «ڕۆژ باش، ئاغای بێرتێن لەوەی کە پیرۆزبایت لێدەکەم زۆر خۆشحاڵم، فەرمانێک لە فلۆرانسەوە هاتووە کە ئێوە ئازاد بکرێن، دەکرێ ئەم نامەیە واژۆ بکەن ؟»

ئارتور چووە پێشێ و بە دەنگێکی گیراوەوە گوتی: «پێمخۆشە بزانم کێ منی بە گرتن داوە»؟

سەرهەنگ بە بزەیەکەوە برۆکانی هەڵێنا: «خۆت ناتوانی ناوی بێنی؟ کەمێ بیر بکەوە.

ئارتور سەری ڕاوەشاند، سەرهەنگ بە سەیرێکەوە دەستەکانی لێک کردەوە.

- یانی نازانی کێ بوو؟ بەڕاستە؟ سەیرە ئەمە خۆت بوویت و بەس ئاغای بێرتێن بێجگە لە خۆت کێی دیکە هەیە ئاگاداری ئەوین و خۆشەویستییە تایبەتییەکەی تۆ بێت؟

ئارتور بێدەنگ ڕوانییە دیوارەکە. خاچێکی چێوی گەورە بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو چاوەکانی بە هێواشی سەرنجیان دایە سەر ڕوخساری خاچەکە، بەڵام ئەم جارەیان لێی ڕامابوو.بە دیتنی ئەم خودا سست و لە سەرەخۆیە کەوتە فکر و ڕامانەوە، ئەم خودایەی کە بۆچی شەلاقی هەورەتریشقەی نەباراندە سەر ئەو قەشەیەی کە نهێنییەکانی کەسێک دەدرکێنێ.

سەرهەنگ بە نەرمیەوە گوتی: «تکایە دەکرێ وەرەقەی وەرگرتنەوەی نامەکانت ئیمزا بکەی؟ لەوە زیاتریش لێرە مەحتەلتان ناکەم، دڵنیام کە بۆ ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵێ بە پەلەن، کار و وەختی منیش بە دەست بوولاوە گیراوە ئەو لاوە سەرەڕۆ و ساویلکەیەی وا ئەو هەمووە خراپەیەی دەرحەق بە ئێوە و ئیمانی

پاک و دروستی ئێوه کردووه، ترسی ئەوەم هەیە زیندانییەکی قورس و درێژخایەنی بۆ ببڕدرێتەوە، بە سڵامەت!»

ئارتور وەرەقەکەی واژۆ کرد و نامەکانی وەرگرتەوە و بە بێدەنگییەکی تاقەت پڕوکێندا چووە دەرەوە، بە شوێن ئێنریکودا بەرەو دەروازە گەورەکە کەوتە ڕێ بێئەوەی خوداحافیزی بکات بەرەو ڕۆخی ئاوەکە ڕۆیی. لێخوڕی گەمیەکە چاوەڕوانی بوو تا لە ئاوەکە بیپەڕێنێتەوە. هەر کە لە پلیکانە بەردینەکان بەرەو شەقامەکە وەسەر کەوت کچێک کە جلوبەرگێکی پەمۆیی و کڵاوێکی حەسیری لەسەر نابوو باوەشی بۆ گرتەوە و بە هەڵەداوان بەرەو لای ئەو دەهات.

- ئاخ ئارتور زۆر زۆر خۆشحاڵم زۆر!

ئارتور بە لەرزە لەرز دەستەکانی لادا و ئاخرەکەی بە دەنگێکی کە دەتگوت هەر هی ئەویش نییە وتی: «جیم!جیم!»

- نیو کاتژمێرێکە لێرە مەحتەڵم. بە منیان گوت کە سەعات چوار دێتە دەرێ. ئارتور ئاوا بە سەیرەوە چاوم لێمەکە؟ شتێک ڕووی داوە؟ ئارتور بۆ وات لێهاتووە؟ ڕاوەستە!

ئارتور بەرەو خواروی شەقامەکە کەوتە ڕێ، دەتگوت جمای بە یەکجاری فەرامۆش کردووە، جما کە لە ڕەفتاری ئارتور سەری سووڕ مابوو ، بە شوێنیدا هەڵات و قۆڵی گرت: «ئارتور!»

ئارتور ڕاوەستا و بە پەرێشانییەوە چاوی لێ کرد جما دەستی خستە ژێر قۆڵی و بێدەنگ کەوتە ڕێ.

جما بە نەرمییەکەوە دەستی پێ کرد: «ئازیزم گوێ بدەیە ، تۆ نابێ سەبارەت بەم ڕووداوە ناخۆشە ئەوەندە خۆت نارەحەت کەی ، دەزانم تەحەمولکردنی زۆر دژوارە، بەڵام هەموو کەسێک بە باشی لەوە حاڵییە».

ئارتور هەر بەو پەرێشان حاڵیەوە لێی پرسی: «باسی چ دەکەی؟»

برووسکەکەی بوولا دەڵێم.

ئارتور بە بیستنی ئەم ناوە دڵتەزێنەوە ڕەنگی تێک چوو. جما درێژەی دا: «پێموابوو هیچت لەم بارەیەوە نەبیستووە، بەڵام ڕەنگبێ پێشیان وتبێتی، بوولا دەبێ شێت بێ کە فکرێکی وای کردۆتەوە.»

ـ فکری وا...؟
ـ یانی لەو بارەیەوە هیچ نازانی؟ ئەو برووسکەیەکی سامناکی نووسیوە و وتبووی کە تۆ سەبارەت بە پاپۆڕە هەڵمیەکان قسەت کردووە و نهێنیت درکاندووە و بوویتە هۆکاری گرتنی ئەو، بەڕاستی ئەوە قسەیەکی هیچ و پووچە، هەر کەسێک کە تۆ بناسێت باش تێدەگا، تەنیا ئەوانەی کە تۆ ناناسن لەو کێشەیە دڵمەندن. ڕاستیەکەی ئەوەیە من لەبەر ئەم باسە گرینگە هاتوومەتە ئێرە تا پێت‌بڵێم کە لە گروپی ئێمەدا کەسباوەڕی بەو قسەیەی نەکردووە.
ـ جما!، بەڵام ئەمە ڕاستە... ڕاستە!
جما چووە ئەو لاوە، وشک بوو، لە ترسا چاوەکانی زەق بووەوە و بەرچاوی ڕەش داگەڕا، ڕەنگی ڕوخساری وەکوو دەسماڵەکەی گەردنی سپی هەڵگەڕا،دەتگوت شەپۆلێکی گەورە و ساردی بێدەنگی دایگرتوون و لە جێگایەکی دوور لە ژیان و بە بێ جووڵەی شەقامەکە، لە زیندانی کردوون.
ئاخرەکەی بە ورینەکردنەوە گوتی: «بەڵێ پاپۆڕە هەڵمیەکان... من سەبارەت بەوان قسەم کرد، ناوی ئەویشم گوت... ئای خودایە! خودایە! چیبکەم؟»
لە پڕێکدا وەخۆ هاتەوە و دیتی کە جما لە تەنیشتی ڕاوەستاوە و لە تووڕەییاندا ڕوخساری ترسی مەرگی لێ دەباری بەڵێ بێگومان ئەو وای بیر دەکردەوە کە....
زۆرتر لێی نزیک بووەوە و بە دەنگێکی بڵیندەوە گوتی: «جما، تێدەگەی!»، بەڵام جما قیژاندی و گوتی: «دەستم لێمەدە!». وای گوت و خۆی کێشایە ئەو لاوە.
ئارتور لە پڕێکدا دەستی ڕاستی ئەوی گرت وگوتی: «بە خاتری خودا گوێ بدەیە! من تاوانێکم نییە...»
ـ بەرم دە، دەستم بەردە، بەرمدە!
لە دواییدا قامکەکانی لە دەست ئارتور دەرکێشا و یەک زللەی لێدا.
تەمێک بەرچاوی ئارتوری داگرت. بۆ چەند ساتێ تەنیا ڕوخساری هیوابڕاو و ڕەنگ هەڵبزرکاوی جمای دەدیت کە دەستی ڕاستی خۆی لە داخان خێراخێرا بە تەنوورەکەیدا دەخشاند. لە دوایەدا کە هاتەوە سەرخۆ، چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد و دیتی کە تەنیایە.

# ٧

چەند سەعاتێکی شەو تێپەڕیبوو کە ئارتور لە زەنگی دەرگا گەورەکەی ماڵی «ویابورا»ی دا. هاتەوە یادی کە چەندە لە شەقامەکاندا خولاوەتەوە، بەڵام لە کوێ، بۆچی و چەندە هیچی لە بیر نەبوو و هیچی نەدەزانی. پێشخزمەتە تایبەتیەکەی جولیا دەرگای کردەوە، بە دیتنی ڕوخساری کزولاوازی دەمی بە تاقەوە وەستا، ئاخەر دیتنی دیمەنی گەڕانەوەی ئاغا لاوەکەی لە زیندان ئەویش وەکوو سواڵکەرێکی «مەست و شێواو» زۆرتر وەک سوعبەت و جەفەنگێکی سەیر و سەمەرە دەچوو، ئارتور چووە قاتی سەرێ، لە قاتی هەوەڵ تووشی گنیوێنز بوو کە قەڵافەتێکی لەخۆباییانە و لۆمەکەرانەی گرتبوو، ئارتور ویستی خێرا بە گوتنی «شەو باشێکی» بە پەلە لێی تێپەڕێ، بەڵام گنیوێنز ئەو پیاوە نەبوو کە کەس بتوانێ بە بێ مەیلی ئەو لە پەنایەوە ڕەت بێت.

گنیوێنز بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە ڕوانییە جلوبەرگ و قژی هەڵشێواوی ئارتور و وتی: «پیاوەکان لە ماڵێ نین، ئاغا لەگەڵ خانمدا چوون بۆ میوانییەکی شەوانە، تا نزیک دوازدەی شەوێش ناگەڕێنەوە».

ئارتور ڕوانییە کاتژمێرەکەی، کاتژمێر نۆ بوو ئای، بەڵێ! وەختی هەیە، وەختێکی زۆریشی هەیە

- ئاغا، خانم پێیان خۆش بوو لێتان بپرسم شێو دەخۆی و هەروەها پێتان ڕابگەیەنم کە ئەمشەو مەخەون چونکە دەیانەوێ قسەت لەگەڵ بکەن.

- زۆر سوپاس، هیچ ناخۆم، دەتوانی پێی بڵێی کە هێشتا نەخەوتووم.

چووە ژوورەکەی خوی، لە کاتی دەسبەسەرکرانییەوە، تا ئێستا ژوورەکەی وەکوو خۆی وابوو، وینەی مونتانلی لە سەر مێزەکە لە سەر جێگای خۆیدا بوو، خاچەکەش وەکوو ڕابردوو لە شانشیندا بوو، ساتێک لەبەر دەرگا ڕاوەستا، گوێی هەڵخست بێ دەنگیێکی سەیر ماڵەکەی داگرتبوو ، ئەوەی باش بوو کەس نەبوو سەرئێشەی بۆ سازکا و سەرودڵی بگرێت بە هێواشی چووە ژووری و دەرگای گاڵەدا.

بەو پێیە لە کۆتایی کارەکە نزیک دەبووەوە، ئیتر کێشەیەک نەمابوو کە بیری لێبکاتەوە یان نیگەرانی بێت، تەنیا خۆ قوتارکردن بوو لە دەست وشیاریەکی داپڵۆسێنەر.بەڵام ئەو کارە زۆرتر وەک کارێکی ساویلکانە و بێئەقڵانە دەچوو، تەمایەکی وا پتەوی نەگرتبوو بۆ خۆکوژی، لە ڕاستیدا زۆریشی بیر لێنەکردبووەوە، ئەوە کێشەیەک بوو کە حەتمەن دەبێ جێبەجێ بکرێ، تەنانەت شێوەی مردنەکەشی هەڵنەبژاردبوو گرینگ ئەوە بوو کە دەبێ خێرا و بە پەلە کۆتایی بە هەموو شتێک بێنێ. هیچی واشی پێنەبوو تەنانەت چەقۆیەک یان قەڵەمبڕێکی گیرفانیش لە ژوورەکەیدا نەبوو، بەڵام ئەوە زۆر شەرت نەبوو، دەیتوانی کە خاولەیەک یان مەلافەیەک بکاتە تەناف یان پەتێکی درێژ.

ڕاست لە سەرووی پەنجەرەکەوە بزمارێکی گەورەی لێ بوو، ئەوە باش و بەجێ بوو، بەڵام دەبێ زۆر قایم بێ تا بتوانێ جەستەی قورسی ئەو ڕابگرێ. چووە سەر کورسیلەیەک تا تاقی بکاتەوە، بەڵام زۆر قایم نەبوو، لە سەر کورسیەکە هاتە خوارێ، چەکوچێکی دەرهێنا و بزمارەکەی داکوتا. کاتێ کە ویستی سەرچەفە(مەلافە)یەک لە سەر قەرەوێڵەکەی هەڵگرێت لە پڕێکدا وەبیری هاتەوە کە دوعاکەی نەخوێندووە، هەڵبەتە گشت کەسێک پێش مردن دەبێ دوعا بکات و بپاڕێتەوە، مەسحییەکان گشتیان ئەو کارە دەکەن تەنانەت دوعای تایبەت هەیە بۆ کەسانی سەرەمەرگ.

چووە شانشینو لەبەر دەم خاچەکەدا ئەژنۆی دادا. بە دەنگێکی بەرزەوە دەستی پێ کرد: «ئەی خودای بەخشەندە و بە توانا...»

کەمێ وێستا و ئیتر هیچی نەگوت. لە ڕاستیدا لەبەر چاوی ئەو جیهان ئەوەندە تاریک و تنۆک بوو کە شتێکی وای بەرچاو نەدەکەوت کە بۆ وی یان دژ بەوی دوعاو تووک و نزا بکات دوای ئەوە مەسیح سەبارەت بەو ئازاردانە چی دەزانێ ـ مەسیح خۆ قەت بۆخۆی ئەو ئێش و ژانانەی نەچێشتبوو، تەنیا ئەویان وەکوو بوولا بە گرتن دابوو، قەتیش لە سەر بەگرتن دانی کەسێک لۆمە نەکرابوو، هەستا سەرپێ و وەکوو جاران خاچێکی لە سەر سینگی خوی کێشا کە نزیکی مێزەکە بووەوە نامەیەکی لە سەر بوو کە بە دەست نووسی مونتانلی و لە لایەن ئەوەوە بوو. ئەو برووسکەیە بە قەڵەم نووسرابوو:

« ـ کوڕە ئازیزەکەم، زۆر بە داخم کە ناتوانم لە ڕۆژی ئازادبوونتدا بتبینم، چونکە دەچم بۆ لای پیاوێک کە بەرەو پیری مردن دەچێ، ئەو شەو تا درەنگانێک ناگەڕێمەوە بەیانی زوو وەرە بۆ لام زۆر بە پەلەم. ل. م».

هەناسەیەکی هەڵکێشا و برووسکەکەی لە سەر مێزەکە دانا، ئەم پێشهات و هەواڵە بۆ پاپا زۆر ناخۆش بوو.

خەڵکی چەندە لە شەقامەکاندا پێکەنیبوون و قسەی هەڵیت و پڵیتیان کردبوو! لەو ڕۆژەوەی کە وەک زیندەوەرێک ژیاوە، تا ئێستا هیچ شتێک و تەنانەت ئەرکی ڕۆژانەش کە لە دەوروبەری بوو، تەنانەت ڕوحی ئینسانێک، ئینسانێکی زیندوو یان ئینسانێکی مردوو هیچ نەگۆڕابوو، هەمووشتێک وەک ڕابردوو بوو، لە چاوە و کانیاوەکان ئاو هەڵدەقوڵێ، چۆلەکەکانیش لە ژێر گوێسوانەکاندا دەجریوێنن، ڕاست وەک ڕابردوو وەکی لە داهاتووشدا ئەو کارە دەکەنەوە، بەڵام ئەو مردبوو ـ هەر بە تەواوەتی مردبوو. لە لێواری قەرەوێڵەکە دانیشت، لە سەر میلەئاسنێی قەرەوێڵەکە دەستی وەک خاچ لێ کرد و تەوێڵی لە سەر دانا. کات و وەختی زۆر بوو، یەکجار زۆر سەریشی دەهێشا، دەتگوت ڕاست مێشکی دەهێشا، لە لای ئەو هەموو شتێک بێمانا و لەخۆڕایی و دڵتەنگی دەنواند.

دەنگی زەنگی دەرگای حەوشەکە بە توندی هاتە گوێی، ئارتور لە کاتێکدا بە دوو دەست قورگی گرتبوو لە ترسانا هەناسەی بۆ نەدەکێشرا. دەرپەڕی. ئەوان هاتنەوە ـ ئەو لەو بەینەدا تەواو چوبووە ماڵی فکرەوە و کات و ساتی بە نرخی

بە فێرۆ دابوو، ئێستا دەبوو بیچمی ئاوان ببینێ و گوێ بیستی قسەی تاڵ و پرتەوس و توانجی ئەوان بێ، خۆزگە چەقۆیەکی پێدەبوو، بێباوەڕانە چاوێکی بە ژوورەکەدا گێڕا، مجر(سندوق)ی نەرگدرووینەکەی دایکی لە سەر تاقەکە بوو، بێگومان مقەستێکی دەبێ تێدابێ، بەو مقەستە دەیتوانی ڕەگی حەیاتی خۆی ببڕێ، نا ئەگەر وەختی هەبوایە سەرچەف(مەلافە) و بزمار زۆر باشتر بوو. مەلافەکەی لە سەر قەرەوێڵەکە دەرکێشا و بە پەلە و بە تووڕەییەوە.دەستی کرد بە لەت لەت کردنی مەلافەکە، دەنگی هەنگاوێکی بیست کە لە پلیکانەکان دەهاتە سەرێ.

نا، لەتی مەلافەکە زۆر درێژ بووەوە، لەوە باش نابەسترێ، گرێیەکیشی دەوێ. دەنگی هەنگاوەکە تا نزیکتر دەبووەوە بە پەلەتر و خێراتر کاری دەکرد. خوێنی دەمارەکانی وا خێرا لە سەریدا دەگەڕان کە لە گوێیدا دەنگی دەداوە. خێراتر! ئای خودایە! پێنج خولەکیتر! دەنگی لێدانی دەرگاکە هات لەتە مەلافە دڕاوەکە لە دەستی کەوتە خوارێ، بێجووڵە دانیشت و هەناسەی لە سینگیدا ڕاگرت تا باشتر ببیستێ، دەستێک دەسگرەی دەرگاکەی گرت، دوایە دەنگی جولیا هات: «ئارتور»

ئارتور بە هانکە هانک هەستایە سەرپێ.

- ئارتور، تکایە دەرگاکە بکەوە،ئێمە مەحتەلین.

مەلافە دڕاوەکەی کۆکردەوەو خستیە نێو چەکمەجەکە و بە پەلە قەرەوێڵەکەی ڕێکوپێک کرد

- ئارتور!

ئەو جار دەنگی جیمزی بیست. دەسگیرەکەش خێراخێرا تەکانی دەخوارد.

- خەوتووی؟

ئارتور چاوێکی لە دەوروبەری ژوورەکە کرد دوایی کە دیتی هەموو شتێکی شاردۆتەوە دەرگاکەی کردەوە.

جولیا بە تووڕەیەکی زۆرەوە خێرا چووە ژوورێ و گوتی: «من پێموابوو ناخەوی‌و ڕێز بۆ خواستی من دادەنێی ، ڕەنگە تۆ وات پێ باش‌بێ ئێمە نیوسەعات لە پشت دەرگای ژوورەکەت چاوەڕوان بین.»

جیمز بەدوای جلوبەرگە ساتەنەکەی خێزانیدا چووە ژووری بە شێوەیەکی هێدی و لە سەرەخۆ وتەی جولیای ڕێکوپێکتر کرد: «چوار خولەک، ئارتور بە بڕوای من زۆر... باشتر بوو ئەگەر...»
ئارتور قسەکەی بڕی: «چیتان دەوێ؟»
دەرگاکەی گرتبوو وەک حەیوانێک کە کەوتبێتە داوەوە بە دزیەوە چاوی لەم و لەو دەکرد.
بەڵام جیمز بە هۆی قسەکردن و جولیاش بە هۆی تووڕەیەکی زۆرەوە هیچیان ئەو نیگایانەیان نەخوێندەوە.
ئاغای بێرتێن کورسیەکی بۆ هاوسەرەکەی دانا و خۆشی لە کاتێکدا شەڵوارە تازەکەی هەتا ئەژنۆکانی هەڵکێشابوو دانیشت.
- من و جولیا بە ئەرکی خۆمانی دەزانین کە لەگەڵ تۆ سەبارەت...
- ئەم شەو ناتوانم گوێتان لێ بگرم، من... حاڵم باش نییە، سەرم دێشێ... دەبێ مەودام بدەن.
ئارتور بە دەنگێکی سەیرەوە کە باشی لێ تێ نەدەگەیشتی قسەی دەکرد، هەڵسوکەوتی گێژ و شێواو بوو. جیمز بە سەیرێکەوە چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، دوای ئەوەی کە لە پڕێکدا هاتەوە یادی کە ئارتور لە کانگای پیسی و پۆخڵی زیندانەوە گەڕاوەتەوە، بە نیگەرانییەوە گوتی: «هیوادارم کە نەخۆش نەبی، وێدەچێ سەرت بێشێ؟»
جولیا بە پەلە هاتە نێو قسەکانییەوە: «لە خۆڕا! وەک هەمیشە فریومان ئەدات، چونکە شەرم دەکا ڕووبەڕووی ئێمە بێتەوە. ئارتور وەرە ئێرە دانیشە!»
ئارتور ژوورەکەی ئارام پێوا لە سەر قەرەوێڵەکە دانیشت و بە ماندوویەتیەوە گوتی: «بەڵێ؟»
ئاغای بێرتێن کۆخی، سینگی ساف کرد و دەستێکی بە ڕیشە ڕێکوپێکەکەی داهێنا و دیسانەوە قسەکانی کە بە وردیەوە تاوتوێی کردبوو دەستی پێ کرد: «من پێموایە ئەمە ئەرکی منە... کە بە شێوەیەکی نائاسایی خۆت لە پێوەندی لەگەڵ... لەگەڵ... پێشێلکەرانی یاسا و گێرەشێوێنەکان و...

ئی... کەسانێکی بێ ئابڕوو لەگەڵتدا بدوێم. بە بڕوای من یاسا شکێن و گەندەڵبووی نەفام و بێئەقڵ بووی... ئە... بێدەنگ بوو.

ئارتور دیسان گوتی: «دەی چیکەش؟»

جیمز بە نابەدڵیەوە، لە بەرانبەر هەڵسوکەوتی ناهومێد و خەمباری ئارتوردا نەرمتر بوو و درێژەی بە قسەکانی دا: «من پێمخۆش نییە کە لەگەڵ تۆدا شەڕئاژۆ بم، زۆرم پێخۆشە کە خۆم ڕازی کەم کە کەسانی خراپەکار تۆیان فریوداوە و لاوبوونت و کەم ئەزموونیت و... ئە... ئە... خۆ هەڵقوتاندن و... ئە... هەستێکی ئاورین کە بە داخەوە میراتی... دایکتە بۆت ماوەتەوە کاریگەرییان لە سەر تۆ هەبووە».

نیگای ئارتور هێواش خزایە سەر وێنەی دایکی و لێی ڕوانی، بەڵام هەروا بێدەنگ بوو.

جیمز درێژەی دا: «بەڵام دڵنیام کە سەرنجت داوەتە ئەم خاڵە کە ئیتر ناتوانم کەسێک ڕابگرم کە ناوی پاکی ئێمەی لە نێو خەڵکدا ڕیسوا کردووە»

ئارتور جارێکی دیکە دووپاتی کردەوە: «دەی چی دیکە؟»

جولیا بە تووڕەیەوە گوتی: «چی دیکە؟» باوەشێنەکەی توند کۆکردەوە و لە سەر ئەژنۆی دانا: «ئارتور ئایا پیاوەتی دەکەی کە شتێکی دیکە جیا لە (ئیتر چی دیکە) بڵێی؟» ئارتور بێئەوەی ببزوێ بە هێواشی وەڵامی داوە: «هەڵبەتە ئێوە چۆنی بە باش بزانن وادەکەن شێوەی کارەکەشتان هیچ بایەخێکی بۆ من نییە».

جیمز ئەوەی لە دڵ گران هات و دووپاتی کردەوە: «بایەخێکی نییە؟» خێزانیشی بە پێکەنینەوە هەستایە سەرپێ «ئەها، بایەخێکی نییە، نییەتی؟ زۆر چاکە جیمز هیوادارم کە لێت حاڵی بووبێ کە چەندە چاوەڕوانی سوپاس و پێزانین بی لە لایەن ئەم پیاوەوە، پێمگوتی کە ئاکامی پیاوەتی لەگەڵ ژنانی کاسۆلیکی و...»

ـ وسس! هیچ نییە لێی گەڕێ ئازیزم.

ـ جیمز هەمووی بێ ئاکامە، ئێمە لەخۆڕایی چاکەی لەگەڵ دەکەین. خۆمان ئازار دەدەین. ئێستا کە منداڵێکی زۆڵ خۆی دێنێتە ڕیزی خێزانەکەوە... زۆر

بە جێیە کە ئێستا بزانێ دایکی کێ بووە! ئێمە لەخۆڕایی دڵسۆزیی بۆ دەکەین، بۆ کەسێکی کە لە ئاکامی کاری حەرامی قەشەیەکی کاسۆلیک کەوتۆتەوە؟ زۆر باشە... ها تەماشای ئەوە بکە!

جولیا کاقەزێکی گرمۆڵە کراوی لە گیرفانی دەرهێنا و لە سەر مێزەکەوە فڕێی دا بۆ ئارتور.

ئارتور کردیەوە، برووسکەکە دەستنووسی دایکی بوو، چوار مانگ پێش لە دایکبوونی ئارتور نووسرابوو، پێ‌لێنانی تاوانێک بوو کە بۆ مێردەکەی نووسیبووی، لە کۆتاییشدا دوو ئیمزای پێوە بوو. ئارتور بە ئارامی ڕوانییە خوارەوەی وەرەقەکە، نێوی دایکی بە پیتی خواروخێچ نووسرابوو، ئیمزایەکی ڕێکوپێک و ئاشنای «لورێنزو مونتانلیش»ی پێوە بوو، چەند ساتێک ڕوانییە برووسکەکە، دوایە بێ‌ئەوەی قسەیەک بکا برووسکەکەی قەد کرد و لە سەر مێزەکەی دانا. جیمز هەستا سەرپێ و قۆڵی خێزانی گرت: جولیا باشە بەسە ئیتر، بڕۆ خوارێ درەنگە، دەمەوێ کەمێ لەگەڵ ئارتور قسە بکەم کە بیستنەکەی بۆ تۆ هیچ خۆش نییە.

جولیا چاوێکی لە مێردەکەی کرد و دوایە ڕوانییە ئارتور کە بێ‌دەنگ تەماشای ئەرزی دەکرد لە ژێرلێوەوە گوتی: «پێم‌وایە گێژبووە».

دوای ئەوەی کە داوێنی کۆکردەوە ژوورەکەی بەجێ هێشت، جیمز دەرگاکەی بە باشی پێوە دا، گەڕاوە بۆ لای کورسیەکەی کە لە لای مێزەکە بوو.

ئارتور هەروا بێ‌دەنگ و بێ‌جووڵە ڕاوەستا بوو.

ئێستاکە جولیا لەوێ نەبوو جیمز نەرمتر لەگەڵی دواو وتی: ئارتور زۆر بە داخم لەوەی کە ئەم نهێنییە ئاشکرا بوو، باشتر وابوو کە تا ئێستا نەتزانیبا، دەڵێی چی تازە کارلەکار ترازاوە و من کە دەبینم ئەوەندە خودداری زۆر خۆش‌حاڵم، جولیا بڕێک... بڕێک تووڕە بوو، ژنان هەمیشە... دەی، نامەوێ لەگەڵت توندوتیژ بم.»

بڕێک بێ‌دەنگ بوو تا بزانێ قسەکانی کاریگەریی باشیان بووە، بەڵام ئارتور نەبزوا، جیمز دوایە دەستی پێ کردەوە: «کوڕە خوشەویستەکەم، ئەم ڕووداوە زۆر دڵتەزێنە، تاقە کارێکی کە دەتوانین بیکەین ئەوەیە کە زمانی

خۆمـان گـرێ دەیـن. باوکـت ئـەوەنـدە لێبـووردەیـی هـەبـوو کـە دایکتـی دوای دانپیانان بە گوناهەکەیدا تەڵاق نەدا، ئەو تەنیا ویستی ئەو پیاوەی کە دایکتی فریـو داوە خێرا لـە وڵات بچێتـە دەرێ. هـەر وەک دەزانـی ئـەو پیـاوەش وەک ڕاهێنـەرێکی ئاینی چوو بۆ چین. دوای گـەڕانـەوەی ئـەو لـە چـین مـن ڕازی نەبووم تۆ هیچ پێوەندییەکت لەگەڵیدا هەبێ، بەڵام باوکت لە کاتی ئاویلکەداندا ڕازی بوو بەو کارە کە هەر ئەو پیاوە یانەکانی تۆ بڵێتەوە، بـەو شـەرتـەی کە قەت هەوڵ نەدا چاوی بە دایکت بکەوێتەوە. هەر بە ڕاستی دەبێ ئەوەش بڵێم کـە هـەردووکیـان زۆر بـە پـاکی و ڕاسـتی ئـەو شـەرتـەیـان تـا مردنـی دایکت ڕاگرت ئەوە کارێکی زۆردژوار بوو، بەڵام...»

ئارتور سەری هەڵێنا، تەڕایی و ڕووناکایی ژیـان لـە ڕوخسـاریدا نـەمـابوو، وەکوو دەمامکێکی بێ ڕوح وابوو.

بە نارەحەتی و پچڕپچڕیـەوە نـەرم وتـی: «بـە... بـە بـڕوای ئێوە هـەمـووی ئەمانە... ژوورجاڕی نییە؟»

جیمـــز کورســـیەکـــەی لـــە مێـــزەکـــەی دوور خـــستەوە و لـــە حاڵێکـــدا سـەرسـووڕماوی و تـووڕەیـی تێکـەڵ ببـوو، لـە سـەر کورسـیەکـەدانیشـت و ڕوانییە ئارتور.

ژوورجاڕ؟ ژوورجارە؟ مەگەر شێتبووی ئارتور؟

ئارتور لە پڕێکا سەری خست بە پشتا، سەرشێتانە پێکەنی.

خاوەن پاپۆڕەکە بە بوغزێکەوە هەستا سـەرپێ و گـوتی: ئـارتور، سـەڵا لـە ئەقڵت، سەرم لە تۆ سووڕماوە».

وەڵامێکی نەبیست، بەڵام قاقای پێکەنینی یەک بە دوای یەک دا دەبیست کە جیمزی خستە شک و گومانەوە کە نـەکا ئـەم پێکەنینانـە نیشانەی شـێتبوونی ئارتور بێ.

لـە ژێر لێوەوە گـوتی: «ڕاسـت وەک ژنێکی زۆربڵـە و سـەرشـێت» شـانی هـەڵتـەکانـد و سـووکێک لێیڕوانـی، گـەڕاوە تـا بـە پـەلـە ئـەوسـەرئـەوسـەری ژوورەکە بپێوێ.

ئارتور، بەڕاستی لـە جولیـا خراپتری، پێمـەکـەنـە بیبڕەوە! خۆ مـن نـاتوانم هەتا بەیانی بە لای تۆوە بم.

واوێدەچوو کە ئەو پێیخۆش بوو کە خاچەکەش لە سەر جێی خۆی هەڵکەندرێ، ئارتور لەوە خراپتر بوو کە سەرکۆنە و ڕێنوێنی بکەی، بۆیە هەر پێکەنی و دیسان پێکەنی.

جیمز ڕاوەستا و گوتی: «پێموابێ ئەم شەو خەرەفاوی و نایەوە سەر ئەقڵ. ئەگەر هەر ئاوا بی ناتوانم لەگەڵت بدوێم.سبەینێ زوو دوای خواردنی نانی بەیانی وەرە بۆ لام ئێستاش باشتر وایە بچی بخەوی، شەو باش».

دەرگاکەی کردەوەو چووە دەرێ، بە تووڕەیی و بە پەلە هەنگاوی هەڵدەهێناوە و لە ژێر لێوەوە دەی گوت: «ئێستا لە خوارێ نۆبەی چەڵتەچەڵتی ئەو سەرشێتەیە ، پێموایە لەوێ گریانیشی تێدایە!»

پێکەنینەکەی کە ئاوێتەی تووڕەیی بوو لە سەر لێوی ئارتور کۆچی کرد، چەکوشەکەی لە سەر مێزەکە هەڵگرت لە سەر خاچەکە ڕاوەستا. بە هۆی دەنگی شکاندنی خاچەکە وەخۆ هاتەوە،ڕووبەڕووی جێگای بەتاڵی خاچەکە ڕاوەستا بوو، چەکوشەکەی هێشتا لەدەست دابوو خاچ بە وردوپردیەوە کەوتبووە بەر پێی و لە ژوورەکەدا بڵاو ببووەوە.

چەکوشەکەی فڕێدایە سەر ئەرزی و گوتی: «ئاوا سووک و هاسان!» دوایە گەڕاوەو گوتی: «چەندە نەفام و بێئەقڵم».

لە پشت مێزەکە دانیشت، کەوتبووە هانکە هانک، تەوێڵی نایە سەر هەر دوو دەستی، خێرا هەستا سەر پێ، چووە ئاودەست، جەڕەیەکی ئاو کرد بە سەروسەکوتی خۆیدا، گەڕاوە ژوورەکەی هێور ببۆوە، دانیشت و فکر و خەیاڵ هەڵیگرت.

لەبەر خاتری ئەو خەڵکە بوو... لەبەر ئەم زیندەوەرە درۆزن و سپڵانە... و ئەم دڵڕەق و کەڕانە... کە قورسایی ئەشکەنجە و بێحورمەتی و شکست و سەرکۆنانەی بە گیان و بەدڵ هەڵدەگرت، تەنافێکی دروست کردبوو تا خۆی هەڵواسێ، چونکە بەڕاستی ئەو قەشەیەکی درۆزن بوو. واشڵەژابوو پێیوابوو هیچیان درۆیان نە کردووە! بەڵێ هەموو شتێک کۆتایی هات. ئێستا چاو کراوەتر و وشیارتر ببوو، تەنیاشتێکی کە پێویستی پێی بوو دووربوون و دوورەپەرێزی لەو خەڵکە پەست و سپڵەیە بوو و دەبوو ژیانێکی نوێ دەست پێ بکا.

شوێنەکانی بارخستن پڕبوون لە پاپۆڕی کاڵاهەڵگر و شتومەک، سەفەرکردن لەگەڵ ئەو پاپۆڕانە ئەویش بو کانادا، ئۆستڕالیا یان کەناری کۆڵنی، یان هەر جێگایەکی دیکە زۆر ئاسان بوو، زۆر شەرت نەبوو کە بۆ کام وڵات بچی، مەبەست تەنیا دوور کەوتنەوە بوو سەبارەت بە ژیان و گوزەرانیشی لەو وڵاتە دیدەنی دەکرد، ئەگەر پێشی خۆش نەبوایە جێگایەکی دیکەی هەڵدەبژارد.

جانتاکەی دەرهێنا تەنیا سی‌وسێ پالۆئی* هەبوو، بەڵام کاتژمێرەکەی زور بە نەرخ بوو، ئەو دەیتوانی بڕێک یاریدەدەری بێ، هیچ نەبوو ـ دەبوو جۆرێک خۆی ڕزگار کات. ئەوان بە شوێنیدا دەگەڕان، هەموویان لە شوێنەکانی بارخستن و کۆبارەکاندا لێپرسینەوەیان لە سەر دەکرد. نا، دەبوو شوێنەونکە بکات، دەبوو ڕازی بن کە ئەو مردووە. ئەو کاتە تەواو ئازاد و ڕزگار دەبوو ـ تەواو ئازاد. لەوەی کە دەیدیت بێرتێنەکان بە شوێن جەستە بێگیانەکەیدا دەگەڕێن لەبەر خۆیەوە پێکەنینی دەهات، ئەم ڕووداوە چەندە ژوورجاڕ دەبوو (کاغەزێکی هەڵگرت دەستی کرد بە نووسین: هەر وەکوو بیر و بڕوام بە خودا هەبوو ئاوا باوەڕیم بە ئێوەش هەبوو، خودا دەستکردێکی گڵوقوڕە کە دەتوانم وردی کەم ئێوەش بە درۆ منتان فریودا».

نامەکەی قەد کرد و نێونیشانی مونتانلی لە سەر نووسی، کاغەزێکی دیکەی هەڵگرت و لە سەری نووسی: لە گۆمیلکەکانی نۆژەنگاکەی (تەعمیرگا) بەندەری دارسینا جەستەی مردووم بدۆزنەوە» دوایە کڵاوەکەی لە سەر کرد و لە ژوورەکەی چووە دەرەوە، کاتێ لەبەردەم وێنەی دایکیدا دەگوزەرا، سەری هەڵێنا، بە تەوسەوە پێکەنی و بزەی هاتێ و شانی هەڵتەکاند. ئەویش درۆی لەگەڵ کردبوو.

بە کالیدۆرەکەدا هێواش ڕۆیشت. دەسگیرەی دەرگاکەی گرت و دەرگاکەی کردەوە و بەرەو پلیکانە مەرمەڕینە پانەکان ڕۆیشت کە تاریک بوو و دەنگی دەداوە، کاتێ چووە خوارێ وای هەست کرد کە ئەو پلیکانانە وەکوو قوڵکێکی ڕەشی تاریک وان کە دەمیان کردۆتەوە بۆ هەنگاوەکانی.

---

* ـ لیرەی ئیتالیای ئەو کات

حەوشەشی تێپەڕاند. لە ترسی جانباتیستا زۆر ئارام هەنگاوی هەڵدەهێنا چونکە ئەو لە قاتی خواری نووستبوو. لە ئەنباری دارەکەدا کە لە بەشی پشتەوە بوو، پەنجەرەیەکی چکۆلەی کون کونی لێ بوو کە بەرەو کاناڵەکە دەکراوە، تەنیا چوار هەنگاو لە ئەرزیەوە بەرزتر بوو، هاتەوە یادی کە لایەکی پەنجەرەکە ژەنگی هێناوە و شکاوە، بە بڕێک پاڵ تێوەنان دەیتوانی ڕێگایەک بەرەو دەرەوە بۆ خۆی بکاتەوە.

پەنجەرەکە قایم بوو دەستی زۆر خراپ بریندار کرد و قۆڵی کۆتەکەی هەڵقڵیشا، بەڵام زۆر گوێی نەدایە. چاوێکی لەم سەروسەری شەقامەکە کرد، کەس دیار نەبوو. کاناڵەکەش وەک دۆڵابێکی ناشیرین و تاریک لە بەین دوو دیواری لینچقدا بێدەنگ خەوتبوو. دیار بوو ئەو دونیایەی کە هێشتا تێیدا نەژیابوو وەکوو چاڵێکی ڕەش و تاریک وابوو، بەڵام هێشتا ئەم باشتر بوو لەو ژیانەی پشتسەری کە بێروح و بێرەحم و پەست بوو، شتێکی باشی نەدەدی کە دیسان لێی بڕوانێ، ئەوێ دونیایەکی چکۆلەی گەندەڵی پڕ لە درۆ و بوختان و فریو بوو، پڕبوو لە چاڵاوی پیس و بۆگەن کە تەنانەت ئەوەندە قووڵ و بێبن نەبوو کە بتوانێ کابرا بخنکێ و ئیدی نەجاتی بێ. بە شانی کاناڵەکەدا کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە مەیدانە چکۆلەکەی نزیک کۆشک و تەلاری مدیسی. ئا لەوێ دابوو کە جما بە ڕووگەشی و لێو بە بزە و بە ئامێزی ئاوەڵاوە بەرەو لای ئەو هەڵاتبوو، ئەمە هەر ئەو پلیکانە چکۆلە بەردینە شێدارانەیە کە بەرەو بەندیخانە دەڕوات. ئارتور تازە زانیبووی کە ئەم قەڵایە چەندە ناشیرین و ناخۆشە. قەڵاکەش هەر لە سەر ڕێی ئەو جۆگەلە ئاوە پیسە دابوو.

دوای ئەوەی شەقامە تەسکەکانی پێوا. گەیشتە گۆمیلکەی نۆژەنگای دارسینا. لەوێ کڵاوەکەی داگرت و خستیە ئاوەکەوە، بە دڵنیاییەوە کاتێ بە شوێن مەیتەکەیدا دەگەڕێن کڵاوەکەی دەدۆزنەوە. دوایە نیگەرانی ئەوە بوو کە دەبێ چی بکا، لە قەراغ ئاوەکەوە دەستی کرد بە پیاسەکردن، دەبوو ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ خۆشاردنەوە لە ناو پاپۆڕێکدا هەرچەند زۆرچەتوونیش بوو. تەنیا شانسەکەی ئەوە بوو کە دەبێ خۆی بگەیەنێتە پردە کۆن و گەورەکەی مدیسی و لەوێوە بەو شانەی دیکەدا بگاتە ئەوسەر،

ئەوێ مەیخانەیەکی چکۆلە و کۆنی لێیە. بەڵکوو بتوانێ پاپۆڕەوانێک بدۆزێتەوە کە بەرتیل وەربگرێ.

بەڵام دەرگای شوێنی بارەکان بەسترابوون. چۆن دەیتوانی لەوێوە لەبەر چاوی کارمەندانی گومروکەوە تێپەڕێ. گیرفانی ئەوەندەی تێدا نەبوو کە بتوانێ بەرتیلی نەبوونی گوزەرنامە و ڕەدبوونی شەوانەی تەواو بکات، دوای ئەوە لەوانەبوو بیان ناسیایە. کاتێ لە بەرانبەر کۆتەڵی زەردی «چوار بەندی مەراکیشی»ه*وە دەگوزەرا، ڕوخساری پیاوێکی دیت کە لە ماڵێکی قەدیمی و کۆنەوە لەو بەری گۆمیلکەکەوە هاتە دەرێ و لە پردەکە نزیک دەبووەوە.

ئارتور خێرا خزایە سێبەری پشت کۆتەڵەکە، لە سەر ئەرز خۆی گرمۆڵە کرد و بە دزیەوە و بە وردی لەم بەر و ئەوبەری دەڕوانی. شەوێکی گەرم و پڕ ئەستێرەی وەرزی بەهار بوو ئاو خۆی دەدا بە دیوارە بەردینەکەی گۆمیلکەکەدا، ئاوەچۆڕەی شەپۆلەکە وەکوو پێکەنینێکی نەرم لە دەوروبەری پلیکانەکان دەخولاوە و هەر لەو نزیکانە دەنگی خڕەی زنجیرێک هات و ئارام دەبزواوە، بەرزکەرەوەیەکی گەورە و بڵیند بێدەنگ و مات لە تاریکیدا سەری دیار بوو. جەستەی یەخسیرە بە زنجیر بەستراوەکان بە پانتایی ئاسمانی پڕ ئەستێرە ومات و هەورە پێچەڵاوپێچەکان لە کاتی تێکۆشان و بەربەرەکانییەکی چروپڕ و بێ ئاکامی دژ بە ژیانێکی ناخۆشدا، ڕەش و تاریکی دەنواند.

ئەو پیاوە گۆرانییەکی بەریتانیای مەجلیسی بە دەنگێکی بەرز دەگوتەوە، لە قەراغ ئاوەکەوە دەڕۆیشت و لاتراسکەی دەبەست. بە ڕواڵەت وادیار بوو کە مەست لە مەیخانەوە دەگەڕاوە، کەسی لێنەبوو، هەر کە نزیک بووەوە ئارتور لە جێگای خۆی هەستا و چووە سەر شەقامەکە. مەلەوانەکە گۆرانییەکەی خۆی بە جنێوێک بڕی و ڕاوەستا.

ئارتور بە زمانی ئیتالیایی گوتی: «دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم، لێم حاڵی دەبی؟»

---

* . ئەم کۆتەڵە بە یادی مدیسیەوە دانرابوو

پیاوەکە سەری ڕاوەشاند و گوتی: «لەم زمانە حاڵی نابم». و دوایە دەستی کرد بە قسەکردن بە فەڕەنسییەکی سەروپێ شکاو و بە ڕوو ناخۆشیەوە پرسی: «چیت دەوێ؟ بۆ نایەڵی بڕۆم؟»

ـ تەنیا چرکەیەک لە ژێر ئەو شەوقە ڕووناکە وەرە ئەم لاوە! دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.

ـ ڕۆشناییت خۆش ناوێ؟ لە ژێر ڕووناکاییەکە بێمە ئەو لاوە! چەقۆت پێیە؟

ـ نا، نا، بۆ حاڵی نابی تەنیا یارمەتیم لێت دەوێ، کرێکەشت دەدەمێ.

ـ ها؟ چی؟ پۆشتە و پەرداخیشی...

مەلەوانەکە ئەم ڕستەیەی بە بەریتانیای گوت، لەو کاتەدا بەرەو سێبەرەکە ڕۆیی و شانی دا بە میلەئاسنەی پەیکەرەکەوە، دیسان زۆر بە ناخۆشی و سەروپێ شکاوانە و بە زمانی فەڕەنسی گوتی: «دەی، چیت لێم دەوێ؟»

ـ دەمەوێ لەم وڵاتە بڕۆمە دەرێ...

ـ ئەها! هەڵدێی! دەتهەوێ بتشارمەوە؟ پێموایە کارێکی خراپت کردووە، چەقۆت لە کەسێک داوە، ها؟ ڕاست وەک ئەم بیانیانە! دەی پێتخۆشە بچی بۆ کوێ؟ پێموانییە پێتخۆش بێ بچی بۆ «پاسگا»؟

بە پێکەنینێکی خۆشەوە چاوێکی داگرت: «هی کام پاپۆڕی؟»

ـ کالوتا ـ لێگهۆڕن بۆ بۆینس ئایریس: لێرەوە ڕۆن بار دەکەین و لەو لاشەوە چەرم، ئەوەتانێ ـ ئاماژەی بەرەو لای پێڵ بەستەکە کرد: «ئەم پاپۆڕە کۆن و پیسەیە!

ـ بۆینس ئایریس ـ باشە! دەتوانی لە پاپۆڕەکەدا بمشاریتەوە؟

چەندەم دەدەیەی؟

ناتوانم زۆرت دەمێ، چونکە کەمێکم پائولی پێیە.

ـ نا ـ کەمتر لە پەنجا بێ ناتوانم ـ ئەوەندەش هەرزان... ئەویش بۆ پیاوێکی پۆشتە و پەرداخی وەکوو تۆ.

ـ مەبەستت چییە لە پۆشتە و پەرداخ؟ ئەگەر جلەکانمت پێجوانە دەتوانم لەگەڵ ئەوانەی تۆ بیانگۆڕمەوە، بەڵام زیاتر لەو پارەیەی پێمە ناتوانم بتدەمێ.

- ئەو کاتژمێرە چییە پێتە، دەریهێنە و بمدەیە.
ئارتور کاتژمێرە ئاڵتونییە ژنانەکەی دەرهێنا کە زۆر بە جوانی و بە وردی ڕەسم و وێنەی لە سەر کێشرابووەوە و پیتی «ج،پ»یی لە پشتیدا هەڵکەندرابوو کاتژمێرەکە هی دایکی بوو، بەڵام ئێستە ئیتر بایەخێکی نەمابوو.
مەلەوانەکە چاوێکی خێرای پێداخشاند و گوتی: «ها! دیارە دزیوتە! بدە با ببینم!»
ئارتور دەستی کێشاوە دواوە و گوتی: نا، ئەو کاتژمێرەت کاتێ دەدەمێ کە لە سەر پاپۆڕە کە بم، نەوەک ئێستا».
- دەیدەی، دیارە زۆریش بێئەقڵ نیت! سوێند دەخۆم کە ئەمە هەوەڵین کارێکی خراپە کە کردووتە، وانییە؟»
ئەوە بە خۆم ڕەبتی هەیە. ئاە! کێشکچیەکە خەریکە دێت.
هەردووکیان لە پشت پەیکەرەکەوە خۆیان مەلاس دا تا پاساوڵەکە ڕۆیشت، دوایە مەلەوانەکە هەستا سەرپێ، بە ئارتوری گوت وەرە بە شوێنمدا، کە کەوتنە ڕێ وەکوو شێت بە دەم خۆیەوە پێدەکەنی، ئارتور بێدەنگ کەوتە شوێنی.
مەلەوانەکە ئەوی گەڕاندەوە بۆ لای مەیدانە چکۆلە و تاریکەکەی پەنای تەلاری مدیسی، لە قوژبنێکی تاریکدا وێستا، بە ترسێکەوە بە هێواشی گوتی: هەر لێرە بە، ئەگەر بێیتە پێشەوە سەربازەکان دەتبینن».
- دەتهەوێ چ بکەی؟
- بچم جلوبەرگت بۆ بێنم. نامەوێ بەو قۆڵ و باڵەخوێناویەوە بت بەمە ناو پاپۆڕەکەوە.
ئارتور چاوێکی لە قۆڵی کۆتەکەی کرد کە ئاسنی پەنجەرەکە دڕاندبووی وکەمێ خوێنی دەستی بە کۆت و کراسەکەیدا بڵاو ببوەوە. حەتمەن مەلەوانەکە ئەوی بە قاتڵ و پیاو خراپ دەزانی. ئێستا ئیدی بپی گرنگ نەبوو کە خەڵکی سەبارەت بەوی چۆن بیر دەکەنەوە.
مەلەوانەکە دوای قەدەرێک، سەرکەوتوانە بە بوخچەیەک جلوبەرگەوە گەڕاوە.

هێواش گوتی زووبه جلوبەرگەکانت بگۆڕە، دەبێ بگەڕێمەوە. ئەو پیرە ناحاڵیە نیو سەعاتە منی بە قسەوە ڕاگرتبوو»

ئارتور یەکەم جاری نەبوو کە ڕقی لە پۆشینی جلوبەرگێکی ئاوا کۆن بوو، بەڵام بە ناچارییەوە بە قسەی کرد.

هەرچەندە ئەم جلانە قوماشێکی زبر و ناخۆش بوون، بەڵام هەر چاک بوو کە برێک خاوێن بوون کاتێ بەو جلوبەرگە تازانەیەوە بەرەو ڕۆشنایی هەنگاوی هەڵێناوە، مەلەوانەکە سەرخۆشانە و سەرکەوتوانە سەری ڕاوەشاند: «زۆر باشە، ئا لێرەوە وەرە دەنگە دەنگت نەیەت».

ئارتور کە جلەکانی خۆی بەدەستەوە بوو بە شوێن ویدا بە نێو کاناڵە پێچەڵاوپێچ و کۆڵانە تاریک و باریکەکاندا تێپەڕی. ئەم گەڕەکە گەڕەکی سەدە ناوەڕاستەکانی هەژارەکانە، کە خەڵکی لێگهۆرن ناوی «وێنیزی نوێ»یان لە سەر دانابوو، لە هەر گۆشەو کەنارێکدا تەلارێکی کۆنە و ناخۆش بە دوو جۆگەلەی بۆگەن لەم لاولایەوە لە نێوان کۆختە نارێک و حەوشە پیس و پۆخڵەکاندا بە دیار دەکەوت، کە تێدەکۆشا مەزنایەتی کەونارایی و کۆنینەیی خۆی ڕاگرێت زۆر جوانیش دیار بوو کە هەوڵێکی بێئاکام بوو. هەربۆیە لە ڕوخساری خەم دەباری. ئارتور دەیزانی کە برێک لەم کۆڵانانە مەکۆی دز و لات و چەقۆکێشان و قاچاخچیەکان بوون و خەڵکی فەقیر و بێنەواشی لێبوو. مەلەوانەکە لەپەنای پلیکانێکی چکۆلە ڕاوەستا و دوای ئەوەی چاوێکی بە وڵاتدا گێڕا و تا ئارخایەن بێت کە کەسێک ئەوانی نەدیتووە بە سەر پلیکانە بەردینەکاندا چووە خوارێ و بە باریکە ڕێیەکدا ڕۆیشت، لە ژێر پردێکدا، گەمییەکی کۆن و پیسی لێ بوو مەلەوانەکە دوای ئەوەی بە پەلە و بە توندی بە ئارتوری گوت خۆی فڕێ داتە ناو لۆتکەکە و ڕاکشێ خۆشی دوایە لە ناو لۆتکەکەدا دانیشت و دەستی کرد بە سەوڵ لێدان. ئارتور بێ ئەوەی ببزوێ لەناو گەمیەکەدا درێژ بوو، لە ژێر ئەو جلوبەرگانەی کە مەلەوانەکە دای بە سەریدا خۆی شاردەوە، بە دزییەوە لەو ژێرەوە چاوی لە شەقامەکان و ماڵە ئاشناکان دەکرد.

دوای کەمێک لە ژێر پردێکەوە تێپەڕین و بەرەو ئەو کاناڵە ڕۆیشتن کە بەندیخانەی قەڵاکەش لەوێ بوو، شوورەی زۆر گەورە کە لە ژێرەوە پانتر بوون و تا بەرەو سەرێت دەڕوانی باریکتری دەنواند. لە کاناڵەکەوە گوزەرا بوون. لە لای ئەو تەنیا چەند کاتژمێر لەوە پێش ئەم دیوار و قەڵایە چەندە سامناک و ترسناک بوون!، بەڵام ئێستا... هەروا کە لە گەمیەکەدا درێژببوو. سووکێک پێکەنی. مەلەوانەکە ئارام گوتی: بێدەنگ بە و سەریشت بخە ئەو ژێرەوە! گەیشتینە گومروک.»

ئارتور جلوبەرگەکانی بە سەر خۆیدا کێشا، کەمێ لە پێشترەوە، لۆتکەکە ڕاوەستا لەبەردەم پۆلێک دار دا کە پێکەوە بەسترابوونەوە و لە سەر کاناڵەکە دانرابوو ڕێگا باریکەکەی نێوان گوومرک و دیواری قەڵاکەی بەستبوو.

کارمەندێکی خەواڵو کە باوێشکی دەدا بە لەنتەرێکەوە هاتە دەرێ، لە سەر دیواری پەنای ئاوەکە دانەوی: «تکایە هەویەو پسوولەی دەربازبوونتان.»

مەلەوانەکە هەویەکەی دایە دەستی کارمەندەکە . ئارتور کە خەریک بوو لە ژێر جلوبەرگەکاندا بخنکێ بێهەناسە کێشان هەستی ڕاگرت.

کارمەندی گوومرک بە بۆڵە بۆڵێکەوە گوتی: «ئێستا کاتێکی باشە بۆ گەڕانەوە بۆ پاپۆڕەکەت! پێموایە چووی کە خۆش ڕابوێری، لۆتکەکەت چی تێدایە؟»

«ئەو جلە کۆنە هەرزانانەیە کە گیرم کەوتووە» و پەستەکێکی بۆ پشکنین هەڵهێنا.

کارمەندەکە لەنتەرەکەی هێنایە خوارێ و دانەوی چاوەکانی چکۆلە کردەوە تا بتوانی ببینی. «پێموایە شتێکی وانییە، دەتوانی بڕۆی».

داری لەمپەرەکەی هەڵێنا و لۆتکەکە هێواش خزیە ناو ئاوە تاریک و پڕ شەپۆلەکان.

دوای بڕێک ڕۆیشتن، ئارتور دانیشت و جلوبەرگەکانی لابرد. مەلەوانەکە لەبەرخۆیەوە گوتی: «ئەوەتانێ» دوای ئەوەی کەمێ بە بێدەنگی سەوڵی لێدا: «پاڵ بدە بە پشتمەوە و بێدەنگ بە».

خێرا و بە پەلە بەسەر پاپۆڕێکی ڕەش و گەورەدا سەرکەوت و لە ژێر لێویەوە جنێوی بە مرۆڤی بێدەسەلات و دەستەوستان دەدا. هەر ئەو چوست و چالاکیە بوو کە ئیزنی پێدا بوێرانە و خێرا بڕواتە پێشێ. دوای ئەوەی کە بە سلامەتی چوونە سەر پاپۆڕەکە، بە ئەسپایی و بە هێوری بە نێو ئەو هەموو مەکینە جۆراوجۆر و بادەوانەدا تێپەڕین. ئاخرەکەی گەیشتنە سەر ڕۆچنێک، مەلەوانەکە ئارام دەرخۆنەکەی هەڵێنا بە ئارامیەوە گوتی: «بچۆخوارێ، خولەکێکی دیکە دەگەڕێمەوە». ئەنباری پاپۆڕەکە تاریک و شێدار و یەکجار زۆر بۆگەن بوو کە بەراستی لووتی ئازار دەدا، ئارتور لە پێشدا خەریک بوو لە بۆگەنیوی چەرمی خاو و بۆنی ڕۆنی ترشەڵوکدا بخنکێ، هێواش هێواش خۆی کێشایە دواوە. پاشان ژووره ناخۆشە «تاکە کەسیەکەی بەندیخانە»ی وەبیر هاتەوە. لە ناردیوانەکەوە چووە خوارێ و شانی هەڵتەکاند و خۆی ڕازی کرد. وادیارە ژیان لە هەموو جێگایەک وەکوو یەک نییە. ژیان دزێو و قێزەون و ناشیرینە مەکۆی مرۆڤانێکی پەست و بێشەرمە و پڕە لە ڕازونهێنی و کەلێن و قوژبنی تاریک و شاراوە، بەڵام بە ڕواڵەتێکیش ژیان ئاوێکی خرۆشان و ڕەوەکە و ئەو تا دەتوانێ دەبێ کەڵکی پێویستی لێوەرگرێ مەلەوانەکە دوای چەند خولەکێک گەڕاوەو شتێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو کە ئارتور بە هۆی تاریکیەوە باشی نەدیت.

- دەی یاڵڵا، پارە و سەعاتەکەت بێنە!

ئارتور کەڵکی لە تاریکی وەرگرت و توانی بڕێک پارە بە دزیەوە لای خۆێ بگێڕێتەوە.

- دەبێ شتێکم بۆ بێنی، خەریکە لە برسانا بمرم.

- هێناومە، فەرموو.

مەلەوانەکە جەڕەیەک ئاو و بڕێک تۆشەی ڕەق و لەتە گۆشتێکی خوێ کراوی بەرازی دادەستی و گوتی: «دەی بیکەوە گۆشتەکە دەرێنە، سبەینێ وەختایەک کە کارمەندانی گوومرک هاتن بۆ پشکنین دەبێ بچیە ئێرە، نێو ئەم بەرمیلە بەتاڵە، لەوێدا خۆت مەڵاس دەی، وەکوو مشکێک، نابێ لە جێگای خۆت ببزوی تا دەگەینە ناوەراستی زەریا، خۆم دێم پێت دەڵێم کە کەی بێیە

دەرێ. خودام لەو خودایە ئەگەر پاپۆڕوانەکە بتبینێ، ئیتر کارت کۆتا دەبێ! شەڕابەکە خاوێن و پاکە؟ شەوت باش!» دەرخۆنەکەی داناوە. ئارتور «شەڕابە»بە نرخەکەی لە جێگایەکی باشدا دانا و چۆوە ناو بەرمیلەکەوە تا گۆشتی بەرازەکە و بیسکویتەکە بخوات.

پاشان لە سەر ئەو ئەرزە پیسە خۆی کۆ کردەوە و بۆ هەوەڵین جار لە منداڵیەوە تا ئێستا بە بێ دوعا و پاڕانەوە خەوت.

مشکەکان لە تاریکایدا خێراخێرا لە پەنایەوە هەڵدەهاتن. بەڵام نە جیکە جیکی مشکان، نە تەکان و بزووتنی ئەم لاوئەولای پاپۆڕ، نە بۆگەنیوی ڕۆن و ترس و نە دڵتێکەڵهاتنەکەی لە سەفەری زەریا هیچیان نەبوونە لەمپەرێک تا نەتوانێ بخەوێت. ئەم شتانە نەیانتوانی بە قەدەر ئەو خوالە* شکست خواردوو و بێئابڕوانە کە تا دوێنێ خودای ئەو بوون و دەیپەرستن و کاریگەریان لە سەر مێشک و ڕوحی هەبوو و نەیانتوانی پەرێشانی بکەن و هەر بۆیە ئەویش سەرنجێکی وای نەدانێ.

---

* . خوالە: بوت. بت

# بەشی دووهەم

## ١

دوای سێزده ساڵ

له شاری فلوڕانس لـه مـانگی ژوئیـەدا چـەند ئاشـنایەک لـه مـاڵی پرۆفسۆر فابریزی (Fabrizi)دا دیدارێکیان پێکەوه هەبوو، تا بەرنامەیەک داڕێژن بۆ کاره سیاسییەکانی داهاتوو. چەند کەسێکیان ئەندامی بزاڤی مـازینی* بـوون و تاقـه ئامـانجێکی کـه لـه سـەری سـوور بـوون، دامـەزراندنی کۆمـاری دیمـوکراتێکی ئیتالیـای یـەکگرتـوو بـوو. ئـەوانـی تـریش لایـەنگرانـی حکومـەتـی پاشـایی مـەرجدار(مـەشـرووتە) و لیبراڵـەکـان بـوون بـه بیـر و بۆچـوونی جیـاوازەوە. سەرەڕای جیاوازییە فکرییەکانی هەموویان له سـەر شـتێک کۆک و هـاودەنگ بوون، ئەویش ناڕازیبوون و دژایەتیی دایرەی سانسۆڕی توسکان بوو. بەو پێیەو به هیوای ئـەوەی کـه نوێنـەرانـی ڕێکخـراوه جۆراوجۆرەکـان بتـوانن لـه سـەر ئەم کێشەیه کۆک بن دەسپێکی کۆبوونەوەکەیان ڕاگەیاندبوو.

ئێستا تەنیا دوو حەوته بەسەر لێبوردنی گشتیدا تێدەپەڕێ، که پاپی نۆهەم له ڕۆژی دەست بەکاربوونی خۆیدا ڕایگەیاندبوو، بـۆ تاوانبـارانی سیاسـی و لـەو پارێزگایانـەی کـه لـه ژێـر دەسـەڵاتـی پاپـدا بـوو، بـەڵام دوای ئـەو

* Mazzini. . ژوزێف مازینی ( ـ ٥) شۆڕشگێڕێکی به نێوبانگی ئیتالی که دامەزرێنەری بناخه و پێشڕەوی ڕێکخراوی «ئیتالیای لاو» بوو.

ڕاگەیاندراوەش هێشتا ئەو بیرۆکە ئازادیخوازیە لە سەرانسەری ئیتالیادا هەروا گەرم و گوڕ و لە برەودا بوو.

وا وێدەچوو، کە لە توسکانیدا ئەو ڕووداوە سەیرە دزەی کردبێتە ناو کاروباری حکومەتییەوە. فابریزی و ڕێبەرانی دیکەی فلۆرانس باش تێگەیشتبون کە ئێستا باشترین هەلێکە بۆ ڕێکوپێککردنی یاسای ڕۆژنامە و چاپەمەنییە گشتیەکان ڕەخساوە.

بۆ هەوەڵین جار کە لیگا (LeGa)ی درامانووس ئەو مەسەلەیەی بیستبووەوە گوتبووی: «بێگومان تا ئەو کاتەی نەتوانین یاسای ڕاگەیەنە گشتیەکان بگۆڕین. ناتوانین ڕۆژنامە بڵاو کەینەوە و کارێکی زۆر چەتوونە، و ئێمە نابێ تاقە ژمارەیەکیشی لێ بڵاو بکەینەوە، بەڵام ئێستە ڕەنگە بتوانین چەند گۆڤارێک لە ژێر تیغی سانسۆڕ ڕزگار بکەین، تا زووتر و خێرا دەست بە کار بین زووتریش دەتوانین یاسا بگۆڕین».

لیگا ئێستا لە کتێبخانەی فابریزیدا، لە سەر ئەوە کار دەکات کە لەو بەستێنەدا نووسەرە لیبراڵەکان دەبێ چ ڕۆڵێکیان هەبێ. یەکێ لە دانیشتووان کە پارێزەر و ڕاوێژکارێکی پیر بوو و بە دەنگێکی تیژەوە هاتە نێو قسەکان و گوتی: «شک لەوەدانییە کە ئێمە دەبێ ئەو هەلە بە باشی بقۆزینەوە. ئێتر هەلێکی وا باش هەڵناکەوێت بۆ جێبەجێکردنی پڕۆگرامی یاسای ڕیفۆرم، بەڵام شک و گومانم هەیە کە بڵاڤۆکەکان بتوانن ڕۆڵێکی زۆر باش بگێڕن. ئەم بڵاڤۆکانە بە جێگای ئەوەی کە حکومەتمان لەگەڵ بخەن- ڕاست ئەو شتەی کە ئێمە بە شوێنییەوەین- کارێک دەکەن کە حکومەت تووڕە و تۆسن بێ. هەر کاتێکیش کە بەرپرسانی دەسەڵات وا بیربکەنەوە کە ئێمە ئاژاوەگێڕین، ئێتر ناتوانین چاوەڕوانی یارمەتی بین لە لایەن ئەوانەوە.»

- ئەی بە بڕوای تۆ دەبێ چی بکەین؟
- داواکاری و داخوازی.
- بەگڕاندوک؟
- بەڵێ بۆ بەرفراوانتر بوونی مەیدانی ئازادی ڕۆژنامە و بڵاڤۆگەکان.

پیاوێکی ڕەشتاڵە کە لە پەنای پەنجەرەکەوە دانیشتبوو و بە ڕواڵەت لە تێگەیشتوو دەچوو بە پێکەنینەوە سەری وەرگێڕا و گوتی: «پێتان وایە کە داواکاریەکانتان بنووسن و بینێرن هیچ ئاکامێکی باشی دەبێ! من پێموابوو کە ئاکامی کاری ڕێنزی* ئەزموونێکی باش بووە بۆ ئەو کەسانەی کە دەیان-هەوێ کارەکەی ئەو ڕەچاو کەن».

– برای ئازیزم، منیش وەکوو تۆ لەوەی کە نەمانتوانی پێشی ڕادەستکردنەوەی ڕێنزی بگرین زۆر بە داخم، بەڵام ڕاستیەکەی... من پێمخۆش نییە هەستی هیچ کەس خەوشدار کەم.

بەڵام جیا لەم خاڵە کە زۆرتر بە هۆی پەلە پەل و بێ بەرنامەیی بڕێک لە هاوڕێیانەوە بوو، من بە ڕاستی دەبێ نکۆڵی بکەم کە...

پیاوە ڕەشتاڵەکە بە توندی قسەکەی بڕی: «هەر وەکوو (پیمونی)** ەکان هەمیشە بە شک و گومانن، من نازانم لە کوێی ئەم کارەدا توندئاژوویی وسەرەڕۆیی تێدایە؟ مەگەر ئەوەی ئێوە لەو داخوازیانەدا دۆزیبێتانەوە کە ناردوومانن. ڕەنگبێ ئەو کارە لە توسکانی یان پیمون بە توندئاژۆیی دابنرێ، بەڵام ئێمە نابێ ئەم کارە بە تایبەت لە ناپلدا بە توندئاژۆیی دابنێین.

پیاوە پیمونییەکە گوتی: «بە خۆشیەوە دەبێ بڵێم کە توندئاژوویی ناپلی، تایبەتی خەڵکی ناپلە».

پڕوفسۆر هاتە نێو قسەکەیانەوە: «باشە، باش بەسە ئیدێ! ڕەسم و نەریتی ناپلیەکان لە جێی خۆیدا زۆر باشە، سەبارەت بەم داب و نەریتی پیمونییەکانیش هەروا ! بەڵام ئێستا ئێمە لە توسکانی داین و عادەتی خەڵکی توسکانیش وایە، کە زوو سەرنج بدەنە سەر مەسەلە و بابەتەکان. گراسینی بە قازانجی داخوازیەکە دەنگ دەدات و گالیش دژی ئەو ڕادەوەستێ. دوکتور ڕیکاردو بیروڕای تۆ چۆنە؟»

---

* . Renzi ڕێبەری شۆڕشێک بوو دژی دیکتاتۆری تئوکراتی پاپ و ئۆتریشیەکان لەو پارێزگایەی کە پاپی لێ نیشتە جێیە. لە ساڵی ٤٥ گیرا بە دەستی گراندوکی توسکانی ڕادەستی واتیکان کرا.

** . خەڵکی پیمون، شارێکی باشووری ڕۆژئاوای ئیتالیایە

من پێمایە کە ئەو داخوازیە زەرەدێکی نییە و ئەگەر گراسینی دانەیەکیان ئامادە بکا زۆر بە خۆشحاڵیەوە واژوی دەکەم، بەڵام پێم وایە تەنیا داخوازی ناتوانێ کارێکی بەجێی لێ بکەوێتەوە. بۆچی لە هەردووکیان کەڵک وەرنەگرین هەم لە داخوازی و هەمیش لە بڵاوکراوە».

گراسینی وتی: تەنیا لەبەر ئەوەی کە ئەم بڵاوکراوانە بتوانن حکومەت ڕازی بکات کە سەرنجێکی وای نەداتێ و پێی بێبایەخ بێ».

پیاوە ناپلیەکە لە جێگای خۆی هەستا و هات بۆ لای مێزەکە: «حکومەت قەت ئەو کارە ناکا، برای من ئێوە لە هەڵە دان. ڕێککەوتن لەگەڵ حکومەت هیچ قازانجێکی نییە. ئەگەر ئێمە بمانەوێ کارێک بکەین دەبێ خەڵکی ڕاپەڕێنین».

- بە قسە زۆر ئاسانە، دەتەوێ چۆنی دەست پێبکەی؟

- گریمان ئەو پرسیارە لە گالی کراوە! حەتمەن لە پێشدا لە سانسۆڕەوە دەست پێدەکا.

گالی ڕێک و ڕاست بە پانەوە گوتی: «ڕاست بڵێن ئەو کارە ناکەین ئیدی! ئێوە هەمیشە وا فکر دەکەنەوە ئەگەر کەسێک خەڵکی باشوور بێ تەنیا و تەنیا باوەڕی بە چەکی ساردە(چەکی سارد وەک چەقۆ و مووس و...).

- دەی، ئەگەر وابێ تۆ چ پێشنیارێکت هەیە؟ بێدەنگ! کاکە سەرنج بدەن! گالی پێشنیارێکی هەیە.

هەموویان کە ببوونە گرووپی دووسێ نەفەری و خەریکی قسەو باسی جیاجیا بوون بۆ بیستنی پێشنیارەکە لە دەوری مێزەکە کۆ بوونەوە. گالی وەک دژایەتییەکی دۆستانە دەستی هەڵێنا: «نا، برادەرینە، ئەمە پێشنیار نییە، تەنیا ڕادەربڕینێکە. پێموایە لەم هەموو شادی و خۆشیانەیدا کە لەبەر پاپی تازە دەکرێ، خەتەرێکی گەورە لە بۆسەدایە لەوە دەچێ کە خەڵکی لە سەر ئەو باوەڕە بن کە چونکە پاپ ڕێگەیەکی تازەی گرتۆتە بەر و لێبووردنی گشتیی ڕاگەیاندووە، ئێمە دەبێ تەنیا - هەموومان ، هەموو ئیتالیا - خۆمان بخەینە ئامێزی ئەوەوە تا ڕێنوێنیمان بکات بەرەو شاری ئاواتەکانمان. من

نامەوێ لە کاروانی پێدا هەلگوتنی پاپدا لەکەس وەدوا کەوم، لێبوردنی گشتی کارێکی زۆر باش و شیاوە».

گراسینی بە سوکایەتیکردن و سەرکۆنەکردنەوە دەستی پێ کرد: «من دڵنیام کە ئەو حکومەتە بەرز و بەڕێزە!! بەو کارە تەواو کەیف خۆش و ڕازی دەبێ...»

ریکاردو بە نۆبەی خۆی قسەکەی بڕی: «باشە، گراسینی لێگەڕێ با قسەکەی بکا! زۆر سەیرە کە ئێوە هەمیشە وەکوو سەگ و پشیلە بە یەکتریدا هەڵدەپڕژێن و هێشتا نەتانتوانیوە کەمێ خۆتان ڕاگرن. گالی درێژە بە قسەکانت بدە!»

پیاوە ناپلیەکە درێژەی پێدا: «ئەوەی کە دەمویست بیڵێم ئەمەیە کە پاپای پیرۆز و بەڕێز بێگومان بە دڵ پاکییەکی زۆر باشەوە کار دەکات، بەڵام چەندە دەتوانێ لە کاری ڕیفۆرمدا سەرکەوتوو بێ ئەوە شتێکی دیکەیە، هەڵبەتە کەش و هەوای ئێستاش ئارامە. دواکەوتووەکان هەموویان لە سەرانسەری ئیتالیادا تا مانگی دوو مانگ بێدەنگ دەبن تا ئەم دڵەکوتەیەی لێبوردنی گشتی کەمێ کز و کاڵ دەبێتەوە، بەڵام بێشک ئیزنی ئەوە نادەن تا بەبێشەڕ و ئاژاوە دەسەڵاتیان لە چنگ دەرهێنن و ڕای من ئەمەیە کە پێش ئەوەی زستان نیوەی بڕوات، هەموو ژێزوئیتەکان*، گرگوریانەکان** و سانڤدیستەکان*** لەگەڵ گروپەکانیتریش دژی ئێمە خەریکی کەڵکەڵە و سەودایەک دەبن و ئەگەر بتوانن بەرتیل بە هەر کەسێک بدەن، دەرمانداوی دەکەن****».

- زۆر وێدەچێ.

---

* . لقێکی کاتۆلیکن کە لە ساڵی ٥٤٠دا پێکهاتوون، زۆربەی ئەندامانی لە چینی لاوانە و پارێزگاری لە سەروەت و دارایی واتیکان دەکەن.

** . ڕێکخراوێکی کاتۆلیکی کە دژی بیروڕای پاپای نوێن.

*** . لایەنگرانی دەسەڵاتی ڕامیاری پاپا کە بە یارمەتی ئۆتریشیەکان دژی بزوتنەوە نەتەوەییەکان کار دەکەن.

****دەرمانداوکردن: ژەهرخواردکردن

- زۆر چاکە دەی ئێمە دەبێ هەروا چاوەڕوان بین و زۆر لە سەرەخۆیانە داخوازی بنێرین تا لامبروچینی بە خۆی و دەست و پێوەندەکانییەوە گوشار بێنێ بۆ گراندوک تا یەکسەرە ئێمە بخاتە ژێردەستی حکومەتی ژێزوئیتەکانەوە و شایەدیش یاساوڵ و سوارکار بنێرێتە شەقام و شوستەکان بۆ سەرکوتکردنی ئێمە، یان ئەوەی کە دەسپێشخەری بکەین و لەم شێواویە کاتیە کەڵک وەرگرین و گورزی خۆمان بوەشێنین؟

- جارێ پێمان بڵێ دەبێ بە چ شێوەیەک بەرەنگاری بینەوە؟

- دەمویست بڵێم کە دەست بکەین بە کارێکی پڕوپاگەندەیی بەربڵاو و ڕێکوپێک و بەرچاو دژی ژێزوئیتەکان.

- لە ڕاستیدا ڕاگەیاندنی شەڕ لە نێو بڵاو کراوەکاندا؟

- بەڵێ، هەڵسوکەوت و ڕاز و نهێنییەکانیان بدۆزینەوە و دەست نیشانیان کەین و خەڵک ئاگادار کەینەوە تا دژی ئەوان بێنە سەر یەک ئامانج و یەک ڕێباز.

- بەڵام خۆ لێرە ژێزوئیتەکانی لێ نییە تا بمانەوێ ڕیسوایان بکەین.

- لێیی نییە؟ سێ مانگ ڕاوەستە بزانە لەوانە چەندە دێن بۆ ئێرە. ئیدی ئەو کات زۆر درەنگ دەبێ کە بتهەوێ پێشیان بگری.

- بەڵام بە ڕاستی ئەگەر کەسێک بیهەوێ دژی ژێزوئیتەکان شار بخرۆشێنێ، دەبێ زۆر ڕوون و ئاشکرا بدوێ، ئەو کات چۆن دەتوانێ لە ژێر چنگی سانسۆر ڕزگاری بێ؟

- لە دەستی هەڵنایەم بەڵکوو سەرنجێکی نادەمێ. چاو و گوێی خۆمی لێ نەبان دەکەم.

- بڵاوکراوەکان بێ نێو چاپ دەکەی؟ زۆر چاکە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەمووکمان ئەوەندەمان شەونامە دیتووە تا بزانین کە....

- مەبەستم ئەوە نییە، من بڵاڤۆکەکان ئاشکرا چاپ دەکەم، ناونیشانیشمانی لێ دەنووسم و دەشنووسم ئەگەر دەتوانن وەرن بمانگرن.

گراسینی گوڕاندی: «ئەم پێشنیارە کارێکی شێتانەیە، یانی ئەوەی کە مرۆڤ تەواو لێبڕاوە و خۆی دەخاتە داوی شێرەوە».

گالی بە تووڕەیەوە قسەکەی بڕی: «ترست نەبێ، خۆ ئێمە نامانەوێ تۆ لەبەر بڵاوکراوەکانی ئێمە بچیتە زیندان».

ریکاردو گوتی: «گالی، زمانت گرێ دە، باسی ترس نییە، ئێمەش بە قەدەر تۆ ئامادەین بچینە بەندیخانە ئەگەر قازانجێکی هەبێ، بەڵام لەخۆڕا و بۆ هیچ خۆت بخەیتە بازنەی ئاگرەوە کارێکی منداڵانەیە. من بەش بە حاڵی خۆم داواکاری و پێشنیارێکم هەیە بۆ باشتربوونی ئەو بیرۆکەیە».

- باشە پێشنیارەکەت چییە؟

- بە بڕوای من، بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ژێزوئیتەکان دەبێ ڕێگا چارەیەکی گونجاو بدۆزینەوە، وابێ کە ڕووبەڕووی دایرەی سانسۆڕیش نەبینەوە.

- من تێ ناگەم کە تۆ دەتهەوێ چ بکەی؟

- من پێموایە، ئینسان ئەو شتەی کە دەیهەوێ بیڵێ، وەها لە پەردەدا بیدرکێنێ کە...

- کە دایرەی سانسۆڕ پێی نەزانێ؟ دوای ئەوە دەتهەوێ کە گشت هەزاران و بەش مەینەتان و پیشەسازە نەدارەکان لەو نەزانی و دواکەوتوییەی خۆیاندا تێیبگەن! پێموایە جێبەجێ نابێ.

پرۆفسۆر ڕووی کردە ئەو پیاوە چوار شانەیە کە ڕیشێکی خەنەیی پڕی هەبوو لە پەنایدا دانیشتبوو و پرسی: «مارتینی ڕای تۆ چییە؟»

- تا ئەو کاتەی زۆرتر لە ڕاستیەکان ئاگادار نەبم و ئەستوندەگی فکری خۆمیان لە سەر دانەبەستم ڕای خۆم دەرنابڕم، کێشەکە لەوە دایە تا ئێمە ئەزمونی خۆمان بخەینە گەڕ تا بزانین چ ئاکامێکی لێ دەکەوێتەوە.

- دەی ئەی تۆ دەڵێی چی ساکووتی؟

- من پێمخۆشە بزانم سینیورا بوولا دەڵێ چی. هەمیشە بیروڕای ئەو بە نرخ بووە، هەموویان ڕوویان بەرەو تاقە ژنی کۆڕەکە وەرگێڕا کە بێدەنگ لە سەر کورسیەکە دانیشتبوو چەناگەی نابووە سەر دەستی و گوێی دابوویە ئەو باسە. چاوەکانی زۆر ڕەش و بیرمەندانە بوو، بەڵام ئێستا کە چاوەکانی هەڵێنا گەشاوەتر و ڕوونتر دیار بوون.

- بە داخەوە دژی بیروڕای هەمووتانم.

ریکاردو گوتی: «هەمیشە بەرهەڵستکار بووی، لەوەش خراپتر ئەوەکە هەمیشە قسەی تۆ پەسند و ڕاستتر بووە».

ـ بە بڕوای من، ئەوە زۆر ڕاستە کە ئێمە دەبێ بە شێوەیەک دژی ژێزوئیتەکان ڕاوەستین ئەگەر بەم جۆرە نەمانتوانی، دەبێ شێوەیەکی دیکە ڕەچاو کەین، بەڵام بەربەرەکانێ و شەڕی دەستەو یەخە، قازانجێکی کەم و هەڵاتنیش چەقۆیەکی کولە، بەڵام سەبارەت بە داخوازیش دەبێ بڵێم، وەک سەرگەرمی و یارییەکی منداڵانە وایە.

گراسینی بە قەیافەیەکی نێرانەوە هاتە نێو قسەکانییەوە گوتی: «سینیورا، دڵنیام کە پێشنیاری... پیاوکوشتن ناکەی؟»

مارتینی دەستێکی بە سمێڵە ئەستوورەکەیدا هێنا و گالیش ئاشکرا پێکەنی. تەنانەت ئەو ژنە لاوەش نەیتوانی بزەی نەیەتە سەر لێو. بوولا گوتی: «بڕواتان هەبێ ئەگەر من ئەوەندە بێڕەحم بایەم کە فکرم لەو شتانە بکردایەتەوە ئەونە منداڵ نەبووم، کە بە زمان و بە قسە بیدرکێنم، بەڵام جەرگبڕترین چەکێک کە من دەیناسم داشۆرینە (هەجو)، ئەگەر ئێوە بتوانن تاقە یەک جار ژێزوئیتەکان لە پێش چاوی خەڵک سووک کەن و خەڵکی ڕازی و حاڵی بن لەوەی کە بە ژێزوئیتەکان و بە بیروداخوازی و بانگەشەکانیان پێبکەنن بە بێ ئەوەی تنوکێ خوێن بڕژێ ئەوانتان شکست داوە».

فابریزی وتی: ئالێرەدا ڕاست دەکەی، بەڵام نازانم چۆن دەتهەوێ ئەو کارە بکەی».

مارتینی پرسی: «بۆ ناتوانین بیکەین؟ بڵاوکراوەیەکي( برگەیی_ هەجوی) زۆر باشتر لە بڵاوکراوەکانی دیکە دەتوانێ بە سەر کێشەی سانسۆڕدا سەرکەوێ . ئەگەریش قەرارە قسەکە پێچراوە و بە ڕەمز و ڕازەوە بگوترێ باشتر وایە کە بە شۆخی و قسەی نەستەق و داشۆرینەوە بێ چونکە خوێنەرێکی مامناوەندی باشتر لەو جۆرە نووسراوەیە دەگا تا لە نامیلکە یان وتارێکی زانستی و ئابووری».

ـ سینیورا،ڕاتان وایە کە یان بلاڤۆکیکی برگەیی چاپ کەین یان هەوڵ بدەین بۆ وەگەڕ خستنی ڕۆژنامەیکی فۆکاهی(ژووریی)؟ دڵنیام کە دایرەی سانسوڕ ئیزنی بڵاوکردنەوەیەکی تەوس و نقورچک نادات.

ـ ئەوانەی گوتتان هیچیان مەبەستی من نین. من دەڵێم ئەگەر بڕێک بڵاوکراوەی چکۆلە و برگەیی، بە شێعر یان بە پەخشان بێ و بە قیمەتێکی کەم بفرۆشترێ ویان بە خۆڕایی لە شەقامەکاندا بڵاو بێتەوە کاریگەریي زۆر باشي دەبێ. لە پەنایەوە ئەگەر بمانتوانیایە وێنەگەرێکی پەنجە ڕەنگین بدۆزینەوە کە لە ڕوحی بابەتەکە حاڵی بێ و بیانکێشێتەوە زۆر باش دەبوو.

ـ ئەمە ڕایەکی زۆر بە جێیە. تەنیا بەو شەرتەی کە کەسێک بتوانێ جێبەجێی کات، بەڵام ئەگەر قەراربێ ئەو کارە بکرێ دەبێ تەواو سوور بین لە سەر جێبەجێکردنەکەی، ئێمە پێویستیمان بە هەجونووسێکی باش و بەرچاو هەیە، دەی دەبێ لە کوێ پەیدای کەین؟»

لێگا گوتی: «دەزانین کە زۆربەمان لە بوارەکانی دیکەدا دەنووسین. سەرەڕای ئەوەی کە ڕێزێکی تایبەتیم بۆ ئەو کۆڕە هەیە، بە داخەوە هەوڵی هەمووومان بۆ نووسینی داشۆرین، وەک هەوڵێکی بێئاکام و سەیر وایە بۆ سەما کردنێکی تارنتێلا*».

ـ من قەت پێشنیاری ئەوە ناکەم کە هەمووومان بەرەو کارێک بڕۆین کە بۆمان جێبەجێ نابێ، من دەڵێم ئێمە دەبێ هەجونووسێکی بە بڕشت و خامەرەنگین پەیدا کەین .

ـ حەتمەن لەو ئیتالیایەدا کەسێکی وا هەرهەیە. دوای ئەوە پێشنیاری ئەوەم هەیە کە بۆ ئەو کارە پارەی پێویست کۆبکرێتەوە. هەڵبەتە دەبێ زانیاریی تەواومان لە سەر ئەو کەسایەتیە هەبێ و تەواو ئەرخەیان بین کە لە سەر ئەو بابەت و بابەتانەی ئێمە کار دەکات.

ـ بەڵام ئەو کەسە لە کوێ پەیدا دەکەیت؟ من دەتوانم هەمووی ئەو کەسانەی کە بە جۆرێک هەجونووسن و لەو بوارەدا هونەرێکی ڕاستەقینەیان هەیە بیانبژێرم کە بە هەموویانەوە ناگەنە پێنجشەش نەفەر.

---

* . Tarentella: سەمایەکی دووکەسی و زۆر بە پەلەی ئیتالیایە

دوای ئەوە دەستمان بە هیچیان ڕاناگا تا کارەکە مسۆگەرکەن، گیوستی ئەو شتە قەبووڵ ناکات، بەڕاستی کاری زۆرە و سەرقاڵە. یەکدوو کەسی باشیش لە لیمباردي هەن، بەڵام تەنیا بە شێوەی زاراوەی میلانی شت دەنووسن...

گراسینی وتی: «دوای ئەوە، بە شێوەیەکی زۆر باشتر دەتوانین خەڵکی توسکانی لەگەڵ خۆمان ڕێک بخەین. ئەگەر قەرار وابایە کە ئێمە کێشەی هەندێ ژیار و ئازادی ئایین بە شۆخی دابنێین، دڵنیام کە لانیکەم، پێویستیمان بە پسپۆڕێکی سیاسی دەبوو. فلۆرانس نەوەکوو لەندەنە کە ناوەندي کارگەی پیشەسازی و کۆ کردنەوەی سەروەت و سامانە و نەوەکوو پاریسیشە کە جێگای خۆش گوزەرانی و ڕابواردنێکی بێ‌مانایە. فلۆرانس شارێکە کە مێژوویەکی گەورە و گرانی هەیە...»

ژنەکە بە بزەیەکەوە قسەکەی بڕی: «ئاتێنیش وابوو، بەڵام سەرەڕای گەورەیەکەی ، پێشکەوتنەکەی کیسەڵ ئاسا بوو... «گێدفلا»یەکی[1] پێویست بوو تا لەخەو ڕاپەڕێنێ...»

ریکاردو دەستیدا بەسەر مێزەکەدا و گوتی: سەیرە ئێمە هیچمان مێشەکەرانەمان هەر لە بیر نەبوو هەر ئەو پیاوەیە!»

ـ ئەو پیاوە کێیە؟

ـ مێشەکەرانە ـ فلیس ڕیوارزە ـ لە بیرت نەماوە؟ کەسێکە لە گرووپی موراتوری کە سێ ساڵ لەوە پێشەوە لە کوێستانەکانی ئاپێنینەوە هاتنەخوارێ.

ـ تۆ ئەو گرووپەت دەناسی، وا نییە؟ لەبیرمە کە لەگەڵ ئەوان سەفەرت کرد بۆ پاریس.

ـ بەڵێ، بۆ بەڕێکردنی ڕیوارز کە دەچوو بۆ مارتی و منیش تا لیگهۆڕن لەگەڵیا چووم. پێی‌خۆش نەبوو لە توسکانی بمێنێ، دەیگوت دوای شکستی شۆڕشەکە تاقە کارێکی کە دەبێ لەوێ بیکەی پێکەنینە و هیچی‌تر. بۆیە باشتر وایە کە بچم بۆ پاریس. ئەو بێ‌گومان لەگەڵ سینیورا گراسینی، هاوبیروڕا بوو کە توسکانی جێگایێکی باش نییە بۆ شادی و پێکەنین.

---

1 لە زمانی ئینگلیزیدا بە مانای مێشەکەرانەیە

- ئەگەر ئێستا لە ئیتالیادا دەرفەتی کارێک ڕەخساوە با بانگی کەینەوە، دڵنیام کە بە قسەمان دەکات و دەگەڕێتەوە.
- نێوی چ بوو؟
- ڕیوارز، پێموایە خەڵکی برازیلە، ئەوندە دەزانم کە لەوێ ژیاوە، تا ئێستە کەسم نەدیوە هێندەی ئەو وشیار و بە توانا و بەهرەمەند بێ، خودا دەزانێ ئەو حەوتەی کە لە لێگهۆڕن بووین هیچ شتێکمان نەبوو بۆ خۆخافڵاندن، دیتنی لامبێرتینی داماو بەس بوو بۆ تێکشکاندنی دڵی هەر ئینسانێک، بەڵام کاتێ ڕیوارز لە لامان بوو نەماندەتوانی پێنەکەنین. یەک پشوو قسەی خۆشی دەکرد، زامێکی گەورەی جێگای شمشێریش لە سەر گۆنای زەق دیار بوو، من ئەو برینەم لە بیرە کە تەقەڵیان لێدەدا، مرۆڤێکی سەیرە، بەڵام من لە سەر ئەو بڕوایەم کە ئەو بەو قسەخۆشانەیەوە پاڵپشتێکی گەورە بوو بۆ ئەو لاوە هەژارانە.
- ئەو هەر ئەو کەسەیە کە لە ڕۆژنامەکانی فەڕەنسە بە ناوی (letaon)* وتارگەلێکی ڕامیاری بڕگەیی دەنووسێ؟
- بەڵێ، زۆربەی وتارە کورتەکان و پەڕاوێزە نەستەق و ژووریییەکانی دەنووسی، بە هۆی تووندوتیژی وتارەکانی، قاچاخچیەکانی کوێستانەکانی ئاپنێن نێوی مێشەکەرانەیان لە سەر دانا، ئەویش هەر بەو نێوە وتارەکانی خۆی ئیمزا کرد.
گراسینی وەک جاران هێور و لە سەرەخۆ هاتە نێو وتوێژەکەوە: «من زانیارییەکم لە سەر ئەم کابرایە هەیە، بەڵام ناتوانم بشڵێم کە ئەوەی بیستوومە دەبێتە بەها و بایەخێکی زۆرتر بۆ کەسایەتیی ئەو، شک لەوەدا نییە کە بە ڕواڵەت ئەو هۆش و ئاوەزێکی تیژی هەیە، بەڵام بە بڕوای من توانایەکانی ئەویان زۆر نرخاندووە و پێیانەوە زیاد کردووە، بەشکەم بوێر و نەترسیش بێ. ڕاستە کە لە پاریس و ڤیەندا ناو و ناوبانگی هەیە، بەڵام واش نییە کە بە دوور لە کەموکووڕی بێت ، وا وێدەچێ کە ئەو.... ئەو پیاوێکە بە ژیانێکی پڕ هەورازونشێو و ڕابردوویەکی نادیارەوە، دەڵێن دەستەیDuprez

---

* . لە زمانی فەرانسە بە مانای مێشەکەرانەیە

به هۆی ئینسان‌دۆستیه‌وه له حاڵێکدا که ژیان و گوزه‌رانێکی زور خراپ و پیس و پوخڵو هه‌ژارانه‌ی بووه له بیابانی گه‌رم و تاقه‌تپڕوکێنی ئه‌مریکای باشووردا ڕزگاریان کردووه. من پێم‌وایه ئه‌و قه‌د به به‌شێوه‌یێکی دڵخوازانه ددانی به ڕابردووی خۆیدا نه‌هێناوه که چۆن گرفتاری ئه‌و وه‌زعه بووه ، به‌ڵام سه‌باره‌ت به شۆڕشی کوێستانه‌کانی ئاپێن، ده‌ترسم که‌سانێکی جۆراوجۆر که له‌وێدا کاری ناڕه‌واو نابه‌جێیان کردووه له دوو تویێی ڕاز و نهێنیدا نه‌مابێ، ئه‌وه ئاشکرایه که ئه‌و پیاوانه‌ی که له بلونیا له دار دران له ڕاستیدا هکۆمه‌ڵێک پیاوکوژی ئاسایی بوون نه‌ک شۆڕشگێڕ. ناتوانی هه‌روا سووک و ئاسان تایبه‌تمه‌ندیی زۆرێک له‌و که‌سانه‌ی که هه‌ڵاتوون به‌یان بکه‌ی. بێ‌گومان بڕێک له به‌شداربووانی ئه‌و شۆڕشه ئاکار و کرداری باش و شیاویان هه‌بووه...»

ریکاردو به تووڕه‌ییه‌وه قسه‌کانی بڕی و گوتی: «چه‌ند که‌سێک له‌وان دۆستانی زۆر نزیکی به‌شێک له دانیشتوانی ئه‌م کۆڕه بوون! گراسینی زۆر باشه، ئه‌گه‌ر ئینسان سه‌ختگیر و دێرپه‌سند بێ، به‌ڵام ئه‌و پیاو کوژه ئاساییانه له ڕێگای بڕوا و ئامانجیاندا گیانیان به‌خت کردووه. کارێکی زۆر گه‌وره و به نرخ که من و تۆ تا ئێستا نه‌مانتوانیوه بیکه‌ین».

گالی گوتی: «جارێکی دیکه کاتێ که خه‌ڵکی سه‌باره‌ت به پاریس پاشاگه‌ردانییه‌کی گلاو و پیسیان بۆ باس کردی، له لایه‌ن منه‌وه ده‌توانی پێیان بڵێی که سه‌باره‌ت به ده‌سته‌ی دوپرێ له هه‌ڵه‌دان، من، بۆ خۆم مادتێل جێگری دوپرێ ده‌ناسم، باسه‌که‌م ته‌واو له زمانی ئه‌وه‌وه بیستووه یانی ئه‌وان ڕیوارزیان له به‌دبه‌ختی و سه‌رلێشێواویدا دۆزیوه‌ته‌وه ڕاست و ڕێک وایه. ئه‌و سه‌باره‌ت به ئارژانتین له شه‌ڕدا به دیل گیراو دوایی هه‌ڵات . به ده‌مامک لێدانی جۆراوجۆر له‌م‌لاولای وڵاتدا ئاواره بوو، تێده‌کۆشا تا بگه‌ڕێته‌وه بۆ بوینێس‌ئایرێس.

به‌ڵام ئه‌گه‌ر به چیرۆکێکی مرۆڤدۆستانه‌ی تێبگه‌ین درۆیه‌کی ته‌واوه، دیلمانجی شانده‌که نه‌خۆش بووه و ناچار بوو بگه‌ڕێته‌وه. فه‌ره‌نسیه‌کان هیچیان نه‌یانده‌توانی به زمانی خۆماڵی و ناوچه‌یی ئه‌وێ قسه بکه‌ن، هه‌ر بۆیه پێشنیاری ئه‌و ئه‌رکه‌یان به‌و کرد و ئه‌ویش سێ ساڵی ته‌واو له‌گه‌ڵ ئه‌و

شاندەدا بە شوێن دۆزینەوەی پەلی چۆمی ئامازۆندا دەگەڕا. مادتێل ڕای وابوو ئەگەر ڕیوارز نەبوایە ئەوان قەت نەیان دەتوانی ئەو ئەرک و ئۆپراسیونە بگەینە ئەنجام».

فابریزی گوتی: «هەرچی دەبێ با ببێ، بەڵام کەسێکی کە بتوانێ ئاوا کاریگەرێتیەکی قورس و قایمی هەبێ لە سەر مادتێل و دووپەرە کە هەردووکیان دوو سەربازی کۆن و بەئەزموون بوون وەک دیاریشە لەو کارەشیدا سەرکەوتوو بووە دەبێ پیاوێکی لەگەڵدەرهاتوو و باش بێ. سینیورا تۆ دەڵێی چی؟»

ـ لەم بارەیەوە من هیچ نازانم، ئەو کاتەی کە ئاوارەکان لە توسکانییەوە تێدەپەڕین من لە بەریتانیا بووم، بەڵام بە بڕوای من ئەگەر ئەو کەسانە بە درێژایی سێ ساڵ لە ولاتێکی نامۆ لە کارێکی گرووپی گەورەدا هاوڕێی ئەو بوون و هەروەها هاوڕێیانێکی کە لە شۆڕشێکدا هاوسەنگەری بوون و سەبارەت بە ئەو بیروڕایەکی باشیان هەیە، ئەوە خۆی بەڵگەیەکی پتەو و حاشاهەڵنەگرە بۆ پووچەڵ کردنەوەی زۆربەی زۆری ئەو پڕوپاگەند و پاشاگەردانیانەی کە لە سەر شەقام دروست دەکرێن.

ریکاردو گوتی: «هیچ شک و گومانێ لە مەڕ قسەی هاوڕێکانی دانییە کە سەبارەت بە ئەو دەیڵێن. لە موراتوری و زامبکاریەوە بگرە هەتا چیانشینانی توورە و تۆسن هەموویان ئامادە بوون گیان بەختکەری ئەوبن، دوای ئەوە ئەو دۆستی نزیکی ئارسینییە. لە لایەکیترەوە ڕاستە کە لە پاریسدا سەبارەت بە وی زۆر قسەی بێ سەرەوبەرە لە پشت سەری وێستاون، بەڵام ئەگەر کەسێ دەیهەوێ کەس لە خۆی نەکاتە دوژمن، دەبێ داشۆرینی سیاسی نەنووسێ».

لێگا وەک بەرهەڵستکارێک گوتی : « ئەو کاتەی کە ئاوارەکان لێرەبوون پێموایە دەبێ ئەوم دیتبێ، هەرچەندە تەواو دڵنیاش نیم. ئەرێ پیاوێکی پشتدەرپەڕیو و شەل و ئا لەو جۆرە نەبوو؟»

پرۆفسۆر چەکمەجەی مێزی نووسینەکەی کردەوە و لەنێو نامە گەلێکی زۆردا بە شوێن شتێکدا دەگەڕا: «پێموایە وەرەقەی پێناسەی ئەو لێرەدا بێ

که پۆلیس نووسیبووی و بڵاوی کردبووەوە لە بیرتانە کاتێکی کە ئەوان هەڵاتن و لە کوێستانەکاندا خۆیان حەشار دا، تایبەتمەندی پێناسەی هەموویانیان لە هەموو جێگایەک بڵاو کردەوە و کاردینال ـ نێوی ئەو گڵاوە چییە؟ ـ سینیولاش پارەیێکی بە نرخی دانابوو بۆ گرتنی ئەوان».

ـ دوایی، سەبارەت بە ڕیوارز و هەویەی پێناسەکەی داستانێکی سەیر کەوتبووە سەر زاران. ئەو جلوبەرگێکی کۆنی سەربازێک لە بەردەکا و وەک تفەنگچییەکی بریندار کە لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشانیدا بریندار بووە و بە شوێن پەل و گرووپی خۆیدا دەگەڕێ و لە وڵاتدا دەکەوێتە ڕێ، بۆخۆی پەلێکی گەشتی سینیولا ڕادەگرێ تا سواری بکەن، تەواو ڕۆژێک لە ئەرابەیەکدا لەگەڵ ئەوان دەبێ. بەسەرهاتێکی دڵتەزێنیان بۆ باس دەکا لە مەڕ چۆنییەتی بە دیل گیرانی بە دەستی شۆڕشگێڕەکان، کە دوایە دەیبێرن بۆ حەشارگە کوێستانییەکان و ئەشکەنجەیەکی زۆر کە بەسەری دێنن. گەشتیارەکان هەویەی پێناسەی خۆیانیان پیشان دەدەن ئەویش بابەتی جۆراوجۆر و سەرسووڕ هێنەریان بۆ باس دەکا لە سەر کەسایەتی دێو و درنجێک بە ناوی مێشەکەرانە. دوایی شەوێ کە هەموو دەخەون، سەتڵێکی پڕ لە ئاو بەسەر باڕوتەکانیاندا دەکات و بە گیرفانی پڕ لە خواردەمەنی و فیشەکەوە هەڵدێ...

فابریزی قسەکەی خۆی بڕی و گوتی: «نامەکەم دۆزیەوە، فلیس ڕیوارز، ناو و ناوبانگ: مێشەکەرانە. تەمەن، دەوروبەری ، شوێنی لەدایک بوون و ئەسڵ و نەسەب: نادیارە، ڕەنگە ئامریکای باشوور، پیشە: ڕۆژنامەنووس، باڵا: خڕیلانە، قژی سەری: ڕەش. ڕدێن: ڕەش. ڕەشتاڵە. چاو: شین. هەنییە: کراوە و چوارگۆشە. لووت، زار، چەناگە... بەڵێ و دوایە پێناسەی تایبەتی: لاقی ڕاست شەل، باسکی چەپ خوار. دەستی چەپی دوو قامکی نییە. برینی جێگا شمشێرێکی تازە لە سەر دەموچاوی. لە کاتی قسەکردندا زمانی دەگرێ. جارێکیتر سەرنجێکی داوە: تیرئەنگێوێکی زۆر کارامەیە ـ کاتی دەسگیرکردنی دەبێ زۆر وشیار بن».

- زۆر سەیرە ئا بەو ڕیزە پێناسە سامناکەوە بتوانێ ئەو پەلە گەشتیارە فریو بدەی.

- هەڵبەتە بوێری و نەترسانی ئەو بوو، کە توانیی سەرکەوتوو بێ، ئەگەر لە پڕێکدا لێی بە شک کەوتبایەن ئیتر کاری تەواو بوو، بەڵام کاتی پێویست خۆی ئەوەندە فەقیر و بەستەزمان نیشان دەدات کە دەبێتە هۆی سەرکەوتنی لە هەر کارێکدا - دەی زۆر چاکە کاکینە ڕاتان سەبارەت بەم پێشنیارە چییە؟ وا دیارە برێک لە دانیشتوانی ئەم کۆڕە ڕیوارز بە باشی دەناسن، پێتان باشە پێی ڕابگەیەنین و بڵێین پێمان خۆشە بێت بۆ ئێرە و هاوکاریمان لەگەڵ بکات و بە گشتی دانووستانێکی لەگەڵ بکەین؟

فابریزی گوتی: «بە ڕای من دەبێ لە پێشدا مەسەلەکەی پێ ڕابگەیەنێن. تەنیا لەبەر ئەوەی با بزانین ئەو کارەی پێیخۆشە یان نا».

- ئێوەدڵنیابن هەر شتێکی پێوەندی بە بەربەرەکانی لەگەڵ ژێزوئیتەکانەوە بێ ئەو زۆری پێخۆشە ئەو بێبەزەییترین کەسێکی دژە ئایینە کە تا ئێستا مـن دیتوومـە، ڕاستیەکـەی ئـەوەیـە کـە ئـەو لـە سـەر ئـەو کێشەیـە زۆر دەمارگرژە.

- ڕیکاردو، دەی بۆی دەنووسی؟

- بە دڵنیاییەوە، با بزانم، ئێستا لە کۆیە؟ پێموایە لە سوئیسرایە. ئەو لە جێگایەک ئۆقرە ناگرێ، بەردەوام هەمیشە لە گەڕانە، بەڵام کێشەی بڵاو کراوەکە...

هەموویان کەوتنە ئاخافتنێکی مەنگ و درێژخایەن، ئاخرەکەی، کاتێکی کە بڵاوەیان دەکرد مارتینی چووە لای ئافرەتە لاوەکەوە و گوتی: «جما، هەتا لای ماڵێ بەڕێت دەکەمەوە».

- زۆرسوپاس، پێمخۆش بوو سەبارەت بە ئیشێک قسەت لەگەڵ بکەم.

مارتینی هێواش پرسی: «لە ناونیشانەکاندا هەڵەیەکیان تێدایە؟

- گرنگ نییە، بەڵام پێم باشە کاتی ئەوە هاتووە کە گۆڕانکارییەکیان تێیدا بدەین. ئەم حەوتەیە لە پۆستدا دەستیان بەسەردوو نامەدا گرتووە، هەر دووکیشیان زۆر بێبایەخ بوون ڕەنگە شتتەێکش ڕووی دابێ، بەڵام ئێمە تا

ئەو جێگایەی دەتوانین نابێ خۆمان تووشی گرفتاری بکەین. هەر کاتێک پۆلیس لە نێو نیشانێکی ئێمە بەشک بێ خێرا دەبێ بیگۆڕین.

- بەیانی دێم بۆ لات، ئەمشەو بە تەما نیم قسەت لەگەڵ بکەم، پێموایە ماندووی.

- نا ماندوو نیم.

- دەی یانی دیسان نارەحەت بووی.

- نا هۆیەکی تایبەتی نییە.

## ٢

- کێتی خانم لەماڵێیە؟

- بەڵێ ئاغا، جلوبەرگەکانی لەبەر دەکا. ئەگەریش بچی بۆ ژووری میوان، ئەویش قەدەرێکی دیکە دێتە خوارێ.

کێتــی وەک کچێکــی دیــونشــایری* ڕووگــەش و دلۆڤــان بــەخێرهــاتنی میوانەکەی کرد و بردیە ژوورەوە. مارتینی خۆشدەویست، ئەو حەتمەن وەک بیانییەک بە زمانی بەریتانیای دەدوا و ئاخافتنێکی ژیرانە و سەنگینی هەبوو، کاتێ خانم ماندوو بوو وەک برێک لە میوانەکان قەت گوشاری بۆ نەهێنا بۆ باس و لێکدانەوەی ڕامیاری، ئەویش تا کاتژمێر یەکی شەو. دوای ئەوە خانم کاتێ منداڵەکەی مرد و مێردەکەشی لە سەرەمەرگدا بوو، بۆ یارمەتی و سوکنایی ئەو هاتبوو بۆ دیونشایر، لەوە بەدوا کێتی ئەم پیاوە زەبەلاح و نەدۆێن و دەستەوستانەی - کە ڕاست وەک ئەو پشیلە ڕەش و تەمەڵەی کە ئێستا لە سەر ئەژنۆی دانیشتووە - خۆش دەویست و وەکوو خێزانێکی ماڵەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد.

قەت پێی لە سەر کلکی دانەدەنا، دووکەڵی توتنی ئاوقای چاوی نەدەکرد و قەتیش وەک مرۆڤێکی زاڵم لێی نەدەدا و بە گژیدا نەدەچوو، ئەویش هەر کەجێگا یان ئامێزێکی گەرم و نەرمی گیر کەوتبایە ئارام و بێقرە و هەراو بە بێدەنگی وەردەکەوت، قەتیش لە بیری نەدەچووەوە کاتێک کە ئینسانەکان لە سەر مێزی نانخواردن ماسی دەخۆن نابێ چاو لە دەمیان کات چونکە بۆ پشیلەیەک زۆر ناخۆش و بێلەزەتە . دۆستایەتیان زۆر کۆن بوو، ڕۆژێکیان

---

* . ئەیالەتێکە لە ئینگلیز

که هەستا و چاوی کردەوە ـ ئەو کات شیرەخۆرە بوو ـ خاوەنماڵ بە هۆی نەخۆشییەکی توندەوە نەیدەتوانی پێیرابگا هەر لەبەر ئەوە و بە هۆی سەرنجی مارتینەوە خستیانە ناو سندووقەکەوە و لە بەریتانیاوە بۆ ئێرەیان نارد. لەوە بەم لاوە جما بە هۆی ئەزموونی خۆی لێی حاڵی بوو کە دۆستایەتی لەگەڵ ئەم خەپەتۆڵە خرپنەدا کات و ساتی بۆ نییە .

جما هاتە ژووری و گوتی: «وابە ئاسوودەیی لە گەڵ ئەو پشیلەیە دانیشتوی دەڵێی مێشێکیشت میوان نییە، ئینسان وا دەزانی بە تەمای کە ئەمشەو لێرە بمێنییەوە».

مارتینی بە ئەسپایی پشیلەکەی لە سەر لاقی هەڵگرت و گوتی: «ئەگەر ئیستیکانێکم چایی پێبدەی زۆرت سوپاس دەکەم. ڕەنگە ئەوی قەرەباڵغ بێ، شەویش گراسینی خواردنێکی باشمان پێنادا، لە ماڵە دەوڵەمەندەکاندا شەوانە قەت خواردەمەنیی باش ناخورێ».

جما پێکەنی وگوتی: «باشە ئیدی! تۆش لە گالی زمان درێژتری! گراسینی بێچارە دەبێ ئەوەندە تاوانی گوناحەکانی خۆی بدات کە وەختێکی نامێنی تا لە ماڵیدا کەم و کووڕی نێو ماڵێ پڕ کاتەوە، بەڵام چایەکە کەمێکی دیکە ساز دەبێ، کێتی بە شێوەی دیونشایر کەمێک کێکی بۆ تۆ ساز کردوە».

ـ کێتی مرۆڤێکی دلۆڤانە وا نییە ؟ هەڵبەتە تۆش هەروای بە تایبەت بەو جلوبەرگە جوانانەوە کە لەبەرت کردوە، دەترسام لە بیرت بچێتەوە.

ـ قەولم پێدابووی کە لەبەریان کەم، هەرچەندە برێک ئەستوورە ئەویش بۆ شەوێکی ئاوا گەرم.

ـ هەوای فیزول زۆر فێنکترە، هیچ جلوبەرگێک وەک کشمیری لە تۆ ناکاڵێتەوە، ئەو گوڵانەشم بۆ هێناوی، تا لە سەر یەخەتی دەی.

ـ لەو گوڵە هێشوەدارە جوانەکانە، زۆرم پێجوانە!، بەڵام باشتر وایە بیانخەینە نێو ئاوەوە ئاخر پێم خۆشنییە گوڵ بدەم لە جلوبەرگەکەم.

ـ ئەمەش بیرێکی دواکەوتوانەی تۆیە.

ـ نا، وانییە، تەنیا لەبەر ئەوەی ئەگەر بەدرێژایی شەو بە سینگی کەسێکی خەمۆکی وەک منەوە بێ دەژاکێن.

ـ بە داخەوە هەمووماﻥ ئەم شەو دادەهێزرێین. ئەم کۆڕە زۆر ناخۆشە و گێژ و ماندوومان دەکات.
بۆ؟
ـ لە لایەکەوە لەبەر ئەوەی، گراسینی هەر کارێک بکا وەک خۆی بێتام و بێلەزەتی دەکا.
ـ باشە، قین لەزگ مەبە، ئێستا کە دەچین بۆ میوانداریێتی ئەم کابرایە، ئەوە شتێکی باش نییە.
مادونا هەمیشە تۆ ڕاست دەکەی ، بەڵام ناخۆشیەکەی لە بەر ئەوەیە کە پیاو ماقووڵ و ئینسانە گەورەکان نایەن بۆ ئەو میوانییە.
ـ لەبەر چی؟
ـ نازانم، یان بە هۆی ئەوەی کە لە شارەکەدا مرۆڤی وای تێدا نییە، یان لەبەر نەخۆشی و شتی ئەلەو جۆرە. سەرجەم ئەمشەو تەنیا دووسێ باڵوێز، چەند هۆزانوانێکی ئاڵمانی، گرووپێک لە گەڕوکانی هەمیشەیی جۆراوجور، شازادە ڕوسیەکان، چەند کەسێکی ئەنجومەنی ئەدەبی و چەند ئەفسەرێکی فەڕەنسی دێن بۆ ئەوێ، تەنیا کەسانێکی دیکەی کە من بیانناسم بێجگە لەوانە نایەن.
ـ هەڵبەت جیا لە داشۆرین نووسە بە ناوبانگەکە، کە ئەو بۆ خۆی گوڵی مەجلیسەکەیە.
ـ هەجونووسە تازەکە؟ کامە، ڕیوارز؟ بەڵام من پێموابوو گراسینی بەتووندی دژی ئەوە.
ـ بەڵێ؟ بەڵام ئێستاکە ئەم پیاوە لێرەیە و قسەکانیش هەمووی لە بارەی ئەوەوەیە. حەتمەن گراسینی بە تەمایە ماڵی ئەو یەکەم جێگا بێ کە ئەو شێرەمەزنە لەوێدا پیشان دەدرێ. تۆ دڵنیای کە ڕیوارز سەبارەت بە بەرهەڵستکاری گرانسیی هیچی نەبیستووە، بەڵام شایەد هەستی پێ کردبێ، ئەو زۆر وشیار و ورد بینە.
ـ تەنانەت من ئاگام لە هاتنیشی نەبوو.
ـ دوێنێ هات ـ ئەمەش چایی، نا، هەڵمەستە، دانیشە من قۆریەکە دێنم.

مارتینی لەو ژوورە چکۆلەیەدا دڵی زۆر خۆش بوو. دۆستایەتی لەگەڵ جما دەبووە هۆی هەڵایسانی کڵپەی ئەوینێک بێئەوەی خۆی ئاگاداربێ و دۆستایەتی پاک و بێگەردی ئەو ئەستێرەیەکی پرشنگدار بوو کە لە تاریکایی ژیانیدا دەدرەوشاوە. هەر کاتێکیش کە دڵی دەگیرا. دوای تەواوبوونی کارەکەی دەهات بۆ ئێرە، زۆر کات بێدەنگ لە لای ئەو دادەنیشت و یەکبین چاوی تێدەبڕی. کاتێکی کە خەریکی گوڵدۆزی دەبوو و چایی تێدەکرد، قەد جما سەبارەت بە ناڕەحەتیەکان و گیروگرفتەکانی لە مارتینی نەدەپرسی و یان بە چەند وشەیەک هاودەردیی خۆی دەرنەدەبڕی، بەڵام ئەو هەمیشە بە دڵێکی قورس و قایم و بە فکرێکی ئارامەوە لە لای ئەو دەڕۆیشتەوە و هەروەک بۆخۆشی گوتبووی وای هەست دەکرد کە دەتوانێ: «دوو حەوتووی دیکەیش هەروا بە ڕێزو حورمەتەوە ڕایبوێرێ» جما بێ ئەوەی خۆی بزانێ تواناییەکی سەیری هەبوو، بۆ هێورکردنەوەی بیرومێشکێکی ناڕەحەت. پارەکە لە کالابریا کە خیانەتیان کرد بە دۆستانی ئازیزی مارتینی و هەروەک گورگ وەبەر دەستڕێژی گوللەیان دان، پێموابێ تەنیا وەفاداری و خۆڕاگریی جما بوو توانیی ئەو لە ناهومێدی ڕزگار کات. جاری وابوو بەیانیانی یەکشەمە دەهات بۆ ئەوێ بو «دانوستاندن سەبارەت بە کارو ئیشەکان» ئەم برگەیە سەبارەت بە کار و تێکۆشانی حیزبی مازینی دەگوترا کە هەردووکیان لایەنگر و هاوڕێی وەفاداری ئەو پارتە بوون، لەو کاتەنەدا جما تەواو دەبووە مرۆڤێکی دیکە، مرۆڤێکی زیرەک لە سەرخۆ، ئاقڵ، زۆر ڕێکوپێک و دوور لە کردەوەی دەمارگرژانە. ئەو کەسانەی کە ئەویان دیتبوو لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکە ڕامیاریەکانیدا، ئەویان تەواو شۆڕشگێڕێکی بە ئەزموون، بە دیسیپلین، باوەڕ پێ کراو، ئازا و لە هەر بارێکەوە کەسایەتییەکی زۆر بە نرخ بوو بۆ پارتەکە، بەڵام دەیانگوت ئەو تەنیا شتێک یان هاوڕێیەکی کەمە لە ژیانی ئاسایی و تایبەتی خۆیدا. گالی لە بارەی ئەوەوە گوتبووی: «ئەو شۆڕشگێڕێکی زگماکە کە بە تەنیایی خۆی بە قەدەر چەندین کەسی ئێمە بایەخدارە و بەس».

دژایەتیکردن لەگەڵ «مادوناجما»یەکی کە مارتینی دەیناسی زۆر سەخت و چەتوون بوو.

جما کە لە سەرشانییەوە ئاوڕی ئەداوە بۆ دواوە و چەکمەجەی مێزە چکۆلەکەی دەکردەوە پرسی: «دەی، هەجو نووسە نوێکەی ئێوە ڕواڵەت و قەیافەی چۆناوچۆنە؟ سزار چاولێکە ئەم نوقوڵ و ئاڵوباڵوە شەکراویانە* هی تۆیە، پێشم سەیرە کە بۆچی کەسانی شۆڕشگێڕ ئەوەندە تامەزرۆی شیرینین».

پیاوی دیکەش پێیان خۆشە، بەڵام چونکە لەخۆباییبن دانی پێدا نایەنن، سەبارەت بە داشۆرین‌نووسە تازەکە پرسیت؟ لەو جۆرە پیاوانەیە کە ژنانی ئاسایی دەیپەرستن، بەڵام ژنێکی وەک تۆ ئەوی خۆش ناوێ، زمان شیرینێکی کارامە و قسە لەڕوو، ڕواڵەتێکی سادە کە زۆر سەرنج ناداتە ڕێکوپێکیی جل پۆشین، لەگەڵ سەماکەرێکی جوان و پاقژ کە هەمیشە لەگەڵیەتی و خەریکی گەڕیانە لەو جیهانەدا.

- هەر بە ڕاستی سەماکەرێکی لەگەڵە، یان تەنیا بە هۆی بێتاقەتیت دەتەوێ لاسایی قسە ڕەقیی ئەو بکەیتەوە؟

- خودا دەزانێ نا! هەر بە ڕاستی سەماکەرێکی لەگەڵە و زۆر کەسیش جوانی و دڵرفێنی ئەویان خۆش دەوێ، زۆریش جوانە، بەڵام من خۆشم ناوێ، بە قەولی ڕیکاردو ئەو قەرەچیە خەڵکی هەنگاریایە و یان ئەو لەو جۆرانەیە کە لە شانۆناوچەیەکانی گالییادا کار دەکا. بە ڕواڵەت ڕیوارز مرۆڤێکی چوختیە. ئەوەی ڕاست بێ وەکوو پیرێژنە پیرەکە وایە کە کچەکەی بە خەڵکی دەناساند!

- باشە ئەگەر ئەو ئافرەتەی لە وڵاتی خۆیەوە هێناوە، کارێکی شیاو و بە ئینسافانەی کردووە.

- مادونای ئازیز، تۆ ئازادی چۆنی پێت‌خۆشە لە کێشەکان بڕوانی، بەڵام کۆمەڵگا وا ناڵێ، بە بڕوای من، زۆربەی خەڵک لەوە دڵمەندن کە دەزانن ئەو ژنە گراوێ(مەعشووق)یەتی و ئەویش هەروا دەیناسێنێت.

---

* میوەی جۆراوجۆر وەکوو گێلاس و ئاڵباڵوو دەخەنە نێو هەنگوین یان شەکرەوە تاکوو وشک بن.

- ئەگەر ئەو بە خەڵکی نەوتبێت، ئەوان لە کوێوە ئەو شتە دەزانن؟

- شتەکە ڕوون و ئاشکرایە، ئەگەر بیبینی بۆخۆت لێت حاڵی دەبێ، بەڵام پێموانیە ئەوەندە ڕوھەڵماڵدراو بێ کە بیهێنێ بۆماڵی گراسینییەکان.

- ئەو هەڵسوکەوتێکی باشی لەگەڵ ناکات، سینیورا گراسینی ژنێک نییە کە کاری وا بکات کە دژی ڕەسم و ئاقاری کۆمەڵ بێت، بەڵام من پێمخۆش بوو سەبارەت بە ئاغای ڕیوارز زانیاریەک بە دەست بێنم، وەک داشۆرینەنووسێک نەوەکو پیاوێک. فابریزی پێی‌گوتم کە ڕیوارز برووسکەیەکی بۆ نووسیوم کە ئامادەی بەربەرەکانییە دژی ژێزوئیتەکان. تا ئێستا ئەوە ئاخرین شتێکە کە من سەبارەت بە ئەو بیستوومە. ئەم حەوتووە کارەکان زۆر کەوتوونەتە سەریەک.

- منیش سەبارەت بە ئەو لەوە زیاتر نازانم تا زانیاری زیاترت بدەمێ، لە مەڕ کەم وزۆری پارەش ئەو جۆرەی کە ئێمە لێی ئەترساین وا نییە. وا دیارە کە ئەو دارایە و پێی‌خۆشە هەر بە خۆڕایی ئیش و کار بکات.

- بۆ خۆی دەوڵەمەندە؟

- وا دیارە هەر وایە، هەر چەندە شتێکی سەیرە - ئەو شەوە لە ماڵی فابریزی بیستت کە شاندی دووپرە کاتێ ئەویان دیتوەتەوە وەزع و گوزەرانی زۆر خراپ بووە، بەڵام ئێستا لە برێک لە کانە ژێرزەویەکانی برەزیلدا شەریکە و بەشی هەیە، هەر وەها لە پاریس، ڤیەن و لەندەن وەکوو نووسەرێکی بەرز و سەرکەوتوو لە بواری ڕەخنەدا ناسراوە، بە سەر زۆر زمانی زیندووی دونیادا زاڵە و دەتوانێ قسەیان پێ بکات. لێرەش لەمپەر و بەر بەستێک نییە بۆ پێوەندی لەگەڵ بلاڤۆکەکانی دەرەوەی وڵات، شەرمەزارکردنی ژێزوئیتەکانیش وا نییە کە هەموو کات و ساتی ئەو بگرێت.

- بەڵی وایە سزار، ئێستاش کاتی ڕۆیشتنە، گوڵەکانیش دەدەم لە یەخەی کراسەکەم تەنیا خولەکێک ڕاوەستە.

خێرا چۆوە قاتی سەرێ و گەڕاوە، گوڵەکانی لە یەخەی جلوبەرگەکانی دابوو و دەسرۆکەیەکی ڕەشی ئیسپانیای دابوو بە سەریدا. مارتینی بە چاوێکی پاقژی هونەرمەندانەوە لێی ڕوانی.

ـ مادونای من، تۆ وەکوو مەلەکەیەکی، وەکوو مەلەکەیەکی گەورە و بیرمەندی سەبا[1]

جما بە پێکەنینەوە وەڵامی داوە: «ئەو قسەیەت دوور لە باوەڕ و ئینسافە! ئێستا خۆ خۆت دەزانی کە من چەندە تێکۆشاوم کە وەکوو ئافرەتێکی ئاسایی ناو کۆمەڵگا بم! کێ دەیهەوێ کە ژنێکی شۆڕشگێڕ شێواز و سەروپوتراکی لە مەلیکەی سەبا بچێ؟ ئەم کارە نابێتە هۆی چەواشەکردنی سیخوڕەکان».

ـ چەندەی هەوڵ بدەی هێشتا ناتوانی ڕوڵی ژنێکی ئاسایی دواکەوتووی ناوکۆمەڵگا بگێڕی. دەی لەوە گەڕێ هەر بە ڕاستی تۆ ئەوەندە جوانی کە سیخوڕەکان بە دیتنی ڕوخسارت لە بیر و ڕات تێدەگەن، هەرچەندەش کە ناتوانی وەک سینیورا گراسینی قاقایێکی گەمژانە بکێشی و بە باوەشێنەکە ڕوخسارت بشارێتەوە.

ـ باشە سزار، لە کۆڵ ئەو ژنە بەدبەختە بەوە! لەو نەقوڵانە کەمێکی تریش بخۆ، با ئیتر لەوە زیاتر تووڕە نەبی و بێیەوە سەرخۆ، حازری؟ دەی واباشە بکەوینە ڕێ.

مارتینی ڕاستی دەکرد کە دەیگوت، کوڕەکەی ئەمشەو زۆر قەرەباڵغ بوو و بنیادەمی وەڕەز دەکرد، پیاوانی ئەدەبدۆست قسەوباسی جۆراوجۆر و بێبایەخیان دەکرد و کوڕەکەیان بە دڵ نەبوو. لەولاشەوە توریستەکان لەگەڵ شازادە ڕوسیەکان لە ژوورە جیاجیاکاندا دەگەڕان و سەبارەت بە کەسایەتیە جۆراوجۆرەکان پرسیاریان لە یەکتری دەکرد، هەوڵیان ئەدا کە لەگەڵ یەکتری وتووێژی بیرمەندانەیان هەبێ.

گراسینی کە تێدەکۆشا لە قسە کردن و هەڵسوکەوتیدا وەک جل و بەرگ و چەکمەکانی ڕازاوە بێ خەریکی پێشوازیکردن لە میوانەکانی بوو، بەڵام بە دیتنی جما وەک گوڵ گەشاوە لە ڕاستیدا جمای خۆش نەدەویست و پڕ بە دڵ لێی دەترسا، بەڵام دەیزانی میوانداریەکەی ئەو بە بێ جما ڕەونەقێکی نییە. گراسینی لە ئیش و کاری خۆیدا بە ناوبانگ بوو، ئێستاش کە دەوڵەمەند و نێو بە دەرەوە بوو گەورەترین ئاواتی ئەوە بوو ببێتە ناوەندی

1 . مەلەکەی حەبەشە کە بووە گراویی سولەیمانی پێغەمبەر

کۆڕوکۆبوونەوەی ئازادیخوازان و ڕووناکبیرەکان. جما باش دەیزانی کە ئەو ژنە هیچوپووچ و لە خۆڕازیە، کە لە کاتی لاویدا لە لای مێردەکەی قەڵەمی پەڕاندبوو، بەم قسە بێناوەڕۆک و بێبایەخانە کە بە ڕواڵەت جوان بوون شایانی ئەوە نەبوو کە ببێتە خاوەن کۆڕێکی وا مەزن. هەر کاتێ کە دەیتوانی جما ڕازی بکات بێتە ئەوێ هەستی دەکرد کە شەوێکی سەرکەوتووی بووە. میوانەکان بە دیتنی ڕەفتاری دڵگیر و بێگرێ و گۆڵی جما خۆمانەتر و ئاساییتر بوون و بە قەولی گراسینی بوونی ئەو ڕوحی دووڕوویی و ناپاکی لەو ماڵەدا دەتاراند کە هەمیشە باڵی بە سەر ئەوێدا کێشابوو.

سینیورا گراسینی دوای ئەوەی بە گەرم و گوڕی بە خێرهاتنی جمای کرد بە هیواشییەکی وا کە زۆرکەس گوێی لێ بێ! گوتی: «چەندە جوان بووی ئەمشەو!» بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە کە جلوبەرگەکەی پێجوان بوو، لەبەر کەسایەتی بەهێز و سەنگینی ئەو و بە هۆی ڕاست و دروستی و خاکەڕاییەکەی و بە هۆی بیر و فکری گەورە و مەزنی و تەنانەت بە هۆی تایبەتیبوونی و شێوەی ڕوخساری، یانی تەواوی ئەو شتانەی کە لە لای مارتینی بەرێز بوون. سینیوراگراسینی هەروەختێک ڕقی لە ژنێک دەبوو بە زمانشیرینی ڕقی خۆی دەردەبڕێ واتا بە قەند دوژمنی خۆی دەخنکاند! جما ئەم بەخێر هاتن و ڕێزلێنانی ئەوی بە قەدەر خۆی بایەخ و سەرنجی دەداتێ و ئیتر زیاتر لەوە بیروهزری خۆی پێوە ماندوو نەدەکرد. بە بڕوای ئەو ئەوەی کە «چوونە ناو کۆمەڵگای» ناو لێنرابوو ئەرکێکی ناخۆش بوو کە شۆڕشگێڕی ماندوو دەکرد تا سەرنجی سیخوڕەکان لە سەر خۆی دوور کاتەوە، کە بۆ پارێزەرانی خۆی حەتمەن دەبوو ئەو کارە بکات، ئەو ئەم کارو ئەرکەی بە ڕەمز و ئیما و ئیشارە دانابوو، دەشیزانی کە دەنگدانەوەی قۆز و جلوبەرگجوانی بۆ کەسانی چەنەوەڕی ئاشقە جلوبەرگ و مۆد چەندە بە نرخە هەروەک کلیلی ڕەمز و نهێنی بە وردی لێی ورد دەبووەوە، هۆگران و شەیدایانی ئەدەب بە بیستنی نێوی جما گەشانەوە، ئەو لە نێو ئەواندا زۆر خۆشەویست بوو، ڕۆژنامەوانانی ڕادیکاڵیش خێرا خۆیان گەیاندە ئەو سەری هاڵە درێژ و گەورەکە کە جمای لێبوو.

جما زۆر لەوە بە ئەزموونتر بوو کە نەهێڵێ بکەوێتە ئابلوقەی ئەوانەوە، ڕادیکاڵەکان هەمیشە و لە هەموو جێگایەک هەبوون، کاتێ کە لە دەوری کۆبوونەوە زۆر بە نەرمی هەر کامەیانی بە شوێنکار و ئیشی خۆیاندا بەڕێ کرد، بە بزەیەکەوە پێیڕاگەیاندن کە لە جێگایەکی کە ئەو هەمووە توریستەی لێ بێ نابێ کات و ساتی خۆیان لە لای ئەو بە فیڕۆ بدەن . ئەو خۆی گیرۆدەی M.P.١ بەریتانیای کرد کە پارتی کۆماریخواز بە دڵ خوازیاری ئەندامبوون و هاودەردیبوونی ئەویان لە پارتەکەیاندا دەکرد . کابرای بەریتانیای چونکە دەیزانی کە ئەو لە ئیش و کاری پووڵ و پارەدا شارەزایە، لە پێشدا بە ئاگادار بوون لە سەر بیروباوەڕی لە سەر خاڵێکی تایبەتی پڕئەزموون سەبارەت بە پارەی ئوتریش سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. لە دواییدا لێزانانە قسەکەی بەرەو لای بڕی پارەی کۆماری (لێمباردوونتیا)٢ ڕاکێشا، پیاوە بەریتانیایەکە کە وای دەزانی بە هۆی وتووێژێکی بێبایەخەوە ماندوو دەبێ، لە ترسی ئەوەی کە نەوەکوو کەوتبێتە دەستی پسپۆڕێکەوە، بە شک و گومانەوە لێی ڕوانی، بەڵام دوای ئەوەی کە زانیی ڕووگەش و قسەخۆشە تەواو گیرۆدەی بوو و دەتگوت لەگەڵ مێترنیخ دانیشتووە . جا ئەمجار لە سەر بایەخی پووڵ و پارەی ئیتالیادا بە تەواوی کەوتە دوان.

کاتێکی کە گراسینی پیاوێکی فەرەنسیی هێنایە لایان کە «پێیخۆش بوو سەبارەت بە مێژووی ئیتالیای لاو پرسیارگەڵێک بکات.» M.P. دەتگوت هەستی خەوش دار بووە شایەد لەبەر ئەوە بێ کە ناڕازیبوونی خەڵکی ئیتالیا زۆر لەوە قووڵترە کە ئەو فکری لێ دەکاتەوە هەر بۆیە گیر نەبوو و هەستا ڕۆیشت.

لە درەنگانی شەودا جما بێ ئەوەی کەس ئاگادار بێ، چووە بن کەپرەکە و ژێر پەنجەرەکانی ژووری میوان، تا بۆ چەند ساتێک لە نێوان گوڵە گەورەکانی کاسنی و قرژانگدا دانیشێت. هەوای خەفە و هاتوچۆی چڕی

---

1 . Member of parliament (ئەندامی پارلمان)

2 . کۆماری لیمباردیوونتیا کە لە سەر ئەرکی کۆنگرەی ویەن یەکگرتوو بوون .

جەماوەر لە ژوورەکاندا خەریک بوو تووشی ژانەسەر و بێتاقەتیی بکات، لە ژێر شەوقی مانگەشەودا ڕیزێک داری گەرمێن وەکوو خورما کە لە گوڵدانی گەورەدا بوون دەبینرا ئەم گوڵدانانە لە نێوان گوڵە سوێسنەکاندا و بڕێک گیای دیکەدا ون ببوون، هەمووی ئەوانە تابڵۆیەکی جوانیان نەخشاندبوو، لە کەڵێنێکی ئەم تابڵۆ جوان و خنجیلانەوە دۆڵ و دەڕەیەکی دڵڕفێن دیار بوون، لقوپۆپی داری هەنار دیار بوو کە بە گوڵووکی ناوادە داپۆشرابوو، کە لە نێوگیا و گوڵەکاندا خۆی دەنواند.

جما هاتبووە نێو ئەم سروشتە جوان و باخچە ڕەنگینە، بە هیوا بوو ماوەیەکی کەم بتوانێ بە بێدەنگی وەحەسێ و پشوویەک بدا و خۆی لەم سەرێشە و هەراوهۆریایە تەریک بخاتەوە . شەوێکی گەرم و بێدەنگ و خۆش بوو، بەڵام هەر کە لە ژوورە گەرمەکان دا هاتە دەرێ هەستی بە فێنکایی کرد و دەسماڵە تۆڕیەکەی دا بەسەریدا.

دەنگی وتوێژ و هەنگاوی پێی هاتە گوێ کە بە درێژایی مانگەشەوەکەدا نزیک دەبوونەوە و هەودای خەیاڵیان لێ پساند، چووە تاریکایەکە تا نەیبینن و بتوانێ دوور لەم قسە و باسانە بڕێک مێشک و زەینی هێور کاتەوە. هەرچەندە زۆر نارەحەت بوو ڕاوەستان و، بە دوای ئەودا دەنگی ناخۆش و تیژی سینیوراگراسینیش تەواو بوو کە قسەکانی پڕبوون لە وتەی هیچ و پووچ و بێئاکام.

ئەو دەنگەی دیکە کە زۆر نەرم و خۆش بوو هی پیاوێک بوو، بەڵام جارجار ڕەگێکی تیژ دەکەوتە نێو دەنگیەوە کە ناخۆشی دەکرد. زۆرتریش لەبەر ئەوە بوو کە هەوڵی ئەدا زاڵ بێ بەسەر زمانی خۆیدا کە گیری دەکرد.

دەنگەکە پرسی: «وتت بەریتانیای؟، بەڵام بێشک ئەم نێوە تەواو ئیتالیاییە، چی بوو ـ بوولا؟؟»

ـ بەڵێ ئەو بێوەژنی جووانی بوولای هەژارە کە چوار ساڵێک لەوە پێش لە بەریتانیا مرد لە بیرت نییە؟ ئاخ! لە بیرم نەبوو کە ئێوە ژیانێکی پڕ لە ئاوارەیی و تاراوگەیتان هەیە! نابێ چاوەڕوانی ئەوەمان لە تۆ هەبێ کە هەموو شەهیدانی ڕێگای ڕزگاریی وڵاتەکەمان بناسی، ئەو شەهیدانە زۆرن!

سینیوراگراسینی هەناسەیەکی هەڵکێشا. هەمیشە ئا بەو شێوەیە لەگەڵ بیانی و نامۆکاندا قسەی دەکرد ڕۆڵی نیشتمانپەروەریێکی دڵ هەڵقرچاو کە لەبەر خەمی ئیتالیا وەک منداڵێکی قوتابخانە لێ داشۆڕاو کە لەگەڵ ڕوخساری جوانیدا باش یەکتر گیر دەبوون.

دەنگەکە دووپات بووەوە: «لە بەریتانیا مرد! ئەو کات پەنا بەرێک بوو؟ پێموایە ئەونێوە دەناسم، پێوەندی لەگەڵ سەرەتای کار کردن و دەسپێکی ئیتالیای لاودا هەبووە؟»

- بۆچی، ئەویش لەگەڵ ئەو لاوە بەشمەینەتانە بوو کە لە ساڵی گیرا - ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەت لەبیرە؟ چەند مانگێک ئازاد بوو، دووسێ ساڵ دوایە هەر کە دیسان حوکمی گیرانیان دایە دەرێ هەڵات بۆ بەریتانیا. دوایە بیستم کە لەوێ ژیانی هاوبەشی پێک هێناوە لە سەریەک ڕووداوێکی شاعیرانە بوو، بوولای هەژار بۆ خۆشی ڕەفتار و هەڵس و کەوتێکی شاعیرانەی هەبوو.

گوتت دوایە لە بەریتانیا مرد؟

- بەڵێ، بە نەخۆشی ئازارە باریکەوە نەیتوانی لەگەڵ کەش و هەوای سامناک و ناخۆشی بریتانیا خۆی ڕابێنێ. تاقە کۆرپەکەی جماش ڕاست پێش مەرگی بوولا مرد. منداڵەکە نەخۆشی خولێرکەی هەبوو. زۆر دڵتەزێنە، وانییە؟ هەموومان جمامان خۆش دەوێ!، بەڵام، بڕێک سرپەیە، دەزانی ئاخەر بەریتانیاەکان هەموویان وان، بەڵام بە بڕوای من ئەو گیروگرفت و ناڕەحەتیانە ئەویان خەماوی کردووە

جما هەستایە سەرپێ و لقوپۆپی هەنارەکەی لادا، شی کردنەوەی خەم و ئازارەکانی ئەو تەنیا بۆ گرێبەستی وتووێژێکی بێئاکام بۆ ئەو زۆر ناخۆش بوو، کە هاتە بەر ڕووناکایەکە بە جوانی ناڕەحەتیەکەی لە سیمایدا بەدی دەکرا.

خاتوونی خانەخوێ بە چاوێکی لە سەرخۆ و خۆشەویستی و بە سەیرێکەوە گوتی: «ئەمەش ڕاست بۆ خۆی! جما ئازیزم پێم سەیر بوو دیار نەبووی، بۆ کوێ چووی. ئاغای فلیس‌ریوارز پێی خۆشە پێکەوە ئاشنا بن».

جما به سەیریکەوه چاویکی لێ کرد و له دڵی خۆیدا گوتی: «دەی دەی مێشەکەرانه ئەمەیه» ریوارز به ڕێزەوه سەری بۆ دانەواند، بەڵام چاوەکانی به جۆریکی ڕوانیانه ڕوخسار و جەستەی که له لای جما تێڕوانینێکی نائاسایی و ڕوودامالراوانه بوو.

ریوارز چاویکی له پەردە ئەستوورەکه کرد و گوتی: «قوژبنیکی دڵرفێنت دۆزیوەتەوه بەرژەوەندیەکەشی چەندە جوانە!»

- بەڵێ، جێگایەکی خۆشە، هاتوومەته ئێره تا کەمێک لەو فێنکایەدا پیاسه بکەم.

خانمی میواندار ڕوانییه ئەستێرەکان. مژۆڵەکانی جوان بوون و پێی‌خۆش بوو که خەڵک بیانبینی و گوتی: «وا وێدەچێ لەم شەوه خۆش و دڵرفێنەدا ئەگەر له ماڵەوه دانیشین نەختێک ناشوکری و ناسوپاسی دێنێ. چاو لێ‌که سینیورا! ئەگەر ئیتالیای ئازیزمان ئازاد بوایه نەدەبووه بەهەشتی سەر ئەرز؟ فکری لێ‌بکەنەوه ئیتالیا بەو گوڵ و ئاسمانه نەخشینەوه ببێته بەردە و قوله ڕەشێکی دیل!»

مێشەکەرانه به هێورییکی کێش‌دارەوه لەبەرە خۆیەوه گوتی: «هەڵبەته به هەبوونی ژنانی ئاوا نیشتمانپەرەوەر و وڵاتپارێز!»

جما ڕاست تیشکی نیگای خسته سەر چاوی ئەو، لەراستیدا ئەو شێوه ڕوانینەی ئەو ئەوەندە ئاشکرا بوو که لەبەر چاوی کەس نەدەشاردراوه، بەڵام جما تاریف کردنەکانی سینیورا گراسینی هیچ پێ خۆش نەبوو هەرچەندە گراسینی کەیفی له تاریف کردنی ئەو بوو، فەقیره مژۆڵەکانی به هەناسه هەڵکێشانێک دانەواند: ئاخ سینیور، ئەمە کاریکی زۆر چکۆلەیه که هەموو ژنێک دەبێ بیکا! خۆزگه ئەو ڕۆژە دابێ که بیسەلمێنم که نێویکی ئیتالیای سەربەخۆ هەیه - کێ ئاگاداری داهاتووه؟ ئێستا دەبێ بچم ئەرکی میوانداریتیم به جێ بێنم، بالوێزی فەڕەنسا داوای لێ کردم که ڕاهێنانی کچەکەی بسپێرمە دەست تۆ. دەزانم که ڕێزی دەگری و به هەموویانی دەناسێنی. ئاخ! ئەوەی که دێ هەر ئەو شازادە خۆش مەشرەفە ڕوسیەکەیه، ئەوت دیتووه؟ دەڵێن ئەو یەکجار زۆر خۆشەویستی نیکولای ئیمپراتوره.

فەرماندەی لەشکری شاریکی پۆلۆنیایە و ناویکی سەیری هەیە کە کەس ناتوانی بیلێ».

1- Quelle nuit maGnifique Nest – ce pas man prince?

هەر لەگەڵ ئەوەی کە چەنەوەریی دەکرد بۆ پیاویکی مل ئەستووری بەرچیڵەزل کە سەرسینگی پڕ بوون لە نیشان و مەدالیا، بە پەلە دوور کەوتەوە، لە قسەکانیدا کە گلەیی تێدا بوو ئەویش لەبەر Notre Malheur patrie1 کە وشەی وەکوو «charme nte»۲ و «Mon prince»۳ی نێوئاخنی قسەکانی دەکرد. لە درێژایی کەپرەکەدا ون بوو.

جما بەبێ جووڵە لە پەنای دار هەنارەکەوە ڕاوەستا. بۆ ئەو ژنە بێئەقڵە و بۆ قسە بێ بایەخەکانی میشەکەرانەش دڵمەند بوو. میشەکەرانە بە قەیافەیەکەوە کە جمای توورە دەکرد ئەو کەسانەی چاو لێ دەکرد کە دوور دەکەوتنەوە. وادیار بوو پێی بێ ئەقڵ بوون و دڵی پێیان دەسووتا .

میشەکەرانە بە بزەیەکەوە ڕووی کردە جما و گوتی: «وڵات پارێزی ئیتالیایی و وڵات پارێزی ڕووسی قۆڵیان لە نێو قۆڵی یەک ناوە و دەڕۆن بە ئاخافتن لەگەڵ یەکتری زۆر خۆشحاڵن کامیانت پێ باشە؟»

جما ڕووی تێکنا و وەڵامی نەداوە.

میشەکەرانە درێژەی پێدا: «هەڵبەتە ئەوە تەواو دەگەڕێتەوە سەر بۆچوونی هەرکەسێک، بەڵام پێموایە، لەم دووانە، جۆری ڕووسیم زۆرتر خۆش بوێ چونکە پوختەتروو کامڵترە. ئەگەر ڕووسیە بۆ گەورەیی و سەروەری ڕاگرتنی خۆی بە جێگەی گوللە و باڕووت ناچار بایە پشت ببەستێ بە ئاسمان و گوڵەکان، بە بڕوای ئێوە Mon prince تا کەی دەیتوانی ئەو قەڵایەی پۆلۆنیا ڕاگری؟»

جما وەڵامی داوە: «بە بڕوای من، ئێمە دەتوانین بیروڕای تایبەتی خۆمان بە ڕێزەوە بۆ خۆمانی ڕاگرین بەبێ ئەوەی سووکایەتی بکەین بە ژنێکی کە میوانی ئەوین».

---

1 . «وڵاتی بەختە ڕەشی ئێمە».

2 . «دڵگیر»

3 . «شازادە»

«بەڵێ! من ئەرکی میوانداریتیم لە ئیتالیادا لە بیر چووبووەوە، ئیتالیایەکان زۆر ڕێز لە میوان دەگرن . دڵنیام کە ئوتریشیەکانیش ئەوان هەروا دەناسن - دانانیشی؟»

بە شەلەشەل بە ژێر کەپرەکەدا ڕۆیی و کورسییەکی بۆ هێنا. ڕووبەرووی ئەو ڕاوەستا و شانی دابە میلەئاسنکانەو، شەوقێکی کە لە پەنجەرەکەوە دەهاتە دەرێ ڕوخساری بە باشی ڕووناک دەکردەوە، جماش دەیتوانی بە باشی سیمای ئەو تاوتوێ بکات.

جما لەو هیوا براو بوو. چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە ئەو کەسەی کە دەیبینێ ئەگەر زۆر پەسندی داخوازیەکانی ئەو نەبێ. لانی کەم قورس و قایم و باش بێ، بەلام باشترین شتێک کە لە ڕوخساری ئەودا بە دی دەکرێ ئەوە بوو کە کەیفی بە جل و بەرگە جوان و تەرپۆشەکەی ئەو هات و شتێک وەک ئازایی و ورە و نەترسی لە ڕەفتار و وتەکانیدا خۆیان نیشان دەدا. لەو لاشەوە وەکوو کەسێکی دوورەی گەنم ڕەنگ و سەرەڕای شەلینی لاقی وەکوو پشیلەیەک چوستوچالاک بوو، بە شێوەیەکی سەیر هەموو ئەندامی لەشی لە بەورێکی ڕەش دەچوو. هەنیە و گۆنای چەپی بە هۆی لێدانی شمشێرەوە ببووە برینێکی کۆن و دیار کە تەواو ڕوخساری ناحەز کردبوو. ئێستا جما ئاگاداری ئەوە بووە کە هەر کاتێک لە قسە کردندا زمانی دەیگرێ، هەستەدەماری سەرگونا بریندارەکەی سەیر دەلەریەوە.

ئەگەر ئەم کەم و کورپیانەی نەبوایە جوانییەکی سروشتی و جێی لێ وردبوونەوەی دەبوو، بەلام بە گشتی تەواو ڕوخسارێکی دڵڕفێنی نەدەبوو.

خێرا بەو شێوە نەرم و هێورانەیەوە درێژەی دا: «بیستوومە کە بڵاوکراوە بنچینەییەکانت لا پەسندە و لە ڕۆژنامەکاندا وتار دەنووسی».

جما بە تووڕەیەکەوە کە وردە وردە وەک شیر هەڵدەچوو لە دڵی خۆیدا گوتی: «کە دەدوێ ئاقاری ڕاست وەک پڵنگ وایە. هەڵبەت پڵنگێک کە بەکەیف ە بە دەماخ بێ و بتوانێ قسە بکات».

- جارجار دەنووسم، بەلام کات و وەختم زۆر نییە.

- حەتمەن! لە قسەکانی سینیوراگراسینی لێم حاڵی بوو کە ئیش و کاری زۆر گەورەترت لە سەر شانە.

جما کەمێ برۆکانی هەڵێنا، لە ڕاستیدا سینیوراگراسینی لەوەی کە ژنێکی بێئەقڵ بوو لەگەڵ ئەم مرۆڤە کە جێگای بەقا و باوەڕ نەبوو زۆر نەترسانە لەگەڵیدا دواوە ، هەرچەندە کە جما بە نۆبەی خۆی وردە وردە لێی بێزار دەبوو.

جما کەمێ بە توورەیەوە گوتی: «کاتێکی زۆر لە وەختی من بە کاروباری ئاسایەوە گیراوە، بەڵام سینیوراگراسینی ئەو کارانەی زۆر گەورە کردوەتەوە، لە ڕاستیدا زۆربەیان زۆر بێبایەخن»

- دەی، ئەگەر ئێمە هەموو کاتوساتی خۆمان تەرخانی ڕزگاری ئیتالیا بکەین، گوزەرانی ژیان و ڕەوتی دونیا زۆر ناخۆش دەبێ، بە بڕوای من، دانیشتن لەگەڵ ئەم خانەخوێیەی ئەمشەومان و هاوسەرەکەی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو باشتر بتوانێ داکۆکی لە خۆی بکات. بەڵێ دەزانم کە دەتهەوێ چی بڵێی، ڕاست قسەی تۆیە، بەڵام ئینسان پێکەنینی دێ بە خۆیان و بە بیری وڵات پارێز و وەتەن پەرستییان - ئاوا زوو دەتهەوێ بچیەوە بۆ هۆڵ؟ کەشوهەوای ئێرە زۆر خۆشە!

- پێموایە ئیتر دەبێ بڕۆم، ئەمە ملپێچەکەی منە؟ سوپاس.

مێشەکەرانە ملپێچەکەی هەڵگرتبوو و ئێستا بە چاوی زەقەوە کە وەک گوڵێک لە گوێی جۆگەلەیەک ڕوابێ و بڵێ لەبیرم نەکەی ، پاک و بێگەردی دەنواند چاوێکی ماناداری لە جما کرد.

بە پەژیوان بوونێکەوە گوتی: دەزانم لەبەرچی لێم ڕەنجاوی، لەبەر شۆخی کردن بەو خانەخوێیەیە کە وەک بووکەشووشە وایە، بەڵام مرۆڤ چی دەتوانێ بکات؟

- ئێستا کە لە من دەپرسی، من ئەمە بە لێنەبووردەیی و... ناجوامێرانە دەزانم کە شۆخی بکەی بە کەسانێکی کە کەمتر تێگەیشتوو و زۆر زانا نەبن، وەکوو پێکەنین بە ئیفلیجێک و یان...

لە پڕێکدا هەناسەی مێشەکەرانە بە ئازارێکی نهێنییەوە لە سینگێدا قەتیس بوو، خۆی کێشایە دواوە چاوێکی لە لاقە شەلەکەی و دەستە نوقستانەکەی خۆی کرد. دوای کەمێک وەخۆ هاتەوە و قاقای کێشا:

سینیورا ئەمە ویچوونێکی زۆر بێئینسافانە بوو، ئێمەی ئیفلیج قەت وەکوو ئەو نین کە تێنەگەیشتووییمان لە لای خەڵکی بەرز بنرخێنین، کەمئەندامی خۆمان بکەینە نمایشی جەماوەر، لانیکەم ئەوەمان لێ قەبووڵ کەن کە ئێمە ناحەزەکانمان لا جوانتر نییە لە ئەندیشە ناحەزەکان . ئێرە پلیکانێکی لێیە، پێتان خۆشە قۆڵی من بگرن؟

جما کە چوە ژووری بێدەنگیێکی زۆر سەیر باڵی بە سەر دیوەکەدا کێشابوو. هەستیاربوونی ناوادەی مێشەکەرانە ئەوی تەواو شڵەژاندبوو. هەر کە مێشەکەرانە دەرگای هۆڵە گەورەکەی کردەوە جما زانی کە ڕووداوێکی چاوەروان نەکراو ڕووی داوە. زۆربەی پیاوەکان لە تووڕە و ناڕەحەت دەچوون. ژنەکانیش هەموو بە گۆنای سورەوە کە وایان نیشان ئەدا کە بێخەبەرن، لە گۆشەیەکی ژوورەکە کۆ ببوونەوە. خانەخوێ کە دەیویست تووڕەییەکەی خۆی بشارێتەوە، بەڵام ئاشکرا لێی دیار بوو چاویلکەکەی ڕێک و پێک دەکرد، چەند توریستێکیش لە گۆشەیەک ڕاوەستابوون و بە چاوێکی زیت و پرسیاراویەوە دەیانڕوانییە ئەو سەری ژوورەکە. بە ڕواڵەت وا دیار بوو کە ڕووداوێک خەریکە دەخولقێت کە لە لای ئەوان ڕەنگی شۆخی پێوە دیار بوو، بەڵام لە لای زۆربەی میوانەکان سووکایەتی پێ کردن بوو. تەنیا سینیوراگراسینی بوو کە واوێدەچوو بە هیچ شتێکی نەزانیوە، بە نازێکەوە بە باوەشێنەکەی خۆی فێنک دەکردەوە بۆ سکرتێری باڵوێزخانەی هوڵەندا کە بە تەوسێکەوە پێدەکەنی و گوێی بۆراداشتبوو چەنەوەڕی دەکرد.

جما کەمێک لەبەر دەرگاکە ڕاوەستا و ڕووی بۆ ئەولا وەرگێڕا تا بزانێ کە ئایا مێشەکەرانەش ئاگاداری شێواوی ئەو کۆڕە بووە. کاتێکی کە مێشەکەرانە نیگای جمای لە سەر ڕوخساری شاد و بێخەبەری خانمی خانەخوێ دزیەوە و ڕوانییە کورسیلەکەی ئەو سەری ژوورەکە سەرکەوتنێکی زیرەکانە لە چاویدا دەبریسکاوە.

جما خێرا هۆێ ئەو کارەی زانی، مێشەکەرانە گراوێکەی بە بیانوویەکی دەست کرد و درۆیین کە توانیبوی تەنیا سینیوراگراسینی پێ فریو بدات هێنابوو بۆ ئەوێ.

کچۆڵە قەرەچییەکە کە پاڵی دابوو بە کورسیلەکەوە، گرووپێکی خۆرێکخەر کە لەخۆڕا پێدەکەنین و ئەفسەرە سوارکارەکانی سوپا بە بزەیەکی ناحەز و نالەبارەوە دەورە درابوو، جلوبەرگێکی گران قیمەتی زەردەڵەی گوڵداری لەبەردا بوو، کە بن گوڵەکان ڕەنگێکی جوانی ڕۆژهەڵاتی پێوە دیار بوو ئەوەندە چووبووە ناخی فکری ئاڵتوون و متومووروەکانییەوە کە بۆ کۆبوونەوەیەکی ئەدەبی فلوڕانس وەک باڵندەیەکی گەرمەسێری ئوستوایی وابوو کە کەوتبێتە نێوان چۆلەکەکان وقەلەرەشەکانەوە . پێی سەیربوو وا وێدەچوو کە لەو کۆڕەدا خۆی زیادی و نابار هەست پێ دەکرد . هەر بۆیە بە سووکایەتی و بە ڕووگرژکردنەوەی سەیرەوە دەیڕوانییە ئەو ژنانە کە ئادیار بوو لێی دڵگیر ببوون. هەر کە مێشەکەرانەی دیت کە لەگەڵ جما بەرەو لای ئەو دێن، دە ڕپەڕیو بە گوتنی چەند ڕستەیەکی فەڕەنسی کە بە باشی تێینەدەگەیشتی هات بۆ لای ئەو:

ـ مسیو ڕیوارز، هەموو جێیەکت لێگەڕام! کێنتسالتیکوف دەیهەویست بزانێ کە ئایا سبەی شەو دەتوانی بچی بۆ تەلارەکەی. ئەوێ مەجلیسێکی سەماو هەڵپەڕینە.

ـ بەداخەوە ناتوانم بچم، ئەگەریش بچوایەم نەمدەتوانی سەما بکەم. سینیورا بوولا ئیزنم بدەن خاتوو زیتا ڕێنیتان پێ بناسێنم .

قەرەجەکە بە شێوەیەکی کەمێ بوغزاویەوە لە جمای ڕوانی، بە نابەدڵیەوە بە ڕێزێکەوە سەری بۆ دانەواند بێشک هەروەک مارتینی گوتبووی زیتا بەش بەحاڵی خۆی جوان بوو، جوانیەکی سروشتی، وەک جوانێکی ڕەشتاڵەی شاغی و گەڕۆک دەچوو. مرۆڤ بە دیتنی هاوئاهەنگی و نەرم و شلی و ڕێک و پێکی ڕێگا ڕۆیشتنەکەی دڵگەشە و پلەزیقان دەبوو، بەڵام نێوچاوانێکی تەنگ و تاریکی هەبوو گنج و لۆچی نێوچاوانی زۆر جوان نەبوو، دەکرێ بڵێین ئەوە نیشاندەری ئاڵۆزی و توونـدوتیژی دەروونی بوو . جما زۆر داهێزرابوو بە هۆی ئاخافتن لەگەڵ مێشەکەرانە، ئێستاش کە ئەم قەرەجە هاتبوە پێشی، ئەوندەی دیکە تێکچوو. دوایی کاتێ کە خانەخوێ هات بۆ لای

سینیورا، بوولا بۆ بەخێرهێنانی چەند توریستێک بە کەیفخۆشیەوە لەگەڵی ڕۆیشت.

لە نیوە شەودا کە دەگەڕانەوە بۆ فلۆرانس، مارتینی لێی پرسی: «دەی، مادونا مێشەکەرانەت پێچۆنە؟ قەت ڕەفتارێکی وا بێشەرمانەت دیتووە لەو کاتەیدا کە ئەو ژووری بەو ژنە فەقیرە دەکرد؟»

ـ ئەو ژنە سەماکەرەکە دەڵێی؟

ـ بەڵێ، مێشەکەرانە سینیورای هێنابوە سەر ئەو بڕوایە کە ئەو کچە لە سەماکردندا دەبێتە ئەستێرەی یەکەمی وەرز ، سینیوراگراسینی بۆ کەسێکی بە ناوبانگ هەموو کارێک دەکات چ باش و چ خراپ.

ـ بە بڕوای من، ئەمە کارێکی ناجوامێرانە و نەگونجاوە، ئەم کارە ئاستی بەرزی گراسینییەکانی هێنایە خوارێ، زوڵم و زۆرییێکیش بوو کە لە کچەکە کرا. دڵنیام کە ئەو ناڕەحەت بوو.

ـ لەگەڵ مێشەکەرانە قسەت کرد وا نییە؟ سەبارەت بە ئەو ڕات چیە؟

ـ سزار، ڕام ئەوەیە کە ئەگەر قەتی نەبینم زۆر خۆشحاڵ دەبم، کەس ئاوا ماندووی نەکردووم، تەنیا دە خولەکێک بوو کە قسەم لەگەڵ دەکرد کەچی سەرم دایە ژان، وەک دێو و درنجێکی بزۆز لە پێستی مرۆڤدا.

«دەم زانی بە دیتنی خۆشحاڵ نابی، ڕاستیەکەییت دەوێ، نەچووە دڵی منیشەوە وەکوو مارماسیەک وایە کە جێگای باوەڕ نییە، من لێی ئەرخایەن نیم».

# ٣

مێشەکەرانە لە نزیک ماڵی زیتا لە دەرەوەی دەروازەی ڕومەن نیشتەجێ بوو. بە ڕواڵەت ئەو برێک خۆشگوزەران بوو، هەرچەندە لە ژوورەکانیدا شتێکی وای لێنەبوو کە نیشانەی خۆش ڕابواردن بێت. لە شتە چکۆلە و وردیلەکاندا لایەنی خۆش ڕابواردنی گرتبووە بەر، بەڵام بە گشتی لە هەموو شتێکدا ڕێکوپێکی و خۆشسەلیقەیی پێوە دیار بوو کە گالی و ڕیکاردو پێیان سەیر بوو.

ئەوان وایاندەزانی لەگەڵ پیاوێک ڕووبەروون کە هەروەک وڵاتانی ئامازۆن زۆر سادە و بێگرێ و گوڵ ژیاوە، بەڵام بە دیتنی کراواتە جوان و خاوێنەکان ڕیزێک چەکمە و گوڵێکی زۆر کە هەمیشە لە سەر مێزی نووسینەکەی دانرابوو زۆریان پێسەیر بوو، لە سەریەک بە باشی لە یەکتری حاڵی بوون مێشەکەرانە لەگەڵ هەموو کەسێک بە تایبەت لەگەڵ ئەندامانی ناوچەیی بزاڤی مازینی هەڵس و کەوتێکی باش و دلۆڤانانەی هەبوو، بەڵام جما لەو بارەوە وا نەبوو، وەک بڵێی هەر لە دیداری هەوەڵەوە ڕقی لێی بوو و تێدەکۆشا هەرچۆنێک بێ نەیبینێ و لێی دوورەپەرێز بێ. دووسێ جار بە ئانقەست بە توورەییەوە لەگەڵی دووا هەر لە سەر ئەو کارەی مارتینی ڕق و قینی ئەوی بە دڵ هەڵگرت. لە پێشدا جما و مارتینی پێوەندییەکی وا نزیکیان بە یەکەوە نەبوو، دەتگوت سروشتیان وا داڕێژراوە کە سەبارەت بە یەکتری

هەستێکی نەفرەتاویان هەبێ. ئەم نەفرەت و قینەش لە لایەن مارتینییەوە بە خێرایی بەرەو شەڕاژۆیی و دژبەرایەتی دەچوو.
ڕۆژێکیان مارتینی بە شێوەیەکی خەماویەوە بە جمای گوت: « من بە لامەوە گرینگ نییە کە مێشەکەرانە ئەمنی خۆش ناوێت، ئەوەش لە بەر ئەو ڕوداوەی ڕابردووەوەیە کە خۆشم ناوێت، هەرچەندە زەرەریش وەکەس نەکەوتووە، بەڵام لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ئەو سەبارەت بە تۆ بە داخم و تێیناگەم، ئەگەر لە حیزبدا بەو هۆیەی کە ئێمە هەوەڵ جار بانگهێشتنمان کردبایەو تێکهەڵچوونمان لەگەڵی هەبایە و شێواندنێکیش سەری هەڵنەدایە، سەرکۆنەم دەکرد»
ـ سزار لێی گەڕێ، قەیناکە، دوای ئەوە منیش بەقەدەر ئەو تاوان بارم.
ـ تاوانی تۆ چییە؟
ـ ئەو ڕقێکی زۆری لە منە، هەوەڵ جار کە ڕووبەرووی یەکتر بووینەوە، ئەو شەوە لە ماڵی گراسینییەکاندا قسەیەکی زۆر ڕەق و بێڕەحمانەم پێگوت.
ـ تۆ قسەیێکی بێڕەحمانەت پێگوت؟ مادونا قەبووڵکردنی ئەو قسەیە زۆر سەختە.
ـ هەڵبەتە بە دڵ پێم نەگوت، یەکجار زۆریش بەداغ بووم. بابەتەکەی من لە بارەی کەسانێکەوە بوو کە بە ئیفلیجەکان پێدەکەنن. ئەویش قسەکەی هێنایە سەرخۆی. قەتیش ئەوم لەزەین و هزری خۆمدا وەک ئێفلیجێک نە نەخشاندبوو هەرچەند شەلینەکەی زۆریش لە چاو نادا.
ـ نا، شانێکی کەمێک لەو شانەی کەی نەویترە و دەستی چەپیشی قەوارەی گۆڕاوە نە پشت دەرپەڕیوە و نە لاقیشی خوار دادەنێ، شەلینەکەشی شیرین شەلە.
ـ بەڵێ بەو قسەیەی من سەیر لەرزی و ڕەنگی گۆڕا، ئەوەش لەبەر بێحورمەتی پێکردنی من بوو، بەڵام زۆر سەیرە کە بۆ دەبێ ئەوەندە لە لای گرینگ بێ، نازانم تۆ بڵێی لەوە پێشیش لە سەر شۆخییەکی وا ناخۆش دڵی ڕەنجابێ یان نا.
ـ بە بڕوای من زۆرتر وا وێدەچێ بۆ خۆی شۆخی و جەفەنگی ئاوای کردبێ. لە ژێر ئەو ڕواڵەتە جەزرەبە دراوەی کە دیتنەکەی بۆ من زۆر دڵتەزێن بوو؛ دەبێ دەروونێکی پڕ لە توند و تیژی و تووڕە و تۆسنی هەبێ ـ

ـ سزار ئەم بۆچوونەت تەواو بێئینسافانە و ڕقاویە منیش وەک تۆ لەوە پێش حەزم پێنەدەکرد، بەڵام بۆ دەبێ لەوەی کە هەیە خراپتری نیشان بدەین؟ ڕاستە هەڵسوکەوتی زۆر سروشتی و ئاسایی نییە ـ پێموایە زیاتر لە بالآی ڕێزی لێگیراوە. ئەو وتە بە ناوبانگەکەشی زۆر دڵگیر نییە، بەڵام پێموانییە بیهەوێت کەسێک ئازار بدات.

ـ من نازانم ویست و داخوازی تۆ چییە، بەڵام پیاوێکی کە بە هەموو کەس پێبکەنێت لە ناخیدا شتێکی باش و شیاو خۆی حەشار نەداوە. ئەو شەوە لە کۆبوونەوەکەی ماڵی فابریزیدا بەو شێوەیە کە سووکایەتی بە ڕیفۆڕمی ڕۆم دەکرد، ئەمن بەو کارەی زۆرم ڕق لێیهەستا، دەتگوت دەیهەوێ لە ناخی هەر کاروئیشێکدا شەڕاژۆیی و توندوتیژیەک بدۆزێتەوە.

جما هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی: «بە داخەوە لەم بارەوە من لایەنگری ئەوم و قسەکەی دەسەلمێنم. ئێوەی نییەت پاک کە لیپاولیپی هیوا و ئاوات و گەشبینین، هەمیشە ئامادەی وەرگرتنی ئەو فکرەن کە ئەگەر لە پڕێکدا پیاوماقووڵێکی دەروون پاک و بە تەمەن هەڵبژێردرێت بۆ پاپابوون هەموو کاروبارەکان بە خێرایی ڕێکوپێک و باش دەبن؛ هەرئەوەندە کە دەرگای گرتووخانەکە بکاتەوە لە پێش چاوی خەڵکی دەبێتە خوالەیەک و ئێمە دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە بە سێ مانگ، دەسەلاتداریەتیی هەزار ساڵەی مەسیح بپێچرێتەوە پێموایە ئێوە خراپی لێتێگەیشتوون. ئەو ئەگەر بیشیهەوێت ناتوانێ ڕیفۆڕم لە حکومەت و دەسەڵاتدا پێک بێنێت، لە ڕەگەوە خواروخێچ و ناڕێکە نەوەکوو لقوپۆپ وئەم وئەوی».

ـ کامە ئەسڵ و ڕیشە؟ دەسەڵاتی ڕامیاری پاپ؟

ـ تەنیا ئەوە؟ ئەمە برگەیەکی بچووک و هەڵەیەکی گەورەیە. چەوتی و ناڕاستی ئەوەیە کە هەر پیاوێک بتوانێ بە هێز و توانای خۆی کەسانێک بەند بکا و کەسانێکی دیکە ئازاد بکات و بەسەر جەماوەرێکی دیکەشدا حاکم بێت. هەبوونی ئاوا پێوەندییەک لە نێوان تاکە کەسێک ومرۆڤانی دیکەدا زۆر خراپ و ناڵەبارە.

مارتینی دەستەکانی بەرز کردەوە: «مادونا بەسە ئیتر» و بە پێکەنینەوە گوتی: «من ناوێرم لەگەڵ تۆ دایمەزرێنم، خێرا ئاوا دژبەرم دەوێستی. من دڵنیام کە باپیرەکانی تۆ لەو بەریتانیایانەن کە لایەنگری بەرابەری سەدەی حەڤدە بوون. دوای ئەوە من لەبەر 1M.S هاتووم بۆ ئێرە».

نووسراوەکەی لە گیرفانی دەرهێنا.

- بلاڤۆکی تازەیە؟

ـ ئەم ڕیوارزە بەدبەختە بابەتێکی هیچ و پوچی ناردووە بۆ کۆبوونەوەکەی دوێنێی کۆمیتەکە من دەمزانی کە خێرا بەرهەڵستکاری ئەو دەبووین.

- کوێی خراپە؟ سزار پێموایە سزای پێش تاوان دەدەی. شایەد ڕیوارزمان زۆر خۆش نەوێت، بەڵام ئەوبێئەقڵ و نەفام نییە.

- من ناڵێم کە ئەو نووسراوەیە بیرمەندانە نییە، بەڵام باشتر وایە کە خۆت بیخوێنیتەوە.

ناوەرۆکی بڵاوکراوەکە نووسراوەیەکی برگەییە لە سەر شادی و خۆشەویستی خەڵکی سەبارەت بە پاپا کە هێشتا لە ئیتالیادا ڕەنگدانەوەی هەر ماوە ، ئەم بڵاوکراوەیە وەکوو هەموو نووسراوەکانی مێشەکەرانە پڕە لە توونـدوتیژی و ڕقوبێزاری، بەڵام جما سەرەڕای ئەوەی کە لە سەر شێوازەکەی تووڕە بوو . ناچار بوو لە دڵی خۆیدا ڕاستی و دروستی ئەو ڕەخنەیەی لا پەسند بێ، نووسراوەکەی لە سەر مێزەکە دانا و گوتی: «من بە ڕاستی لەگەڵ تۆ دام کە ئەم نووسراوەیە بە شێوەیەکی توندئاژویانە بە ڕق و قینەوە نووسراوە، بەڵام لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە کە هەمووشی ڕاستە».

- جما!

ـ بەڵێ وایە. ئەم پیاوە مارماسیەکی زۆر لە سەرەخۆیە، بەڵام حەق بەویشە قازانجێکی بۆ ئێمە نییە کە خۆمانی پێ فریو دەین و بڵێین ئەم تیرە خاڵەکە ناپێکێ ـ بەڵکوو ڕاست دەیئەنگێوێ!

- جا ڕای تۆ وایە کە ئەو بابەتە چاپ بکەین؟

---

1 ـ نووسراوە یان دەسنووس

- ئەمە مژارێکی جیا لەوەیە، من ناڵێم کە ئەم بابەتە ڕاست هەر ئاوا چاپ بکەین، ڕەنگە هەموو کەسێکمان لێ بڕەنجێ و لێمان جیا بنەوە و هیچ نرخێک و قازانجێکیشی نابێت. پێموایە، ئەگەر ئەو دیسان بینووسێتەوە و بڕێک ڕستەی تایبەتی لێهەڵاوێرێت بەڵکوو ئاوا ببێتە وتارێکی زۆر بە نرخ، لە بارەی ڕێتمی سیاسیەوە زۆر باشە نەمدەزانی کە دەتوانێ ئاوا بە باشی بنووسێ باسی شتی وای کردووە کە ئێمە هیچکاممان ناوێرین هەر بیریشی لێ بکەینەوە، لەو لاپەڕانەیدا کە ئەو، ئیتالیای بە پیاوێکی مەست و سەرخۆش شوبهاندووە کە دەگری و خەمینە و خۆی بە شانی دزێکەوە ڕاگیر کردووە و ئەویش گیرفانەکانی خاڵی دەکات، کارێکی زۆر جوانە!

- جما! ئەمە ڕاست خراپترین بەشیەتی من لەم لوورە لوورەی کە سەبارەت بە هەموو کەس و هەموو شتێک ڕەشبینە بێزارم!

منیش بێزارم، بەڵام خۆئەمە شەرت نییە. ڕیوارز شێوە نووسینێکی زۆر ناخۆشی هەیە، وەک مرۆڤێکیش زۆر باش و دڵگیر نییە، بەڵام کاتێ دەڵێ ئێمە خاچ پەرستین و دوور کەوتووینەتەوە لە ئامێزگرتنی یەکتر و لە دۆستایەتی و ئاشتی و خۆشەویستی ؛ تەنیا ئەو کەسانەی کە لەو کارەدا قازانج دەکەن ژێزوئیتەکان و سانفدیستەکانن. بە ڕاستی هەزاران جار قسەی ئەوەو ڕاست دەکات، خۆزگە لەو کۆبوونەوەکەی دوێنێدا بام، ئاخرەکەی چ تەمایەکیان گرت؟

- بەڵام ئەوشتەی کە سەبارەت بە ئەو هاتوومەتە ئێرە ئەمەیە کە داوات لێ بکەم بچی بۆلای‌و ڕازی بکەی شێوازی وتارەکە نەرمترکات.

- من؟ هێشتا ئەو بە باشی ناناسم، لەوە سەیرتر، ئەو ڕقی لە منە، بۆ دەبێ لەنێو ئەو هەموو کەسەدا من بچم؟

- تەنیا لەبەر ئەوەی کە ئەمڕۆ کەسێکی دیکەمان پێشک نایەت کە ئەو کارە جێبەجێ کات، پاشان تۆ لە هەمووومان ئاقڵتر و ژیرتری، وەکوو ئێمە بە قسەی هیچ و پوچ لەگەڵی دانابەستی و چەلەحانەی لەگەڵ ناکەی.

- بێگومان من قسەی هەڵیت‌وپڵیتی لە گەڵ ناکەم، زۆر باشە، هەرچەندە زۆر گەشبین نیم کە سەرکەوتو وبم، بەڵام لەبەر ئێوەش بێ دەچم.

- دڵنیام ئەگەر هەوڵ بدەی ڕازی دەکەی. بەڵێ، جارێکی دیکەش دەیڵێمەوە کە لەوەی هەموو ئەندامانی کۆمیتە لە باری ئەدەبیەوە نووسراوەکەیان پێباش بووە ئەو خۆشحاڵ دەکات با ئەوەشت پێبڵێم کە ئەمە ڕاست ڕاستە و بێ گرێوگۆڵە.

مێشەکەرانە لە پەنای مێزەکە کە بە گوڵ و گیا داپۆشرابوو دانیشتبوو، نامەیەکی کراوەی لە سەر ئەژنۆ بوو و بە پەرۆشێکەوە لە ئەرزی ژوورەکەی دەڕوانی، کە جما لە دەرکەی دا سەگێکی تووکن کە لەبەر پێیدا و لە سەر فەرشەکە خەوتبوو کەوتە مرەمر، مێشەکەرانە بە پەلە هەستا سەرپێ و بە ساردوسڕییەوە سنگی بۆ دانەواند. لەپڕێکدا ڕوخساری تێکچوو، بە تەوسەوە گوتی: «گەورەیی خۆتان بە جێ هێنا، ئەگەر بە منتان ڕابگەیاندایەت کە دەتهەوێ قسەم لەگەڵ بکەی، بۆخۆم دەهاتمە خزمەتان.

جما چوونکە دەیزانی کە بە دیتنی ئەو بێشک بێزارە ، بە پەلە بابەتەکەی پێڕاگەیاند . مێشەکەرانە جارێکی دیکە بە ڕێزەوە سەری دانەواند و کورسییەکی لەبەر دەمی دانا.

- کۆمیتە دیهەویست کە من دیدارێکم لەگەڵ تۆ هەبێ، چونکە لە سەر ئەو نووسراوەی ئێوە بیروڕای جیاوازیان هەیە.

مێشەکەرانە بە پێکەنینەوە ڕووبەڕووی ئەو دانیشت، گوڵدانێکی گەورە کە پڕ بوو لە گوڵی داودی خستیە نێوان ڕوخساری خۆی و شەوقەکەوە.

- زۆربەي ئەندامانی کۆمیتە لایەنی ئەدەبی نووسراوەکەیان پێ باشە، بەڵام لە لایەکیترەوە لە سەر ئەو ڕایەن کە ئەم بابەتە ئابەو شێوەیە لەمڕۆکەدا شیاوی چاپ نییە، ئەوان لەوە دەترسن کە نەوەکا شێوازی توندوتیژی ئەو ببێتە هۆی ئەوەی کە لایەنگران و یارمەتیدەرانی حیزب کە زۆر بە نرخ و بایەخن لێمان زویر بن وڕێگای خۆیانمان لێ جیا کەنەوە.

مێشەکەرانە گوڵێکی داودی لە گوڵدانەکە دەرهێنا و بە ئارامیەوە پەڕەی گوڵەکەی لێ کردەوە. جما بە دیتنی دەستی ڕاستی کزی ئەو کە بە بێهێزیەوە پەڕەی گوڵەکانی لێدەکردەوە زۆر پەرێشان و ناڕەحەت بوو، دەتگوت ئەو جۆرە کارەی لە جێگایەک دیتبوو. مێشەکەرانە بە سارد و سڕییەکەوە گوتی:

«ئەم نووسراوەیە لە باری ئەدەبییەوە زۆر بێبایەخە، تەنیا لەبەر چاوی کەسانێک بلیەخدارە کە لە سەر ئەدەبیات هیچ زانیارییەکیان نەبێت، بەڵام سەبارەت بە زوێربوونیان، ئەمە ڕاست ئەو شتەیە کە من لێی دەگەڕێم».

ـ تەواو لێت حاڵیم، ترسی ئەوە هەیە کە لە پێکاندنی کەسایەتی تاوانبار سەرکەوتوو نەبێت.

مێشەکەرانە شانی هەڵتەکانت، پەڕەی گوڵێکی خستە بەین ددانییەوە و گوتی: «پێموابێ هەڵە دەکەی، کێشەکە ئەوەیە کە: کۆمیتەکەی ئێوە منی لەبەر چ شێک بانگهێشتنی ئێرە کردووە؟ پێموابێ بۆ لە قاودانی ڕۆڵی ژێزوئیتەکان و ژوورجاڕی بە وانە. من تا ئەو جێگەیەی بتوانم ئەرکی خۆم بە باشی بە جێ دێنم».

ـ ئەمنیش دەتوانم ئەرخەیانت کەم کە هیچ کەس شک و گومانی لەوە دانییە کە تۆ لێهاتوو دەروونپاکی. کۆمیتە لەوە نیگەرانە کە کرێکارانی شار ئیتر لایەنگری و پشتیوانی ئەخلاقی لە حیزب نەکەن. پێموابێ تۆ دەتهەوێ لەو نووسراوەیەدا هێرش بکەیتە سەر سانفدیستەکان، بەڵام زۆربەی خوێنەران ئەو کارە بە هێرشکردنە سەر کلیسا و پاپ دەزانن، کۆمیتەش ئەو کارە بە تاکتیکێکی ڕامیاریی باش نازانێ.

ـ وردە وردە تێدەگەم، تا ئەو کاتەی کە من لەگەڵ گرووپێکی تایبەتی پیاوانیئایینیدا کە حیزب ئێستا لەگەڵ ئەواندا پێوەندییەکی باشی نییە ـ دژبەرایەتیم هەیە هەروەختێک پێمخۆش بێ دەتوانم ڕاستیەکان بدرکێنم، بەڵام هەر کە بچم بۆلای ئەو قەشانەی کە کۆمیتە حەزی لێیانە، ئەو کاتە «ڕاستی و دروستی وەکوو سەگێک وایە کە دەبێ بەرەو کون و قوژبنێک ڕاو بنرێ؛ کاتێ کە پاپای خۆشەویست ڕاوەستاوە و دەرڕوانێتە ئاگرەکە دەبێ ئەو سەگە ڕاونرێ»[1] بەڵێ ئەو بێئەقڵە ڕاستی دەکرد. من هەر جۆرە ئینسانێک بم پێمخۆشە، بەڵام مرۆڤێکی بێئەقڵ و نەفام نەبم.

هەڵبەت من دەبێ ملکەچی بڕیاری کۆمیتە بم، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لە سەر ئەو باوەڕەم کە کۆمیتە توانایی فیکریی خۆی لە هەردوو لایەنەکەدا لە

---

1 . وتەی «نەفام» لە شانۆی شکسپیەردا بە نێوی کینگلیر . لێرەدا مەبەستی نووسەر ئەوەیە کە هەر کاتێ ئازانجی پاپ لە ئارادابێ دەبێ ڕاستیەکان ژێرپێ نرێ.

خۆرا خەسار دەکا و میس... میس میسو... مو... مونتانلی وەلاناوە و کاری پێی نییە.

جما دووپاتی کردەوە: «مونتانلی؟ تێناگەم ئۆسقۆفی بریزیگولا دەڵێی».

- بەڵێ، پاپی تازە پلەوپایەی ئەوی گەیاندە کاردینالی. سەبارەت بە وی برووسکەیەکەم لێرە پێبوو، پێتخۆشە گوێت لێبێ؟ نووسەری ئەو برووسکەیە یەکێکە لە برادەرەکانی من، کە لەوبەری سنوور دەژی.

- سنووری پاپانشین؟

- بەڵێ ئەمەیە ئەو شتەی کە ئەو نووسیویێتی...

کاتێ جما دەهاتە ژووری برووسکەکەی بە دەستەوە بوو، برووسکەکەی هێنا و بە دەنگێکی بڵێند خوێندیەوە. لە پڕێکدا سەیر زمانی گیرا: «بەو زووانە چا - چا - چاوتان ڕوون دەبێتەوە بە دیداری یەکێ لە خراپترین، د - دوژمنانی کا - کاردینال لۆرێنز و مو - مو - مونتانلی، ئۆسقۆفی بریزیگولات بە نەسیب دەبێ، ئەو بە تە - تەما بوو-»

لە خوێندنەوە دەستی ڕاگرت، بڕێک ڕاوەستا و دیسانەوە ئارام و بە پشوودرێژییەکی زۆرەوە درێژەی پێدا، بەڵام ئیتر زمانی نەدەگیرا: «ئەو بە تەمایە کە لە مانگی داهاتوودا بۆ ئەرکی و ڕێکخستن و پێوەندی دیدارێکی لە توسکانی هەبێ، لە پێشدا لە فلورانس موعیزە دەکات و سێ حەوتوو لەوێ دەمێنێتەوە دوایی دەچێ بۆ سیێنا1 و پیزا و دواییش لە ڕێگای پیتویاوە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆمانیا2.

ئەو بە ئاشکرا ئەندامی حیزبی لیبراڵە کە سەر بە کلیسایە و دۆستی نزیکی پاپ و کاردینالفرتییە3. لە زەمانی گرگوریدا دەگیرێ و لە کوێستانەکانی ئاپنین دوور لە خەڵکی ڕادەگیرێ. ئێستا لە پڕێکدا سەرکەوتوو بوە و ، هەڵبەتە ئەویش وەکوو هەموو سانفدیستەکان هەوسارەکەی لە دەستی ژێزوئیتەکان دایە. ئەم مەئموریەتە لە لایەن پاپایەکی ژێزوئیتەکانەوە

1 . Siena

2 . RomanGna

3 . Feretti

پێشنیار کرا ئەو وێژەرێکی گەورەی کلیسایە، وەکوو لامبروچینی ڕێوی‌سیفەت و فێڵ بازە. ئەرکەکەی ئەمەیە کە نەیەڵێ خۆشحاڵی و شادی خەڵک کە لەبەر پاپا بەرپا بووە بەرەو کزی بچێ، بەو کارە خەڵکی بە خۆیەوە سەرگەرم بکات تا ئەو کاتەی کە کارگێڕانی ژێزوئیت ئەو گەلاڵەیەی کە بە دەستیانەوەیە بۆ واژۆ کردنی دەیخەنە بەردەستی گڕاندوک، بەلام من لە باش و خراپی ئەو گەلاڵەیە نەگەیشتم». دوایی دەنووسێ: «ئایا مونتانلی لێی حاڵیە کە لەبەر چ هۆیەک ناردویانەتە توسکانی، یان ئەوەی کە ژێزوئیتەکان گەمەی پێ‌دەکەن، ئەوە بۆ من ڕوون نییە، ئەو یان خوێڕیە پیاوێکی زۆر وشیارە یان گەورەترین ولاخێکە کە تا ئێستا لە دایک بووە، لەوە سەیرتر ئەمەیە کە تا ئەو جێگایەی من لێی تێگەیشتبێتم نە بەرتیل وەردەگرێ، نە گراوێشی هەیە، هەوەڵ جارمە کە گیان‌لەبەرێکی ئاوا دەبینم».
برووسکەکەی لە سەر مێزەکە دانا، چاوەکانی چکۆلە کردەوە و بە ڕواڵەت مەحتەلی قسەکردنی جما بوو و لێی ڕوانی.

جما دوای کەمێ بێدەنگی پرسی: «ئایا لە ڕاستی و دروستی هەواڵنێرەکەی خۆت دڵنیای؟»

ـ سەبارەت بەوەی کە ژیانی تایبەتی منسیونیور مونتانلی سەرکۆنە ناکرێ؟ نا، بۆ خۆشی دڵنیا نییە، ئێوە خۆتان دەیبینن کە ئەو باسەی کە بە کاری هێناوە بە شەرتوو ئەگەرەوە بەسراوەتەوە، هەڵبەت تا ئەوجێگایەی کە من لێی حاڵی بووبێتم....

جما بە بێ‌مەیلیەوە گوتی: «ئەوەم نەدەگوت، مەبەستم ئەو خاڵە بوو کە سەبارەت بەو ئەرکە نووسرابوو».

ـ باوەڕی تەواوم بە نووسەرەکەی هەیە، ئەو یەکێ لە دۆستە قەدیمیەکانی منە. هاوڕێیەکی ساڵی ٤، کە بە هۆی ئیش و کارەکەیەوە گەلێ دەرفەتی باشی بۆ هەڵدەکەوێ تا ئەو جورە کێشانە بخاتە ڕوو.

جما خێرا بیری لەوە کردەوە: «کەسێ بە پلەومەقامێکی واوە لە ڤاتیکان، وادیارە پێوەندیەکانی ئەو لەو شێوەیەیە؟ هەستم دەکرد کە دەبێ لەو جۆرە کەسانەبێ».

مێشەکەرانە درێژەی پێدا: «هەڵبەتە ئەمە برووسکەیەکی تایبەتیە و سەرنجت بەوە داوە کە بابەتەکانی ئەو حەتمەن دەبێ لە چوارچێوەی ئەندامانی کۆمیتەی ئێوەدا بمێنێتەوە».

- پێویست بە وشیار کردنەوە ناکات، بەڵام سەبارەت بە نووسراوەکە ئێزنم پێدەدەی کە بە کۆمیتە ڕابگەیەنم کە ئێوە ڕازین لە دووسێ جێگادا گۆڕانکارییەکی بچوک پێکبێنن یان...

- سینیورا پێتان وانییە کە گۆڕانکاری لەمەڕ توونودتیژی بابەتەکە، جوانیی ئەم بەستە ئەدەبیە بشێوێنێ؟

- تۆ بیروڕای خۆم دەپرسی، بەڵام ئەوەی کە من لێرە بەیانی دەکەم و لەبەر ئەو هاتووم، کۆ کراوەی بیروڕای کۆمیتەیە.

- ئەو قسەیەی تۆ ئەوە ناگەیەنێ کە دژی بیروڕای کۆمیتەی؟

پێشتر برووسکەکەی خستبووە گیرفانییەوە، ئێستا کەمێ دانەوی و بە شێوەیەکی وردبینانە و بە دڵگەشیەوە زۆر بە وردی لە ڕوخساری ئەوی ڕوانی.

- بە ڕای ئێوە....

- ئەگەر دەت هەوێ ڕای خۆم بزانی چییە... بۆچوونی من لە سەر هەردوو بابەتەکەدا دژایەتی هەیە لەگەڵ بیروڕای زۆرینە. من ئەم بڵاڤۆکەم لە باری ئەدەبیەوە هیچ پێ باش نییە، بەڵام لەبەر ڕاگەیاندنی ڕاستیەکان و لە باری تاکتیکییەوە زۆر ژیرانەیە.

- یانی...

- من لێرەدا تەواو لە سەر قسەی تۆم کە ئیتالیا بەرەو ئامێز و ناخی زەلکاو هەنگاو دەنێ زۆر وێدەچێ کە بە هۆی ئەم گەشبینییەوە بە چاڵەرەشێکی سامناکدا ڕۆبچێ، منیش ئەگەر بمتوانیبایە بە پانەوە و بوێرانە ئەم بابەتە بدرکێنم پڕ بە دڵ خۆشحاڵ دەبووم، تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆی تەریک کەوتنەوەی بڕێک لە هاوبیرانی ئێستامان، بەڵام من وەک تاکەکەسێکی ناو کۆمەڵ کە زۆرینەیان بیروڕایەکی جیا لەوەیان هەیە، ناتوانم لە سەر بیروبۆچوونی خۆم پێداگربم، بەڕاستی من پێموایە کە ئەگەر پێویست بێ

بابەتي ئاوا بەیان بکریت، دەبێ بە نەرمی و بە ئارامی بگوترێت، نەوەک بەو شێوەیەی کە لەم نووسراوەیەدا نووسراوە.

- دەکرێ چاوێک لەو برووسکەیە بکەم؟

برووسکەکەی دەرهێنا و چاوێکی بە پەڕەکانیدا گێڕا، بە هۆی ناڕازی بوونییەوە نێوچاوانی تێکنا.

- بەڵێ بەڕاستی قسەی تۆ ڕاستە. ئەم بڵاوکراوەیە بە شێوەی بەستەیەکی ژووریی بۆ Cate 1chanatant نووسراوە، نەوەکوو بڕگەیەکی ڕامیاری.

- بەڵام مرۆڤ دەتوانێ چی بکا؟ ئەگەر من شتێک بنووسم کە زمانێکی ئەدەبی و قورسی هەبێ ، خەڵکی تێیناگەن. دەڵێن بابەتێک کە بە ڕقەوە نەنووسرابێ، ئینسان ماندوو دەکات.

- پێتان وانییە وتارێکیش کە لە ڕادەبەدەر ڕقاوی و قیناوی بێت مرۆڤ چاک ماندوو دەکات؟

مێشەکەرانە بە گۆشەی چاو نیگایێکی تیژی تێبڕی و قاقای کێشا: «سینیورا! بە ڕواڵەت کەسایەتی سامناک هەن کە هەمیشە قسەی ئەوان ڕاستە، جا ئەگەر من بە کەڵکەڵەی ڕق و قینەوە ملکەچ بم زەمانێک دێت کە منیش وەکوو سینیوراگراسینی مەجلیس ناخۆش و بێتام دەبم؟ ئەی خوایە گیان وەرە سەیری بەخت و نێوچاوانی من! نا پێویست ناکا نێو چاوت تێک نێی. دەزانم کەیفت بە من نایە، وا چاکە باسی بابەتەکە بکەم. جا پوختەی قسەکەمان ئاوا دەبێ: ئەگەر من ڕێگای ڕەخنە و گازندە لە کەسایەتیە کان لە سەر خۆم تابۆ بکەم وبەشێکی زۆری ئەم بابەتە هەر بە شێوەی خۆی بهێڵمەوە. کۆمیتەش کە نەتوانێ چاپکردنەکەی بە ئەستۆ بگرێ ، زۆر بە داخ دەبێ !

ئەگەر ڕاستیە ڕامیاریەکانی لێ هەڵاوێرم و هەموو نێو و نێونیتکە ناشیرینەکان، بۆ دوژمنەکانی حیزب دانێین، کۆمیتە زۆر بە باشی ڕێزی لێدەگرێ، بەڵام بە ڕای من وبە ڕای تۆش،ئیدی ئەوکات شیاوی چاپ نابێ، ئەمە خاڵێکی گرینگ و جێگای سەرنجە: کامەیان بکەین، کردە پەشیمان بین

1 . ڕیستورانێک کە گۆرانی و سەمای تێدابێ.

یان نەکردە پەشیمان، چاپ بێت و بایەخی چاپبوونی نەبێ، یان شتێکی بە نرخ بێت و چاپ نەکرێت، کامەیان باشە سینیورا؟»

ـ پێم‌وایە وا باشترە تۆ کارت بەو گۆڕانکاریە نەبێ ، ئەگەر ڕەخنە و گازندەت لە مەڕ کەسایەتیەکان لێکەم بکردایەت، کۆمیتە ڕازی دەبوو چاپی بکات. هەرچەند زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەش ڕازی نەدەبوون و من پێم‌وایە زۆر بەجێ و باش دەبوو، بەڵام تۆ دەبێ ئەو ڕقەبەرایەتیە وەلانێی، ئەگەر دەتهەوێ تەوەرێک بێنیتە ئاراوە کە وەکوو حەبێکی گەورە و باش دەرخواردی خوێنەرانتی بدەی، خۆنابێ ئەوان بە دیتنی بترسێنی.

مێشەکەرانە هەناسەیەکی هەڵکێشاو لەرووی ناچاریەوە شانەکانی هەڵتەکاند: «باشە ڕازی دەبم سینیورا، بەڵام بە شەرتێک ، ئەگەر ئێستە بەقسەم ناکەن و نارەحەتم دەکەن، جارێکی دیکە دەبێ خۆشحاڵم کەن و لە سەر بیروڕای من بن، کاتێ کە بەڕێز کاردێنال دێ بۆ فلوڕانس، ئێوە و کۆمیتە نابێ بەرهەڵستکاری ڕق و بێزاری من بن، ئەم کارە ئەرکی منە!»

بە شێوەیەکی هێدی و لە سەرەخۆ دەدوا، گوڵە داودیەکانی لە گوڵدانەکە دەردەهێنا و هەڵی دەهێنان تا لەبەر شەوقی چراکە باشتر پەڕە ناسکەکانی ببینێت. جما بە دیتنی لەرزینی توندی گوڵەکان لە دڵی خۆیدا گوتی: «دەستی چۆن دەلەرزێ، پێم‌وانییە شەڕاب بخواتەوە!» کاتێ کە هەڵدەستایە سەر پێ گوتی: «باشتر وایە خۆت ئەم باسە لەگەڵ ئەندامانی دیکەی کۆمیتەدا باس بکەی، من ئەسڵەن لێرەوە ناتوانم شتێک بڵێم کە ئەوان لەوبارەوە چ بۆچوونێکیان دەبێ».

مێشەکەرانە هەستا سەرێ و پاڵی دا بە مێزەکەوە و کاتێ کە گوڵەکانی بە دەم و چاوی خۆیدا دەهێنا گوتی: «ئەی تۆ دەڵێی چی؟»

جما دوودڵ ما، ئەم پرسیارە ئەوی ڕاچڵەکاند و بیرەوەریە تاڵوکۆنەکانی لە زەینیدا زیندوو کردەوە . ئاخرەکەی گوتی: «من... باش نازانم، چەند ساڵێک لەوەپێش بڕێک زانیاریم سەبارەت بە منسینیور مونتانلی دەزانی، ئەو کات من کچ بووم و ئەو کانوون و بەرپرسی سمیناری زانستی ئایینی ئەو هەرێمە بوو کە من لە وێدا دەژیام. زۆر شتم سەبارەت بە وی... لە کەسێکی

که ئەوی لە نزیکەوە دەناسی بیستووە، بەڵام قەت شتێکی خراپی نەگوت، بە ڕای من لەو سەر دەمەدا ئەو پیاوێکی باش‌و لێهاتوو بوو، بەڵام ئەم شتەی کە باسم کرد هی ڕابردوویەکی دوورە، ڕەنگە ئێستا فەرقی کردبێ. هەست بە بەرپرسیارەتی دڵسۆزانە نەبێ زۆربەی کەسایەتیەکان بەرەو زەلکاوی گەندەڵی ڕاکێش دەکا».

مێشەکەرانە چاوی لە سەر گوڵەکان هەڵبڕی و بە نیگایەکی پڕ ماناوە لیی‌ڕوانی: «ئەگەریش منسینیورمونتانلی بۆخۆی کەسێکی هیچ و پووچ و خوێڕی نەبێ، داردەستی خوێڕیە پیاوانە، بە ڕای من و...دۆستانی من کە لەوبەری سنوورن هەردووکیان یەک مانایان هەیە. ئەگەر بەردێک لە سەر ڕێگای مرۆڤایەتی بێ، با بە نیازی چاکە و پیاوەتیش بێ، بەڵام دەبێ لای بەیت و فڕێی دەیتە ئەولاوە».

- ئەگەر ئیزنت لە سەر بێ من دەڕۆم سینیورا!

زەنگەکەی لێدا و بە شەلەشەل چووە لای دەرگاکە و بوی کردەوە.

- سینیورا گەورەت کردم کە هاتی بۆ دیدەنیم. ئەگەر دەکرێ با کەسێک بنێرم« Veturra[1]»ات بۆ بێنێ؟ نا؟ زۆر چاکە خودات لەگەڵ بێ! بیانکا تکایە دەرگای سەرسەراکەی بۆ بکەوە.

جما بە فکر و هزرێکی پەرێشانەوە گەیشتە سەر شەقام. «لەوبەری سنوور دۆستانێکم هەیە» - ئەوانە کێن؟ و چۆن و بە چ شێوەیەک بەردی سەر ڕێگاکەت دەبێ فڕێ دەی؟ ئەگەر تەنیا قسەیەکی داشۆرین بێ، ئەی بۆچی ئەو قسەیەی بە نیگایەکی سامناکەوە بەیان کرد؟

---

1 - عارەبانە

# ٤

مونتانلی لە هەوەڵین حەفتەی مانگی ئۆکتۆبەردا گەیشتە فلۆڕانس، ئەو دیدارەی شەپۆلێکی دڵەکوتەی خستە داوێنی شارەوە.

ئەو کارووس‌وێژێکی(مۆعیزە وێژ) بە ناوبانگ و نوێنەری ڕیفۆرمخوازی پاپ بوو. خەڵکیش بە خۆشحاڵیەوە چاوەڕوانی دیداری ئەو بوون تا سەبارەت بە «ئایینی نوێ» یانی خۆشەویستی و دۆستایەتی بدوێ کە بڕیار وا بوو ئازار و برینەکانی ئیتالیا سارێژ بکات. دانانی کاردینال گینزی بۆ وەزارەتی دەرەوەی ڤاتیکان بە جێگای لامبروچینی کە خەڵک ڕق و قینێکی زۆریان لێی بوو، هەر ئەوە ببووە هۆی زیاتر خۆشحاڵ بوونی، مونتانلی کەسێک بوو کە بە ئاسانی دەیتوانی ئەم خۆشحاڵیەی خەڵکی بە باشی ڕابگرێت.

لە نێوان بەرپرسانی بڵیندپایەی کلیسای ڕۆمدا ئەو کەسایەتییەکی ناسراوبوو لە باری پاکی و باشیدا کەسایەتی مونتانلی ئەوەندە دەگمەن بوو کە دەیتوانی ڕوانگە و سەرنجی خەڵکی بە لاڕێدا بەرێ و فریویان بدا و خەڵکی چاو بنوقێنن لە دزی و داوێن پیسی و نگریسی و ڕسوایی کاربەدەستانی کلیسا کە ببووە پیشەی دایمی و جیا نەکراوەیی ئەوان. دوای ئەوە توانایەکی سەیر و باشی هەبوو لە وێژەری و موعیزەکردندا و بە دەنگی نەرم و بلاوێنی و کەسایەتیی ناسراوی لە هەر جێگا و هەر کاتێکدا دەیتوانی خۆی بە باشی نیشان بدا.

گراسینی، وەک عادەت و پیشەی خۆی هەموو هەوڵی خۆی خستە گەڕ تا ئەم کەسایەتیە بە نێو بانگ و تازەیە بانگهێشتنی ماڵی خۆی بکات. بەڵام مونتانلی

نێچیرێکی سرک بوو کە بە ئاسانی دەستەمۆ نەدەبوو. ئەو هەموو بانگهێشتنەکانی زۆر ژیرانە و بەرێزەوە ڕەد دەکردەوە، دەیگوت کە ناساخە یان وەختی کەمە و دەرفەتی چوونە ناو کۆبوونەوەکانی نییە، لە بەیانییەکی ڕوون و ساردی یەکشەممەدا مارتینی کە لەگەڵ جمادا لەمەیدانی سینیوریادا دەگوزەران ڕووی کردە جما و بە بێزارییەوە گوتی: «ئەو گراسینیانە چ بوونەوەرێکی سەیر و بێچاوورووون. گراسینیت دیت کاتێ کە کەژاوەکەی کاردینال دەگوزەرا چۆنی سوژدە بۆ دەبرد؟ بۆ ئەوان فەرق و تەوفیری نییە کە ئەو پیاوە چ کارەیە و چ بیروبۆچوونێکی هەیە تەنیا و تەنیا نێو و ناوبانگی هەبێ وەکوو نیسک وان بەروپشتیان بۆ کەس نییە. بە درێژایی تەمەنم قەساب و ڕاوچی وام نەدیتووە کە ناسیاوان و بە ناوبانگەکانی کۆمەڵگا بخەنە داوو تۆڕەوە. لە مانگی ئووتی ڕابردوودا مێشەکەرانە بوو، ئێستاش مونتانلی. بێشک مونتانلی لەم سەرنجە ڕازی و بە کەیفە، زۆر کەسی هەلپەرست ئەو هەل و دەرفەتەیان لەگەڵ یەکتردا بەش کردووە.

هەردووکیان لە موعیزەی مونتانلی لە کلیسای ناوەندی و جامیعەدا دەگەڕانەوە، بیسەرەکانی بەپەرۆشی، ئەوەندە زۆر بوون کە لەو کۆشکە گەورەدا هەر جمەیان دەهات و جما بەو هۆیەوە تووشی سەرئێشەیەکی قورس بوو، مارتینی کە لەبەر نەخۆش کەوتنی جما ترسی لەروو نیشتبوو ڕازی کرد کە پێش تەواو بوونی بەرنامەی (عیشای ڕەبانی) بچنە دەرەوە.

دوای بارانێکی خەست کە دیمەنێکی جوان و بەیانییەکی هەتاوی وجوانی پێک هێنا بوو، بەهانەیەکی باش بوو تا مارتینی پێشنیاری پیاسەکردنێک بە جما بکات بە نێو باخەکانی داوێنی سانیکولودا. جما وەڵامی داوە: «نا، سەیاحەتم پێخۆشە،، بەڵام نەوەکوو بەرەو ئەو تەپکانە، وەرە با بە درێژایی لونگئارنۆدا پیاسە بکەین، مونتانلی کاتێ کە لە کلیساوە بگەڕێتەوە بێرەدا دەڕوا، منیش وەکوو گراسینیم ـ پێمخۆشە کەسایەتیە ناسراوەکان ببینم».

ـ خۆ تۆ قەدەرێک لەوە پێش ئەوت دیت.

ـ لە نزیکەوە نەمدیت، لە کلیسادا قەرەباڵخەکە زۆر بوو، ئەو کاتەش کە عارەبانەکە لەوێوە دەگوزەرا پشتی لە لای ئێمەوە بوو. ئەگەر لە پردەکە

دوور نەکەوینەوە حەتمەن بە باشی دەبیینین ـ ئاخر لە لونگئارنودا نیشتە جیّیە.

ـ بۆچی وا خێرا کەلکەڵەی دیتنی مونتانلی کەوتە خەیاڵت؟ خۆ تۆ قەت سەرنجت نەدەدایە ئەو جۆرە ئینسانانە.

نا،مەبەست بیستن و دیتنی کارووس بێژە بە ناوبانگەکان نییە، دەمەوێ ئەم کابرایە ببینم، پێمخۆشە بزانم لەو کاتەوەی ئەوم نەدیتووە هیچ فەرقێکی کردووە.

ـ لە کەنگێوە نەتدیتووە؟

ـ دوو ڕۆژ پێش مردنی ئارتور بوو.

مارتینی بە پەروشێکەوە چاوی لێ کرد، ئێستا گەیشتبوونە لونگئارنۆ و جما وا پەرێشان بوو کە مارتینی بە دیتنی ئەو سەر و وەزعە پەشێوەی ، بێزار و دڵمەند بوو و ڕوانییە پانتایی ئاوەکە.

مارتینی پاش بێدەنگییەک گوتی: «جما، ئازیزم ئایا دەتهەوێ ئەو بیرەوەریە تاڵ و ناخۆشە تا دوا پشووی ژیانت دوڵپای سەرشانت بێ؟ هەموومان لە تەمەنی حەڤدە ساڵیدا تووشی هەڵە و لارێ بوون بووین».

جما بە پشێویەوە وەڵامی داوە: «بەڵام هەموومان لە حەڤدە ساڵیدا ئازیزترین و خۆشەویستترین دۆست و گراوێی خۆمان نەکوشتووە». شانی بە میلەئاسن بەردینەکانی پردەکەوە دا و ڕوانییە ئاوی چۆمەکە. مارتینی ئیتر نەدوا، هەر وەختێک جما وای لێدەهات نەیدەوێرا قسەشی لەگەڵ بکا.

جما بە ئارامی چاوەکانی هەڵێنا و لە چاوی ئەوی ڕوانی: قەت نەمتوانیوە لە ئاو بڕوانم و نەیەتەوە یادم کە ئێمە...» دوایە بە تووڕەیەوە لەرزی گوتی: «سزار کەمێ پیاسە بکەین، لەترسی سەرما ناتوانین ڕاوەستین»

بەبێ دەنگیەوە لە سەر پردەکەوە گوزەران و بە درێژایی شەقامی قەراخ چۆمەکەوە ڕۆیشتین، پاش کەمێک درێژەی پێدا: «دەنگی ئەم پیاوە چەند دڵگیر و خۆشە! شێوەی دەنگی ئەوم لە دەنگی کەسدا نەبیستووە، بۆ کاریگەری و کار تێکردن لە سەر خەڵکی، ئەم دەنگە خۆی نیوەی کارەکەی لە ئەستۆ گرتووە».

مارتینی جەختی کرد: «دەنگێکی سەیر و سەرسوورِ هێنەرە» و لە سەرئەم تەوەرەیە دوا، کە بەشکم بیرەوەریی ناخۆشی گوێی چۆمەکە کە لە زەینی جمادا زیندوو ببوەوە بە جۆرێک لە بیری بچێتەوە: «دەنگیش هیچ، دەتوانم بڵێم گەورەترین وێژەرێکی ئایینییە کە من تا ئێستە دیتوومە، بەڵام من لە سەرئەو رایەم کە ڕاز و نهێنی کاریگەری ئەو لە سەر ئەو خەڵکە زۆرلەوە قووڵتر و بەرینترە. ئەمەش بە هۆی ژیانیً ئەوەوەیە کە لە ژیانی ئۆسقۆفەکانی دیکە باشتر و بەرچاوترە، من پێموایە ناتوانی کەسێکی بڵێند پایە وەک ئەو بدۆزیەوە ـ جیا لە کەسایەتی پاپا ـ لە کلیسای ئیتالیادا نێو و ناوبانگی ئاوا بە باشی و بە پاکی دەرچووبێ. لە بیرمە کە پارەکە کە لە ڕۆمانیا بووم، ڕۆژێکیان کاتێ لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئۆسقۆفی ئەوەوە دەگوزەرام، گوندنشین وخەڵکی ئەو کوێستانە هەزارانەم بینی کە لە ژێر باراندا چاوەڕوانی دیداری ئەو یان زیارەتی جل و بەرگەکەیان دەکرد. لەو ناوچەیەدا هەر وەکوو شتێکی پیرۆز ڕێزی لێدەگیرێ، ئەوەش لە حاڵێکدایە کە خەڵکی ڕۆمانیا ڕقێکی زۆریان لە کەسایەتی ئایینییەکان هەیە .کابرایەکی پیری گوندنشینم دیت کە ڕواڵەتی وەکوو قاچاخچی دەچوو ـ پێمگوت: «وەکوو دیارە خەڵکی حەز و خۆشەویستیەکی زۆریان لە ئۆسقۆفەکانە و ئەو وەڵامی داوە: «ئێمە ئۆسقۆفەکانمان خۆش ناوێ ئەوان درۆزنن، منێسینیورمونتانلیمان خۆش دەوێ، تا ئێستە کەس نەیدیتووە کە درۆیەک بکات یان کارێکی ناعادڵانە ئەنجام بدات».

جما وەکوو ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێ بە هێواشی و نەرمیەوە گوتی: «نازانم کە ئایا ئەو بۆ خۆێ دەزانێ کە خەڵکی سەبارەت بە وی ئاوا بیر دەکەنەوە».

ـ بۆ نازانی؟ پێتوایە ئەو قسەیە ڕاست نییە؟

ـ من دەزانم کە ڕاست نییە.

ـ لە کوێوە دەزانی؟

ـ چوونکە ئەو پێیگوتم.

ـ ئەو بە تۆی گوت؟ مونتانلی؟ جما تێناگەم؟

جما پرچی سەر هەنییەی لادا وتەماشایێکی ئەوی کرد. هەروا بە بێدەنگیەوە ڕاوەستا بوون مارتینی پاڵی دابوو بە میلەئاسنکەوە، جماش بە هێواشی بە نووکی چەترەکەی لە سەر بەردی شەقامەکە هێڵی جۆراوجۆری دەکێشاوە:

- سزار ئێمە بە درێژایی ئەم چەند ساڵە پێکەوە دۆست و هاوڕێ بووین، بەڵام قەت ئەو بەڵاو ڕووداوەی کە بەسەر ئارتوردا هاتووە بۆم باس نە کردووی.

مارتینی بە پەلە پەڕیە ناو قسەکانییەوە و گوتی: «ئازیزم پێویست بە گوتن ناکا، هەموو شتێک دەزانم».

- جووانی بە تۆی گوت؟

- بەڵێ، کاتێ لە سەرە مەرگدا بوو. شەوێکیان کە لە لای ئەو بووم و بەخەبەر بووم، لەو بارەیەوە قسەی کرد. گوتی... جما ئازیزەکەم، ئێستاکە لە سەر ئەو بابەتە قسە دەکەین باشتر وایە ڕاستیەکەیت پێبڵێم... گوتی تۆ هەمیشە لە فکری ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەدا بووی و داوای لێ کردم ئەوەندەی دەتوانم دۆست و هاوڕێی تۆ بم. کارێک بکەم کە کەمتر فکر لەو ڕووداوە بکەیتەوە، منیش هەوڵ و کۆششی خۆم کردووە - هەرچەندە ڕەنگە سەرکەوتوو نەبوبێتم، بەڵام بە ڕاستی لەوبارەوە تێکۆشاوم.

جما بۆ ساتێک چاوی لە سەر ئەرزی هەڵبڕی و بە نەرمیەوە وەڵامی داوە: «دەزانم کە بە نەبوونی تۆ گوزەرانێکی ناخۆش و تاڵم دەبوو، بەڵام... ئەی جووانی سەبارەت بە منیسینیور مونتانلی لەگەڵ تۆ قسەی نەکرد؟»

- نا من نەمدەزانی کە ئەم کێشەیە پێوەندیی بەویشەوە هەیە، ئەوەی کە پێیگوتم پێوەندیی هەبوو بە... ڕووداوی سیخوڕی و....

- ئەو زلەیەی کە من لە ئارتورم دا و ئەویش لە ئاوەکەدا خۆی خنکاند لە... زۆر چاکە سەبارەت بە مونتانلی قسە دەکەین.

بەرەو ئەو پردە ڕۆیشتن کە قەرار بوو عارەبانەکەی مونتانلی لەوێوە تێپەڕێ. جما لەگەڵ ئەوەی کە قسەی دەکرد بێجووڵە چاوی لە ئاوەکە بڕیبوو: لەو کاتەدا مونتانلی کانوون بوو؛ سەرپەرشتی سمیناری زانستە ئایینیەکانی پیزای بە

ئەستووە بوو. یانەی فەلسەفەی بە ئارتور دەگوتەوە و کاتێ کە چووە زانستگا لەگەڵ ئەودا موتالاّی دەکرد. ئەو دووانە یەکتریان زۆر خۆش دەویست! زۆرتر وەکوو دوو دڵدار دەچوون تاوەکوو مامۆستا و خوێندکار. بە گشتی ئارتور ئەو جێگایەی کە مونتانلی بە سەریدا دەڕۆیشت دەیپەرست و لە بیرمە کە ڕۆژێکیان پێی‌گوتم، ئەگەر باوکی بمرێ. هەمیشە مونتانلی وەکوو باوکی خۆی بانگ دەکات ـ بوون و نەبوونی خۆی لەودا دەبینێتەوە . خۆ ئاگاداریشی کە سەبارەت بە سیخوڕەکە چی بە سەرهات. سبەینێی ئەو ڕۆژە باوکی من و بێرتێنەکان ـ زڕبراکانی ئارتور کە نەفرەتاویترین کەسایەتین ـ بۆ دۆزینەوەی تەرمی ئارتور کەوتنە پشکنین لە گۆمیلکەی دارسنادا لە قەراخ دەریا، منیش بە تەنیا لە هۆدەی خۆمدا دانیشتم بیرم لە ئاکاری خۆم کردەوە کە سەبارەت بە ئارتور کردبووم....»

کەمێک بێدەنگ بوو دوایی درێژەی بە قسەکەی دا: «درەنگانێکی شەوێ بوو، کە باوکم هاتە هۆدەکەمەوە و گوتی: «کچم جما وەرە خوارێ، پیاوێک لەوێیە کە دەیەوێ بتبینێ. کاتێ چوومە خوارەوە یەکێ لە خوێندکارەکان کە ئەندامی بزاڤە جەماوەریەکە بوو ، سەیر دەلەرزی و سپی هەڵگەڕابوو، لە ژووری چاوپێکەتن دانیشتبوو، ئەو سەبارەت بە برووسکەی جووانی کە لە گرتووخانەوە ناردبووی قسەی لەگەڵ کردین و گوتی: ئەوان لە برووسکەکەدا ڕایان گەیاندووە دەربارەی فڕو فێڵی کاردی و فریوخواردنی ئارتور لە کاتی دانپێدانانی ئەو بڕێک زانیارییان لە لایەن بەند کراوەکانەوە بیستووە. لە بیرمە کە ئەو خوێندکارە پێی‌گوتم: «لانیکەم، ئاگاداربوون لەمەڕ بێتاوانیی ئارتور سوکناییمان پێ دەبەخشێ. باوکم دەستی گرتم و هەوڵیدا دڵخۆشیم داتەوە ئەو کاتە باوکم نەیدەزانی من بە زللە لە ئارتورم داوە، دوایی گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و ئەو شەوە تا بەیانی بە تەنیایی دانیشتم. سبەی بەیانی دیسان باوکم لەگەڵ بێرتێنەکان چووبوو بۆ بەندەر، تا چاوەدێری گەڕان و پشکنین بێ، ئەوان هێشتا هیوادار بوون کە تەرمەکە بدۆزنەوە».

ـ تەرمەکە قەت نەدۆزراوە، وا نییە؟

ـ بەڵێ، دەبێ ئاوەکە بەرەو دەریای بردبێ، بەلاّم ئەوان پێیان وابوو کە هێشتا ئومێدی دۆزینەوەی هەر هەیە. بە تەنیایی لە ژوورەکەم دانیشتبووم کە

پێشخزمەتێک هات بۆ لام: Veverendissimo1 ێک هاتووە باوکت ببینێ. دوای ئەوەی کە زۆرم پێگوت کە باوکم لە کارگەی نۆژەنکردنەوەی پاپۆڕەکەیە ئەویش گەڕاوە ، دەمزانی کە ئەوە دەبێ کانوونی مونتانلی بێ، هەر بۆیە هەڵاتم بەرەو دەرگای پشتەوە، لە لای دەروازە گەورەکەی باخەکە پێی گەیشتم، کاتێ بانگم کرد: «کانوون مونتانلی، دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم». بێهەست و خوست ڕاوەستا تا من قسە بکەم. ئاخ، سزار، ئەگەر ڕوخساریت بدیبایە - تا زەمانێکی زۆر لە بیرم نەدەچووەوە! گوتم: من کچی دوکتور وارێنم، هاتووم کە پێت بڵێم کە من ئەوم کوشتووە، هەموو شتێکم پێگوت و ئەویش وەکوو نەخشی سەر بەرد و دیوار تا ئەو کاتەی قسەکانم تەواو بوو ڕەق ڕاوەستا و گوێی بۆ ڕاداشتم. دوایی گوتی: کچم، ئارام بە و دڵنیابە، ئەوە منم کە قاتڵم نەک تۆ، من ئەوم فریو دا و ئەویش ئاخرەکەی پێیزانی. ئەوەی گوت و بەبێئەوەی وشەیەکی دیکە بڵێ، لە دەرگا گەورەکە چووە دەرەوە.

- دەی دوایی؟

- دوای ئەوە ئیتر نازانم چی بەسەرهات، هەر ئەو ڕۆژە عەسر بوو کە بیستم بە هۆی ڕاوەستانی دڵ و گوشاری دەمارەوە لە سەر شەقام درێژ دەبێ و دوایی دەیبەنە ماڵێک لە نزیک کارگەی نۆژەنکردنەوەی پاپۆڕەکە. ئەمەی کە گوتم هەمووی ئەو شتانەیە کە دەیزانم. باوکم هەرچی لە توانایدا بوو بۆی کردم، ئەو کات کە ڕووداوەکەم بۆ گێڕاوە دەستی لە کار هەڵگرت و لەبەر ئەوەی کاریگەریی تاڵی ئەو ڕووداوەم لە مێشک دانەمێنێ، خێرا بردمی بۆ بریتانیا ، لەوە دەترسا کە منیش وەکوو ئارتور خۆم بخەمە ئاوەکەوە، هەر بە ڕاستی جارێکیان هەر بەو مەبەستە تا نزیکی ئەوێ چووم، بەڵام دوایی کە هاتەوە یادم کە باوکم نەخۆشی شێرپەنجەی هەیە، ناچار بووم کە وەخۆبێمەوە - ئاخر بێجگە لە من کەسێکی دیکە نەبوو کە ئاگاداری بکا، دوای مردنی ئەو، کۆشێک منداڵی ورد بەسەرمدا مابووەوە، تا دوایە براکەم توانیی ماڵێکیان بۆ پێکەوەنێ. دوایی جووانی هاتە نێو ژیانمەوە، کاتێ کە ئێمە هاتین بۆ بەریتانیا بە هۆی ئەو بیرەوەریە تاڵ و سامناکەوە، دەترساین ڕووبەڕووی یەکتر ببینەوە. ئەویش خۆی بە تاوان باری

---

1 - لە زمانی ئیتالیادا یانی پیاوێکی زۆر بەرێز

ئەو ڕووداوە دەزانی ـ بۆیە برووسکەیەکی دڵتەزێن و خەفەتاوی لە گرتووخانەوە نووسیبوو ـ سەیر پەژیوان ببوەوە، بەڵام من بە ڕاستی لە سەر ئەو ڕایەم ئەوەی کە ئێمەی لێکترنزیک کردەوە ئەوە بوو کە هەردووکمان یەک ئازار و ژانمان هەبوو.

مارتینی بە بزەیەکەوە سەری بزواند: «ڕەنگە لە لای تۆ وا بوایەت، بەڵام جووانی لە هەوەڵ کەرەتەوە کە تۆێ بینی بڕیاری خۆی دابوو. گەڕانەوەی ئەو بۆ میلان دوای هەوەڵین سەفەری بۆ لێگهۆڕنم لە بیرە. ئەوەندە لە بارەی تۆوە چەنەدرێژیی کرد کە ئیتر من بێزار بووم لە بیستنی ناوی جمای بەریتانیای، جاری وابوو وام لێدەهات پێموابوو کە ڕقم لە تۆیە ـ ئەوەش کاردینال!»

عارەبانەکە لە پردەکەوە ڕەد دەبوو بەرەو ماڵێکی گەورە لە لونگئارنۆ دەڕۆیشت. مونتانلی پاڵی دابوو بە پشتیەکانەوە و بە هۆی ماندوویەتیەوە نەیدەتوانی بە باشی و ڕووگەشیەوە سەرنج بداتە ئەو جەماوەرەی کە لە دەوری ماڵەکە بۆ دیتنی کۆ ببوونەوە.

ئیتر ئەو ڕوخسارە گەشەی لە ناو کلیسای لە سەر ڕوو نەمابوو، تیشکی هەتاو مرومۆچی و ماندوویەتی لێ بەدیار خستبوو. پاش ئەوەی دابەزی بە هەنگاوی شل و شەویقەوە کە نیشانەی شەکەتی و نەخۆشی دڵی دەورانی پیری و کەنەفتی بوو چووە ژوورەوە جما گەڕاوەو ئارام بەرەو پردەکە ڕۆیشت، کە لە ڕوخساریت دەروانی دەتگوت ئاوێنەی ژاکاویی و پەشێوی و هیوابڕاوی بیچمی مونتانلیە. مارتینی بە بێدەنگی لە پەنایەوە دەڕۆیشت.

جما پاش کەمێ بێدەنگی گوتی: «زۆر جار وام بیردەکردەوە... کە مەبەستی لە فریودان چی بووە جارجار وام بیردەکردەوە کە»

ـ دەی؟

ـ زۆر سەیرە، زۆرویێک دەچن دەڵێی سێوێکن کە قاشت کردووە.

ـ نێوان کێ و کێ؟

ئارتور و مونتانلی، هەڵبەتە تەنیا من نیم کە لەوە گەیشتبووم. لە پێوەندیی نێوان ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە خاڵێکی سەیر و سەرنجڕاکێشم دەبینی، ڕوخساری ڕاست وەک ڕوخساری پاکی ئارتور دەچوو من دڵنیام کە تایبەتمەندیی

ئەخلاقیشیان زۆر لێک نزیک بوو، بەڵام ئەو هەمیشە وەک تاوانبارێکی کە بە شوێنییەوە بن لە سێبەری خۆشی دەترسا، هاوسەری زرکوڕەکەشی هەڵسوکەوتی خراپی لەگەڵیدا دەکرد، کە هیچ مرۆڤێکی باش ئەو جۆرە کردەوە دزێوەی لەگەڵ سەگێکیش نەدەکرد. بۆخۆشی لەگەڵ ئەو بیرتێنانەدا ـ کە مرۆڤانێکی قێزەون بوون ـ دژایەتیەکی سەیری بوو. بێ‌شک بۆ منداڵێک هەموو شتەێک هەروا ساکار وئاسایە کە دەیبینێ ، بەڵام دوایی کە بیرم لە ڕابردوو دەکردەوە، سەرم سوورمابوو کە ئایا بەڕاستی ئارتوریش لە بیرتێنەکانە؟

مارتینی هاتە نێو قسەکانییەوە و ئەو جۆرەی کە ئەقڵی پێی‌دەشکا پێی گوت: «ڕەنگە شتێکی سەبارەت بە دایکی بیستبێ ـ دەتوانین بڵێین هەر ئەوەش بۆتە هۆی خۆکوژیەکەی و دەنا ئەو کارەی ئەو هیچ پێوەندییەکی بە کردەوەی پاپا کاردیەوە نەبووە. جما بە نابەدڵیەوە سەری بزواند :«سزار ئەگەر لەو کاتەدا کە من زللەکەم لە ئارتوردا ڕوخساریت بدیبایە قەت وات نەدەگوت. ڕەنگبێ ئەو قسە و باسانەی کە سەبارەت بە مونتانلی دەکرێ ڕاست بێ ـ زۆریش وێدەچێ... بەڵام من بۆخۆم دەزانم کە چیم کردووە».

بە بێدەنگی مەودایەکی کورتیان پێکەوە بڕی، ئاخرەکەی مارتینی گوتی: «ئازیزم ئەگەر لە دونیادا ڕێگای ئەوەیان بدۆزیایەتەوە کە ئاوی جۆ و جۆبارەکانیان بۆ سەرچاوە بگەڕێندایەتەوە، ئەو کات نرخ و بایەخێکی بوو کە بەسەر هەڵەکانی ڕابردووی خۆماندا بچینەوە، بەڵام لەڕاستیدا ڕابردوو هی ڕابردووانە، ڕووداوێکی زۆر ناخۆشە، بەڵام لانیکەم ئەم لاوە هەژارە ئیتر لە ئارادا نییە و هیچ کارێکیشی بەسەر ئەم شتانەوە نەماوە و لە هەمووی ئەوکەسانەی کە ئێستە ماون بەختەوەرترە ـ لە هەمووی ئەو کەسانەی کە شاربەدەر کراون و یان دەست بەسەرن. ئێستا ئێمە دەبێ خەمی ئەمانە بخۆین‌ئێمە نابێ لەبەر مردووەکان خۆمان سەرکۆنە و سەرزەنشت بکەین. ئەو کەسەی تۆ حەزت لێیەتی شللی، لە بیرت ماوە دەڵێ چی: «ڕابردوو هی ڕابردووانە و داهاتووش هی داهاتوویە» ئێستە کە داهاتوو هی تۆیە، دەبێ بتوانی ڕایبگری و نابێ بیرو هزرت لە سەر ئەو یان هێنانەوەی ئازار و شلەژانی ڕابردوودا خەسار بکەی بەڵکو دەبێ ئەو توانایانەت لە سەر یارمەتی گەیاندن بە ئێستا و داهاتوودا وەگەڕ بخەی».

لەم وتوویژە گەرم و گوڕەدا دەستی جمای بە دەستەوە گرتبوو. لە پڕێکدا بە هۆی دەنگێکی ناخۆشەوە کە لە دەروونییەوە هات و نرکەی لێ هەستاند وەخۆ هاتەوە و دەستی بەردا.

ئەم دەنگە بێڕۆحە بە گوێی دڵیدا چرپاندی: «دوکتوری ئازیز تەواوی ئەو شتانەی کە سەبارەت بە مونتانلی دەیڵێی ڕاستە. بەڕاستی ئەو زۆر لەوە شاعیرانەترە ئەگەر لەم دونیایەدا بمێنێتەوە، ئەو جۆرەی کە شایانی ئەوە دەبێ بەڕێزەوە بۆ ئەو دونیایەی دیکە بەڕێ بکرێ. من دڵنیام کە لەوە پێش وەکوو ئێرە خرۆشانێکی جەماوەری بە پێز وەگەڕ دەخات، بێشک لەوێ ڕوحانییەتگەلێکی زۆر کۆن و قەدیمی لێیە کە قەت کاردینالێکی وا گەورە و بەڕێزیان نەدیتووە، ئەو ڕۆحانە پتر لە هەموو شتێک حەزیان لە شتە نوێیەکانە».

دەنگی دوکتور ڕیکاردو کە تۆزێ ڕەگی تووڕەیی تێدابوو گوتی : «ئەمە لە کوێوە دەزانی؟»

ـ لە کتێبی پیرۆزەوە تێگەیشتووم کاکی بەڕێز! ئەگەر بکرێ متمانە بە ئینجیل بکەین تەنانەت ڕێزدارترین ڕۆحیانەتەکانیش کەڵکەڵەی پەیداکردنی هاوڕێ و یەکگرتوویی قورس و قایمیان لە سەر دایە، بەڵام ئێستا شەرافەت و حەیاو ک ـ ک ـ ک کاردیناڵەکان، بە بڕوای من، ئەم تێکڵاوە نابار و نابەجێیە وەکوو هەنگوین و کەکرە وایە، ئاخ، سینیور مارتینی و سینیورابوولا! کەش و هەوای دڵکەرەوەی دوای باران قەت وانییە، ئێوەش قسەی ساونارولا١تان بیست؟

مارتینی بە پەلە گەڕاوە، مێشەکەرانە، کە جگەرەیەکی بە لێوە بوو و گیایەکی خستبووە جێ دوگمەکەی، دەستە کزەکانی کە تەواو لە دەستکێشەکانیدا داپۆشرابوو، بۆ تەوقە بۆ لای ئەوی ڕاداشت لەو کاتەدا تیشکی هەتاو دەیدا لە چەکمەخاوێنەکانی و لە ئاوەکە و شەوقی ئاوەکە دەیدا لە ڕوخساری، مارتینی پێیوابوو شەلینیەکەی کەم بووەتەوە، بەڵام لەخۆباییبوونەکەی زۆرتر بووە، لەو دووانە یەکیان بە دلۆڤانییەوە و ئەویتر بە تۆزێ ڕووتاڵییەوە دەستی یەکتریان دەگوشی. کە ڕیکاردو بە پەلە گوتی: «مەخابن حاڵ و وەزعی سینیورابوولا باش نییە!» جما ئەوەند ڕەنگی هەڵ بروسقابوو کە ڕوخساری لە ژێرکڵاوەکەدا کەمێ

---

1 ـ Savonarola ـ قەشەیەکی بە ناوبانگی ئیتالیایە.

بۆری دەنواند کراسەکەی سەرسینگی بە هۆی دڵەکوتەکەیەوە بە توندی دەلەرییەوە. بە دەنگێکی هێواشەوە گوتی: «من دەچمەوە بۆماڵێ».

عارەبانەچیەکەیان بانگ کرد. مارتینیش لەگەڵ ئەو چووە ناو عارەبانەکەوە، تا ماڵێ بەرێی بکات. مێشەکەرانە، دانەوی تا جلوبەرگەکەی لە سەر تەگەرەکە لابدا، لە پڕێکدا ڕوانییە ڕوخساری جما مارتینی دیتی کە جما بە ڕوخسارێکی ترساو و زەقەوە خۆی کێشایە دواوە. دوای ئەوەی کەوتنە ڕێ، مارتینی بە زمانی بەریتانیای پرسی: «جما چی بوو؟ ئەم خوێڕیە چی پێگوتی؟»

ـ هیچی نەگوت، سزار، خەتای ئەو نەبوو. م... من ترسام....

ـ ترسان؟

ـ بەڵێ، پێموابوو... بە دەستی چاوەکانی خۆی گرت.

مارتینی بە بێدەنگی چاوەروان بوو تا وەخۆ بێتەوە. وردە وردە ڕەنگ و ڕووی هاتەوە سەر خۆ.

ئاخرەکەی ڕووی کردە مارتینی و بە دەنگی تایبەتی خۆی گوتی: «قسەی تۆیە، ئاوڕدانەوە لە ڕابردوویەکی ترسناک بێ سەمەر و بێبایەخە و کاریگەریی لە سەر مێشک و هەستەدەمار دەبێ، مرۆڤ وا لێدەکا هەر جۆرە کردەوەیەکی نەگونجاو لە مێشکی خۆیدا جێگیر بکات. دەنا هەمیشە لە ڕوخساری هەموو کەسێکدا شێوەیەکی خەیاڵی لە ڕوخساری ئارتور دەبینم. ئەمە جۆرێک خەون و خەیاڵاتە کە لە ڕۆژی ڕووناکدا مێشکی مرۆڤ ئابڵوقە دەدا. هەر ئێستا کاتێ کە ئەو پیاوە لە خۆڕازیە هات بۆ لای ئێمە، وام زانی ئارتورە».

# ٥

مێشەکەرانە بێشک دەیزانی کە چۆن دوژمنی تایبەت دروست بکات، لە مانگی ئووتدا گەیشتبووە فلۆرانس و لە کۆتایی مانگی ئوکتوبەردا سێ لە چواری ئەندامی بانگهێشتیان کردبوو، لەگەڵ مارتینی هاوبیر و ڕابوون، هێرشە توووند و بێبەزەییانەکەی ئەو بۆ سەر مونتانلی وای کرد تەنانەت ئەوانەشی کە ستایشیان دەکرد و ڕێزیان لێدەگرت زویر بن، تەنانەت گالیش کە لەپێشدا لە سەر هەرشتێک قسەیەکی نەستەق و پێکەنینی هەبوو و ڕێزی لە داشۆرین‌نووس دەگرت لە سەر ئەم خاڵە ڕەخنەی هەبوو وردە وردە بە شێوەیەکی دۆش‌داماو جەختی کرد کە باشتر وابوو کە کارمان بە مونتانلی نەبوایە.

«کاردیناڵە باشەکان ئەوەندە زۆر نین، هەر بۆیە ئەگەر کاردیناڵێکی ئاوا باش سەری هەڵدا دەبێ هەلەکە بقۆزینەوە و ڕێزی بۆ دابنێین». بە ڕواڵەت تەنیا مونتانلی بوو کە شەپۆلی کاریکاتۆر و داشۆرینانەی بە هەند نەدەگرت وەک نەبای دیبێ و نە باران. هەروەکوو مارتینی گوتی ئەو کارە بایی زەحمەتەکەی نەبوو کە پیاو توانایی خۆی بۆ سووکایەتیکردن بە کەسێک بە فیڕۆ بدات کە بۆخۆی ئاوا بە ڕوو خۆشیەوە بەرەو ڕووی کێشەکە دەبێتەوە.

لەشاردا دەنگۆی ئەوە هەیە کە ڕۆژێک مونتانلی کاتی خواردنی فراوێن لە تەک ئۆسقۆفی فلۆرانسدا دانیشتبوو یەکێ لەو قسەنەستەق و داشۆرینە

توندانەکەی میشەکەرانەی دەخوێندەوە کە دژ بەو نووسرابوو، پاشان دەیداتە دەستی ئۆسقۆفەکە و دەڵێ: «زۆر لێزانانە نووسراوە، وا نییە؟

رۆژێک بڵاوکراوەیەک لە ژێر ناوەرۆکی: «رێورەسمی ئاگادار بوون لە دووگیانبوونەکەی حەزرەتی مریەم۱» لە شاردا بڵاو بۆوەوە ئەگەرچی نووسەر ئیمزای بە ناوبانگی خۆی کە میشەکەرانەیەکی باڵکراوە بوو، لێی نەدابوو. شێوازی توندی سووکایەتی پێکردنەکە لە لای خوێنەرانی تەواو ئاشکرا بوو کە هی میشەکەرانەیە. ئەم بڕگەیە کە قسەیەکی تەواو ژووریی بوو بە شێوەی وتووێژی نێوان توسکانی کە ڕۆڵی کچێنی مریەمی هەبوو، مونتانلیش لە ڕۆڵی فریشتەیەکدا نووسرابوو، فریشتەکە گوڵە سوێسنەکانی بە دەستەوە بوو کە نیشانەی داوێن پاکین و تاجەگوڵینەیەک کە لقوپۆپی زەیتونی ئاشتیخوازی لە سەر نابوو و هاتنی ژێزوئیتەکانی ڕادەگەیاند.

هەوەڵ تا ئاخری ئەم نووسراوەیە پڕبوو لە هێما و ئاماژەی قسەی خراپ و سوکایەتی پێ کردن کە لە ناخی کەسێکی ئاژاوەخوازەوە هەڵدەقوڵا. هەموو خەڵکی فلورانسیش هەستیان بەوە دەکرد کە ئەم داشۆرینە ناجوامێرانەیە دوور لە مەردایەتییە، بەڵام هەموویان بە خوێندنەوەی پێدەکەنین. لە پیسترین نووسراوەکانی میشەکەرانەدا خاڵێکی ئەوەند بە هێزی تێدا بوو کە کەس لە بەرانبەریدا توانای خۆڕاگری نەبوو، تەنانەت ئەوانەی کە ڕقیشیان لێی بوو و سەرکۆنەشیان دەکرد، ڕاست وەکوو باشترین لایەنگرانی ئەو بە خوێندنەوەی هەموو داشۆرینەکانی پڕ بە دڵ دەکەوتنە پێکەنین، لەوێڕا کە شێوەی بەیانی ئەو بڵاوکراوەیە قسەی ناخۆش بوو بە توندترین شێوە، بە گشتی لە سەر هەست و ڕوحی خەڵکی شار، ڕەنگدانەوە و کاریگەریی هەبوو، بەڵام ناو و ناوبانگی مونتانلی ئەوەندە بە باشی دەرچو بوو کە ئەو جۆرە نووسراوانە نەیدەتوانی بیچرژێنێ.

بەڵام تاقە جارێکیش بێ مونتانلی بەخت ڕووی لێوەرگێڕا، میشەکەرانە لێی حاڵی ببوو کە گورزی خۆی لە کوێدا داهێنێتەوە. هەرچەندە هێشتا زۆر بوون ئەو کەسانەی کە دەهاتن بۆ دیتنی کاردیناڵ لە کاتی سواربوون لە عارەبانەکەدا

---

1 ـ دەڵێن زگپڕبوونی مریەم لەلایەن فریشتەیەکەوە لە ڕێ ورەسمێکدا پێی ڕاگەیاندراوە.

یان کاتی ئەوەی کە لە ماڵێ دەچێتە دەرەوە، بەڵام دیسانەوە گورە و هەرای «ژێزوئیت!» و «سانفدیستی سیخوڕ!» لەگەڵ دوعا و پاڕانەوەی خێروچاکە و هەراوهۆریای شادی و خۆشحاڵی خەڵکیدا تێکەڵاو دەبوو.

مونتانلی لایەنگرەکانی کەم نەبوون. دوو ڕۆژ دوای بڵاوبوونەوە ئەو بڕگە ژوورجارپەی خزمەتکاری کلیسا، ڕۆژنامەیەکی بە ناوبانگی ئاینی، وتارێکی تێدا چاپ کرابوو لە ژێر سەردێڕی «وەڵامێک بۆ ڕێورەسمی ئاگادار بوون لە زگپڕی حەزرەتی مریەم» بە ئیمزای «ڕۆڵەی کلیسا».

ئەم وتارە لە ڕاستیدا وەڵامێک و بەربەرەکانییەکی بە بڕشت بوو لە سەر مونتانلی و ئەو تاوانە ڕیسواکەرانەیەي کە مێشەکەرانە نوسیبووی. نووسەرە نەناسراوەکە دوای ئەوەی کە بە ئیشتیا و بە پاراوییەکی زۆرەوە باس لە ئایینی ئاشتی و خێرخوازی بۆ مرۆڤایەتی دەکات کە پاپی نوێ مزگێنی دەریەتی، لە ئاخرەکەیدا مێشەکەرانە بانگهێشتی بەربەرەکانی و شەڕەلاوژە دەکات بۆ ئەوەی تاقە یەک شت لەوانەی کە باسی دەکا بە بەڵگەوە بیسەلمێنێ. پاشان بە شێوەیەکی فەرمی لە خەڵکی داوا دەکات تانێ فریوی قسەی درۆ وبۆختانی کەسێکی وا هیچوپوچ نەخۆن. توانایی وتارەکە لە باری بەربەرەکانێ و هەڵوێست گرتندا باش بوو لە باری هونەریشەوە نووسراوەیەکی ئەدەبی و لە ئاستێکی سەرووی بیروهزری خەڵکی ئاساییدا بوو کە دەیتوانی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. بە تایبەتی کە بەرپرسی ڕۆژنامەکەش نەیتوانی بزانێ کە نووسەری وتارەکە کێیە. ئەم وتارە دیسانەوە خێرا و بە تەنیایی چاپ و بڵاوکرایەوە و «لایەنگری نەناسراو» لە هەموو قاوەخانەکانی فلورانسدا بووە هۆی باس و خواسی خەڵکی.

مێشەکەرانە بە نووسراوەیەک بە توندی هێرشی کردە سەریان و وەڵامی پاپ و هەوادارانی ئەو و بە تایبەت مونتانلی داوە و لە پەردەدا ئەوەی درکاند کە گوایە مونتانلی بەو پێدا هەڵگوتنەی خۆی ڕازی بووە، لایەنگری نەناسراو لە ڕۆژنامەی «خزمەتکاری کلیسا»دا بە تووڕەییەوە ڕەتی کردەوە، بە درێژایی ئەومەودایەی کە مونتانلی لەوێ بوو باس و شەڕە دەندووکێ نێوان

ئەو دوو نووسەرە سەرنجی گشتی خەڵکی تەنانەت زیاتر لە خودی مونتانلی بە خۆیەوە سەرقاڵ دەکرد.
بڕێک لە ئەندامانی حیزبی لیبراڵ خۆیان هاندا تا دژبەری مێشەکەرانە ڕاوەستن و لەبەر بەیانی خراپ و کردەوەی ناشیرینی سەبارەت بە مونتانلی ئەویان سەرکۆنە دەکرد، بەڵام سەرکەوتنێکی بەرچاویان بە دەست نەهێنا. ئەو تەنیا بزەیەکی دلۆڤانانەی هاتە سەر لێو و بە زمان گیرانێکی کەمەوە وەڵامێکی سەرزارەکی دانەوە: «بە ڕاستی ئێوە بێ‌ئینسافن. کاتێ من کەوتمە بەردەست و تەسلیمی سینیورا بوولا کرام. ڕێک و ڕاست گوتم کە دەبێ لەبەر خۆشم بێ ئازاد بم تا کەمێ ئاسایش و خۆشی دەستەبەر کەم. لە پەیمانەکەدا ڕێک سەرنج دراوەتە سەر ئەو خاڵە!»١
لە کۆتایی مانگی ئوکتوبەردا مونتانلی گەڕایەوە بۆ ڕۆمانیا بۆ ناوەندی ئۆسقۆفی خۆی و بەرلەوەی فلوڕانس بە جێ بێڵێ، لە سەر قسەو باسی گەرمی فلوڕانس وتەیەکی بەیان کرد. هەست و ئێحساسی هەردوو نووسەرەکەی بە نەرمی و هێوری سەرکۆنەکردو داوای لە داکۆکی کاری خۆی کرد ئەو لێ‌بردوویی هەبێ و کۆتایی بەو شەڕەدەندووکێیە بێنێ. سبەینێ لە خزمەتکاری کلیسادا بەیاننامەیەک بەو شێوەیە بڵاو بووەوە: «لە سەر ویست و داخوازی مێسینیور مونتانلی کە لەبەر دەم بیروڕای گشتیدا گوتویەتی «ڕۆڵەی کلیسا» لەم بەربەرەکانییە دەست هەڵدەگرێ».
ئاخرەکەی قسەی مێشەکەرانە بوو، ئەو بڵاڤۆکێکی چکۆلەی بڵاو کردەوە و لەوێدا گوتی لە بەرانبەر لە سەرخۆیی و خاچپەرستی مونتانلیدا ئیدی بێدەنگ دەبێ و بۆچوونی خۆی دەگۆڕێ تەمایەتی لە ئامێزی هەوەڵین سانفدیستێکی کە دەیبینێ فرمێسکی ئاشتی و ئاشت بوونەوە هەڵوەرێنێ. لە کۆتایشدا نووسیبووی: «من تەنانەت دەخوازم بەرهەڵستکارە نەناسراوەکەی خۆشم بگرمە ئامێز، وەکوو من و بەڕێز مونتانلی دەزانین ئەگەر خوێنەرانی منیش بیانزانیایە کە ئەم کارە یانی چی و ئەو بۆچی بە نەناسراوی ماوەتەوە دەیانزانی کە بۆچی من ئاوا بە دڵێکی فراوانەوە ڕاوبۆچوونی خۆم گۆڕیوە».

---

1 - وتەی شیلوک لە «بازرگانی وینیز»دا - بەرهەمی شکسپیر [پەردەی پێنجەم، دیمەنی یەکەم].

له کۆتایی مانگی نوامبەردا مێشەکەرانە بە کۆمیتەی ڕاگەیاند کە بۆدوو حەوتە بۆ گەشت و سەیران دەچن بۆ لای دەریا. بە ڕواڵەت بەرەو لێگهۆڕن کەوتە ڕێ، بەڵام دوکتور ڕیکاردو کە خێرا کەوتە شوێنی و دەی هەویست قسەی لەگەڵ بکات. لە شاردا زۆری بە شوێندا گەڕا، بەڵام نەیدۆزیەوە. لە ڕۆژی پێنجەمی دیسامبەردا لە پڕێکدا ئاخێزێکی دیمونستراسیونی١ ڕامیاری بە شێوەیەکي زێدەڕۆیانەي توندەوە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی کلیسادا لە سەرانسەری زنجیرە چیاکانی ئاپێندا سەری هەڵدا، خەڵکیش وردە وردە لێیان حاڵی بوو کە بۆچی مێشەکەرانە لە پڕێکدا لەو زستانەدا هەوای سەیاحەت و گەڕیانی کەوتۆتە سەر. هەر کە سەرهەڵدانەکان سەرکوت کران گەڕاوە بۆ فلوڕانس و کاتێ کە لە سەر شەقامدا تووشی ڕیکاردو بوو بە ڕووخۆشیەوە پێی گوت: «وام بیستووە کە لە لێگهۆڕندا بە دوای مندا گەڕاوی، بەڵام لە پیزا بووم - شارێکی چەندە جوان و کۆنە! هەر دەڵێی شاری ئارکادیە»٢. لە حەوتووی کریسمەسدا کۆمیتەی ئەدەبی ئێوارە دانیشتنێکی لە ماڵ دوکتور ڕیکاردودا پێکهێنا کە لە نزیکی پرتائالا کروس بوو مێشەکەرانەش بەشدار بوو. ئەمە یەکێ لەو دانیشتنە قەرەباڵغانە بوو و کاتێ کە مێشەکەرانە کەمێ درەنگتر گەیشتە کۆبوونەوەکە بە ڕێزێکەوە سەری دانەواند و بە بزەیەکەوە داوای لێبووردنی کرد. هیچ جێگایەکی خاڵی نەمابوو کە ئەو لێی دانیشێ.

ڕیکاردو هەستایە سەرپێ تا کورسیەک لە ئەودیوەوە بێنێ، بەڵام مێشەکەرانە نەیهێشت و گوتی: «زەحمەت مەکێشە جێگاکەم باشە و ڕاحەتم». بەرەو لای ئەو پەنجەرەیە ڕۆیشت کە جما کورسیەکەی لەوێ دانابوو، لە سەر لێواری پەنجەرەکە دانیشت و سەری نا بە پەردەکەوە.

هەر کە بە پێکەنینەوە کە چاوی تەنگ و چکۆلە کردبووەوە و بە نیگایەکی تیژ و مانادارەوە دەیڕوانییە جما وەکوو ئەبولهول ڕوخساری بە شێوەی تابلۆیەکی

---

1. Demonstration

2. ناوچەیەکی کۆنی یۆنان، کە جێگای ژیانی شوانەکان بوو و بە هۆی ئارامی و ئاسایشێکی کە بوویەتی لە هۆنراوەکاندا بە سەرتۆپی ئاشتی و ئارامی یادی لێ کراوە.

لیژناردۆداوێنچی نیشان دەدا ئەوانە ببوە هۆی ئەوەی کە ئەو شک وگومانەی کە جما لەوەپێش لێی هەبوو ئەو جار ببووە ترس و دڵەراوکێ.

باسەکەیان لەمەڕ جێبەجێ کردنی بڵاڤۆکێکدا بوو کە لەودا بیروڕای کۆمیتە سەبارەت بە کەم بوونی خواردەمەنی و پێداویستیەکانی خەڵکی توسکانی کە ژیانی ئەوانی خستبوە مەترسیەوە و ئەو کارانەی کە دەبوو لەمەڕ بەربەرەکانی کردن لەگەڵ ئەم کێشەیە بکرێ. پلان دانان بۆ ئەو کێشەیە هاسان نەبوو، چونکە بیروڕای ئەندامانی کۆمیتە وەک یەک نەبوو و جیاوازیان زۆر بوو. گروپی پێشکەوتنخواز کە جما و مارتینی و ڕیکاردویان لەگەڵ بوو لایەنگری خێرایی و جێبەجێ کردنی کوتوپڕی ئەرکەکەبوون بەو شێوەیە کە سووربن لە سەر داخوازیەک لە حکومەت و لە خەڵکی بۆ ئیش و کارێکی خێرا لەمەڕ ئاسایشی چینی وەرزێڕدا. گروپی مامناوەندی ـ کە گراسینی لەوێ بوو ـ لەوە دەترسان کە بەیانێکی توند و بەتایبەتی ئەگەر جەختیشی لە سەر کرابێ بە جێگای ئەوەی دەوڵەت و وەرزێران ڕازی بکا توورەیان دەکات.

گراسینی بە شێوەیەکی ئارام و بە داخ بوون چاوێکی لە گروپی ڕادیکاڵ و توندئاژۆ کرد و گوتی: «خۆشەویستان! ئەوە زۆر باشە ئەگەر ئێمە داوا بکەین کە خێرا یارمەتی بگەیەندرێتە دەستی خەڵکی و دەبێ ئەوەش بزانین کە زۆربەی ئێمە داخوازیەکی زۆرمان هەیە کە جاریواشە جێبەجێ نابێ و ئاکامێکیشی بۆ ئێمە نابێ، بەڵام ئەبەو شێوە بەیانەی کە ئێوە پێشنیاری دەکەن دەستی پێبکەین، زۆر واوێدەچێ کە تا ئەو زەمانەی کە قات و قڕی تەواو وڵاتی دانەگرتبێ ڕژیم خۆی لێ نەبان دەکا و دوورەپەرێز ڕادەوەستێ و هیچ کارێک بۆ ئاسایشی خەڵکی ناکات، بەڵام ئەگەر هەرئەوەندە بتوانین لیژنەی وەزیران ڕازی بکەین کە هەنگاوێک بۆ باشتر کردنی حاسڵاتی خەڵکی هەڵێنێتەوە، سەرکەوتنێکمان بە دەست هێناوە وهەنگاوێک بەرەوپێشەوە چووین».

گالی کە لە پەنای سۆبەکە دانیشتبوو دەرپەڕی تا وەڵامی بەرهەڵستکاری خۆی بداتەوە: «هەنگاوێک بۆ پێشەوە ـ بەڵێ ئاغای بەرێز، بەڵام ئەگەر قەرار

وایە کە قاتوقڕییەک پەیدا بێت ئیتر مەحتەلی ئێمە نابێ کە هەنگاوێک بۆ پێشەوە هەڵێنینەوە پێش ئەوەی کە ئێمە توزقاڵانێک ئاسایش و تەباوڕەبایی دەستەبەر کەین، ئەو گەلە هەمووی لە برساندا دەمرێ».

ساکۆنی دەستی بە قسە کردن کرد: «قسەیەکی جوانە، ئەگەر بزانین کە...»، بەڵام لەم لاولاوە دەنگیان داو قسەکەیان بڕی.

«دەنگت هەڵێنە، ئێمە نابیستین!»

گالی بە تووڕەیەوە گوتی: بەم گرم و هۆڕەی سەر شەقامەوە پێمwایە باش حاڵی نابن ڕیکاردو ئەو پەنجەرەیە داخراوە؟ پیاو گوێی لە دەنگی خۆشی نابێ!»

جما چاوێکی لە دەورووبەری خۆی کرد و گوتی: «بەڵێ، بەستراوە پێموایە سیرکێکی کۆچەر یان شتێکی لەو جۆرەیە دەیەوێ لێرەوە تێپەڕێت».

تێکەڵاوییەک لە دەنگی هەراوهوریا و پێکەنین و زەنگوڵە و هەنگاوەکان لە سەر شەقامەوە دەبیسترا، لەگەڵ مۆسیقایەکی ناخۆشی گروپێکی ژەنیارکە تێکەڵ بە دەنگی دەهۆڵێکی گەورە بوو.

ریکاردو گوتی: «چارەیەک نییە لەم چەند ڕۆژەدا ئاوایە ئیدی، لە پشوودانی کریسمەسدا دەبێ چاوەڕوانی هەراوهوریای خەڵکیش ببی، ئەرێ ساکۆنی دەتویست چ بڵێی؟»

- دەمگوت بیستنی بیروڕای خەڵکی لە پیزا و لێکهۆڕن لە سەر ئەو بابەتە دەبێ باش و بە جێ بێ.

لەم بارەوە ڕەنگبێ سینیور ڕیوارز بتوانێت زانیاری باشترمان پێ ڕابگەیەنێ، ئەو بەم زووانە لەوێ بووە.

مێشەکەرانە وەڵامی نەداوە، ئەو لە پەنجەرەکەوە بۆ دەرێی دەڕوانی و وادیار بوو کە ئەو وتەیەی نەبیستووە.

جما وتی: «سینیورریوارزا!»

تاقە کەسێ کە لە تەنیشت مێشەکەرانەوە دانیشتبوو جما بوو و چونکە ئەو هەروا بێدەنگ بوو کەمێ چووە پێشەوە و باسکی گرت، مێشەکەرانە ئارام ئاوڕی داوە و لە ڕوخساری جمای ڕوانی.جما کە کارتێکەری سامناک

و زیتی ئەوی لە سەر خۆی دیت داچڵەکی، بۆ ساتێک وەک جەستەیەکی مردوو هاتە پێش چاوی، دوایە لێوەکانی بە شێوەیەکی سڕوسارد و بە سەیرێکەوە کەوتە جووڵە .

بە ئارامییەکەوە گوتی: «بەڵێ سیرکێکی کۆچەرییە».

تاقە فکرێکی کە هاتە سەر زەینی جما، ئەوە بوو کە سەرنجی ئەوانیتر لە سەر مێشەکەرانە لابەرێت بێ ئەوەی ئازار و ناڕەحەتی ئەوی هەست پێ کردبێ، زانی کە خەیاڵ و فکرێکی ترسناک باڵی بەسەر ئەودا کێشاوە، کە ئێستا بە ڕوح و بە لەش هەستی پێدەکات. بە پەلە هەستا سەرپێ و لە نێوان ئەو و کوڕەکەدا ڕاوەستا، پەنجەرەکەی کردەوە. جیا لە جما کەس ڕوخساری مێشەکەرانەی نەدیت.

لە سەر شەقام سیرکێکی کۆچەر دەگوزەرا، لاسایکەرەوەکان سواری کەر ببوون و حەنەچییەکانیش جلوبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر دابوو، ئەو جەماوەرەی کە بە دەمامک و جلوبەرگی تایبەتییەوە لە جەژنەکەدا بەشداریان کردبوو بە پێکەنین و شانە چرتێ لەگەڵ وێژەران و نەقالانی سیرک شۆخیان دەکرد. کاغەزەدرێژ و باریکەکانیان بە سەریەکتردا هەڵدەخستەوە و قتوی چکۆلەی پڕ لە نەقوڵیان بۆ مەلەکەی سیرک دەخست کە لە عەرابەکەیدا دانیشتبوو مەلەکەش خۆی بە مووروو پوڵەکە و لیزگەی زەنگیانەوە ڕازاندبووەوە. لە سەر هەنییەی ئەگریجە و بسکێکی دەست کردی دانابوو، پێکەنینێکیشی بە ڕەنگ لە سەر لێوی کێشابووەوە بە شوێن ئەرابەکەشەوە مرۆڤانی جۆراوجۆر دەبینرا ـ منداڵی بەڕەڵا و سواڵکەر و ئاکروبات کارەکان کە بەملاولادا ڕۆڵیان دەگێڕا. میوە فرۆشە گەڕۆکەکانیش بە دەنگ و هەرایەکی زۆرەوە خەریکی فرۆشتنی میوەی خۆیان بوون. ئەوان سەرقاڵی پاڵ تێوەنان و سیخورمە تێککوتان و پێدا هەڵگوتن بە کەسێکدابوون کە جما لە پێشدا بە هۆی گوشار و شەپۆلی جەماوەرەوە نەی توانیبوو بیانبینێ، بەڵام دوایە توانی بە باشی بیبینێ، ئەویش کەسێکی پشت دەرپەڕیوی زۆر خڕپلانە و ناحەز بوو کە کڵاوێکی ڕەنگاوڕەنگی کاغەزی سەیری لە سەر نابوو بە بڕێک زەنگوڵەوە کە بە خۆیدا هەڵیواسیبوو وبە ڕواڵەت وادیار بوو

لە گەڵ سیرکەکەیە، بە ئەدا و ئەتوار و خۆبادان بەملاولادا خەڵکی دەترساند و سەرگەرمی دەکردن.

ڕیکاردو نزیکی پەنجەرەکە بووەوە و گوتی: «لەوێ چ خەبەرە؟ واتماشای دەکەن دەڵێی لە برق دراون».

لەوەی کە ئەو دووانە بە هۆی تماشای ئەو سیرکەوە کۆمیتە و کۆبوونەوەکەیان ڕاگرتبوو بڕێکیان پێ سەیر بوو. جما گەڕاوە و گوتی: «شتێکی باش نییە، تەنیا سیرکێکی کوچەرە، بەڵام ئەوەندەی هەراوهۆریا ساز کردووە کە پێموابوو دەبێ شتێکی سەیر قەومابێ». هەروا دەستی لە سەر لێواری پەنجەرەکە بوو لەپڕێکدا زانی کە قامکە ساردەکانی مێشەکەرانە بە توندی دەستی دەگوشی. مێشەکەرانە هێواش گوتی: «سوپاست دەکەم» دوایە پەنجەرەکەی داخستەوە و دیسانەوە لە سەر لێوارەکەی دانیشت.

مێشەکەرانە بە جۆرێکی کە خوی نیشان بدات گوتی: «براینە بمبوورن کە قسەکانتانم بڕی، سەرقاڵی چاولێ کردنی ئەو سیرکە گەڕاڵە بووم، دیـ ـ دیمەنێکی زۆر سەیرە».

مارتینی بە توورەیەوە گوتی: «ساکۆنی پرسیارێکی لە تۆ کرد» هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مێشەکەرانەی پێ خراپ بوو و لەوەی کە جما ئاوا ڕووهەڵماڵدراوانە پشتیوانی لە مێشەکەرانە دەکات پێی ناخۆش بوو ـ ئەو کارە لەو نەدەوەشاوە.

مێشەکەرانە خۆی لە گێلی داو گوتی سەبارەت بە بارودۆخی ناوخۆی پیزا هیچ نازانم و گوتی: «تەنیا بۆ سەیاحەت» چووە بۆ ئەوێ. دوایە کەوتە قسەو باسێکی گەرموگوڕ لە سەر داهاتووی باری وەرزێڕی و کێشەی چاپەمەنییەکە، ئەوەندە بە زمانی گیراو بە تەتەپەتەوە وشەی هەڵڕشت کە هەموویانی ماندوو کرد دەتگوت کەیف خۆش دەبێ بە بیستنی تۆنی دەنگی خۆی کاتێ کە دانیشتنەکە کۆتایی پێهات و ئەندامانی کۆمیتە ویستیان بڕۆن ڕیکاردو هات بۆلای مارتینی و گوتی: «دێی لەگەڵ من فراوێن بخۆی؟ فابریزی و ساکۆنی بڕیارە بمێنەوە».

ـ سوپاس دەبێ سینیورابوولا بگەیەنمەوە ماڵێ.

جما کە بە دەم هەستانەوە لەچکەکەی دەخستە سەرسەری پرسی: «بەڕاستی پێتوایە کە من بە تەنیایی ناتوانم بڕۆمەوە بۆ ماڵێ؟ دوکتور ریکاردو! هەڵبەتە کە ئەو لێرە دەبێ گۆڕانکاری بۆ ئەو باشە، زۆر کەم لە ماڵەوە دێتە دەرێ».

مێشەکەرانە هاتە نێو قسەکانیانەوە: «ئەگەر پێتخۆش بێت من تا ماڵێ لەگەڵت دێم منیش هەرواوە دەڕۆم».

- ئەگەر بەڕاستی هەر بۆ ئەوێوە دەڕۆی....

ریکاردو کە دەرگاکەی بۆ دە کردنەوە پرسی: «پێموانییە کە دەرفەتی ئەوەت هەبێ ئەمشەو بێی بۆ ئێرە، وانییە؟»

مێشەکەرانە بە پێکەنینەوە لە سەر شانییەوە ئاوڕی داوەو گوتی: «لەگەڵ منتە دۆستی ئازیز؟ دەم هەوێ بچم بۆ تماشای ئەو سیرکە! ڕیکاردو کە دەگەڕاوە بۆ لای میوانەکانی گوتی: «بەشەرێکی سەیرە حەزو خولیایەکی سەیری هەیە کە دەچی بۆ لای ئەو لاساکەروانە!»

مارتینی گوتی: «من پێموایە ئەوانیش وەکوو خۆی وان. ئەگەر تا ئێستا مرۆڤی سیرکم نەدیوە ئەمە ڕاست لەوانە».

فابریزی بە قەیافەیەکی لەخۆڕازیەوە هاتە نێو قسەکانیانەوە و گوتی: «بریا بمگوتایە تەنیا لاسایکەرەوەیە، ئەگەریش وابێ بە داخەوە لاسایی کەرەوەیەکی زۆر خراپ وترسناکە.

- چۆن ترسناکە؟

- من حەزم لەم سەیاحەتە کەم و گوماناویەی ئەو نییە کە ئەو ئەوەندەی پێ خۆشە، ئاخەر ئەوە سێیەمین جاریەتی و من پێموایە ئەو لە پیزا نەبووە هەڵس و کەوتو کارەکانی زۆر گوماناویە.

ساکۆنی گوتی: «بە بڕوای من ئەوە زۆر ڕوونە کە ئەو دەچێ بۆ کوێستانەکان. تەنانەت خۆی ئەوەندە زەحمەت نادات کە درێژەی پێوەندی خۆی لەگەڵ ئەوقاچاخچیانەی کە لە ڕووداوی ساوینێۆدا[1] کە لەگەڵیان ئاشنا بوو ڕەتی دەکاتەوە ؛ زۆر سروشتی و ئاساییە ئەگەر بۆ پەڕاندنەوەی

1 Savigno

بلاقۆگەکانی لە هێڵی سنووری ژێر دەسەڵاتی پاپ یارمەتی لە دۆستانی خۆی بخوازێ.

ریکاردو گوتی: «ئەمە هەر ئەو کێشەیەیە کە من دەمویست باسی بکەم. بە زەینم داهات باشترین رێگا چارەیەک کە دەتوانین بیگرینە بەر ئەوەیە کە ئێمە داوای لێ بکەین کە ئیش و کارەکانی سنووربەزاندن بگرێتە ئەستۆ، بە بڕوای من لە پیستویا چاپەمەنییەکان زۆر بە خراپی بەڕێوە دەچێ. سنوور بەزاندن بۆ بلاقۆگەکانیش کە بە شێوەی لە کاغەزی جگەرەوە پێچان بەڕێوە دەچێ زۆر کۆن و ئاشکرا و کارێکی قورس و قایم نییە».

مارتینی بە تەوسەوەگوتی: «تا ئێستا ئاکامی بووە» وردە وردە کە دەی دیت گالی و ڕیکاردو بە دایم مێشەکەرانە وەک سەرمەشق و پێشرەوێک چاو ێ دەکەن تەنگی لێ هەڵچنرابوو و لە فکری ئەوە دابوو کە پێش ئەوەی ئەم «ڕێگرە لەخۆڕازیە» پەیدا بێ و ڕێنوێنیکەری هەمەویان بێ، ژیان زۆر بە خۆشیەوە دەگوزەرا.

- ئێمە ئێستا بەو کارە قانعین ئەویش بە هۆی نەبوونی ئامرازێکی باشتر و لە دەست دانی ئەوانەوەیە کە تا ئێستا ئاکامێکی باشیشی بووە، بەڵام هەروەک دەزانین زۆر کەسیان لێ گرتووین و دەستیان بە سەر زۆر کەرەسە و کەلوپەلی دیکەشدا گرتووە. هەر بۆیە من پێموایە ئەگەر ڕیوارز ئەم کارە وەئەستۆ بگرێ گرتنی هاوڕێیان و ئامرازی کاروئیشەکانیشمان کەمتر دەبێتەوە.

- لەبەر چی وابیردەکەیتەوە؟

- لە پێشدا لەبەر ئەوەی لەم مامڵەیەدا کە قاچاخچیەکان وەک بیانیێکی بەهرەدار کە خێروقازانجی بۆ ئەوان بە دواوەیە لە ئێمە دەڕوانن، ئێستاش کە واوێدەچێ ڕیوارز بۆ ئەوان وەک دۆستێکی نزیک یان وەک ڕێبەرێکی ئەوان بێ کە جێگای ڕێز و باوەڕی ئەوانە. دەشتوانێ تەواو دڵنیا و ئەرخەیانبێ کە لە کوێستانەکانی ئاپێنیدا هەر قاچاخچییەکی کە کارێک بۆ ئێمە جێبەجێ نەکات لەبەر خاتری پیاوێکە کە لە شۆڕشی ساوینیۆدا بەشدار بووە جێبەجێی بکات. دوای ئەوە ئێمە کەسێکی وامان نییە جیا لە ڕیوارز کە کوێستانەکان بە باشی

بناسێت. لە بیرتان نەچێت کە ئەو زەمانێک لەوێ خۆی شاردۆتەوە و شارەزای هەموو ڕێگا و کوێرەڕێگاکانی قاچاخچیەکانە. هەربۆیە هیچ قاچاخچییەک تەنانەت ئەگەر بە ئەنقەستیش بیویستایەت نەی دەوێرا فریوی بدات و فێڵی لێ بکات. ئەگەریش بیوێرایەت نەیدەتوانی فێڵی لێ بکات.

ـ جا تۆ ڕاتوایە ئێمە داوای لێبکەین کە هەموو ئەرکی بڵاو کراوەیی بڵاڤۆکەکە بگرێتە ئەستۆ کە بریەتە لە بڵاو کردنەوە، نێونیشانەکان، حەشارگەکان، و هەموو شتێکی ئەوپەڕی سنوور بدەینە دەستی و داوای لێبکەین کە بڵاو کراوەکانی ئێمە لە سنوور بپەڕێنێتەوە؟

ـ دەی سەبارەت بە نێو نیشان و حەشارگەکان، ڕەنگبێ تا ئێستا هەرشتێکی کە ئێمە هەمانە و نیمانە لێی ئاگاداربێ، پێموانییە لەم بارەیەوە بتوانم زانیارییکی زیاتری بدەمێ، بەڵام سەبارەت بە بڵاو کردنەوە، هەرچۆنێک کە دۆستان پێیان باش بێ منیش پێم باشە. بە ڕای من، لە هەموویان بەرچاوتر کێشەی سنوور بەزاندنە. ئەگەر پەرتووکەکان بە سلامەتی بگەنە بۆلۆنیا ئیتر بڵاو کردنەوەیان کارێکی هاسانە.

مارتینی گوتی: « من بەشبەحاڵی خۆم دژی ئەم کارەم، تەواوی ئەوکارانەی کە قسەی لە سەر کرا سەبارەت بە لێهاتوویی ئەو شتێکی ساختەییە و ڕاست نییە. خۆ ئێمە ئەومان نەدیوە لە جێبەجێ کردنی ئەرکە سنووریەکان و ناشزانین کە ئایا ئەو توانایی ئەوەی هەیە کە لە کاتی قەیران و هەستیاریدا خۆڕاگری هەبێ یان نا».

ریکاردو گوتی: «پێویست ناکات لەو بارەیەوە بە شکوگومان بین! ڕووداوی ساوینیۆ دەسەلمێنێ کە ئەو خۆڕاگرە و ئاگای لە خۆیەتی».

مارتینی لە درێژەدا گوتی: «تازە، سەرەرای ئەو وردە زانیاریەی کە لە سەر ڕیوارزم هەیە بە دڵ ناوێرم هەموو ڕازونهێنییەکانم بسپێرمە دەستی ئەو. بە بڕوای من ئەو مرۆڤێکی سووک و کەم ئەقڵ و لەخۆڕازیە ئەگەر هەموو ئەرکە نهێنییەکانی حیزبێک بە دەست یەک نەفەر بسپێردرێ. شتێکی ناشیاو و مەترسیدارە. ڕای تۆ چیە فابریزی؟»

پرۆفیسۆر وەڵامی داوە: «مارتینی، ئەگەر من وەک تۆ تەنیا برێک گلەیی و شکوگومانم هەبایە لە سەر ئەو پیاوەی کە ڕیکاردو ئەو هەمووە لە پیاوەتی و مەردایەتی ئەو دەدویێ حەتمەن چاوپۆشیم لێ دەکرد و دڵم پاک دەبووەوە. من بۆخوم لە ئازایەتی و بەشەڕەفی و ژیری ئەو تورقالانێک شک و گومانم نییە و لەو بارەشەوە کە شارەزای کوێستانەکان و خەڵکی دەڤەری چیاکانە بەڵگەی زۆرمان هەیە، بەڵام جیا لەوانە خاڵێکی گوماناوی دیکە لە ئارادایە، من تەواو دڵنیا نیم کە ئەو تەنیا لەبەرئەوەی کە بڵاو کراوەکان بگەیەنێتە ئەو بەری سنوور دەچێ بۆ ئەو کوێستانانە. وردە وردە ئەو فکرە دێتە زەینمەوە کە نەکا ئامانجێکی دیکەشی لەو ڕۆیشتنە هەبێ. هەڵبەتە ئەم باسە دەبێ تەنیا وتەنیا لە بەینی خۆماندا بمێنێ. ئەمە تەنیا شک و گومانێکە، پێموایە پێوەندی هەیە لەگەڵ گروپە نهێنییەکانی سەرشاخ و شایەدیش لەگەڵ توندئاژۆترینی ئەواندا لە پێوەندی دابێ».

- مەبەستت کامە گروپە - «پشتوێندە سوورەکان؟»

- نا ئوکولتلاریوت.

- «خەنجێر وەشێنەکان» ئەمە گروپێکی کەمینەیە لە وەرزێڕە شاربەدەرەکان ئەمانە زۆربەیان بێسەوادن و ئەزموونی سیاسیان نییە.

- شۆڕشگێرانی ساوینیۆش هەروا بوون، بەڵام ڕێبەرانێکی باسەواد و خوێنەواریان هەبوو. شایەدیش ئەم جەماوەرە کەمەش ڕێبەرانێکی ئاوایان هەبێ. لەبیریشت نەچێ دەنگۆی ئەوە هەیە کە زۆربەی ئەم گروپە شەڕاژۆیە ڕۆمانیایە پاش ماوەی ڕووداوی ساوینیۆن و چونکە لە شۆڕشێکی ئاشکرادا دژ بە پیاوانی کلیسادا لاواز بوون لە ئاکامدا ڕوویان کردۆتەوە پیاوکوژی. زۆر شارەزای تفەنگ و کەرەسەی لەو جۆرە نین هەر بەو هۆیەوە خەنجەریان هەڵبژاردووە

- بەڵام بۆچی پێتوایە کە ڕیوارز لەگەڵ ئەواندا لە پێوەندی دایە؟

- تەواو دڵنیا نیم، تەنیا بە شکەوە گوتم. بە ڕای من پێش ئەوەی کە ئێمە لە سەر سنوور ئەرکی قاچاخی پێبسپێرین، باشتر وایە جارێ ئەرخەیان بین. جا دوایە دەست بەکار بین. ئەگەریش بە تەمای ئەوە بێ کە هەر دوو کارەکە

پێکەوە ئەنجام بدات زەربەیەکی گورچووبڕ وە پەیکەرەی حیزب دەکەوێت، خوای نەخواستە ئەگەریش وابێ تەنیا دەتوانێ نێو و ناوبانگی حیزب خەوشدار کات و هیچیتر هەڵبەتە جارێکی دیکەش لەو بارەوە لەگەڵ یەکتری دەدوێین. دەمویست سەبارەت بەو هەواڵانەی کە لە ڕۆمەوە پێمان گەیشتووە قسەتان لەگەڵ بکەم. گوایە کۆمیسیۆنێک ڕێکخراوە تا پرۆگرامی حکومەتێکی خودموختاری ناوچەییدارێژێت.

## ٦

جما و مێشەکەرانە بە درێژایی ڕێگای «لونگئارنو»دا بە بێدەنگی کەوتنە پیاسە کردن. وادیاربوو کە زۆروێژیەکەی نشەستی کردبوو. لەو ساتەوەی کە ماڵی ڕیکاردویان بە جێ هێشتبوو قسەیەکی نەکرد جماش لە دڵدا بەو بێدەنگیە خۆشحاڵ بوو. چونکە لەوە پێشیش لە قسە کردن لەگەڵ مێشەکەرانەدا هەستێکی ناخۆشی هەبوو، بەڵام ئەمرۆکە ئەم هەستە ناخۆشە بەرینتر بووە چونکە هەڵسوکەوت و زۆر بڵێی سەیری ئەو لە کۆبوونەوەی کومیتەدا جما زۆر سەیر پێی داهێزرا ؛ نزیکی کۆشکی ئوفیتزی[1] لە پڕێکدا مێشەکەرانە ڕاوەستا و ڕووی کردەجما و گوتی: «ماندوونیت؟»

- نا چۆن؟
- ئەم شەویش کارێکی تایبەتیت نییە؟- نا
- داوایەکم هەیە، دەمەوێ پێکەوە گەشت و گەڕانێک بکەین.
- بۆ کوێ؟
- جێگایەکی تایبەتیم لەبەر چاو نییە. هەرکۆیەک کە تۆ پێت خۆش بێت.
- بەڵام بۆچی و لەبەر چی؟

کەوتە دوودڵی.

---

1 . ئەم کۆشکە لە سەدەی شانزدەهەمدا دروست کراوە و ئێستاش پەرتووکخانەیەک و کۆمەڵێک بەرهەمی هونەری لەخۆ گرتووە.

- لانیکەم ناتوانم... بە... ئێوەی بڵێم، زۆر چەتوونە، بەلام تکایە ئەگەر پێت دەکرێ وەرە. لە پڕێکدا سەری هەڵێنا و جما دیتی کە نیگای چاوەکانی چۆن سەیر گۆڕان.

بە هێوریەوە گوتی: «هەر دەڵێی شڵەژاو و نەخۆشی».

پەڕەی گوڵێک کە لە جێگا دوگمەکەی دابوو لێی کردەوە و بە ئارامی دەستی کرد بە ورد کردنی. کێ بوو کە ئەوەندە شێوەی ئەوی دەدا؟ ئەو کەسەی کە قامکەکانی دەستی دەجوڵاند و هەڵسووکەوتێکی بە پەلە و بزۆزی هەستەدەماری هەبوو.

مێشەکەرانە چاوی لە پەنجەکانی خۆی کرد و بە دەنگێکی کە باش نەدەبیسترا گوتی: «نیگەرانم نامەوێ ئەمشەو بە تەنیا بم دێی؟»

- هەڵبەتە، ئەگەر پێت باش بێت و بێی بۆماڵی من.

- نا وەرە با پێکەوە لە چێشتخانەیەک شێو بخۆین، لە-مەیدانی سینیوریا چێشتخانەیەکی لێیە. تکایە ئیتر چەتی تێمەخە، بۆخۆتان قەولتان دا کە بێن!

چوونە ناو چێشتخانەیەکەوە، مێشەکەرانە گوتی شام بێنن، بەلام دەستی بۆ خواردەمەنییەکەی نەبرد و هەروا بێدەنگ بوو و نانی سەر مێزەکەی ورد دەکرد و بە ڕیشۆڵی دەسماڵی سفرەکەوە خۆی خافڵاند. جما هەستی بە نارەحەتێکی زۆر دەکرد و وردە وردە لە دەروونیدا هەستی بەوە کرد کە بریا نەهاتبایە. بێدەنگیەکە وردە وردە زۆری ماندوو کرد، وای لێهات کە جما ئەوی لەبیر چووبووەوە و نەیدەویست لەگەڵیدا دانووستانێکی بێبایەخ و وەخت گری هەبێ.

ئاخرەکەی سەری هەڵێنا و لە پڕێکدا گوتی: «پێتخۆشە یاری سیرکەکە ببینین؟»

جما بە سەیرێکەوە لێی ورد بووەوە: «چیە دەبێ چ لە مێشکی دابێ سەبارەت بە سیرکێکی کۆچەر؟»

پێش ئەوەی کە جما دەرفەتی وەلام دانەوەی هەبێ گوتی: «ئایا تا ئێستە سیرکت دیتووە؟»

- نا، پێمواننییە دیبێتم، پێم شتێکی باش و دڵگیر نەبووە.

- زۆر باشە، بە ڕای من کەس ناتوانێ بێ ئەوەی کە سیرک ببینێ ژیانی خەڵکی شرۆبە کات وەرە با بچین بۆ پرتائالاکورس.

کاتێ کە گەیشتنە ئەوێ، لاساکەرەوەکانی سیرک خەریکی دامەزراندنی خێوەتی خۆیان بوون لە پەنا دەروازەی شار. دەنگی ناخۆشی ویلۆنەکان کە گوێچکەی ئازار ئەدا و گرمەی سەیری دەهۆڵەکان نیشانەی دەسپێکی شانۆکە بوو.

دراماییەکە زۆر تووڕە و تووندوتیژانە بوو، کارگێران و ڕۆڵگێرانی، شۆخی و جەفەنگ و حەنەچی و ئاکروبات کارەکان، سوارکارێکی سیرک کە لە نێوان بازنەی ئاگرەوە بازی دەدا، شاژنی جێژنەکە کە خۆی بە داوودەرمان ڕەنگاندبوو، کەسایەتیەکی پشت دەرپەڕیو کە کاری سەیر و سەمەرەی دەکرد و خۆی لە بێئەقڵی دەدا، هەمووی ئەوانە هێز و توانایی ئەو گروپەی نیشان دەدا، شۆخی و جەفەنگەکان و شەڕاژۆ و سیخورمە تێککوتانی تێدا نەبوو، بەڵام زۆر پێس و بێتام بوون. لە ناخی هەمووی ئەو کارانەدا ماندوویەتی و دەست کردی تێدا بوو. بینەران بە هۆی بێئەدەبی و بێئەخلاقی خۆیانەوە پێدەکەنین و چەپڵەیان لێدەدا، بەڵام ئەو بەشەی کە بەڕاستی وادیار بوو هەموو چێژیان لێوەردەگرت و پێیان خۆش بوو، یاری کردن و کارەکانی کابرای پشت دەرپەڕیوبوو، کە جما نەیتوانی خاڵێکی خۆش و جێگای سەرنجی تێدا بدۆزێتەوە. ئەم بەشە بریتی بوو لە برێک کاری پێچەڵاوپووچ و هەڵات هەڵاتی ناشیرین و سەیر، کە بینەران لاساییان دەکردەوە. منداڵەکان دەچوونە سەرشان و قەڵاندۆشی یەکتری تا بتوانن «پیاوە ناشیرنەکە» ببینن.

جما ڕووی کردە مێشەکەرانە کە لە پەنایەوە ڕاوەستا بوو و شانی دابوو بە ئەستوندەکی خێوەتەکەوە و گوتی: «سینیور ڕیوارز بەڕاستی ئەمەت پێباشە؟ پێموایە...»

قسەکەی خۆی بڕی و بێدەنگ چاوی تێبڕی. جما جیا لەو جارەی کە لە لێگهۆڕن لە لای دەروازەی باخەکە لە پەنای مونتانلیدا ڕاوەستا بوو، قەت بە زەینیدا نەدەهات کە ڕوخساری مرۆڤێک نیشاندەری ئاوا بەدبەختی و

هیوابڕاوییک بێت. هەروا کە لە مێشەکەرانەی دەڕوانی، (دۆزەخی دانتە)[1]ی هاتەوە یاد. لەو کاتەدا کابرای شۆخیباز و ژوورجاڕ شەقێکی لە کابرای پشتدەرپەڕیو هەڵدا و ئەویش خولێکی خوارد و لە بازنەی یاریگاکە بە خلارۆکی فڕێدرایە دەرەوە دوو ژوورجاڕەکە ئاخافتنێکیان دەست پێ کرد. مێشەکەرانە داچڵەکی دەتگوت لە خەو هەستاوە.

لە جمای پرسی: «پێتخۆشە بڕۆین؟ یان دەتهەوێ دیسان چاویان لێ بکەی؟»

- پێم خۆشە بڕۆین.

خێوەتەکەیان بەجێ هێشت و بە سەر چیمەنەکەدا بەرەو لای چۆمەکە ڕۆیشتن.

بۆ ساتێک هیچیان قسەیان نەکرد.

مێشەکەرانە پرسی: « ئەو شانۆیەت پێ چۆن بوو؟»

- بە ڕای من کارێکی زۆر ناخۆش و دزێوە بەشێکی زۆر بێتام و نابەجێ بوو.

- کام بەشی؟

- ئەو ئەداوئەتوار دەرهێنان و جیفڕک لەخۆدانە ، زۆر ناشیرین و ناحەزە، هیچ هونەرێکیان تێدا بەستەنییە.

- مەبەستت نومایشتی پشت شکاوەکەیە؟

جما نەیویست ئەو بەشە بێنێتەوە یادی خۆی بە هۆی ئەوەی کە دەیزانی مێشەکەرانە بەو بەشە هەستیارە لەبەر کەمینەی لەشی خۆی، بەڵام ئێستا ئەو بۆخۆی ئەنگوستی لە سەر ئەو خاڵە داناوە و وەڵامیداوە: «بەڵێ، ئەو بەشەم هەر پێخۆش نەبوو».

- ئەمە ئەو بەشە بوو کە خەڵکی چێژی تایبەتیان لێ دەبرد.

- بەڵێ، هەر ئەوەیە کە جێگای داخە.

- چوونکە کارێکی هونەرمەندانە نەبوو؟

1 . یەکەمین بەشی ـ کومێدی ئیلاهەی دانتە.

- نا، هیچ کارێکی سیرکەکە هونەرمەندانە نەبوو، مەبەستم... ئەوە بوو چوونکە کارێکی زاڵمانە بوو. مێشەکەرانە بزەیەکی هات: «زاڵمانە؟ مەبەستتان پشتدەرپەڕیوەکەیە؟» بێگومان ئەم کارە وەک کاری سوارچاکەکە و کاری شاژنی جێژنەکە ڕێگایەکە بۆ ئەوەی ژیانی پێڕابوێرێ، بەڵام ئەم کارە مرۆڤ والێدەکا کە هەست بە ڕۆژڕەشی بکات، پیاو سووک دەکات، ئەم کارە سووکایەتی کردنە بە مرۆڤایەتی.

- ئێستا پێموایە ئەو ئەم ئیشەی بە قەدەر هەوەڵ جار پێی سووک و بێبایەخ نەبێت. هەموومان بە شێوەیەک سووکایەتیمان پێ کراوە

- بەڵێ،...ڕەنگە تۆ ئەوەت پێ دەمارگرژیەکی پوچ و بێبایەخ بێت، بەڵام بە بڕوای من جەستەی هەر ئینسانێک پیرۆز و بەهادارە، من پێمخۆش نییە کە ببینم سووکایەتی پێدەکرێ و بە شێوەیەکی ترسناکی دەردێنن.

- ئەی ئەگەر ڕوح و گیانی مرۆڤێک سووکایەتی پێ بکرێ؟

راوەستا، دەستێکی لە سەر میلەئاسن بەردینەکانی سەر تەپۆڵکەکە دانا و ڕێک ڕوانییە جما.

جماش ڕاوەستا، ئەویش بە سەیرێکەوە چاوێ لە ئەو کرد و دووپاتی کردەوە «ڕوحێک؟»

مێشەکەرانە لەپڕێکدا و بە پەلە دەستەکانی ئاواڵە کردو گوتی: «ئایا قەت بە زەینتاندا هاتووە کە بڵێن ئەو ژوورجارە ڕۆژڕەشەش ڕوح و گیانی بێ - ڕوحێکی زیندو کە لە تێکۆشانی مرۆڤایەتی دا کە لە نێو قەوارەیەکی ناحەزدا لە نێوی ڕکەی جەستەدا بەند کراوە و ناچارە پێبەندی لەش بێ؟ تۆ کە سەبارەت بە هەموو شتێک ئەوەندە دلۆڤان و دڵناسکیت... تۆ کە بە دیتنی جەستەیەکی ئیفلیج لە نێو جەماوەرێکی بێئەقڵ و زەنگوڵەداردا دەست دەکەیتە گریان... ئایا قەت فکرت لە ڕوحێکی بەش مەینەت کردۆتەوە کە تەنانەت جلێکی چلجار پینە کراویشی نییە تانێ ڕووت و قووتی سامناکی خۆی پێ داپۆشێ؟ فکر لە ڕوحێک بکەوە کە لەبەر تەوژمی سەرمادا هەڵدەلەرزێ، بەڵام لەبەر شەرم و حەیا و ڕۆژڕەشی خۆی لە بەرانبەر ئەو جەماوەرەدا لە ئەلف نایەتە بێ - ئەو ڕوحەی کە پێکەنینی خەڵکی وەکوو

خەنجەری سەر دڵ هەست پێدەکا، قاقا و پێکەنینی ئەو جەماوەرە وەکوو پشکۆ و ئاگر لەشی دائەپلۆسێنێ ئەو ئازارە بە لەش و بە ڕوح هەست پێدەکات! بیر لەو ڕوحە بکەوە کە... لە پێش چاوی ئەو دڵڕەقانە بە دڵ شکاوێەوە پەرۆشی ئەوەیەتی کە بۆچی کێوەکانیش بەسەریدا نارمێن[1]... پەرۆشی ئەو ڕەوەز و بەردانەیەتی کە بۆچی نایشارنەوە... ئێرەیی بەو مشکانە دەبات کە دەتوانن خۆیان لە کون و قوژبندا بشارنەوە. ئەوەشت لەبیر نەچێ کە ڕوح لاڵە ـ دەنگێکی نییە تا هاوار و ناڵەی خۆي پێ دەرببڕێ.دەبێ ملکەچ بێ و ملکەچ و دیسانەوە ملکەچ بوون، قسەکانم زۆر بێتام و بێمانایە! بۆ پێناکەنی؟ ـ تۆ هیچ هەستێکی شۆخی کردنو قسەی نەقاڵیت نییە!»

لە بێدەنگیەکی تاقەت پڕوکێندا بە ئارمی گەڕاوە و بە قەراخ چۆمەکەدا کەوتنە ڕێ. بە درێژایی ئەو شەوە جما تەنانە یەک جاریش نەیتوانی ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بزانێ لە نێوان ئاڵۆزی ئەو و ئەو سیرکەدا چ پێوەندیەک لە ئارادایە. ئێستاش کە بە هۆی ئەو گڵە و هەڵچوونە دەروونییەوە بڕێک لە کەڵێن و قوژبنەکانی ژیانی ناخۆشی ئەوی بۆ ڕوون ببوەوە و دڵی ببوە قوڵپی گریان. نەیدەتوانی تەنانەت وشەیەکیش بێنێتە سەر لێو. مێشەکەرانە کە ڕۆوی لێ وەرگێڕابوو و دەیڕوانییە ئاوی چۆمەکە، لەپەنای ئەوەوە دەڕۆیشت.

لە پڕێکدا ڕووی تێ کرد و بوێرانە پێی گوت: «ببورە پێمخۆشە بزانی ئەوەی کە پێم گوتی بەیانی خەون و خەیاڵێک بوو. جارجار ئاوا دەکەومەوە ئامێزی وەهم و خەیاڵەوە، بەڵام نامەوێ کە کەس ئەوە بە شتێکی ئاشکرا و ڕاست بزانێ.»

جما وەڵامێکی نەداوە و بە بێدەنگی کەوتنە ڕێ. کاتێ بە تەنیشت دەروازەی ئوفێتزیدا دەگوزەران مێشەکەرانە چووە ئەوبەری ڕێگاکە و بۆ پڕیسکەیەکی ڕەش دانەوی کە بە میلەئاسنکانەوە نرابوو.

1 ـ ئاماژە بەو قسە پێشینیانە: کابرای بیرکەن کە هەموو گڵ و بەردی چاڵەکەی بەسەریدا دەڕمێ، دەزانێ تازە دەرەتانی نیە دەڵێ کێوەکان تۆخودا ئێوەش وەرن بە سەرمدا. (و)

• به دەنگێکی زۆر نەرم و هێدی کە تا ئەو کاتە جما لێی نەبیستبوو گوتی: «بیچکۆلانەکە ئەوە چۆنە لێرەی؟ بۆ نارۆیەوە بۆ ماڵێ؟»

پرێسکەکە جوڵاوە و بە دەنگێکی ئارام و بە دڵتەنگیەوە وەڵامی داوە. جما هاتە پێشێ تا ببینێ. منداڵێکی دەوروبەری شەش ساڵانی چڵکن، جلوبەرگێکی شڕۆڵی لەبەردابوو وەک گیانداریکی ترساو خۆی لەقەراخ رێگاکە گرمۆڵە کردبوو. مێشەکەرانە دانەویو دەستی بەسەر قژوسەری شێواوی داهێنا. زۆرتر دانەوی تا باشتر لە وەڵامەکەی ئەو حاڵی بێ و گوتی: «بۆ لێرەی ئێستا تۆ دەبێ لە ماڵەوە بی و خەوتبێتی، منداڵانی هاوشانی تۆ شەوانە نابێ لە دەرەوەبن لەبەر سەرما رەق هەڵدێن! دەستت بدە بە من و وەکوو پیاوێکی ئازا هەستە سەرپێ ـ ماڵەکەتان لە کوێیە؟»

دەستی منداڵەکەی گرت و هەڵیستاندە سەر پێ، منداڵەکە توونـد قیژانـدی و بە پەلە خۆی کێشایە دواوە.

مێشەکەرانە لە سەر رێگاکە چۆکی دادا و پرسی: چەن سەیرە ئەوە چیە؟ سینیورا چاوی لێبکە؟»سەرشان و کۆتی منداڵەکە شەلاڵی خوێن بوو.

مێشەکەرانە بە دەم دەست بەسەردا هێنانیدا گوتی: «پێمبڵێ بۆ وات لێهاتووە؟ لە جێگایەکەوە نەکەوتوویتە خوارەوە، ها؟ نا، کەسێک لێی داوی؟ دەمگوت دەبێ وابێ! کێ بوو لێی دای؟»

ـ مامم

ـ دەی! کەی بوو؟

ـ ئەمرۆکە بەیانی، مەست بوو، منیش ـ منیش ـ

ـ تۆش چوویتە سەر رێگاکەی ـ وانییە؟

کاکە چکۆل، تۆ نابێ بچیە سەر رێگای کەسێک کە مەستە ئەوانە ئەو کارەیان پێخۆش نییە. سینیورا ئەم کورپە هەژارە چ لێبکەین؟ رۆڵە گیان وەرە ژێر شەبەقی ئەو چرایە و با چاو لە شانت بکەم. دەستت لە ملم بهاڵێنە، مەترسە ئازارت پێناگەیەنم، زۆرچاکە گەیشتین!

منداڵەکەی کردە باوەشی و بردیە ئەوبەری رێگاکە و لە سەر میلەئاسن بەردینێکی پاندا داینا و سەری منداڵەکەی نایە سەر سینگی خۆی و جماش

قۆڵە بریندارەکەی هەڵێنا، ئەو جار مێشەکەرانە چەقۆیەکی لە گیرفانی دەرهێنا و شان و قۆڵی کۆتی منداڵەکەی هەڵدڕی. سەرشانی کوڕە وەدەرکەوت کە بە شێوەیەکی سەیر بریندار و ڕەش ببووەوە ، برینێکی قووڵی لێدروست ببوو.

مێشەکەرانە دەسرەکەی خۆی لە سەر زامەکە دانا تا کۆتەکەی لە برینەکەی نەخشێ و توند بەستی و گوتی: «ئەم برینە بۆ منداڵێکی چکۆلانەی وەک تۆ زۆر خراپە، بە چی لێی دای کە وات لێهات؟

ـ بە پێمەڕە چکۆلەکە، چووم تا پەسوڵدوی[1] لێ وەرگرم و بچم بۆ دووکانی ئەو سەر گۆشەیە لەوێ نەقول‌وشت بکڕم بۆ خۆم، ئەویش بە پێمەڕە چکۆلەکە لێی‌دام.

مێشەکەرانە تەزوویەکی پێداهات و بە هێواشیەوە گوتی: «ئایش! زۆر دێشێ وانییە؟»

ـ بە پێمەڕە چکۆلەکە لێی دام... منیش هەڵاتم... منیش ئیتر هەڵاتم... ئاخر چوونکە لێی‌دام.

ـ لەوکاتەوە تا ئێستا بێ ئەوەی فراوێنت خواردبێ هەروا سەرگەردانی؟

منداڵەکە بە جێی وەڵام هەنیسکی دەدا. مێشەکەرانە ئەوی لە سەر میلەئاسنەکە هەڵگرت:

ـ دەی باشە دەی! ئێستا هەموو شتێک جێ‌بەجێ دەکەین نازانم عارەبانەیەکمان گیر دەکەوێ یان نا دەترسم هەموویان لەبەر دەرکی شانۆگەریەکە چاوەڕوانی مشتەری بن، ئەمشەو لەوێ پرۆگرامێکی گەورە چێ دەکرێ، سینیورا داوای لێبووردنت دەکەم لەوەی کە ئەم شەو ئەو هەمووە بەم لاولادا هەڵم سووڕاندی، بەڵام...

ـ پێم خۆشە لەگەڵ تۆدا بێم، بەڵکو بتوانم یاریدەتان بدەم. پێتوایە کە دەتوانی بەو هەموو ڕێگا دووریەوە ئەو هەڵگری؟زۆر قورس نییە؟

ـ نا، دەتوانم سوپاس.

لەبەر دەرگای شانۆدا تەنیا دووسێ فایتونی خاڵیان پەیدا کرد. ئەوانی دیکە هەموویان لەوە پێش گیرابوونەوە. شانۆ تەواو ببوو زۆربەی بینەرانیش

---

1 ـ قەرە پووڵی ئیتالیا

ڕۆیشتبوونەوە. نێوی زیتا بە پیتی گەورە لە سەر پلاکاردی سەر دیوارێک نووسرابوو. ئەو لە باڵتدا سەمای دەکرد. مێشەکەرانە دوای ئەوەی کە بە جمای گوت کەمێک مەحتەل بێت، بەرەو دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەکتەرەکان ڕۆیشت و لەگەڵ دەرگاوانەکە قسەی کرد: «مادام ڕێنی ڕۆیشتووە؟»

پیاوەکە وەڵامی داوە: «نا ئاغا نەرۆیشتووە» و بە سەیرێکەوە ڕوانییە ئەو دیمەنە کە کابرایەکی ئاوا پوشتەو پەرداخ منداڵێکی هەژاری ڕووت و ڕەجاڵی لە باوەش دایە: «پێموایە هەرئێستا مادام ڕێنی بێت، عارەبانەکەی مەحتەلی ئەوە، بەڵێ، خەریکە دێت».

زیتا کە قۆڵی خستبووە ناو قۆڵی ئەفسەرێکی سوارچاکی شۆڕە لاو لە پلیکانەکانەوە هاتە خوارێ زۆرجوان دیار بوو. شنێلێکی مەخمەری گوڵ ڕەنگ کە تایبەتی ئۆپێرا بوو و لە سەر جلوبەرگی شەویەوە لەبەری کردبوو و باوەشێنێکی گەورەش کە لە پەڕی وشترمریشک دروست کرابوو نابوویە بەر پشتوێنەکەی. لەبەردەرگای چوونە ژوورەوە ڕاوەستا.قۆڵی لە قۆڵی ئەفسەرەکە دەرهێنا و بە سەیرێکەوە لە مێشەکەرانە نزیک بووەوە.

لە ژێر لێویەوە گوتی:«فلیس! ئەمە کێیە؟»

- ئەم منداڵەم لە سەر شەقام هەڵگرتووەتەوە. بریندارە و برسیشیەتی، دەمەوێ خێرا بیگەیەنمەوە ماڵێ،لێرەدا عارەبانەیەک گیر ناکەوێ، هەربۆیە دەم هەوێ لە عارەبانەکەی تۆ کەڵک وەرگرم.

- فلیس! نابێ منداڵێکی بەڕەڵاو قێزەون بەریتە ماڵەوە! پۆلیس ئاگادارکە تانێ بیبەنە هەتیوخانە یان هەر جێگایەکی کە پێویست بێ، خۆ تۆ ناتوانی هەموو سواڵکەرەکانی شار....

مێشەکەرانە دووپاتی کردەوە: «بریندارە، ئەگەر پێویست بێ سبەینێ دەتوانێ بچێ بۆ هەتیوخانە، بەڵام لە پێشدا دەبێ ئاگاداری لێ بکەم و تێری بکەم».

زیتا بێزی لێی هەستا و بە تووڕەیەوە گوتی: «ڕاست سەریت لە سەر کراسەکەت داناوە! چۆن بێزت دێ ئەو کارە بکەی؟ پیسە!»

مێشەکەرانە بە تووڕەیەوە سەری هەڵێنا و گوڕاندی: «برسیەتی، تۆ نازانی برسیەتی یانی چی دەزانی؟»
جما وردە وردە کە نزیک دەبووەوە هاتە نێو قسەکانیانەوە و گوتی: «سینیوررپیوارز ماڵی من نزیکە. وەرە با منداڵەکە بۆ ئەوێ بەرین. ئەو کات ئەگەر توانیت یەک Vetturraای بۆ بدۆزەوە بۆ ئەمشەو جێگایەکی بۆ دابین دەکەم.
مێشەکەرانە بە پەلە گەڕاوەو گوتی: «بۆتان گرینگ ـ نییە؟»
ـ هەڵبەتە کە گرینگێکی بۆ ئێوە نییە، شەوت باش مادام ڕێنی!
قەرەچیەکە بە سەردانەواندنێکی فەرمیەوە و بە ڕق هەستاویەوە شانی هەڵتەکاند و دیسانەوە دەستی ئەفسەرەکی گرت، داوێنی جلوبەرگەکانی کۆکردەوە و لەبەر دەم ئەوانەوە بەرەو فایتونەکەی خۆی ڕۆیشت.
لە بەر پێی قاندرمەی عارەبانەکەدا ساتێک وەستا و گوتی: «میسیوریوارز، ئەگەر پێت خۆش بێت عارەبانەکەت بۆ دەنێرم بێت بە شوێنتاندا تا تۆ و منداڵەکە بێنێتەوە».
ـ زۆرچاکە نێونیشانەکەی پێدەدەم.
هاتە سەر شوستەکە و نێونیشانەکەی بە عارەبانەچیەکەدا و بە منداڵەکەی باوەشیەوە هاتەوە بۆ لای جما.
کێتی نەخەوتوبوو، چاوەڕوانی خاتوونەکەی بوو، هەر کە بە ڕووداوەکەی زانی خێرا چوو بۆ هێنانی ئاوی گەرم و کەرەسەی پێویستی‌تر، مێشەکەرانە دوای ئەوەی کە منداڵەکەی لە سەر کورسیەکە دانا، لە پەنایەوە بە ئەژنۆوە دانیشت، بە هێوری و بە ئارامیەوە جلە کۆنەکانی لەبەر دادەکەند و برینەکەی لێزانانە و بەتاقەتەوە بۆ پێچا.
لە شتنەوەی برینی منداڵەکە و دەرمان و پێچانی تەواو بوو و لەپەتۆیەکی گەرمەوەی پێچا و جماش بە کەشەفێکی خواردەمەنییەوە وەژوور کەوت.
بزەیەکی هاتە سەرلێو کە دەیڕوانییە ڕوخساری پاک و بێگەردی منداڵەکە و لە مێشەکەرانەی پرسی: «نەخۆشەکەتان ئامادەیە بۆ شێو خواردن؟ ئەم

خواردەمەنییەم بۆ ئەو هێناوە». مێشەکەرانە هەستایە سەرپێ و جلە کۆن وپیسەکانی تێکەوە پێچا و گوتی: بمبوورە کە ژوورەکەتم تەواو شێواندوە، بەڵام سەبارەت بەم جلانە، باشتر وایە خێرا لە نێو ئاگردا بسوتێن، بەیانی جلوبەرگی نوێی بۆ دەکڕم سینیورا ئێوە براندیتان هەیە؟ پێموایە دەبێ کەمێکی پێ بدەین. ئەگەر پەلەم لێ نەکەی ئێستا دەست و پەلیشم دەشۆرم».

منداڵەکە دوای ئەوەی کە پێخۆرەکەی خوارد، کاتێکی کە سەر و قژی هەڵشێواوی خۆی نابوو بە سینگی مێشەکەرانەوە، خێرا خەوی لێکەوت، جما کە یاریدەی کێتی دەدا بۆ کۆ کردنەوەی ژوورەکەی و لە پشت مێزەکە دانیشت: «سینیورڕیوارز تۆ پێش ئەوەی بچیتەوە بۆ ماڵێ دەبێ شتێک بخۆی . نیوەڕۆش هیچت نەخوارد، ئێستاش زۆر درەنگە».

ــ ئەگەر بکرێ پێمخۆشە ئیستکانێک چایی بخۆمەوە بە شێوەی بەریتانیای١. بمبوورە کە تۆم هەتا ئەو درەنگ وەختە ڕاگرتووە و زەحمەتم داوی.

ـ هیچ نییە، منداڵەکە لە سەر کورسیەکە دانێ ماندووت دەکا، خولەکێک ڕاوەستە، هەرئێستا مەلافەیەک دەکێشم بە سەر باڵنجەکاندا. دەتهەوی ئەو منداڵە چی لێبکەی؟»

ـ سبەینێ؟ لێی دەکۆڵمەوە تا بزانم کە ئایا جیا لەو حەیوانە کێویە، خزم و کەسی دیکەی هەیە و ئەگەریش نەیبێ، پێموایە هەر وەک مادام ڕێنی گوتی دەبێ بیبەم بۆ هەتیوخانە. ڕەنگە دڵسۆزانەترین کارێکی کە دەتوانین بۆی بکەین ئەوەیە کە بەردێک بە ملیەوە ببەستین و بیخەینە چۆمەکەوە تا نەجاتی بێ، بەڵام ئەم کارەش بۆمن ئاکامی تاڵو ناخۆشی بە دواوەیە. ئای ڕۆڵە گیان! چەندە مەینەتکێش و بەدبەختی ! ـ تەنانەت وەک پشیلەیەکی بەڕەڵاش تواناییت نییە بەربەرەکانێ بکەی و لە سەر خۆت کەیەوە!

کاتێ کێتی کەشەفی چایەکەی هێنا، کوڕەکە چاوەکانی هەڵێنا و دانیشت و بە سەیرێکەوە لەوانی ڕوانی. هەر کە مێشەکەرانەی ناسیەوە کە ئێستا ئەوی بە پاڵپشتی خۆی دەزانی، بە قنگەخشکێ لە سەر کورسیلەکە هاتە خوارێ و

1 . چایی خواردن بە پێوە

پەتووکەی کە لێی هاڵابوو لە خۆی دەکردەوە و بەرەو لای ئەو ڕۆیشت تا لە باوەشیدا ستار بگرێت. ئێستا ئیدی برێک بووژابوەوە چاوی لە دەستە خوارەکەی مێشەکەرانە کرد کە کەیکێکی پێبوو و لێی پرسی: «ئەوە چیە؟»

- ئەمە! کەیکە، پێتخۆشە؟ پێموایە تەواو تێر بووی، کاکە چکۆل دەبێ تا سبەینێ ڕاوەستی . منداڵەکە دەستی هێنایە پێشەوە، دەستی هێنا بە سەرکۆنە برینەکانی قامکەکانی و جێ سووتاوێکی گەورەی سەر مەچەکیدا و گوتی: «نا - ئەوە دەڵێم» مێشەکەرانە کەیکەکەی لە سەر مێزەکە دانا: «ئەمە وەک ئەو شتە وایە کە تۆش لە سەر شانت دایە - کەسێکی کە لە من بە هێزتر بوو لێی دام».

- زۆرت ئێش پێنەگەیشت؟»

- نازانم - زیاتر لە ڕووداوەکانیتر ئێشی نەبوو، باشە برۆ بخەوە، شەو درەنگە ئیتر نابێ پرسیار بکەی.

کاتێ کە فایتونەکە گەیشت، منداڵەکە خەوتبوو، مێشەکەرانە، بێئەوەی هەڵی بستێنێ، بە هێواشی هەڵیگرت و بەرەو قاندرمەکان ڕۆیشت، لەبەر دەرگاکە ڕاوەستا و بە جمای گوت: «ئەمرۆکە تۆ بۆ من فریشتەی خێروبەرەکەت بووی، بەڵام بە بڕوای من ئەمە نابێتە لەمپەڕ کە لە داهاتوودا گوێ نەدەینە خواست و ویستی دڵەکانمان و لەگەڵ یەکتری شەڕە دندووکێ بکەین.

- بەڵام من لەگەڵ کەس شەڕە دندووکێ ناکەم.

- بەڵام من دەیکەم، ژیان بە بێقسەوباس و شی کردنەوە ناخۆشە و بێبایەخە. دیالۆگێکی باش خوێ و تامی ژیانە، دیالۆگ لە سیرکێکی کۆچەر باشترە!

دوای ئەوە، کە ئارام بە خۆی پێدەکەنی و منداڵە خەوتووەکەی لە باوەش دابوو لە قاندرمەکە هاتە خوارێ.

## ٧

لە یەکێ لە ڕۆژەکانی حەوتەی هەوەڵی مانگی ژانویەدا، مارتینی کە خەریکی ناردنی داوەتنامە بۆ بەشداری کردن لە دانیشتنی گشتی مانگانەی کۆمیتەی ئەدەبی بوو، وەلامێکی کورتی لە لایەن مێشەکەرانەوە پێگەیشت: «بمبورن زۆرم پێناخۆشە کە ناتوانم بێم.» کەمێ نارەحەت بوو چونکە لە داوەتنامەکەدا ئاماژە بەوە کرابوو کە «مزاری کۆبوونەوەکە زۆر پێویست و جێگای سەرنجە" ئەم شێوە کردارە شوالیەیە سەرەڕۆیانە ، وەک بڵەی لەخۆبایی بوون دەچوو.

دوایە بە درێژایی ئەو ڕۆژە لە ناوچە جیاجیاکانەوە سێ برووسکەی هەواڵی ناخۆشیان بە دەست گەیشتبوو، وادیاربوو هەل و مەرجیش هیچ لە باش نەدەچوو. هەربۆیە مارتینی بە لەش و بە ڕۆح هەستی بە نارەحەتی و دڵمەندییەکی زۆر کرد، ئەوکاتیش کە دوکتور ڕیکاردو لە کۆبوونەوە گشتیەکەدا لێی پرسی: «ڕیوارز لێرەیە؟» بە بێزاریەوە گوتی: «نا، وادیارە کێشە و ئیشێکی بایەخدارتری بۆ هاتووتە پێشێ و نەیتوانیوە بێت یان نەیویستووە بێت.»

گالی بە تووڕەیەوە گوتی: «مارتینی! لە ڕاستیدا تۆ لە فلورانسدا یەکێ لەو کەسانەی کە لەم و لەو زۆر ئیراد دەگری، هەرکاتێک بە باری تۆ

هەڵنەسوڕێت و هەر کارێکی کە بیکات لەلای تۆ هەڵەیە. کاتێ کە ڕیوارز نەخۆشە چۆن دەتوانێ بێت؟»

- کێ پێی گوتی کە ئەو نەخۆشە؟

- تۆ نەتزانیبوو؟ چوار ڕۆژە کەوتووە.

- نەخۆشیەکەی چیە؟

- نازانم پێنجشەمە کە بڕیار وابوو لێرەبێ بە هۆی نەخۆشیەکەوە قەرارەکەی دواخست دوێنێشەو کە چووم بۆلای لێم بیست کە بە هۆی نەخۆشیەکەیەوە نەیتوانیوە دیداری لەگەڵ هیچ کەسێک هەبێت. پێموابوو کە ڕیکاردو ئاگاداری لێ دەکات.

- لەم بارەیەوە هیچم شتێکم نەزانیوە. ئەمشەو دەچم بۆلای تا بزانم پێویستی بە چی هەیە.

ریکاردو سبەینێ بەیانی کە ماندوو و ڕەنگ هەڵبزرکا بوو چوو بۆلای جما لە ژوورە چکۆلەکەی‌دا. جما لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو ڕیزێک نووسراوەی بژاردن و حیساب کردنی بۆ مارتینی دەخوێندەوە کە مارتینی بە زەڕەبینێک کە لە دەستی چەپیدا بوو و قەڵەمێکی نووکدرێژیش کە لە دەستی ڕاستیدا بوو خەریکی فێربوونی بڕێک نیشانەی وردی حیساب کردن بوو کە لە سەر وەرەقی کتێبێک نووسرابوو. جما بە دەستی ئاماژەی پێ کرد کە بێدەنگ بێت.

ریکاردو چونکە دەیزانی کەسێکی کە خەریکی نوسینی ڕەمز و نهێنییە نابێ فیکر و زەینی بشلەژێنی لە پشت سەری ئەو لە سەر کورسیلەکە دانیشت و وەک کەسێکی کە هیلاکی خەو بێت بایشکێکی دا.

«، ٤، ، ، ٦، ، ، ٥، ٤، ،» دەنگی جما بوو کە لەگەڵ دەنگی ماشێنی چاپەکەدا دەیگووتەوە:

«، ٤، ، ٥،، ، سزار ڕستەکە ئالێرەدا تەواو دەبێ.»

بۆ ئەوەی ڕاست لەو جێگایەدا نیشانەیەک دانێ دەرزییەکی بە کاغەزەکەوە ناو دوایە ڕووی وەرگێڕا: «دوکتور بەیانیت باش. دەڵێی زۆر ماندووی! نەخۆشیت؟»

- نا تەنیا زۆر ماندووم، دوێشەو شەوێکی ناخۆش و سامناکم لەگەڵ ڕیوارز بردە سەر.»
- لەگەڵ ڕیوارز؟
- بەڵێ، بە درێژایی شەو لە ژوور سەری بەخەبەر بووم، ئێستاش خێرا دەبێ بڕۆمەوە بۆ نەخۆشخانە بۆلای نەخۆشەکانم. تەنیا لەبەر ئەوە هاتووم پرسیارتان لێبکەم کە ئایا کەسێک هەیە کە چەند ڕۆژێ بتوانێت ئاگاداری لێبکات. زۆر نەخۆشە و جێگای مەترسیە، هەڵبەتە من تەواو هەوڵی خۆم دەدەم، بەڵام بە ڕاستی هیچ دەرفەتێکم نییە بە قسەشم ناکات کە پەرەستارێکی بۆ بنێرم.
- نەخۆشیەکەی چیە؟
- هۆکارێکی زۆرن کەوتوونەتە سەریەک. پێش هەموویان...
- لەپێشدا جارێ نانی بەیانیت خواردووە؟
- بەڵێ زۆر سوپاس؛ بەڵام ڕیوارز، بێگومان لەگەڵ نەخۆشینی ڕۆحی و شپرزەیی هەستەدەماردا بەرەوڕوویە، بەڵام هۆی سەرەکی ئەم نەخۆشیە، برینێکی کۆنە کە لە چارەسەر کردنیدا کەمتەرخەمی کراوە. بە گشتی ئەو زۆر لە مەترسیدایە، پێموایە ئەم برینە هی شەڕەکانی ئەمریکای باشوور بێ. بێگومان دوای ڕووداوەکە ئاگادارییەکی باشی لێنەکراوە، ڕەنگە لەوێ کارەکانیان بە پەلە پەل ئەنجام دابێ، هەربۆیە دەبێ خۆشحاڵیش بین کە ماوە. کورتی ببڕمەوە شەپۆلێکی تەب و نوبەتێ خەریکە ڕووی تێدەکا. وەکوو دیارە ناڕەحەتی و گرفتارییێکی بچووک دەتوانێ ببێتە هۆی جەڵغەی خوێنی و سەکتە کردنی...
- یەکجار زۆر جێگای مەترسیە؟
- نا، نا، ئەوەی جێگای مەترسیە لە کاتی وادا کە نەخۆش کاری کۆتابێ و سەم و دەرمانی شیمیایی مەترسیداری خواردبێ.
- دەبێ زۆری ئێش و ژان هەبێت؟
ـ نەخۆشیی و ژانەکەی لە ڕادەبەدەرە، نازانم چۆن خۆی ڕادەگرێ. شەوانە ناچار بووم بە تریاک ئێشەکەی دامرکێنم - ڕقی دنیام لەوکارەیە کە

دەبێ بەو شێوەیە لە سەر نەخۆشییەکی ڕۆحی و هەستەدەمار ئەنجامی بدەم، بەڵام ناچاری هەرچۆنێک بێت دەبێ ئەو ئێش و ژانە دامرکێنێ.

- پێموایە ئەو ئێش و ژانە لە ناخی ماسولکەژنییەوە بێت.

- بێگومان، بەڵام بە ڕاستی بە غیرەتە. دوێنێشەو لە سەرەخۆیی و بە توانایی زۆر سەیر بوو کە ئەو ئێش و بڕکە بێهۆشی نەدەکرد، بەڵام لە ئاخر و ئۆخری شەو وەزعەکە ئالۆزتر بوو. پێتان وایە ئەو وەزعە ناخۆشە چەندی خایاند؟ ڕاست پێنجکاتژمێر، کەسیشی لێنەبوو یاریدەم بدات بێجگە لەو ژنە ساحێب ماڵە نەفامەی کە ئەگەر خانوەکەش تێکبڕمایەت بەخەر نەدەهات، هەڵبەت ئەگەر بەخەبەریش بهاتبایەت هیچ قازانجێکی نەبوو.

- ئەی ئەو کچە سەماکەرە لەوێ نەبوو؟

- شتێکی زۆر سەیرنییە؟ مێشەکەرانە ناهێڵێ کە ئەو لێی نزیک ببێتەوە سەیر لێی دەترسێ. لە سەریەک مرۆڤێکە کە کەمکەس تێیدەگا - تێکلاوێکە لە کۆمەڵێک دژایەتی و دژبەرایەتی دەروونی.

کاتژمێرەکەی دەرهێنا، بە ناقابلییکەوە چاوێکی لێ کرد و گوتی: «درەنگتر دەگەمە نەخۆشخانە، بەڵام چیبکەم. یاریدەدەرەکەم ناچارە بۆ هەوەڵینجار بە تەنیایی و بە بێمن کار بکات، خۆزگە لەوە پێش ئەمەم بزانیبایە - دەبوو نەمهێشتایەت ئا بەو شێوەیە چەند شەو درێژەی هەبێت.»

مارتینی هاتە نێو قسەکانییەوە: «ئەی بۆچی پێی ڕانەگەیاندین کە نەخۆشە؟ دەبوو ئەوەی زانیبایە کە لە کات و ساتی ئاوا ناسکدا ئێمە بەجێی ناهێڵین.»

جما وتی: «دوکتور خۆزگە دوێنێشەو بە جێگای ئەوەی ئەوەندە خۆت ماندوو کردایە یەکێکمانت بانگ بکردایە.»

خاتوونی بەڕێز ویستم کەسێک بنێرم بە شوێن گالیدا، بەڵام ڕیوارز وەها تووڕە بوو کە نەموێرا ئەوکارە بکەم. کاتێ کە لێمپرسی ئایا کەسێکی وا هەیە کە ئەو پێیخۆشبێ بێت بۆلای، پێموابێ دەترسا، بڕێک لێم ڕاما و دوایە بە هەردوو دەستی ڕوخساری خۆی گرت و گوتی: «پێیان مەڵێ، پێم پێدەکەنن!» دەتگوت لە مێشکیدا بیرەوەری ژوور و پێکەنینی تاڵی خەڵکی

بەشتەیەکی تێیدا زیندوو بووەتەوە. لەوکارەی تێنەگەیشتم کە بزانم چیە، لە سەریەک بە زمانی ئیسپانیایی قسەی دەکرد، بەڵام نەخۆشی وا هەیە کە جاریوایە وڕینە و شتی سەیر دەکات.

جما پرسی: «ئێستا کێی لەلایە؟»

- هیچکەس. تەنیا ژنە ساحیبماڵەکەی و پیشخزمەتەکەی.

مارتینی گوتی: «هەر ئێستا دەچم بۆلای.»

«سوپاس. شەوێ دیسان دێم بۆلای. لە چەکمەجەی مێزەکەی نزیک پەنجەرە گەورەکە کاغەزێکی لێیە کە چوونییەتی ئەنجامی کارێکی لە سەر نووسراوە. ترياکیش لە سەر تاقی هۆدەکەیە. ئەگەر ئێش و ژانەکە دیسان ڕووی‌تێ کردەوە ئەوەندەی دیاری کراوە بیدەیە - نەچی زۆرتری بدەیەی - هەرچۆنێکی کە پێت باش بوو ، شووشەکە لە جێگایەک دانێ کە نەتووانێ بیدۆزێتەوە و ناچاربێ زۆرتر بخوات.

کاتێ کە مارتینی چووە هۆدە تاریکەکەوە، مێشەکەرانە خێرا سەری وەرگێڕا و بەشێوەیەکی ناحەز و نەگونجاو کە پیشەی خۆی بوو گوتی: «ئای مارتینی! هاتووی کە بە هۆی بوونی ئەو دکومێنت و بەڵگانەوە بمکوژی. جنێودان بە هۆی ئەوەی کە دوێنێشەو نەمتوانیوە بێمە کۆبوونەوەکە بایەخێکی نییە، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە حاڵم زۆرباش نەبوو...»

- گوێت لێنەبێ لە کۆبوونەوەکە گەڕێ. هەر ئێستاش ڕیکاردوم بینی، دوای ئەوە هاتووم بۆ ئێرە ئەگەر کارێکم لەدەست بێ بتوانم بۆتی بکەم.»

مێشەکەرانە نێوچاوانی تێکنا: «دەستت خۆشبێت، بەڵام لەخۆڕای هاتووی، تەنیا کەمێ نەخۆشم.»

لە ڕیکاردوم بیست. پێم‌وایە دوێنێ شەویش هەتا دەمەوبەیان ئاگاداری کردووی.

مێشەکەرانە لە حەیبەتدا لێوی خۆی توند گەزی: «زۆرباشم، سوپاست دەکەم. هیچیشم ناوێ.»

- زۆرچاکە، من ئەوە لە ژوورەکەی دیکەدا دادەنیشم. ڕەنگە پێت‌خۆشبێ بە تەنیا بی، کەلێنێکیش بە درگاکە ئەدەم تا چاوم لێت‌بێ.

- تکایە خۆت مەخە زەحمەتەوە، هەر بە ڕاستی پێویستیم بە هیچ نییە.
مارتینی بە تووڕەیەوە پەڕیە نێوقسەکانییەوە «پیاو قسەی خۆڕایی مەکە! لە خۆڕایی بۆ دەتهەوێ فریوم بدەی؟ پێتوایە کوێرم نابینم؟ ئەگەر دەتوانی ڕاکشێ و بێدەنگ بخەوە.»
چووە ژوورەکەي دیکە، درگاکەی کردەوە، کتێبەکەی بە دەستیەوە گرت و دانیشت. خێرا بیستی کە مێشەکەرانە بە نالەوە جینگڵی ئەدا، کتێبەکەی نا ئەولاوە و گوێی هەڵخست ، کەمێ بێدەنگ بوو، دیسان مێشەکەرانە بە ناڕەحەتیەوە بزوا، دوایە دەنگی هاسکە هاسکی هەناسەکێشانی و ددانەچیرێی بیست تاناڵە و ئێش و ژانی بشارێتەوە.
- ڕیوارز پێمبڵێ چیت بۆ بکەم؟
وەڵامێکی نەبیست. مارتینی ژوورەکەی پێوا و چووە ژوورسەری. مێشەکەرانە بە ڕوخسارێکی ڕەنگپەڕیوو و سامناکەوە لێی ڕووانیو و دوایە بە بێدەنگی بەسەر گوتی «نا».
- کەمێکیترت تریاک دەوێ؟ ڕیکاردو وتی ئەگەر ئێش و ژان زۆرتر هێرشی بۆ هێنای دەتوانی کەمێکیتر بخۆی.
- نا، دەستت خۆشبێت، دەتوانم کەمێکیتریش ددان بەسەر جەرگمدا داگرم ئەگەر دوایە خراپتر بووم دەیخۆم.
مارتینی شانی هەڵتەکاند، لە پەنایەوە دانیشتوو بە قەیرایی یەک کاتژمێری تەواو لێی ڕووانی. دوایە هەستا و تریاکەکەی هێنا: «ڕیوارز ئێتر نایەلم ئەو وەزعە درێژەی هەبێ ئەگەر تۆ ئەتوانی خۆڕاگربی، من ناتوانم، دەبێ بیخۆی.»
مێشەکەرانە بێقسە لێ کردن خواردی، ئێتر چاوەکانی لە سەریەک دانا و ڕووی وەرگێڕا. مارتینی دانیشتەوە و گوێیدایە دەنگی هەناسەکێشانی کە وردە وردە ئاسایی دەبوو.
مێشەکەرانە ئەوەندە ماندوو بوو ئەگەر خەوی لێکەوتبایە بە ئاسانی هەڵنەدەستا. هەربویە مەودایەکی زۆر بێئەوەی بجولێتەوە خرپ لێیخەوت. مارتینی بە درێژایی ئەو ڕۆژ و شەوە زۆرجار لێی نزیک بووەوە و لەو

جەستە بێجووڵەیەی ڕووانی کە بێجگە لە هەناسەکێشان نیشانەیەکی‌تر لە ژیان و مانی لەودا بەدی نەکرد. ڕوخساری وا هەڵبزرکابوو کە ئاخرەکەی ترسێکی سەیر دایگرت، ئەگەر تریاکێکی زۆری پێدابێ چی دەبێ؟ دەستە چەپە ئازار دیتووەکەی کە لە سەر مەلافەکە بوو ئارام بزواند تا بەخەبەر بێت، لەپڕێکدا قۆڵی کراسەکەی کە دوگمەکەی داخرابوو لادا و بڕێک زام و برینی قووڵ و سامناک لە مەچەکیەوە تا ئانیشکی بەدەر کەوت.

دەنگی ڕیکاردو لەپشت سەریەوە هات: «ئەم دەستە کاتی تازەبوونی برینەکان حەتمەن جوان و ڕێکوپێک بووە.»

ـ ئاە ئاخرەکەی هاتی! ڕیکاردو، بڕوانە، ئەم پیاوە دەبێ هەر بخەوێ، دە سەعات لەوەپێش کەمێکم تریاک پێدا و لەوکاتەوە تا ئێستا تەنانەت ماسوولکەیەکیشی نەبزواندووە.

ریکاردو دانەوی و لەپەنایەوە گوێی هەڵخست: نا زۆر ئاسایی و لە سەرەخۆ هەناسە هەڵدەکێشێ، هەر لەبەر کزی و لاوازیەتی، دوای شەوێکی ئاوا ناخۆش و پڕ زەحمەت چی کەت لێی دەوێ؟ ڕەنگە تا پێش گزنگی بەیانی شەپۆلێک ئێش و ژانی‌تر ڕووی تێبکا، حەتمەن کەسێک دەبێ لە ژوور سەری بێ.»

گالی بەخەبەر دەبێ، گوتویەتی کاتژمێری دێم بۆ ئێرە.

ـ ئەوە کاتژمێر نزیک یە، باشە باشە، خەریکە هەڵدەستێ! خێرا بە پێشخزمەتکارەکە بڵێ سووپەکە گەرم کاتەوە. ئارام... ئارام، ڕیوارز!

ـ دەی دەی پیاو پێویست ناکا شەڕ بکەی، خۆ من ئۆسقۆف نیم!

مێشەکەرانە بە ڕوخسارێکی سامناکەوە لەجێ دەرپەڕی. بە زمانی ئیسپانیایی بە پەلە گوتی: «نوبەی منە؟ خولەکێک ئەو خەڵکە سەرگەرم کە، من ـ ئاە!

ریکاردو نەمزانی لێرەی.

چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا و دەتگوت کەمێک گێژ بووە دەستێکی بە هەنییەیدا هێنا: «مارتینی! پێمسەیر بوو پێموابوو ڕۆیشتووی. حەتمەن دەبێ خەوتبێتم.»

- لەم دە کاتژمێرەدا وەکوو کیژە جوانەکەی چیرووکی پەریەکان خەوت لیکەوتبوو ئێستاش دەبێ کەمێک سووپ بخۆیت و دیسان بخەویەوە.
- دە کاتژمێر! مارتینی لەوبەینەدا تۆ حەتمەن لێرە نەبووی؟
- با، لێرەبووم، وردە وردە ترسم لێنیشتبوو نەکا تریاکم زۆر پێدابێتی.
مێشەکەرانە بە سەیرێکەوە چاوێکی لێ کرد: «شانسی واتنییە! ئەوکات دانیشتنەکانی کۆمیتە زۆر ئارام دەبوو؟ ریکاردو چیت لە ڕۆحی من دەوێ؟ تۆ خودا لە کۆڵم بەوە ناتوانی؟ من بێزارم لەوەی کە دوکتورەکان لە دەوروبەرم بن.»
- زۆرباشە، ئەمە بخۆ، جا لە کوڵت دەبمەوە. یەک دوو ڕۆژێکی دیکە دێمەوە بۆلات ئەوکات بە باشی معاینەت دەکەم، پێموایە ئەو قەیرانە مەترسیدارەی لێ دوورکەوتبێتەوە. زۆریش لەو مردوانە ناچێ کە لە گۆرستانەوە هەڵاتبێتن.
- ئاها، هەر بەو زووانە چاک دەبمەوە، سوپاست دەکەم ئەوە کێیە - گالیە؟ پێموایە ئەمشەو ئێرە دەبێتە کلوکسیونی ڕەحم و دڵسۆزی و دڵۆڤانی.
- من بۆیە هاتووم کە ئەمشەو لەلات بمێنمەوە.
- قسەی خۆڕایی مەکە! من کەسم ناوێ، بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان، هەمووتان بڕۆنەوە. ئەگەریش ئەو ژان و بڕکە ئەوکم بگرێ ناتوانن یاریدەم بدەن، ئیتر نامەوێ تریاک بخۆم، باشتر وایە کارەکە یەکلا بێتەوە یان گاڵدێنێ یان پەمۆ.
ریکاردو گوتی: «دەبێ بڵێم بەداخەوە قسەی تۆیە، بەڵام گرتنە پێشی ئەو بڕیارە زۆریش ئاسان نییە.»
مێشەکەرانە بە بزەیەکەوە سەری هەڵێنا: «مەترسە! ئەگەر قەرار بوایە کاری وا بکەم دەبوو زۆر لەوەپێش بکردایە.»
ریکاردو بە بێمەیلییەکەوە وەڵامی داوە: «ئەونە بزانە کە ئەمشەو بە تەنیا نابی. گالی ئادەی تا ئەودیو وەرە. دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم، من دەڕۆم شەوت باش ڕیوارز، سبەینێ دێمەوە"
مارتینی ویستی لەگەڵ ئەوان بچێتە دەرەوە دیتی کەسێک بە هێواشی بانگی دەکا. مێشەکەرانە دەستی بۆلای ئەو ڕاداشت.

ـ دەستت خۆش‌بێت، سوپاست دەکەم.
ـ ئاه، لەو قسانە گەڕێ بخەوە.
دوای ئەوەی کە ڕیکاردو ڕۆیشت مارتینی لەو دیوەی دیکە کەمێک لەگەڵ گالی قسەی کرد. هەرکە درگاکەی کردەوە کە بڕوات، دەنگی عارەبانەیەکی گوێ لێ‌بوو کە لەبەر درگای باخەکەدا ڕاوەستا و دیتی کە ژنێک لێی دابەزی و لە شەقامی باخەکەدا بەرەو ئێرە دێت.
ئەم ژنە زۆر جوان بوو وادیارە کە لە میوانییەکی شەوانەدا دەگەڕاوە. وەک ڕێز لێ نانێک کڵاوەکەی لە سەر خۆی لابرد و لە قەراخ شەقامەکە ڕاوەستا تا ئەو بڕوات. دوایە چووە کۆڵانێکی تاریکەوە بەرەو تەپکی پوجیا ئەمپریال . لەنێو باخەکەدا خێرا گەڕاوە، دەنگی هەنگاوێکی بە پەلەی هاتە گوێ لە ئەوسەری کۆڵانەکەوە. زیتا گوتی: «خولەکێک ڕاوەستە!»
کاتێ کە مارتینی گەڕاوە تا ببینێ، زیتا ڕاوەستا و دوایە لە حاڵێکدا کە دەستی بەسەر و پرچیدا دەهێنا، بە هێواشییەوە بەرەولای ئەو هات، لەو کۆڵانەدا تەنیا چرایەک دایسا ئەویش لە قوژبنێکدا بوو و لەبەر شەوقی چراکە زیتای دیت کە نارەحەت یان شەرمەزار بوو، سەری دانەواندبوو.
زیتا بێ‌ئەوەی سەری هەڵێنێ پرسی: «ئەرێ چۆنە؟»
ـ لەچاو بەیانی زۆر باشترە. ئەمڕۆ لە چاو دوێنێ زۆرتر خەوتووە، وادیارە بەرەو باشی دەڕوات پێموایە ئیدی جێگای مەترسی نییە.
زیتا هەروا چاوی بڕیبووە سەر ئەرزی.
ـ ئەمجارەیان ئێش و ژانەکەی زۆری پەرە ئەستاندبوو؟
ـ پێموایە قەد بە قەدەرایی ئەمجارە بڕک و ژانەکەی بڵێسەی نەستاندووە.
ـ منیش پێموایە. کاتێ کە ناهێڵێ من بچمە ژوورەکەیەوە نیشانەی ئەوەیە کە حاڵ و وەزعی باش نییە.
ـ بە بەردەوامی ئەم شەپۆلە ئێش و ئۆفەی لەگەڵە؟
ـ کات و ساتێکی تایبەتی و مەعلومەی نییە... لەپڕێکدا وای لێ‌دێ. هاوینی ڕابردوو لە سوئیس زۆر باش بوو، بەڵام زستانی ڕابردوو کە لە ویەن بووین زۆر خراپ و جێگای مەترسی بوو. لە سەریەک چەند ڕۆژێک نەیهێشت لێی نزیک ببمەوە. هەرکاتێ کە نەخۆش دەکەوێ ناهێڵێ لێی نزیک ببمەوە. حەز بە تەنیایی

دەکا. سەرێکی هەڵێنا و دیسانەوە لە ئەرزی ڕووانی و گوتی: «هەمیشە و هەموو جارێ کە دەیزانی شەپۆلی ئێش و نەخۆشینەکەی لێ نزیک دەبێتەوە بە بیانوویەکەوە دەیناردم بۆ کۆبوونەوەیەکی سەما کردن ، کونسێرتێک یان بۆ جێگایەکی دیکەی دەناردم و دوایە درگای ژوورەکەی لە سەر خۆی گاڵە دەدا بە دایم بە دزیەوە دەگەڕامەوە و لەپشت درگای ژوورەکەی دادەنیشتم . ئەگەر بیزانیبایە لە تووڕەیاندا وەکوو شێت کەفی هەڵدەچاند . تەنانەت ئەگەر سەگەکە بینووزاندایەت دەیهێشت بچێتە ژوورەوە، بەڵام ئیزنی بە من نەدەدا بچمە ژوورێ، پێموایە زۆرتر سەرنج ئەداتە سەر سەگەکە تا من.»

وادیاربوو ئەو وەزعەی مێشەکەرانە بۆ ئەو بایەخێک و تەوفیرێکی وای نییە، قسەکانی بۆنی گلەیی و گازندەیان لێدەهات.

مارتینی بەشێوەیەکی دۆستانەوە گوتی: «هیوادارم ئیتر ئاوا خراپ و ئاڵۆز نەبێ. دوکتور ڕیکاردو چوار چاو بەسەریەوەیەتی، بەڵکوو بتوانێ بۆ هەمیشە دەرمانی کاو لەو بشێویە ڕزگاری بکات. هەرچی بێ ئەم دەوا و دەرمانە بۆ ئەو کاریگەرە، بەڵام لەبیرت نەچێ جارێکی دیکە خێرا بە ئێمە بڵێ. ئەگەر زووتر بمانزانیبایە زۆر کەمتر ئازاری دەکێشت. شەوت باش!»

دەستی بردە پێشێ، بەڵام زیتا بە پەلە خۆی کێشایە دواوە: «من تێناگەم بۆچی دەتهەوێ لەگەڵ گراوێی ئەودا تەوقە بکەی.»

مارتینی بە نارەحەتیەکەوە گوتی: «هەرچۆنێکت پێخۆشە.»

زیتا لاقی بە ئەرزیدا کوتا و بە چاوی زەق و پڕ لە تووڕەییەوە گوڕاندی: «من ڕقم لە هەمووتانە، لە هەمووتان! ئێوە دێنە ئێرە ولە گەڵیدا باسی کێشەی سیاسی دەکەن، دەیەڵێ ئێوە شەوێ لەلای بمێنەوە و بۆ دامرکاندن و سوکنایی ئێش و ئازاری دەوا و دەرمانی بدەنێ، بەڵام من ناوێرم لە کەلێنی دەرگاکەشەوە چاوی لێبکەم! لەگەڵ ئێوە چ خزمەمایەتییەکی هەیە؟ ئێوە چۆن بە خۆتان ئیجازە ئەدەن بێن بۆ ئێرە و دەتانەوێ ئەوم لێ بستێنن؟ لە هەمووتان بێزارم! بێزارم! بێزار!»

پڕ بەدڵ دەگریا، هەڵاتە نێو باخەکەوە و بە توندی درگاکەی داخست. مارتینی، هەروا کە بەرەو خوارەوی کۆڵانەکەوە دەڕۆیشت، لە دڵی خۆیدا گوتی: «سەیرە! بە ڕاستی ئەم ئافرەتە ئاشقی ئەوە! زۆر سەیرە...»

## ٨

چاک بوونەوەی مێشەکەرانە زۆری نەخایاند. ڕیکاردو لە پاش‌نیوەڕۆیەکی حەوتەکەی دیکەدا دیتی کە جلوبەرگێکی ڕاحەتی شێوە تورکی نێو ماڵێی لەبەردا بوو و لە سەر کورسیلەکە دانیشتبوو و لەتەک مارتینی و گالی سەرقاڵی قسە کردن بوو. تەنانەت وای لی‌هاتبوو کە ئیشتیای چوونە دەرەوەی دەکرد. ڕیکاردو بەو پێشنیارەی بڕێک پێکەنی و پرسی کە ئایا پێی‌خۆشە بە درێژایی شیودۆڵی فیزولدا گەڕیانێکی هەبێ و دیسان بە تەوسێکەوە پێی گوت: بۆ جێ گۆڕکێش بێ دەتوانێ بچێ گراسینییەکان ببینێ. دڵنیام کە سینیورا بە دیتنت خۆشحاڵ دەبێ، بە تایبەت ئێستا کە ڕەنگی مردووت لێ نیشتوە و ڕۆخسارێکی جوان‌کیلانەت هەیە!»

مێشەکەرانە بە کزەڵوکیەوە سەری بە لاوە ناو دەستەکانی هەڵپێکا: «ئای خودایە، هەر لە بیریشم نەبوو! حەتمەن وادەزانێ شەهیدێکی ئیتالیا هاتووە بۆلای و سەبارەت بە نیشتمان و وەتەن‌پەرەستی لەگەڵمدا دەدوێ. منیش دەبوو ئەو ڕۆڵەم بە باشی بگێڕابایە و بەوم بگوتایە کە لەو چاڵە ڕەشەدا لەت لەتیان کردم و دیسانەوە بەشێوەیەکی زۆر نارێک و ناشیرین پێکەوەیان لکاندووم، ئەویش دەیویست ڕێک و ڕاست لەوە ئاگادار بێ کە هەست و ئیحساسی مرۆڤایەتی لەو ڕووداوەدا چۆنە، ڕیکاردو باوەڕ ناکەی کە ئەو قسانەی پێ‌ڕاست دەبوو! من لە سەر ئەو خەنجێرە سوور پێستیە و کرمی

کوولەکەی نێو شووشەی ژووری کارەکەت گرێو دەکەم کە هەموو درۆیەکی چکۆلە و گەورەی من باوەڕ دەکات. پێشنیارێکی باش و بەجێیە واباشە خێرا ئەو گرێوەم لەگەڵ بکەی.»

- زۆر سوپاست دەکەم، من وەکوو تۆ حەزم لە ئامرازی کوشت و کوشتار نییە.

- دەی باشە ئەی لەگەڵ کرمی کوولەکەکە چۆنی خۆ ئەو وەکوو خەنجێر کەس ناکووژێت و دوای ئەوە خۆ هیچ جوانییەکی تێدا نییە.

- بەڵام دۆستی ئازیز ڕاستیەکەی ئەوەیە کە من کرمی کوولەکەم دەوێ، بەڵام خەنجێرەکەم ناوێ مارتینی من دەبێ خێرا بڕۆم، ئاگاداری لەم نەخۆشە سەرەڕۆیە بە عۆدەی تۆیە؟

- تا سەعاتی . من و گالی دەبێ بچین بۆ سان‌مینیائۆ. سینیورابوولا قەرارە تا من دێمەوە لێرە بێ.

مێشەکەرانە قوت‌بووەوە و بەشێوەیەکی سامناکانەوە دووپاتی کردەوە: «سینیورابوولا! زۆر سەیرە مارتینی ئەو هەر نابێ بێت! من نایەڵم کە خاتوونێکی ئاوا بەڕێز لەبەر من و نەخۆشینی من بکەوێتە زەحمەت و دەردی‌سەری. دوای ئەوە لەکوێدا دەبێ دانیشێ؟ ئەو قەد ئەم ژوورەی پێ‌خۆش نابێت.»

ریکاردو بە پێکەنینەوە پرسی: «لە کەیەکەوە ئاوا پێبەندی داب و نەریتی میوانداریەتی بووی؟ کاکی من سینیورابوولا لە پەرەستاری و ئاگاداریەتیدا مامۆستای هەموومانە ئەو لە منداڵیەوە پەرەستاری لە زۆر کەسی نەخۆش کردووە و ئەم کارە زۆر باشتر لەو ئافرەتە خێرخوازانەی کلیسا کە من دەیاناسم بەڕێوە دەبات. جا ئەگەر وابێ یانی ئەو پێی خۆش‌نابێ کە بێتە هۆدەکەی تۆوە؟ سەیرە! حەتمەن لەگەڵ ئەو ژنە گراسینییە لێت گۆڕاوە! مارتینی ئەگەر قەرارە ئەو بێت پێویست بەوە ناکا کە من ڕێ و شوێنی کارەکەی بۆ بنوسم. ئەی هاوار نیوسەعات لە گوزەراوە، درەنگ کەوتم!»

- دەی ڕیوارز، پێش ئەوەی کە ئەو بێت درمانەکەت بخۆ.

ئەوەی گوت و بە شووشەیەک دەرمانەوە لە قەرەوێڵەکە نزیک بووەوە.

میشەکەرانە وردە وردە نەخۆشیەکەی دەرەوی و بەسەریدا زاڵ دەبوو و، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە زۆر لە جێگادا کەوتبوو بێتاقەت ببوو خەریک بوو پەرەستارە دڵسۆزەکانی خۆی وەڕەز دەکرد.

- خودا ئەم دەوا و دەرمانانە لە بەین بەرێ! خۆ ئێستا ئێش و ژانێکم نییە بۆچی هەر دەتانەوێ ئەم ترش و تاڵانەم دەرخوارد دەن؟

- تەنیا لەبەر ئەوەیە کە نامانەوێ دیسانەوە نەخۆشینەکەت سەرهەڵداتەوە. بێشک خۆ بەتەمانیت لەپێش چاوی سینیورابوولادا لەبەردەم ئێش و ئازارەکەتریە چۆکدا بێیت و ئەویش ناچار بێ تریاکت بداتێ.

- برای بەڕێز، ئەگەر ئەو ئێش و ژانانە بیانەوێ سەرهەڵدەنەوە، ئەوە دێنەوە. وەکوو ئێشی ددان نییە کە لەو شەربەتە هیچ و پووچانەی ئێوە بترسێ و هەڵێ. قازانجی ئەم دەوا و دەرمانانە بە قەدەر کەرەسەی کایە کردنی منداڵێکە کە بیەوێ نێومالێکی ئاگر گرتوو بکووژێنێتەوە، بەڵام بڵێم چی پێموایە ئێوە هەر بە قسەی خۆتان دەکەن.

ئێستیکانەکەی بە دەستی چەپیەوە گرت. دیتنی ئەو هەموو برینە سەیر و سەمەرەیە گالی خستەوە یادی مژاری وتووێژەکەی ئەوجارەیان لێی پرسی: «ئەرێ، چۆنبوو ئەم هەمووە ئازارت دیتوە؟ لە شەڕدا، ها؟»

- هەر ئێستا پێم نەگوتی کە لە گرتووخانەیەکی تاریک و تنوک و نهێنیدا بوو......

- بەڵێ ئەم شروبە کردنە بابەتی سینیوراگراسینییە. هەر بە ڕاست پێموایە ئەم ڕووداوە لە شەڕی برەزیل[1]دا بووە.

- بەڵێ لەوێ زۆر بریندار نەبووم، دوایە کە لە ناوچە شاخاویە شاغیەکاندا بۆ ڕاو دەچووم، وردە وردە زۆرتر بریندار بووم.

- بەڵێ هاوڕێ لەگەڵ شاندێکی زانستی. دەتوانی دووگمەی کراسەکەت داخەی. کارەکەم تەواو بوو، وادیارە لەوێ ژیانێکی پڕ چەرمەسەرێت بووە. میشەکەرانە لە سەرخۆ و ئارام گوتی: «بەڵێ، وایە، هەڵبەت مرۆڤ ناتوانی

---

1. ڕەنگە ئاماژەیەک بێت بۆ شۆڕشی برەزیلیەکان دژ بە دەسەلاتدارانی پورتەقالی کە «گاریبالیدی»ش لەو شەڕەدا بەشدار بوو.

لەو ناوچە شاغیانەدا بە ئاسوودەگی و بێ خەم بژی . هەر ڕۆژەی گۆنگەلێکی تووش ئەبێت. زۆر دەگمەنە ئەگەر جارجار ڕووداوێکی خوش و باشت بێتە سەر ڕێ.»

- بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە من تێیداماوم کە تۆ چۆن ئەو هەموو ئازارەت بینیوە مەگەر ئەوەی لەگەڵ حەیوانێکی کێوی درەندە ڕووبەڕوو بووبێتیەوە . بۆ وێنە ئەم برینانەی سەر قوڵت هی چیە.

- ئەمە لە ڕاوی یوزپڵینگدا وای لێهات. چاو لێکە من تەقەم کرد..... لە درگاکەیان دا.

- مارتینی، ژوورەکە ڕێکوپێکە؟ بەڵێ؟ دە تکایە درگاکە بکەوە. سینیورا بمبوورە کە ناتوانم لەبەرت هەستم.

- هەڵبەتە کە نابێ هەستی، من وەک میوانێک نەهاتوومەتە ئێرە. سزار کەمێ زووتر هاتووم گوتم نەوەک بەپەلە بی بۆ ڕۆیشتن.

- چارەگێکی دیکەش دەمێنمەوە ڕووپووشەکەت لە ژوورەکەی دیکە دادەنێم. قەرتاڵەکەش ببەمە ئەو دیو؟

- ئاگات لێ بێ هێلکەی تازەیە. کێتی ئەمڕۆکە بەیانی لە مونت ئولیورتو هێناویەتی. سینیور ڕیوارز کەمێکم گوڵ بۆ هێناوی. دەزانم حەزت لە گوڵە.

لەپەنای مێزەکەوە دانیشت. گوڵەکانی ڕێکوپێک کرد و خستنییە ناو گوڵدانەکە.

گالی گوتی: «دەی ڕیوارز، درێژەی ڕاوی یوزپڵینگەکە ، کە ئێستا لێی دەدوای بۆمان باس بکە.»

- بەڵێ! سینیورا، گالی سەبارەت بە ژیان و بەسەرهاتی من لە ئەمریکای باشوور پرسیاری لێ کردم و منیش بۆم باس دەکرد کە چۆن قوڵی چەپم بریندار بوو. ئەم ڕۆداوەم لە پێرو بەسەر هات. ئێمە بۆ ڕاوی یوزپڵینگ لە چومەکە دەپەڕینەوە؛ کاتێ کە تەقەم لەو جانەوەرە کرد، باڕووتەکە ئاوری نەگرت، ئاو دزەی کردبۆە ناو باڕووتەکە، سروشتیە ئیدی یوزپڵینگیش مەحتەل نەبوو تا من کارەکەم ڕێکوپێک بکەم و ئەمەش ئاکامەکەی.

- حەتمەن دەبێ ڕووداوێکی خۆشیش بووبێ.

- زۆریش ناخۆش نەبوو! هەڵبەتە مرۆڤ دەبێ لە بەرانبەر رووداوەکاندا وەک کێو ڕاوەستێ، بەڵام بە گشتی ژیانێکی ناخۆش نییە، بۆ وێنە ڕاوی مار...

دەستی کرد بە چەنەوەری و لە سەریەک قسەی خۆش و نوکتە گێڕانەوە سەبارەت بە شەڕی ئارژانتین. شاندێکی نێردراوی برەزیلی، بە هەڵۆ ڕاو کردن ، چەرمەسەری دیتن لەگەڵ شاغیەکان و بوونەوەرە دڕندەکان. گالی وەک منداڵێک کە بە بیستنی ئەفسانەیەک بە کەیف و دڵخۆش دەبێ پەیتا پەیتا دەپەڕیە نێو قسەکانییەوە تا پرسیارێکی لێبکات. ئەو ڕۆحێکی سروشتی ئاسای ناپلی هەبوو کە شتەکان خێرا کاریگەریان لە سەر دادەنا و هەموو شتێکی هەستبزوێنی خۆش دەویست.

جما کەرەسەی شتچنینەکەی لە قەرتاڵەکە دەرهێنا و چاو و دەستی کەوتنە کار، بێدەنگ گوێی ڕاداشتبوو. مارتینی نێوچاوانی تێکنابوو بە گشتی بەدڵی نەبوو ئەو جۆرەی کە ئەو قسەکانی دەگێڕایەوە ، پێی وابوو زۆر لەخۆڕازیە و بەخۆدا هەڵگوتنە. ئەو پیاوەی کە حەوتوویەک لەوەپێش لەبەرچاوی ئەو زۆر بە بڕشتانە توانیبووی لە بەرانبەر ئەو ئێش و ئازارەدا خۆ ڕاگرێ ئێستا لە هەموو کردەوە و هەڵسوکەوتیەکانی بێزار ببوو.

گالی بە ئێرەی بردنێکی زۆر منداڵانەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «بێشەک ژیانێکی گەش و ڕوونت هەبووە! پێم سەیرە کە بۆچی بڕەزیلت بەجێهێشتووە. حەتمەن ئەو وڵاتانەی دیکە ئاوا هەست بزوێن نەبن.»

مێشەکەرانە گوتی: «پێموابێ پێرو و ئێکوادۆر لە هەموو جێگایەک بۆ من خۆشتر بوو. بە ڕاستی ئەوێ ناوچەیەکی سەرسەوز و دڵڕفێنە. هەڵبەتە زۆر گەرمە. بە تایبەت لە ئێکوادۆر و ئەو ناوچانەی قەراخ دەریا، مرۆڤ بە زەحمەت دەتوانێ ساتێک لەوێ هەڵکا، بەڵام سروشتێکی بێحەد جوان و لەبەر دڵانی هەیە.»

گالی گوتی: «بەڕای من ژیانێکی تەواو ئازاد لەو ناوچە سروشتیەی کە دەستی مرۆڤایەتی نەیچرژاندووە لە هەموو جێگایەکیتر دڵڕفێنترە. مرۆڤ توانایی خۆی و هەستی ئینسانی بوونی خۆی ، لەوێ باشتر هەست پێدەکا تا لەم شارە گەورە و پڕ حەشیمەتانەدا.»

مێشەکەرانە وەڵامی داوە: «بەڵێ، ئەمە...»

جما سەری لە سەر کارەکەی بەرز کردەوە و ڕوانییە مێشەکەرانە، مێشەکەرانە لەپڕێکدا سوورهەڵگەڕا و قسەکەی خۆی بڕی. هەموو کەمێک بێدەنگ بوون. گالی بە پەرۆشییەکەوە گوتی: «خۆ ئێش و ژانەکەت دیسان دەستی پێنەکردۆتەوە؟»

- شتێکی وا نییە زۆر سوپاس، هیوادارم بێحورمەتیم پێنەکردبێتی. مارتینی بە تەمای بڕۆی؟

- بەڵێ گالی بڕۆین، درەنگ ئەکەوین.

جما لەگەڵ هەردووکیان چووە دەرێ و خێرا بە لیوانێک شیرەوە کە هێلکەیەکی تێدا شڵەقاندبوو هاتەوە ژوورێ.

بە حورمەتێکی بە برشتانەوە گوتی: «تکایە ئەمە بخۆ.» و دیسانەوە دەستی کردەوە بە شتچنینەکەی، مێشەکەرانەش بەدڵخۆشییەوە بە قسەی کرد، نزیکەی نیوسەعاتێک هیچیان قسەیان نەکرد، ئاخرەکەی مێشەکەرانە بە دەنگێکی زۆر ئارامەوە گوتی: «سینیورابوولا!» جما سەری هەڵێنا. مێشەکەرانە هەروا کە سەری داخستبوو ڕیشکۆی مافورەی سەر قەرەوێڵەکەی لێدەکردەوە: «تۆ باوەڕت بەوە نەکرد کە قسەکانی ئێستای من ڕاست بن.»

جما بە نەرمی وەڵامی داوە: «شک لەوەدا نییە کە درۆت دەکرد.»

- ڕاست دەکەی، هەموو ئەو قسانەی کە کردم درۆ بوون.

- مەبەستان لە شەڕەکەیە؟

- مەبەستم هەموو شتێکە، من قەت لەشەڕدا نەبووم، بەڵام سەبارەت بە لێژنەکە هەڵبەتە لەگەڵ چەند ڕووداوێک بەرەوڕوو بووم، زۆربەی ئەو داستان و بەسەرهاتانە ڕاستە، بەڵام بە هۆی ئەوانەوە نەبوو کە بریندار بووم. تۆ لە درۆیەکدا ڕاستیەکانت پێدرکاندم هەر بۆیە پێموایە دەبێ ئاماژە بە هەموو ڕووداوە ڕاستیەکان بکەم.

جما پرسی: «پێتوانییە، کە ئەو هەمووە درۆ کردنە خەسار کردنی توانایی و وزەی لەشە؟ پێموایە ئەم کارانە بایەخی ماندووبوونەکەی نییە.»

ـ ئەگەر تۆ بە جێگای منبایەی چت دەکرد؟ ئەمە قسەی پێشینیانی ئینگلیسیە. خۆ دەزانی: «پرسیار مەکە تا درۆت لەگەڵ نەکەن.» بۆ من هیچ خۆشی و چێژێکی تێدا نییە کە ئاوا سووکایەتی بە خەڵکی بکەم، بەڵام کاتێ کە ئەوان لەهۆی ئیفلیج بوون و نوقوستانیم دەکۆڵنەوە منیش دەبێ بەشێوەیەک وەڵامیان بدەمەوە. دوای ئەوە کاتێ کە مرۆڤ ناچارە درۆ بکات دەبێ چیرۆکی زۆر باشیش بخوڵقێنێ. ئاگات لێبوو کە گالی چەندەی پێخۆش بوو؟»

ـ تۆ پێخۆش بوونی گالیت لە بەیانی ڕاستیەکان پێباشترە؟

مێشەکەرانە کە ڕیشکۆیەکی لەت کراوی لە دەستدا بوو سەری هەڵێنا و گوتی: «بەڕاستە! دەتویست هەروا سووک و ئاسان ڕاستیەکەیان پێ بڵێم؟ پێشئەوەی کە بمگوتایە زمانی خۆمم دەقرتاند!»

پاشان بە پەلە کردنێکی خەجاڵەتیانەوە درێژەی پێدا: «قەد ڕاستیەکانم لەلای کەس نەدرکاندووە، بەڵام ئەگەر حەز و خوولیای بیستنیت هەبێ بۆتانی دەگێڕمەوە.

جما بە بێدەنگیەوە کاری چنینەکەی نا ئەولاوە. بەڕای ئەو لە دەروونی ئەم مرۆڤە نالەبار و تووڕەیەدا کە ناخی کەیلی ڕاز و نهێنی بوو کە لەپڕێکدا دەیویست ڕازی دڵی خۆی لەلای ژنێک بدرکێنێ کە بە ڕواڵەت هیچ حەزی پێنەدەکرد؛ و چاکیشی نەدەناسی دەبێ لە دڵ و دەروونیدا خاڵێکی زۆر دڵتەزێن خۆی حەشار دابێ.

بێدەنگییەک هەردووکیانی داگرتبوو. جما سەری هەڵێنا. مێشەکەرانە قۆڵی چەپی نا بە مێزێکی چکۆلانەوە کە لەپەنایدا دانرابوو و چاوەکانیشی خستبوە ژێر سێبەری دەستە ئیفلیجەکەی، جما سەرنجی چووە لای گوشار و دڵەڕاوکەیەکی دەروونی کە لە لەرزینی قامکەکانی و توند لێدانی ڕەگی کۆنە برینەکەی سەرمچەکی خۆی نیشان دەدا. هاتە پەنایەوە و بە نەرمیەوە نێوی هێنا. مێشەکەرانە داچڵەکی و سەری هەڵێنا. بەشێوەیەکی عوزرمایی هێنانەوە و بە پچڕپچڕەوە گوتی: «لە... بیرم چوو، دەمویست بۆ تۆ سەبارەت بە...»

- سەبارەت... بەو ڕووداوە ، یان هەر شتێکی کە بووە هۆی ناقیسنی لاقت، بەڵام ئەگەر نارەحەت و پەرێشانت دەکا...

- ئەو ڕووداوە؟ زاماربوونم! بەڵێ، ڕووداو نەبوو کێردێک بوو.

جما زۆر بە سەیرەوە لێیڕووانی، مێشەکەرانە بەو دەستەی کە لەرزینەکەی بە جوانی دیاربوو قژی سەری لادا و بە بزەیەکەوە چاوی لێ کرد.

- دانانیشی؟ کورسیەکەت بێنە پێشەوە، بمبورە کە ناتوانم کورسیەکەتان بۆ بێنم و .. سەیر ئەوەیە ئێستا کە بیری لێدەکەمەوە، ئەگەر ڕیکاردو بێتوانیایە کە بە زۆریش بێ نەشتەرگەری بکرێم، خەزینەیەکی گەورەی لێپەیدا دەبوو، چونکە ئەو شکستەبەندێکی عاشقە و عاشقی چاک کردنەوەی ئێسکەشکاوەکانە و من پێموایە هەموو ئێسک و پروسکی لەشم ورد بوو و شکا بێجگە لە ئێسکی ملم.»

جما بە نەرمییەکەوە گوتی: «بەڵام خۆ ورەت و نەڕووخا ڕەنگە ئەوانە بخەینە ڕیزی ئەو شتانەی کە زۆر بە کەمی ورد دەبن و دەڕووخێن.»

سەری تەکان دا: «نا ،ورەم بەر نەدا ، بەڵام ئەوکات ڕاست وەک فینجانێکی شکاوم لێ هاتبوو؛ ئەمە ناخۆشترین و سامناکترین بەشی ڕووداوەکەیە. بەڵێ دەی سەبارەت بە خەنجێرەکە دەدوام.

- ئەمە... ئیزنم بدە... دەوروبەری سێزدەساڵ لەوەپێش لە لیما ئەو ڕووداوەم بە سەرهات. پێم گوتی کە پێرو بۆ ژیان و گوزەران وڵاتێکی خۆش و دڵفەریحە، بەڵام بۆ مرۆڤێکی وەکوو من کە بە هەڵکەوت لەوێ گیرسابوومەوە و لەبەر نەبوونی کەوتبوومە سەرساجی عەلی ئەوەندەش خۆش و دڵڕفێن نەبوو. هەوەڵ جار لە ئارژانتین و دوایە لە شیلی و ئەو وڵاتانەدا دەگەڕام. زۆرجاریش بە برسیەتی ڕامدەبوارد. دوایە وەک کەسێکی هەمەکارە بە لۆتکەیەکی حەیوانکێش لە (والپارایزو)١ەوە چووم بۆ لیما.

لە خودی لیمادا نەمتوانی ئیش و کارێک پەیدا بکەم، هەر بۆیە بەرەو گومیلکەکانی نۆژەنگای پاپوڕ ڕۆیشتم تا بەشکم لەوێ کارێک پەیدا بکەم.

---

1. valparaiso: لەنگەرگەیەکی شیلی.

ئاخەر ئەم گومیلکانە لە (کالائو)١یە. هەڵبەتە لەو لەنگەرگەیە گەڕەکی زۆر هەژار نشینی لێبوو کە دەریاوانەکان لەوێ کۆ دەبوونەوە. پاشان لە قومارخانەیەکی جەحەنمی ئەوێ کاری پێشخزمەتیم دەست پێ کرد،دەبوو چێشتلێنەری بکەم و بەشی بیلیاردم بەڕێوە ببردایە، بۆ مەلەوانەکان و گراوێکانیان شەڕابم بهێنایەت و بە گشتی ئا لەو جۆرە کارانم بکردایەت ئیشێکی دڵخۆشکەرەوە نەبوو، بەڵام دیسانیش خۆشحاڵ بووم کە لانیکەم کارێکم هەیە. لانیکەم لەوێ هەرچۆنێک بێ خواردنێک هەبوو، ڕوخسار و قەیافەی مرۆڤایەتی و بە گشتی دەنگی مرۆڤایەتیم دەبیست. ڕەنگە بڵەی خۆ ئەوە هیچ نییە، بەڵام من لەو کاتەدا تاق و تەنیا ، بە هاودەمی تەب و نوبەتێی و زەردوویی لە سەر ئەرزی تەویلەی ماڵێکی پیس و شێدار و بۆگەنیو و نیوەگیان بووم، ئەوەش ترسێکی سەیری خستبووە دڵمەوە، بەڵێ شەوێک ئەمریان پێ کردم کە لاسکار٢ێکی مەست کە بەد مەستی کردبوو بیخەمە دەرەوە، ئەو هاتبوە ئێرە، هەموو پووڵەکەی دۆڕاندبوو زۆر کەنفت و بێحاڵ بوو. ئەگەر من دەمویست کە لە سەر کارەکەم بمێنمەوە و لە برسانا نەمرم، بێشک ناچار بووم بە قسەیان بکەم، بەڵام ئەو پیاوە دوو بەرابەری من دەبوو ـ من ئەوکات هێشتا بیست و یەک ساڵی تەواو نەبووم، دوای ئەو تەب و نەخۆشینەش وەک پشیلەیەک کز و لاواز ببووم، بەڵام لەوە سەیرتر کابرای دۆڕاو کێردێکیشی پێبوو.

بڕێک ڕاوەستا بە دزیەوە چاوێکی لە جما کرد و پاشان درێژەی بە باسەکەدا: «وادیاربوو بە تەمابوو کە یەکجاری کۆتایی بە ژیانم بێنێ، بەڵام زوو پەلەی کرد ـ شلشل کووتامی و بە قەدەرایی ئەوەندەی کە بمێنم نەمرنەژی ئەندامی ورد نەکراوی بۆ لەشم هێشتەوە.»

ـ ئەی ئەو خەڵکە؟ نەیانتوانی نێوبژێویتان بکەن؟ یانی هەموویان لە لاسکارێک دەترسان؟

---

1 . لەنگەرگەیەکی لیما

2. مەلەوانێکی مالایایە

مێشەکەرانە سەری هەڵێنا و پێکەنی: «ئەو خەڵکە؟ قومارباز‌ەکان و جەماوەری ئەو شوێنە؟ سەیرە تۆ ناتوانی ئەو شتە بێنییە بەر زەینی خۆت! من خزمەتکاریان بووم ـ وەک شتومەکی نێو ماڵییان وا بووم. هەڵبەتە دەوریٚ منیان دابوو و لەو شۆخی و جەفەنگە چێژیان وەردەگرت. ئەم جۆرە رووداوانە لەو جێگایانەدا وەکوو جەفەنگێکە بۆ خۆش‌ڕابواردنی ئەوان.خۆ وا نییە، تۆ بڵەی کە مرۆڤ پێی خۆش نەبێ قەت شتی وای بەسەر نایەت.»

جما تەزوی پێدا هات: «ئاخرەکەی چیت بەسەر هات؟»

ـ لەم بارەوە ناتوانم لەوە زیاتر زانیاریت بدەمێ: زۆرجار مرۆڤ لەو جۆرە کاتانەدا تا چەند ڕۆژێک دوای ئەو رووداوە هیچی لەبیر نامێنێ. بە ڕواڵەت دوای ئەوەی کە ئاگادار بوون کە نەمردووم، یەکێکیان دوکتورێکی شکستەبەندی پاپورەکەی هێنا کە هەر لەو نزیکانە بوو. دوکتورەکە هەروا بە سەرسەرەکی پینەی کردم ـ ڕیکاردو لە سەر ئەو باوەڕەیە کە نەشتەرگەری شکستەبەندیەکە خراپ کراوە، بەڵام ڕەنگە لەبەر ئێرەیی‌بردنی کاری دوکتوری بێ. سەرت نەیەشێنم دوای ئەوەی کە بە هۆش هاتمەوە، پیرێژنێکی ئەوێ بەخێری خۆی و لە ڕێگای خاچ و مەسیحدا منی بردبووە لای خۆی ـ شتێکی زۆر سەیر نییە؟ پیرێژنەکە لە قوژبنێکی ماڵە کوختەکەیدا خۆی کۆ دەکردەوە و قەنەیەکی ڕەشی تێ‌دەکرد و دووکەڵی بڵاو دەکردەوە، تف و بەڵغەمی بەسەر وڵاتدا فڕێ دەدا و لەبەر خۆیەوە پرتەوبۆڵەی دەهات، بەڵام ژنێکی خێرومەند بوو، پێی دەگوتم، ئارام و بێ‌قرە دەمری کەسیش ئەو مەندی و ئارامیەت لێ‌تێک نادات، بەڵام هەستی بەربەرەکانێی دەروونیم قەوی بوو و منیش ژیان و مانم هەڵبژارد. گەڕانەوە بۆ باوەشی ژیان و تێ‌کۆشان و کار کردن سەخت و گران بوو. جاریواش هەیە وا بیر دەکەمەوە کە ئەو کارە تێ‌کۆشانێکی بێ‌ئاکام بووە. بە گشتی تاقەت و لە سەرخۆیی ئەو پیرێژنە زۆر سەیر بوو و بە درێژایی....

چەندەی خایاند؟

ـ چوار مانگێک لە جێگادا کەوتم و ئاگاداری لێ کردم. جارجاریش وەکوو شێت قسەم هەڵدەبروسقاند و وڕێنەم دەکرد دەنا وەکوو ورچێکی زامار لە

بەر ئێش و ژانی لەشم، نالەو هاوارم نەدەبڕایەوە، نازانی چەندەم ئێش و ژان هەبوو ؛ سروشتی ژیانی منیش بە هۆی ئەوەوە کە دەورانی منداڵیم زۆر نازپەروەردە بووم عادەت و خۆڕاگرییەکی زۆرم نەبوو.

ـ دوایە؟

ـ دوایە هەرچۆنێک بێ لە جێگادا هەستام زۆر بە زەحمەتەوە لە ماڵەکە چوومە دەرێ. نا، وا بیر نەکەیتەوە کە سووال کردن لە ژنێکی هەژاری ڕەش و ڕووت ناخۆش و سەخت بوو ـ من لەبەر ئێش و ژانی خۆم ئەوانەم هەر بە زەینیشدا نەدەهات! هۆکارەکەی ئەوە بوو کە ئیتر نەمدەتوانی لەو کوختەیەدا خۆم ڕاگرم.

تۆش ئێستا سەبارەت بە خۆڕاگری و ورەی من دوای. خۆزگە ئەوکات منت بدیبایە! ئەو ئێش و ژانە هەمیشە کاتی عەسر و نزیکی خۆرئاوابوون و تاریکی شەوێ برستی لێدەبڕیم. پاشنیوەڕۆیان ڕادەکشام و چوارچاو دەمڕوانییە هەتاو کە وردەوردە دەچووە خوارێ ـ ئاخ ناتوانی بیهێنیتە بەر زەینت! ئێستاش کە دەڕوانمە ڕۆژئاوابوونی هەتاو دادەهێزرێم!

هەردوو بێدەنگ بوون.

ـ بەڵێ تا ناوەندی ئەو وڵاتە ڕۆیشتم تا بەشکم کارێک بدۆزمەوە ـ ئەگەر لە لیما بمایەمەوە بێگومان شێت دەبووم. گەیشتمە (کوسکۆ١) و لەوێ ـ ئەرێ بە ڕاست من تۆم بۆچی بە زۆر گوێڕایەڵ کردووە بۆ بیستنی ئەم بەسەرهاتەی ڕابردووی خۆم. تەنانەت خاڵێکی خۆش و بە تامیشی تێدا نییە.

جما سەری هەڵێنا، بە چاوانێکی بیرمەندانەوە لێی ڕووانی و گوتی: «تکایە قسەی وا مەکە.»

مێشەکەرانە لێوی خۆی گەست و بڕێکیتر لە ڕیشکۆکانی مافوورەکەی ژێر خۆی لێ کردەوە. دوای کەمێک پرسی: «درێژەی باسەکەت بۆ بگێڕمەوە.»

ـ ئەگەر... پێتخۆشە بەڵێ بیگێڕەوە مەخابن وەبیر هێنانەوەی ئەو بەسەرهاتە بۆ تۆ زۆر ناخۆش و دڵتەزێنە.

---

1. شارێکی کەونارای پێرویە کە پێش ئەوەی ئەوروپییەکان بێنە ئەو وڵاتەوە پێتەختی ئینکاها بووە.

- پێتوایە کاتێ باسی ناکەم لەبیرم دەچێتەوە؟ ئەوکات خرابترە، بەڵام وا بیر نەکەیتەوە تەنیا ئەم بیرەوەریانەیە کە ئاوا دڵم دەکوشێ، ڕاستیەکەی ئەوەیە کە باوەڕ بەخۆ بوونم لاواز بووە و وزەی خۆڕاگری ڕۆحیم کزەڵۆکە و ڕۆحیشم خەوش‌دار و کەنەفت بووە.

- پێموایە باش لە مەبەستەکەت نەگەیشتووم.

- دەمەوێ بڵێم ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ورە و چالاکی دەروونیم کووژرا بوو. تا ئەو جێگایەی کە وام لێهاتبوو ئیدی خۆم زۆر ترسەنۆک و قزە دەزانی.

- ئەوەش دەبێ بزانین کە خۆڕاگری هەرکەسێکیش سنوور و هێڵێکی تایبەتی هەیە.

بەڵێ، بەڵام پیاوێکی کە لە پڕێکدا دەگاتە ئەو سنوورە، قەت نازانی کە کەی دەگاتە دۆخی جارانی و ئاسایی بوونەوەی.

جما بە دوودڵیەوە لێی پرسی: «تکایە دەتوانی پێم بڵێی کە چۆن بوو لە تەمەنی سالانەدا تاق و تەنیا لەو ناوچانەدا ئاوارە و سەرگەردان بووی؟»

- زۆر ئاسان، لە ماڵی خۆمدا ، لە وڵاتی خۆم ژیانێکی باش و تەباوڕەبام هەبوو، بەڵام هەڵاتم.

- بۆچی؟

دیسان هەر بەو شێوە ناشیرینییەو توندەی خۆی پێکەنی: «بۆچی؟ چونکە منداڵێکی بەرزەئەقڵ بووم. من لە ماڵ و خێزانێکی زۆر دەوڵەمەندا گەورە ببووم. ئەوندە لە ناز و خۆشی و ئاسایشدا بووم پێموابوو کە هەموو دنیا لە پەمۆی ڕەنگاوڕەنگ و هەنگوین و شیر و بادام ساز کراوە. دوایە لە ڕۆژێکی گەرمی تیشکاوێژدا زانیم کە ئەو کەسەی کە جێگای بڕوا و باوەڕی من بوو فریوی داوم. سەیرە، ئەوە بۆ وا داچڵەکیت! چی بووە؟

- هیچ نییە، تکایە درێژەی باسەکە بدە.

- زانیم کە بە نامەردی و دوو ڕوویەوە درۆیان لەگەڵ کردووم. هەڵبەتە ئەزموونێکی بێبایەخ بوو، بەڵام هەروەکوو لەوەپێش‌تر گوتم من لاوێکی کەم‌ئەزموون و لەخۆڕازی بووم و پێموابوو کە درۆزنەکان دەچنە جەهەندەم.

هەر بۆیە لەماڵەوە هەڵاتم و بەرەو ئەمریکای باشوور کەوتمە ڕێ یان دەمردم یان بێئەوەی قرانێکم پێبێ؛ بێئەوەی وشەیەک زمانی ئیسپانیایی بزانم، تەنیا بەو دەست و پێ سپیکەلانە و بەو عادەتە دەوڵەمەندانەیەوە بۆ بژیوی خۆم لە دەریای پڕ شەپۆلی ژیاندا مەلە بکەم و ئاکامەکەشی ئەوە بوو کە خلوور بوومەوە بەرەو ناخی دۆزەخێکی تاڵ و پڕکارەسات ، تا لە فکر و خەیاڵی ئەو درۆزنانە ڕزگاریم بێ. ژیانێکی پڕ چەرمەسەرێ بوو، ئەم ڕووداو و کارەساتە، ڕاست پێنج ساڵ بەر لەوەی لێژنەی دوپرە بێت و ڕزگارم کات بەسەرم هات.

- پێنج ساڵ! ئاه چەندە سامناکە! دۆست و هاواڵێکت نەبوو؟

- من و دۆست و هاواڵ؟ (لە پڕێکدا بە ڕق و تووڕەییەکەوە لێی ڕووانی) من قەت دۆست و هاوڕێم نەبووە!

وادیاربوو کە لە تووڕەبوونەکەی خۆی پەشیمان بووەتەوە بۆیە خێرا بایداوە و بە ئە هۆنییەوە گوتی: «تۆ نابێ ئەوجۆرە شتانە بە هەند بگری، لەوکاتەدا ڕەنگە من سەبارەت بە هەموو شتێکی ڕەشبین بوو بێتم. لە ڕاستیدا ساڵ و نیوی هەوەڵێنم زۆریش خراپ نەبوو، من لاوێکی شاز و بە توانا بووم و ژیانیشم زۆر بە باشی بەڕێوە دەچوو تا ئەوەی ئەو لاسکارە ڕقی خۆی بە سەر منی چارە ڕەشدا ڕشت. ئیدی دوای ئەوە نەمتوانی کارێک بۆخۆم جێبەجێ کەم. سەیر ئەوەیە ئەگەر تەنانەت بزمارێک بە لێهاتوویەوە داکوتی کەرەسەیەکی باشی لێ دروست دەبێ ؛، بەڵام من ببوومە بزمارێکی خوار و خێچ وژەنگاوی . دوای ئەوە کەسیش خەمخۆری بۆ نوقوستانێک ناکات تا ئیش و کارێکی پێبدا.»

- چ کارێکت دەکرد؟

- هەر جۆرە کارێکی کە بۆم هەڵکەوتایە. سەردەمانێک فەڕاش و سەقاو بووم بۆ ئەو بەندیانەی بێگاریان پێدەکردن لە قامیشەڵانە شەکریەکاندا، شتم دەهێنا و شتم دەبردەوە. ئا لەو جۆرە کارانە، بەڵام بێفایدە و بێئاکام بوو. خاوەنەکانیان هەمیشە دەریان دەکردم. وا دەشەلیم کە نەمدەتوانی خێرا خێرا کار بکەم، نەمدەتوانی باری قورسیش هەڵگرم. دوای ئەوە بە دایم لەبەر

تەوژمی ئەم ئێش و ئازارە ناوادەیەدا بووم. دوای بەینێک چوومە کانگاکلتی نوقرە و هەولم دا بەشکم لەوێ کارێک بدۆزمەوە، بەلام کەلکی نەبوو بەرپرسانی ئەوێ بە دیتنی من پێمپێدەکەنین کرێکارانیش لێیان دەدام.

- لەبەر چی؟

- پێموایە ئەوە سروشتی مرۆڤە چوونکە لاواز بووم و ئەوان دەیاندیت کە من تەنیا بە دەستێک دەتوانم بەربەرەکانی و داکۆکی بکەم لە خۆم ئاخرەکەی ئەوێشم بەجێهێشت و بێئەوەی بزانم بۆ کوێ دەچم ملی ڕێگام گرتە بەر و کەوتمە گەڕان لە ولاتدا. تەنیا لەبەر ئەوەی کە بتوانم لە جێگایەکەوە ئێش و کارێک دەستەبەر کەم. ئاوارە و سەرگەردان هەموو جێگایەکەم دەپشکنی.

- هەموو جێگایەک دەگەڕای؟ بەو لاقە شەلەتەوە؟

مێشەکەرانە هەناسەیەکی دڵتەزێنی هەلکێشا و لەپڕێکا سەری هەلێنا و گوتی: «برسی، زۆر برسی و کەنەفت بووم.»

جما کەمێ سەری ڕاوەشاند و چەناکەی لە سەر دەستێکی دانا مێشەکەرانە پاش کەمێ بێدەنگی درێژەی دا، تۆنی دەنگی لە کاتی قسە کردندا وردەوردە ئارامتر و لاوازتر دەبوو: «بەلێ، ئەوندە بە تەنیایی پیاسە کردبوو خەریک بوو شێت و دێوانە دەبووم و هیچ ئاکامێکیشی نەبوو. چووم بۆ ئێکوادۆر. ئیدی ئەوێ هەر مەپرسە لە هەموو جێگایەک خراپتر بوو. جارجارەیەک کەمێکم لەحیمکاری دەکرد - لەحیم کارێکی لێزانیشم - بە شوێن ئەمر کردنێکدا خێرا هەلدەهاتم و یان ئاغەلی بەرازەکانم خاوێن دەکردەوە. جاریواش بوو... ئاخ نازانم چی دیکەم دەکرد، ئاخرەکەی ڕۆژێک...»

دەستە کز و ڕەشهەلگەڕاوەکەی کە لە سەر مێزەکە بوو لەپڕێکدا مێزەکەی توند گرت. جما سەری هەلێنا و بە نارەحەتیەوە لێی ڕووانی. ڕوخساری مێشەکەرانە تەواو ڕووبەڕووی ئەو نەبوو هەر بۆیە دەیتوانی دەماری لاملی و لای گوێچکەی ببینێ کە چۆن وەک چەکوچێک ئاوا توند و خێرا و نارێک لێدەدا. بڕێک نزیک بووە و دەستی بە ئارامی نایە سەر قۆلی.

- پاشماوەکەی مەگێڕەوە، قسە کردن لە سەر ئەم بەستێنە زۆر ناخۆش و دڵتەزێنە. بە گومانەوە ڕووانییە دەستی جما، سەری تەکان دا و قورس و قایم درێژەی دا: «ئاخرەکەی ڕۆژێک تووشی سیرکێکی گەڕوک بووم، لەبیرتە ئەوەی کە ئەو شەوە دیتت؟ شتێکی وەکوو ئەوە، بەڵام توورەتر و بێبایەختر. هەڵبەتە لەو سیرکەدا یاری کردن لەگەڵ گاشی تێدا بوو. سیرکە گەڕوکەکە ، شەوێ لە قەراخ ڕێگایەکدا بارگە و بنەیان دامەزراندبوو، منیش بۆ سواڵ کردن چوومە دەوارەکەیانەوە، دەی هەوا گەرم و منیش برسی، تووني، هەر بۆیە لەبەر دەرکی دەوارەکەیاندا تخێل بوومەوە.

لەوکاتەدا وەک کچێکی قوتابی قوتابخانەی شەو و ڕۆژی کە لە بەر هەڵبێنە توند و تەنگەکەی خۆی بێزار بووە، بە ئەنقەست خۆم تخێل کرد، هەربۆیە منیان بردە ژووری و بڕێک خواردەمەنی و بڕێک شتیتریان بۆهێنام، و دوایە... سبەینی بەیانی... پێشنیاریان پێ کردم کە...» (بێدەنگییەکی کورت) ئەوان پێویستیان بە پشتدەرپەڕیوێک یان کەسێکی سەیر و ناحەز و قیزێون بوو. تا منداڵەکان بتوانن پێستی پرتەقاڵ و مۆز و شتی وای بەسەردا فڕێ بدەن - شتێکی وا کە بتوانێت ئەوان بێنێتە پێکەنین - ئەو شەوە ئەو کابرا ژوورجارەت دیت - بەڵێ دووساڵی عەلەن تەواو ئەوە کار و پیشەی من بوو.

بەڵێ، حوقەوبەزمی سەیر فێربووم، گۆڕانکاریەکی زۆرم لە خۆمدا بەدی نەهێنابوو، تەنیا پشتێکی کۆمی دەست کردیان بۆ دادەنام ئەم لاق و دەستە نوقوستانەشمیان ناحەزتر نیشان دەدا. خەڵکی ئەوێ وردبین و بە هانەگیر نین. ئەگەر تەنیا بتوانن زیندەوەرێکیان گیر بکەوێ و ئەشکەنجەی بدەن وپێی پێبکەنن زۆر بە ئاسانی ڕازی دەبن - کومەڵگای دواکەوتوو و نەفامیش بەش بە حاڵی خۆی، بایەخێکی زۆری هەیە . ئەوان زۆرزان و فێڵاوی نین چییان لە دڵدایە بێگرێ و گۆڵ نیشانی دەدەن. خراپەکەی لەوەدابوو کە زۆرجار نەخۆش دەکەوتم. نەمدەتوانی یاری بکەم. جاری وابوو، ئەگەر بەرپرسەکە کەیفی قنج نەبوایێ و لە ژێر باری قورسی ئەم نەخۆشینوو و ئێش و ئازارەشدا بایەم زۆری لێدەکردم تا بچمە نێو بازنەی ڕینگەکە و یاری بکەم . من لە سەر ئەم باوەڕەم کە خەڵکی زۆرتر چێژیان لەوکاتانە دەبرد کە من

نەخۆشیەکە ڕووی تێ دەکردم . لەبیرمە جارێکیان ئەوەندەم دەرد و ژان هەبوو کە لە نیوەی پرۆگرامەکەدا بێهۆش بووم... کاتێ کە وەهۆش هاتمەوە تەماشاوانەکان لە دەوروبەرمدا کۆببوونەوە... هۆیان دەکرد و دەیان گوڕاند و تێیان هەڵدەدام...»

- بەسە ئیدی! ئیتر ناتوانم ببیسم، بۆ خاتری خودا بەسە!

جما ڕاوێستا بوو و بە هەردوو دەستی گوێچکەکانی توند گرتبوو، مێشەکەرانە بێدەنگ بوو ، سەری بەرز کردەوە و دڵۆپە ئەسرینەکانی چاوی جمای دیت. لە ژێرەوە گوتی: «خودا هەموویان لەبەین بەریت، تەماشە من چەندە بێئەقڵم!»

جما بەرەولای پەنجەرەکە ڕۆیشت، قەدەرێک ڕووانییە دەرەوە. کاتێ کە گەڕاوە و چاوی لێ کرد مێشەکەرانە شانی دابوو بە مێزەکەوە چاوەکانی بە دەستی داپۆشیبوو. وادیاربوو لەبیری چووبووەوە کە جما لێرەیە. جماش بە بێدەنگیەوە لەپەنایدا دانیشت. دوای قەدەرێکی زۆر بێدەنگ بوون هێواش گوتی: «دەمەوێ پرسیارێکت لێبکەم.»

بێ ئەوەی بجوڵێت گوتی: «فەرموو.»

- بۆچی شارەگی گەردنی خۆتت نەبڕی؟

مێشەکەرانە زۆری پێسەیر بوو، سەری هەڵێنا و گوتی: «هەر بە خەیاڵیشمدا نەدەهات کە تۆ پرسیاری وام لێبکەی، ئەوکات ئەی ئیش و کارەکەم چی لێ کردبایە؟ کێ بە جێگای من ئەوکارەی کردبایە!؟»

- کارەکەتان؟ ئەها، تێگەیشتم هەر ئێستا قسەت لە ترسەنۆکی خۆت دەکرد، ئەگەر بڕیارەکەت ئەوە بووە و ئێستاش هەر لە سەر ئەو بڕیار و ئامانجەی، تۆ بوێرترین و ئازاترین پیاوێکی کە من تا ئێستا دیتوومە.

مێشەکەرانە دیسان چاوەکانی داپۆشی و بەدڵە کوتەیەکی سەیرەوە دەستی جمای لەنێو دەستی خۆیدا گووشی. بێدەنگییەکی درێژخایەن باڵی بەسەر هەردووکیاندا کێشابوو. لەوکاتەدا دەنگێکی سوپێرانوئی[1] نەرم و بێگرێی ژنێک کە گۆرانییەکی فەڕەنسەوی دەگوت لە باخەکەدا دەنگی داوە:

---

1. دەنگێکی ژنانە

"Eh Pierrot! Danse Pierrot!
Danse un peu mon pauvre jeannot!
Vive la danse et lallagresse!
Jouissons de note balle, jeunesse!
Si moi je pleure ou moi je soupire,
Si moi je fais la triste figure
Monsieur, ce nest que pour rire:
Ha! Ha! Ha! Ha!
Monsieur, ce nest que pour rire![1]

مێشەکەرانە بە بیستنی هەوەڵین وشەی گورانییەکە بە پەلە دەستی جمای بەردا و هێواش ناڵاندی و خۆی کێشا ئەولاوە. جما وەک کەسێکی کە نەشتەرگەری بکرێ هەردوو شانی مێشەکەرانەی توند گرت و گووشی. دوای ئەوەی کە گورانییەکە تەواو بوو و دەنگی قاقاکێشان‌و چەپڵە لێدانەکان لە باخەکەوە دەبیسترا، مێشەکەرانە کە سەری هەڵێنا چاوەکانی وەک گیانلەبەرێکی ئەشکەنجەدراو وابوو.

---

1. «ئای حەنەکچی! سەما بکە تۆ حەنەکچی!
کەمێک سەما، هۆ ژانوی هەژاری من!
هەر بژی هەڵپەرین و سەما کردن
وەرن لە لاویەتی و خۆشییەکانی چێژ وەرگرین!
گەر دەگریم یان دەناڵێنم .
روو گرژ ئەکەم و روو تێکدەنێم .
کاکە، تەنیا لەبەر ساتێ پێکەنینە
ها! ها! ها! ها!
کاکە، تەنیا لەبەر ساتێ پێکەنینە.»

ئارام گوتی: «بەڵێ، ئەوە دەنگی زیتایە، لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەی کە لەگەڵیدا دۆستن . ئەو شەوە پێش ئەوەی کە ڕێکاردو بێتە ئێرە، ویستی بێتە ژووری. بێگومان ئەگەر دەستی لێم کەوتبایە، شێت دەبووم!»

جما بە هێوریەوە دژبەری قسەکانی ڕاوەستا و گوتی: «بەڵام ئەو نازانێ و ناشتوانێ لەوە بگات کە ئێوە بە دیتنی نارەحەت و قەڵس دەبن.»

دەنگی قاقاکێشانێکیتر لە باخەکەوە هاتە گوێیان. جما هەستاو پەنجەرەکەی کردەوە زیتا کە لەچکەیەکی گوڵدۆزی زەردی بە جوانی لە دەورسەریەوە پێچابوو، لە سەر شەقامی باخەکە ڕاوەستابوو، چەپکێ گوڵی وەنەوشەیی بە دەستەوە بوو سێ ئەفسەری لاوی سوارکاری لەشکری دەورەیان دابوو و هەرکامەیان بە تەمای ڕفاندی ئەو چەپکە گوڵە بوون، زیتاش چەپکە گوڵەکەی بەرز ڕاگرتبوو و ئەم دەستوئەو دەستی پێ دەکرد.

جما گوتی: «مادام ڕێنی!»

ڕوخساری زیتا وەک هەوری بەرتەوژمی توفانێک ڕەش هەڵگەڕا. هەروا کە بە ڕقێکەوە سەری بەرەولای سەرێ ڕاداشت گوتی: «بەڵێ مادام؟»

- دەکرێ بەو دۆستانەت بڵێی کەمێ ئارامتر قسە بکەن؟ سینیورا ڕیوارز حاڵی زۆر خراپە. قەرەچیەکە چەپکە گوڵەکەی فڕێ دا. ئەفسەرەکان کە زۆریان پێسەیر بوو زیتا ڕووی تێ کردن و گوتی:

messieurs!"1. en! Vous membetes, . Vous ." Allez

به هێواشی بەرەو ڕێگاکە ڕۆیشت و جماش پەنجەرەکەی داخست.

ڕووی کردە مێشەکەرانە و گوتی: «ڕۆیشتن»

- دەستت خۆشبێت. تکایە... بمبورە کە ئاوا کەوتیە زەحمەتەوە.

- نا هیچ زەحمەتێک نییە.

مێشەکەرانە خێرا لە دڕدونگی قسەکەی گەیشت.

- بەڵام سینیورا ئەم ڕستەیەت کەم و کۆڕی هەبوو «بەڵام»ێک کە لە زەینتدایە بە زمان نەتدرکاند.

---

1. بڕۆن! بە ڕاستی ماندووتان کردووم ئاغایان!

ـ تۆ ئەگەر دەتوانی فکر و زەینی خەڵکی بخوێنیتەوە، نابێ لە مانا و مەبەستی قسەکانیشیان زوێربی. هەڵبەتە ئەمە هیچ پێوەندی بە منەوە نییە، بەڵام من لەوە ناگەم کە...

ـ ڕقێکی کە من لە مادام ڕێنیم هەیە؟ ئەمە تەنیا لە کاتێکدایە کە...

ـ نا، حەز و خۆشەویستییەکی کە سەبارەت بە ژیانی ئەو هەتە، ئەگەر هەست بە ڕق و بوغزێکی وا دەکەی بەڕای من ئەمە ئیهانە کردنە بە ئەو. ئیهانە کردن بە ژنێک، بە... (مێشەکەرانە بە تەوسێکەوە پێکەنی) ژنێک! ئە بەوە دەڵێن ژن؟

" Madam ce nest que pour rire!"[1]

جما گوتی: «بە ڕاستی ئەمە دوور لە پیاوەتیە! تۆ حەقت نییە لەلای خەڵکی بە سووکایەتی نێوی بێنی بە تایبەت لەلای ژنێکی دیکە!»

مێشەکەرانە ئاوڕی داوە بە چاوانێکی سەرگەردان و پەرێشانەوە خۆی ڕاکێشا و لە پەنجەرەکەوە ڕووانییە هەتاو کە ئاوا دەبوو. جما پەردەکەی کێشا و پەردەکڕکڕەیەکانیشی بەست تا نەتوانێ ڕۆژئاوابوون ببینێ، پاشان لەپەنای پەنجەرەیەکی دیکەدا لەپشت مێزەکە دانیشت و دیسانەوە دەستی کردەوە بە چنین.

پاش کەمێکیتر پرسی: «چراکە ڕۆشن کەم؟»

مێشەکەرانە بە سەری گوتی: «نا»

کاتێ کە تاریکی بەرچاوی گرتن جما شتچنینەکەی تێکەوە پێچاو خستیە ناو زەمیلەکەیەوە بڕێک دەستی لە سەردەستی دانا و بێدەنگ ڕووانییە جەستەی مێشەکەرانە کە بێجووڵە خۆی ڕاکێشابوو. وادیاربوو کە ڕووناکایی کەم و بێتینی شەو کە دەکەوتە سەر ڕوخساری، شەڕاژویی و ڕقهەستاندنەکەی کەمڕەنگتر دەنواند و چرچ و لۆچی خەمئاژوی دەم و چاوی قووڵتر نیشان دەدا. لە پڕێکدا جما بە هۆی وەبیرهێنانەوەی ڕابردوویەوە فکری ڕاست چوە سەر ئەو خاچە بەردینەی کە باوکی بە یاد و بیرەوەری ئارتورەوە دروستی کردبوو و ئەو نووسراوەیەشی لە سەر

1. خانم، ئەمە تەنیا بۆ پێکەنینە

هەڵکەندبوو:«هەموو شەپۆلە بە تەوژمەکانی ئازاری جەستەی تۆ، بە سەر مندا تێ پەڕیون. »

سەعاتێنێک لە بێدەنگیدا ڕایانبوارد. ئاخرەکەی هەستا و چووە دەرەوە کاتێ کە بە چرایەکەوە گەڕاوە بۆ ژوورەکە، وایزانی کە ئەو خەوتووە، کەمێ ڕاوەستا، مێشەکەرانە هەرکە شەوقی چراکە لە ڕوخساری درا ڕووی وەرگێڕا.

جما هەروا کە چراکەی لە سەر مێزەکە دادەنا، گوتی: «ئیستیکانێک قاوەم بۆ ساز کردووی.»

ـ جارێ لە سەر مێزەکەی دانێ. تکایە ئەگەر دەکرێ کەمێک وەرە پێشەوە. هەردوو دەستی جمای توند گرت و گوتی: « لە دڵی خۆمدا وام بیر کردەوە کە قسەی تۆ ڕاستە و ژیانی خۆم ئاوێتەی ئاڵۆزییەکی فیزیۆن کردووە، بەڵام لە بیرت نەچێ کە پیاوێک بۆ ئەوەی کە ژنێکی خۆشبوێت، هەموو ڕۆژێکو لە هەموو کات و ساتێکدا ناتوانێ بە ئارەزوی دڵ ڕووبەڕوی بێتەوە ؛ و منیش... ژیانێکی پڕ لە چەرمەسەرێم هەبووە. من لە تاریکایی دەترسێم.»

ـ ترس...

ـ بەڵێ، جاریوایە ناوێرم کە شەوانە بە تەنیایی بمێنمەوە. دەبێ حەتمەن کەسێکم لەلابێ ـ کەسایەتیەکی قەوی و بە توانا. ئەم تاریکایە دەرەکیە کە لەوێ ... نا، نا! هەڵەم کرد، ئەمە یارییەکی منداڵەنە و بێبایەخە ـ ئەم تاریکاییە هی دەروونی خۆمە، لەم دنیا نهێنییەدا نە گریان و نە ئەسرینڕشتنی تێدایە و نە ددانە چیرێ، تەنیا کپی و بێدەنگی، بێدەنگی.

چاوەکانی زۆرتر کرانەوە. جما تەواو بێدەنگ بوو و زۆر بە ئەستەم و ئارامی هەناسەی هەڵدەکێشا. تا ئەوەی کە مێشەکەرانە دیسانەوە کەوتەوە قسە کردن: «ئەوانەی باسم کردن هەموویان لەلای تۆ خەیاڵێکی بێبایەخن، وا نییە؟ بە خۆت نییە ناتوانی تێیبگەی ـ خۆزگەم بە خۆت کە! مەبەستم ئەوەیە ئەگەر من بمویستایە کە بە تەنیا بم زۆر زوو شێت دەبووم و لە کەللەی دەدام. تکایە ئەگەر دەکرێ ئەوەندە من بە دڵڕەق مەزانە، بە گشتی من ئەو دڕەندە شاخیە نیم کە ئێوە سەبارەت بە من وا بیر دەکەنەوە.»

جما وەڵامی داوە: «من ناتوانم لە سەر کەسایەتی تۆ لێکدانەوەم هەبێ، چونکە بە قەدەر تۆ ئازارم نەکێشتووە، بەڵام منیش بە شێوەیەکی دیکە چەرمەسەرێم دیتووە و پێموایە ـ دڵنیام ـ کە ئەگەر بۆ خۆت بێڵی ترس و خۆف بە سەرتدا زاڵ بێ ، هانت بدا بۆ هەر کارێکی زاڵمانە و نامرۆڤانە و دوور لە جوامێری و ناعادڵاتە ، بێ شک دوایە پەژیوان دەبیەوە ، بەڵام سەبارەت بەوشتانەی دیکە، ئەگەر تۆ لەم کارەدا شکستت خواردوە، من خۆم باش دەناسم، ئەگەر بە جێگای تۆ بایەم لە هەموو شتێک و هەموو کارێکدا شکستم دەخوارد. قسەی ناشیرینم ئاراستەی خودا دەکرد و کۆتاییم بە ژیانم دەهێنا.»

مێشەکەرانە هەروا کە دەستی ئەوی گرتبوو، بە شێوەیەکی زۆر نەرم و هێدیەوە گوتی: «پێم بڵێ! ئایا قەد لە ژیانتدا کردەوەیەکی زاڵمانەت ئەنجام داوە ؟»

جما وەڵامی نەداوە، بەڵام سەری داخست و دوو تنوک فرمێسکی گەش و گەورە کەوتنە سەر دەستی مێشەکەرانە.

هەروا کە دەستەکانی ئەوی توندتر دەگووشی بە برشت و بە قورس و قایمیەوە گوتی: «پێم بڵێ! من هەموو ڕۆژەڕەشی خۆمم بۆ گێڕایتەوە.»

ـ بەڵێ، تاقە جارێک، زۆر لەوەپێش، ئەویش سەبارەت بە کەسێک کە لەو دنیایەم زیاتر خۆش دەویست.

ئەو دەستەی کە دەستەکانی جمای دەگووشی سەیر دەلەرزین، بەڵام ئاستی گووشینەکەی کەم نەدەبووەوە.

جما درێژەی دا: «ئەو هاوڕێیەکی من بوو، و منیش زۆر کوێرانە باوەڕم بەو درۆیە کرد کە سەبارەت بە ئەو سازاندبوویان ـ درۆیەکی هیچ و پووچ و بێشەرمانە کە پولیس دروستی کردبوو. وەک خۆفرۆشێک چاوم لێ کرد و زللەیەکم لێدا. ئەویش ڕۆیشت و خۆی خنکاند. دوو ڕۆژ دوایە زانیم کە ئەو بێتاوان بووە، ئەم ڕووداوە ڕەنگە لە هەموو بیرەوەریەکانی تۆ تاڵتر بێ. ئەگەر ئەم ئاوە ڕژاوە بگەڕێتەوە، لە خۆشیانا دەستی ڕاستی خۆم دەپەڕاند.»

تیشکی تەوژمی نیگایێکی ترسێنەر و توقێنەر ـ شتێکی وا کە جما تا ئەو کاتە نەیدیتبوو ـ لە چاوەکانی مێشەکەرانەدا درەوشایەوە. بە دزە دز نیگای چاوەکانی لێدزیەوە و سەری داخست و دەستەکانی جمای ماچ کرد.

جما بە ڕوخسارێکی ترسهێنەرەوە خۆی کێشایە دواوە و بە ڕقهەستاویەوە گوڕاندی: «وا مەکە! تکات لێدەکەم ئیتر کاری وا مەکە! بەو شێوەیە تۆ هەست و سۆزی من خەوشدار دەکەی!»

- بۆ پێتوایە تۆ هەست و سۆزی ئەو کابرایەی کە کوشتووتە خەوشدارت نە کردووە؟

- پیاوێک کە من... کووشتم... ئاه ئاخرەکەی سزار هات!... دەبێ... دەبێ... بڕۆم!

کاتێکی کە مارتینی هاتە ژوورەکەوە، مێشەکەرانەی دیت کە بە تەنیایی قاوەیەکی ساردەوەبووی لەپەنادایە و ڕاکشاوە، بە سستی و بە ڕەنگپەڕیویەوە جنێو بە خۆی دەدا وەک بڵەی تەواو ڕازی نەبووبێ.

## ٩

دوای چەند ڕۆژێک کە مێشەکەرانە هێشتا ڕەنگی سەرخۆ نەکەوتبووەوە و زۆر سەیر دەشەلی چووە کتێبخانەی گشتیەوە و کارووسێکی کاردینال مونتانلی داوا کرد. ڕیکاردو کە لەپەنای ئەوەوە دانیشتبوو خەریکی موتالا کردن بوو، سەری هەڵێنا. ئەو مێشەکەرانەی زۆر خۆش دەویست، بەلام ئەم خۆشەویستیە نەدەبووە هۆی ئەوەی کە ڕەگێکی ڕق و توورەیی کە لە ناخیدا بوو بیشارێتەوە. بە کەمێک توورەییەوە لێی پرسی: «خەریکی خۆتەیار کردنی ئەوەی کە هێرشێکیتر بکەیتە سەر ئەو کاردیناله ڕۆژەڕەشە؟»

- کاکی خۆم، بۆچی هەم - هەمیشە ڕێگای خراپ و ن - نالەبار بۆ خەڵکی دەکێشی؟ ئەمە ڕ - ڕاست دوور لە ئاکاری خاچپەرەستیە من سەرقاڵی نووسینی وتاریکم سەبارەت بە پیرۆزی و لێهاتوویی خواوەند. کە بۆ ئەو ڕۆژنامە نوێیە دەبێ.

ڕیکاردو نێوچاوانی تێکنا و گوتی:«کام ڕۆژنامەی نوێ.»

لە ڕاستیدا ئەمە بە هۆی دەنگۆیکەوەیە لە مەڕ ئەگەری وەگەڕ کەوتنی یاسایکی نوێی چاپەمەنییەوەیە، کە گرووپێکی بەرهەڵستکار بە تەمان خۆ تەیار کەن بۆ بلاو کردنەوەی ڕۆژنامەیکی ڕادیکاڵ ئەمە هێشتا وەک ڕازێک وایە کە لە نێو خەڵکی شاردا زاربەزار دەگەڕێ.

- بێشک یان ڕۆژنامە حیلەبازە دوو ڕووەکەیە ، یان ساڵنامەکەی کلیسایە.

ـ سس! ڕیوارز ئەو جەماوەرە خەریکی موتالا کردنن.

ـ دەیباشە، ئەگەر نەشتەرگەری حەز و خولیای تۆیە، خەریکی ئیشی خۆت بە و لێگەڕێ با منیش خەریکی زانستی ئاینی بم، هەرچەندە کە لە سەر شکان و گردەبڕبوونی ئێسکی لەش زانیاریم لە تۆ زیاترە، بەڵام سەبارەت بە چۆنییەتی هەڵبەستنەوەیان خۆمی تێهەڵناقورتێنم.

بەشێوەیەکی قورس و قایم و بە حەزەوە خەریکی موتالا کردنی موعیزەکە بوو. بەرپرسێکی پەرتووکخانەکە هاتە لای و گوتی: «سینیورا ڕیوارز، پێموابێ تو لەگەڵ لیژنەی دووپرە بووی بۆ دۆزینەوە و ناساندنی لقێک لە چۆمی ئامازۆن؟ بەڵکوو بتوانی یاریدەمان بدەی بۆ جێبەجێ کردنی گرفتێک، خاتوونێک ڕاپورتەکانی ئەوشاندەی دەویست، بەڵام ئەو ڕاپورتانە لای جزووبەندن.

ـ دەیەوی لەوبارەیەوە چی بزانێ؟

ـ تەنیا ئەوەی کە شاندەکە کەی ڕێکەوت و کەی ئێکوادۆری بەجێهێشت.

ـ لە پایزی لە پاریسەوە ڕێکەوت و لە ئاوریلی لە کیوتووە گوزەرا . سێ ساڵ لە برێزیل بوین. دوایە بەرەو ڕیو داپەڕین و لە هاوینی ٤ گەڕاینەوە بۆ پاریس. ئەم خاتوونە هەموو بەروارەکانی ئەم کەشف و ناسینانەی گەرەکە؟

ـ نا، زۆر سوپاس، هەر ئەوەندە تەواوە. من ئەوانەم نووسیەوە، بێپو، تکایە ئەم نووسراوەیە بدە بە سینیورابولا.

ـ زۆر سوپاست دەکەم سینیور ڕیوارز. دەستت خۆشبێ بمبورە.

مێشەکەرانە بە ڕوخسارێکی پەشێوەوە لە سەر کورسیلەکەی پاڵی داوە: «بەروارەکانی بۆچی بوو؟ لیژنەکە کەی لە ئێکوادۆرەوە گوزەرا...»

جما نووسراوەکەی وەرگرت و گەڕاوە بۆ ماڵێ: «ئاوریلی ، ئارتوریش لە مانگی مەیی دا مرد پێنج ساڵ...» لە ژوورەکەی خۆیدا دەستی کرد بە پیاسە کردن. چەند شەوی ڕابردووی بە ناخۆشیەوە ڕابواردبوو. لەبەر بێخەوی

---

١. Quito: پێتەختی ئێکوادۆر

٢. Rio: مەبەست ڕیودوژانیرۆیە

دەوری چاوی بۆر ببووەوە. پێنج ساڵ...» و «قەڵاو باڵاخانەیەکی زۆر خۆش؟»... و «کەسێکی کە دنیایەکی باوەڕي پێی بووە فریوی داوە" ـ ئەوی فریو داوە و ئەویش بەوەی زانیبوو... ڕاوەستاو دەستەکانی لە سەر سەری دانا. ئاە تەواو کارێکی سەرشێتانە بووە ـ شتیوا قەت نابێ... کارێکی دوور لە ئەقڵ و ڕاستیە... ئەوان بە چ وردبینییەکەوە ئەو گومیلکانەیان بست بە بست پشکنی!

«پێنج ساڵ» و هێشتا «تەمەنی بیست و یەکساڵ نەبووە" کە لاسکار ـ یانی کاتێ کە ئەو لە ماڵەوە هەڵاتووە نۆزدە ساڵان بووە ـ مەگەر ئەو نەیگوت کە «بەرابەر و نیوێک...» ئەم چاوە شینانەیو ئەم تووڕەیە و ئەم قامکە لەرزۆکانەی، چی؟

ئەگەر هەر ئەوەندە بیزانیبایە کە خنکاوە، ئەگەر تەنیا مەیتەکەی دیبایە، بێگومان تۆزێ سوکنایی دەهات و ئیدی ئەم بیرەوەریە، سامناکیەکەی دەڕەوی. ئیتر پاش بیست ساڵ دەیتوانی بێئەوەی بترسێت و بلەرزێت ئاوڕ بداتەوە بەرەو ڕابردوو، هەموو تەمەنی لاویەتی لە ژێر باری قورسی ئەوکارەی کە کردبووی دەینالاند. ساڵیانێکی زۆرە لەگەڵ دێوی پەژیوانیدا دەستەو یەخەیە. دایمە لە فکری ئەوەدایە کە داهاتوو تۆڵەی لێدەکاتەوە و هەمیشە چاو و گوێی خۆی بەسەر دەروازەی ڕابردودا داخستووە، ساڵیانێکی زۆرە کە بیرەوەری تەرمێکی کە لە دەریادا خنکاوە ئەوکی بەر نەدەدا و گریانێکی تاڵ کە لە سەر دڵی قورسایی دەکرد و نەیتوانیبوو دایمرکێنێ و دایم دەیگوتەوە: «من ئارتورم کووشتووە! ئارتور مردووە!» جاریوابوو وای بە مێشکدا دەهات کە قورسایی خەمی ئەو ئەوەندە گەوریە کە شانیی توانایی هەڵگرتنی ئەو بارە قورسەی نییە.

ئێستا نیوەی تەمەنی خۆی دەبەخشی بەوەی کە دیسانەوە ئەو خەمە قورسە بێتەوە میوانی دڵی. ئەگەر ئەو ئارتوری منی کوشتبوو ـ ئەمە خەمێکی ئاشنا دەبوو ـ لەگەڵ ڕەنجی ئەو خەمەدا ڕاهاتبوو ئیتر دڵی هەستی بە قورسایی نەدەکرد ببووە هاوڕێی بیر و هزری، بەڵام ئەگەر ئەویان بە جێگای ئاو ـ دانیشتوو و بە هەردوو دەستی چاوەکانی داپۆشی و لەبەر

ئارتور و خەمی ئەو، ژیانی ببووە جەهەندەم، چونکە ئەو مردبوو! ئەگەر سەرزەنشت و سەرکۆنەکانی ئەو لە مەرگ خراپتر نەبووبێ...

بە پێ داگری و بە سەختیەوە هەنگاو بە هەنگاو و ئارام ئارام بە جەهەندەمی ژیانیدا بەرەو ڕابردوو گەڕاوە . ڕابردوو بۆ ئەو ڕوون و زیندوو بوو کە دەتگوت هەموویان لەبەردەمی دان و هەستی بە بوونی هەموویان دەکرد، ترسی هێوابڕاوی ڕۆحی ڕووتەڵەی ، بە تەوسەوە پێکەنینێک کە لە مەرگ تاڵتر بوو، ترس لە تەنیا بوون و ڕەنج و ژانی بیرەوەری ئەو ڕووداوە. هەمووی ئەوانە ئەوندە زیندوو بوون کە دەتگوت ئێستا لەو ماڵە پیسە ئیندیانایەدا لەپەنای مێشەکەرانەوە دانیشتووە، دەتگوت لەگەڵ ئەوە و لە کانگای نوقرە و مەزرای قاوە و سیرکی کۆچەردا شان بە شانی ئەو کار دەکا و ئازار دەبینێ.

سیرکی کۆچەر ـ نا، لانیکەم دەبێ خەیاڵی بیر کردنەوەکەشی لەخۆی دوورخاتەوە، تەنیا وەبیرهێنانەوەی ئازاری ئەو سیرکە ئینسانی شێت دەکرد. چەکمەجەیەکی چکۆلەی مێزی نووسینەکەی کردەوە. لەو چەکمەجەیەدا چەند یادگارییەکی تایبەتی تێدا بوو کە نەیدەتوانی لەبەینیان بەرێت. ئەو نەیدەویست وەک منداڵ بە هەبوونی ئەوشتانە خۆی هەڵخەڵەتێنێ. ڕاگرتنی ئەم شتە بەنرخانە بەلای ئەوەوە بە هۆی خواست و ویستی دڵیزامارییەوە بوو. کە ئەو بە بێڕۆحمیەوە ئەو خواستەی دڵی سەرکوت کرد و ئێستاش جارجارە ئەوندە بە خۆیدا دیتەوە کە چاویان لێبکات و باڵ بە بیرەوەریەکانی بگرێت.

ئەوانەی یەکبەیەک هێنایە دەرێ: هەوەڵ نامەی جوانی و ئەو گوڵانەی کە کاتی مردنی لە دەستیدا بوون و قولێک لە قژی منداڵەکەی و گەڵایەکی ژاکاوی سەرقەبری باوکی. لەوسەری چەکمەجەوە ڕەسمێکی مینیاتوری ئارتوری تێدا بوو کاتێکی کە دەساڵانە بووە ـ تاقە ڕەسمێکی کە لێی بەجێمابوو. ڕەسمەکەی بە دەستیەوە گرت و دانیشت و ئەوەندە چووە ناخی ئەو ڕەسمەوە و ئەو سەر و کاکۆڵە منداڵانەیەوە، تا دیسانەوە ڕوخساری لاویەتی ئارتور لەبەر چاویدا زەق بوەوە . چەندە ڕوون و جوان بوو! هێڵی

زەریف و ناسکی لێوەکانی و چاوی پیاڵەیی و کراوەیی ئەو و پاکی و ڕووگەشیەکەی، هەموویان، دەتگوت تازە دوێنەکە بوو کە مردووە، هەموو ئەوانە نەخشی سەر زەینی بوو و فرمێسکەکانی کە بە لێزمە دەهاتنە خوارێ و وەک پەردەیەک پێش چاویان دەگرت و ئێرەییان بە نیگای چاوەکانی دەبرد بۆ دیتنی ڕەسمەکە.

ئاه، چۆن توانیبووی بیر لە شتێکی وا خراپ بکاتەوە! تەنانەت ئەگەر بە خەیاڵیش ، مەینەتیەکانی ئەم ژیانە بەو ڕۆحە پاکەوە بلکێندرێت ئیهانە کردنە بە چەمکە پیرۆزەکان. بێ‌گومان خوداکانیش ئەویان زۆرخۆش دەویست و لێی‌گەڕان تا بە لاویەتی بمرێ! چوونکە ئەم زەویە پیس‌گرە، هەزاران جار لە خودام دەویست کە ئەو مردبێت و نەمابێ تا ئەوەی ئێستا مابێ و مێشەکەرانە بێ - مێشەکەرانە بەو کراواتە ڕێکوپێکەیەوە بەو قسە خۆشانەیەوە، بەو تووڕەیەوە و بەو کچەتیوە سەماکەرەیەوە! نا! نا! هەموو ئەوانە خەیاڵە و خەیاڵێکی سامناک و ترسێنەر و جما ئاوا بەو خەیاڵەوە دڵی خۆی دەرزی ئاژن دەکرد.

ئارتور مردبوو.

دەنگێکی نەرم و ئارام لەپشت درگاکەوە پرسی: «ئیزنم هەیە بێمە ژوورێ؟»

جما وا داچڵەکی کە ڕەسمەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە و مێشەکەرانە بە شەلەشەل هاتەوە ژوورەوە ڕەسمەکەی هەڵگرتەوە و دایەوە دەستی.

جما گوتی: «سەیر ترساندمت!»

- بمبورە، پێم‌وایە وەختێکی نابەجێ هاتووم؟

- نا، خەریکی ئەوشتومەکە قەدیمیانە بووم.

کەمێ ڕاوەستا، دوایە مینیاتورەکەی دایە دەستی.

- سەبارەت بەم ڕەسمە ڕات چیە؟

کاتێ کە وێنەکەی چاو لێ‌دەکرد، جما ڕوخسار و ڕووانینی ئەوی هەڵدەسەنگاند، دەتگوت ئەو ڕەسمە بە ژیانییەوە بەستراوەتەوە، بەڵام هەڵس‌وکەوتی نەرێنی و ڕەخنەگرانە بوو. مێشەکەرانە گوتی: «ئەرکێکی

قورس و گرانت خستووەتە سەر ڕێم، وێنەیەکی کاڵەوەبووە تێگەیشتن لە ڕوخساری منداڵێک زۆر ئاسان نییە، بەڵام بەڕای من ئەم منداڵە ئەگەر گەورە ببوایە بەش مەینەت دەبوو و باشترین کارێکی کە دەیتوانی بیکات ئەوە بوو کە نەهێڵی گەورە بێت.»

- بۆچی؟

- چاو لە هێڵی ژێر لێویەوە بکە. ئەم مرۆڤانە کەسانێکن کە دەرد و ژانەکان وەکوو خۆی و ناڕاستیەکان و چەوتیەکان پڕ بە دڵ وەک هەیە هەست پێدەکەن. هەربۆیە دنیا جێگای ئەو جۆرە مرۆڤە پاقژانە نییە. دنیا کەسانێکی دەوێ کە هەستێکی مردارەوەبوویان هەبێ و هەستیار نەبن و تەنیا و تەنیا کار و ئیشی خۆیان لەبەرچاو بێ.

- پێتان وایە ئەم وێنەیە لە کەسێک دەچێ کە ئێوە بیناسن؟

بە وردبینییەکی زۆرترەوە لە ڕەسمەکەی ڕووانی: «بەڵێ، زۆر سەیرە بەڵێ وێ دەچێ و تەواو وەک ئەویش وایە.»

- لە کێ دەچێ؟

- کا ـ کا ـ کاردینال مونتانا ـ نلی. تەواو دڵنیا نیم کە ئایا ئەو بەڕێزە برازای هەیە؟ دەکرێ لێت بپرسم کە ئەم ڕەسمە هی کێیە؟

- ئەمە وێنەی منداڵی ئەو دۆستەیە کە ئەو ڕۆژە سەبارەت بە ئەو قسەم بۆکردی...

- ئەو کەسەی کە کووشتت؟

سەیر لەو قسەیە داچڵەکی، چەندە لە سەرەخۆ ئەم وشە سامناکەی بەیان کردا!

- بەڵێ ئەوکەسەی کە من کووشتم ـ ئەگەر بە ڕاستی مردبێ.

- ئەگەر؟

جما تەواو چاوی بڕیبووە سەر ڕوخساری ئەو. جاریوابووە کە کەوتوومەتە شک و گومانەوە تەرمەکەی قەد نەدۆزراوە. ڕەنگە وەکوو تۆ لە ماڵەوە هەڵاتبێ و پەنای بردبێتە بەر ئەمریکای باشوور.

- تۆخودا ئارەزوویەکی وای بۆ مەکە. ئەمە بیرەوەریەکی زۆرخۆش نییە کە بتهەوێ لە زەینی خۆتدا ڕایگری. من بە درێژایی ژیانم بەربەرەکانییەکی زۆرم کردووە و بگرە کەسانێکیشم کوشتبێ و بەرەو دۆزخم ناردبێتن. قەتیش ویژدانم ئیدانەم ناکات، بەڵام ئەگەر بوونەوەرێکی زیندووم بەرەو ئەمریکای باشوور بەڕێ کردبێ، شەوانە بە پەشێویەوە دەخەوتم و ویژدانیشم کسپەی لێوە دەهات...

جما، هەروا کە دەستی لێکهەڵپێکابوو لێی نزیک دەبووەوە، قسەکەی پێبڕی و گوتی: «کە وایە باوڕت بەوە هەیە کە ئەگەر ئەو نەخنکابایەت - ئەگەر نەخنکابایەت و وەک ئێوە ڕووداوگەلێکی ناخۆشی بەسەردا بهاتبایە - قەت نەدەگەڕاوە و لە ڕابردووی خۆی چاوی دەنووقاند؟ یان لە سەر ئەو ڕایەن کە قەد ڕابردوی خۆی فەرامۆش نەدەکرد؟ لەبیرت نەچێ کە ئەوکارە کاردانەوەیەکی تاڵ و ناخۆشیشی لە سەر من هەبووە. چاوم لێ بکە!» پرچی پڕ و لوولی لە سەر هەنییەی لادا: قژی سەری کەمتاکورتێ سپی تێ کەوتبوو.

بێدەنگییەک هەردووکیان داگرت.

مێشەکەرانە ئارام گوتی: «بەڕای من باشتر وایە کە وردەوردە مردووەکان فەرامۆش بکرێن. هەرچەندە یادی ئازیزی وا هەیە کە ناتوانرێ فەرامۆشی بکەیت و ئەگەر ئەمن بە جێگای ئەو دۆستەی تۆ لە ژیانی ڕابردووتدا بایەم، وەک ئە - ئە - ئەوانیتر مردبووم. مردوویەکی لە گۆڕ دەرپەڕیو ناحەز و دزێو.»

جما وەک جاران ڕەسمەکەی لە چەکمەجەی مێزەکە ناوە و دایخست.

- ئەم بیروڕایە زۆر دڵڕەقانە و بێبەزەییانەیە ؛ باشە ئێتر با لە سەر تەوەرەیەکی دیکە قسە بکەین.

- هاتووم بۆ ئێرە تا لە سەر مژارێک ڕاوێژکاریم لەگەڵ بکەی، ئەگەر ئیزنم بدەی دانووستانێکمان هەبێ لە سەر ئەو گەلاڵەیەی من.

کورسییەکی لای مێزەکە دانا و دانیشت، بێئەوەی لە قسە کردنەکەیدا زمانی بیگری گوتی: «سەبارەت بەو یاسا نوێیەی چاپەمەنییەکان ڕات چیە؟»

- ڕای من لەوبارەیەوە چیە؟ پێم وایە شتەیێکی پڕ بایەخ نییە، بەڵام مووێک لە بەرازێک بێتەوە هەر زۆرە.
- بێگومان، یانی بە تەمای لە یەکێ لەو ڕۆژنامە نوێیانەدا کە ئەو خەڵکە باشە بڵاوی دەکەنەوە درێژە بە کارکەی خۆت بدەی؟
- بەڵێ، زۆر جار ڕۆژنامەیەک پێویستی بە ئیش و کارێکی زۆر گرینگی فەنیی هەیە ـ وەکوو چاپ، بڵاو کردنەوەی ڕێکوپێکی و...
- تا کەی بە تەمای بیر و هزری خۆت لەو ڕێگایەدا خەسارکەی؟
- بۆچی خەسار؟
- چوونکە خەسار کردنە. تۆ بۆخۆت زۆرباش دەزانی کە بیرو ئەندێشەت لە هەموو ئەو پیاوانەی کە لەگەڵیان کار دەکەی باشتر کار دەکات و سەرەڕای ئەوە تۆ ڕێگەیان پێ دەدەی وەکوو خۆفرۆشێک Johannestactotum چاوت لێ بکەن. لە چاو گراسینی و گالی ئەوەندە ئاقڵتر و فامیدەتری ، کە ئەوان وەک دوو منداڵی قوتابخانە وان، بەلام تۆ خەریکی هەڵەکانی ئەوان ڕاستە و پاستە دەکەیتوو وەک قوتابیەکی چاپخانە ڕێکوپێکیان دەکەی.
- لەپێشدا ئەوەت پێ بڵێم کە هەموو کات و ساتی من بە ساخ کردنەوەی هەڵەکانەوە ناگوزەرێت ، دوای ئەوە پێمواب‌ێ سەبارەت بە توانایی هزر و ئەندێشەی من زێدەڕۆیی دەکەی قەت بیر و هزری من ئەوەندەش باش و پەسند نییە.
بە هێواشی و ئارامیەوە وەڵامی داوە: «قەت ناڵێم ئەندێشەت وا درەوشاوە و پەسندە، بەڵام بێگومان زۆر سلامەت و لە سەرەخۆیە. ئەم خاڵە بایەخێکی زۆری هەیە.»
- لەو کۆبوونەوە ناخۆشانەی کۆمیتەدا، هەمیشە هەر تۆی کە قامک لە سەر ئەو خاڵە لاوازانەی قسەکانیان دادەنێیت.
- تۆ بە ئینسافەوە بیر لەوان ناکەیتەوە. بۆ وێنە مارتینی قسەکانی زۆر پەسند و بەجێیە، سەبارەت بە لێهاتوویی فابریزی و لیگاش هیچ شک و

٣. قەرەواش

گومانێکم نییە و گراسینیش سەبارەت بە خشتەی ئابووری ئیتالیا ڕەنگە لە هەموو کارمەندانی ئەم وڵاتە زانیارییەکی باشتر و ڕێکوپێکتری هەبێ.
- باشە، ئەوە زۆر بە هەند مەگرە. دەی ئەگەر ئیزنت لە سەربێ با لە کۆڵ ئەوانوو و توانایەکانیان بینەوە . ڕاستیەکەی ئەوەیە کە تۆ بەو هزرە باش و بەهرەمەندیەتەوە دەتوانی ئەرکی گرینگتر جێبەجێ بکەی و بەرپرسیایەتی باشتر و گەورەتر بگریە ئەستۆ.
- من بە کار و ئیشی خۆم زۆر ڕازیم. ئەوکارەی کە من دەیکەم رەنگە بایەخێکی زۆری نەبێ، بەڵام ئێمە ئەوەندەی کە لە تواناییماندا بێ دریغی ناکەین.
-سینیورابوولا، ئێمە ئەوەندە لێکتر نزیک بووینەتەوە کە نابێ ڕوودەربایسیمان لە گەڵ یەکتری هەبێ ؛ تۆ شەرەفت پێم بڵێ بۆخۆشت پێتوانییە کە بیر و هزرت لە سەر کارێکی کەمبایەخ و تەسک لە خەساری دایە کارێکی کە زۆر کەسی کەمئەزموون و ئاسایش دەتوانن جێبەجێی کەن؟
- ئێستا کە پرسیارەکەت وا بە بڕشتانەیە، بەڵێ کەم تا زۆرێک قسەکانت دەسەلمێنم.
- ئەی ئەگەر وایە بۆچی درێژە بەوکارە دەدەی؟
وەلامێکی نەداوە.
- بۆچی دەهێڵی ئەم کارە کەمبایەخە بەردەوام بێت؟
- چوونکی ڕێگاچارەیەکی دیکەم نییە.
- بۆچی؟
جما سەری هەڵێنا و گوتی: «ئەم جۆرە دوواندنە دوور لە ئینساف و پیاوەتییە کە ئا بەو جۆرە سەرکۆنەم دەکەیت و دەمخەیتە بازنەی زەقت و گووشارەوە.»
- بەلام لە کۆلت نابمەوە تا هۆی ئەو کارەم پێ نەڵێی.
- ئەگەر دەتهەوێ بیزانی، چوونکە... من ژیانێکی پڕ لە شکست و دەردئاژوییم بووە، بە ڕاستی ئیتر بڕستی ئەوەم لێبراوە کە کارێکی پڕاوپڕ

شیاو و بەپێز بکەم. من لە خۆم ڕادەبینم و شایانی ئەوەشم کە شانم هەڵگری بارێکی قورسی شۆڕشگێڕی بێت و ئیش و کاری پڕ زەحمەت و پڕ چەرمەسەری جێبەجێ بکەم.

- بێگومان کەسێک دەبێ شانی وەبەر ئەو جۆرە کارە قورسانە بدات، بەڵام نەک هەمیشە لە سەر شانی کەسێکی تایبەتی بێت و دەبێ جێگۆڕکێی پێ بکرێ.

- ڕاست ئەوشتەی کە من بۆی دروست کراوم.

مێشەکەرانە بە گۆشە نیگایەک چاوێکی ماناداری لێ کرد. جماش خێرا سەری هەڵێنا و گوتی: «وردەوردە دەگەڕێینەوە سەر باسەکەی ڕابردوو. ئێستا وادیارە کە دەبێ لە سەر ئەو مژارە لەگەڵ یەک بدوێین. من ئارخایەنتان دەکەم کە من واش نیم کە هەموو کارێکم پێ جێبەجێ کرابێ. ئیدی بۆ زور کاریش تازە لە من گوزەراوە، بەڵام ڕەنگە بتوانم لە بەڕێوە بردنی گەڵاڵەکەتاندا یاریدەتان بدەم، دەی، گەڵاڵەکەتان چیە؟»

- لەپێشدا دەڵێی بایەخێکی بۆ من نییە ئەوکارەی کە پێشنیاری دەکەی و دوایەش دەتهەوێ بزانی کە پێشنیارەکەم چیە. ئیشەکەی من نە تەنیا پێویستی بە یاریدەدەری بیر و ئەندێشەی تۆ هەیە، بەڵکوو دەبێ بە کردەوەش بۆی تێبکۆشی.

- جارێ پێم بڵێ بزانم چیە دوایە قسەی لە سەر دەکەین.

- لە پێشدا پێم بڵێ سەبارەت بە ڕێکخستنی ڕاپەڕینێک لە وێنتیادا هیچت بیستووە؟

- لە دوای لێبووردەیی گشتی بەولاوە، بێجگە لە گەڵاڵەی شۆڕشی نابەجێی سان فدیستەکان هیچی دیکەم نەبیستوە ، کە بە داخەوە وەک ئەوانەی دیکە بە ڕەشبینییەوە لێی دەڕوانم.

- منیش لە زۆر جێگادا وەک تۆ ڕەشبینم، بەڵام ئێستا لە هەموو پارێزگاکاندا بە بڕشتەوە خەریکی ڕێکخستنی شۆڕشێکن دژ بە ئوتریشەکان و دەمەوێ قسە لە سەر ئەوە بکەم. زۆر لە لاوانی ناوچەکانی ژێردەسەلاتی پاپ - بەتایبەتی چوار پارێزگا سەرەکیەکە - بە دزیەوە خەریکن سنوور

بەزێنن و دڵخۆازانە خۆیان بگەیێن بە ئەوان. لەلایەن دۆستانمەوە کە لە ڕۆمانیان ئاگادار کراومەتەوە کە...

جما قسەکەی بڕی: «پێم بڵێ، ئایا بە تەواوی دڵنیای کە ئەو دۆستانە جێگای بڕوا و متمانەن؟»

- تەواو دڵنیام. من لە نزیکەوە ئەوان دەناسم و کارم لەگەڵ کردوون.

- یانی ئەوان ئەندامی گروپێکن کە ئێوەی تێدان؟

بمبورە کە ناتوانم تەواو ئارخایەن بم، من هەمیشە سەبارەت بەو زانیاریانەی کە لەلایەن ئەو ڕێکخراوە نهێنیانەوە دێت دوودڵم و تەواو دڵنیا نیم، پێموایە کە عادەتی...

مێشەکەرانە بە تووڕەیەوە پەڕیە نێو قسەکانییەوە و گوتی: «کێ پێی گوتوی کە من ئەندامی گروپێکی نهێنیم؟»

- هیچ کەس پێی نەگوتوم، خۆم وام بیر کردەوە.

مێشەکەرانە پاڵیدا بە کورسیەکەی و بە مۆڕەییەکەوە لێی ڕووانی. پاشان گوتی: «ئایا هەمیشە خۆ لە ڕاز و نهێنییەکانی خەڵکی هەڵدەقوتێنی؟»

- زۆرجار من لە شتەکان ورد دەبمەوە و کێشەکانیش پێکەوە گرێبەست دەکەم. بۆیەکانێ ئەوەم پێگوتی ئەگەر پێتخۆش نەبوو ئاگاداری شتێک بم پێم مەڵێ.

- ئێستاکە زانیاریەکانت بستێک لە خۆت دوور ناکەوێتەوە منیش پێم شتێکی سەیر نییە. پێموایە ئەم بابەتە...

جما بە سەیرێکەوە سەری هەڵێنا و بە کەمێ دڵئێشاویەوە گوتی: «بە ڕاستی پرسیارێکی نابەجێیە؟»

- هەڵبەتە دەزانم کە ئەو قسانە بە گوێی هەموو کەسێک ناگەیەنی. وادیارە تەنیا لەگەڵ ئەندامانی حیزبەکەتانی...

- حیزب بایەخ ئەدا بە ئیشی ڕاست و واقیع، نەوەک بە کاری خەیاڵی و گوماناوی. هەڵبەتە من ئەوەم لەلای کەس نەدرکاندووە.

- زۆر سوپاس، زانیتان کە من ئەندامی کامە دەستە و گروپێکم؟

- هیوادارم لەو قسانەی من نەڕەنجابێتی کە بێپەردە درکاندم. ئاخەر ئەوەش بزانە کە تۆ قسەکەت دامەزراند. هیوادارم ئەندامی «خەنجەر وەشێن»ەکان نەبێت.

- بۆ پێت خوشە کە لەگەڵ ئەوان نەبم؟

- چوونکە شایانی ئەوەی کە زۆر کاری لەوە چاکتر بکەی.

- هەموومان شایانی زۆر کاری لەوە چاکترین کە هەتا ئێستە کردوومانە. دیسانەوە گەیشتینەوە سەر وەلامەکەی خۆتان، هەرچی بێ من ئەندامی خەنجەر وەشێنەکان نیم. بەڵکوو ئەندامی «پشتوێنە سوورەکان»م. ئەوان گرووپێکی چالاکتر و جێکەوتووترن و کارەکانیشیان پوختە و باشترە.

- مەبەستان کاری خەنجێر لێدانە؟

- ئەمەش وەکوو کارەکانی دیکە وایە. لە کات و وەختی پێویستدا خەنجێرەکانیش کاریگەرن ، ئەگەر تەنیا پروپاگەندەیەکی ڕێکوپێکیان بە شوێنەوە بێ، هەر لەبەر ئەوەیە کە من گروپەکانی دیکەم خۆش ناوێ. ئەوان پێیان وایە کە خەنجەرێک بە تەنیایی دەتوانێت هەموو کێشەکانی جیهان چارەسەر کات و ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. هەڵبەتە لە کات وساتێکی تایبەتی‌دا دەتوانێ کێشەیەکی زۆر چارەسەر کات، بەلام بە گشتی ناتوانێ دەرمانی هەموو عیلەتەکان بێت.

- ئایا بە ڕاستی تۆ باوەڕ دەکەی کە خەنجێر ، بتوانێ کێشەیەک چارەسەر کات؟

مێشەکەرانە بە سەیرێکەوە لێی ڕووانی.

جما درێژەی پێدا: «هەڵبەتە مەبەستم ئا ئێستایە کە ئاریشەکە بە هۆی هەبوونی سیخۆڕێکی وریا یان کارمەندێکی چەوتو و خراپەوەیە کە خەنجێر دەتوانێ ئەوانە بکووژێت، بەلام ئایا لە ئاکامدا کۆی کێشەکەش دەسڕێتەوە، ئایا گرێپوچکەیەکی زیاتر دروست ناکات. ئەمە بەڕای من وەکوو ئەو ماڵە پاکە وایە کە دوایە حەوت شەیتانی دیکەشی تێوە هات٤. کووشتن ، پولیس

٤. ئاماژە بۆ چیرۆکی ئەو پیاوەیە کە ماڵەکەی خۆی بە هۆی هەبوونی شەیتانێکەوە و دەر کردنی ئەو ماڵەکەی پاک کردەوە و دوایە بە چۆل کراوی بەجێی‌هێشت، بەلام ئەو شەیتانە لەگەل حەوت

هـارتر دەكا و خراپتر دەیهـاروژێنـێ خـەڵكی بێڕەحم و شـاغی باردێنی و ڕەنگە كارتێكەری خراپی هەبێ لە سـەرداهـاتووی كۆمـەڵگا و كارەكە لـەوەی هەیە خربتریشی كات .

ـ بەڕای ئێوە، زەمانێک کە شۆڕش دەسپێبكات چ ڕووداوێک دەخوڵقێ؟ پێتان وایـە لـەو كاتـەدا كۆمـەڵگا دەسـت ناكـات بـە ڕەشـەكـووژی و كوشـت وكوشتار لە نێو جەماوەردا شتەیێكی ئاسایی نابێت؟ شـەڕ شـەڕە و لـەشـەڕدا نەقوڵ و شیرینی نابەخشرێتەوە.

ـ بەڵێ، بەڵام شۆڕشێكی ئاشكرا شتێكی دیكەیە. ئەمە تاقە یەكجار لە ژیانی خەڵكیدا پێكدێ كە بەرابەری دەكات لەگەڵ تەواوەتی پێشكەوتنەكانی ئێمە. شک لـەوەدا نییـە ڕووداوی زۆر دڵتـەزێـن دەخـوڵقێ، كـە ئـەمـە لـە هـەر شۆڕشـێكدا ئەنجام دەدرێ ئەمانە ڕاستییەكی حاشا هەڵنەگرن و شتێكی جیا لـەو باسـەشـە ، واتە تایبەتمەندییەكی تایبـەتـی و هـەل ومـەجێكی لـەبیر نـەكراوە . سامناکترین ئاكامێک كە چاوڕوان دەكرێ ئـەوەیـە كە لـەم گرووپـە خـەنجێر وەشـێنە كوێر هاوێژانەدا ،لە كۆمەڵگادا كارەكەیان ببێتە عادەت. ئـەوكات خـەڵكی لـەو ڕووداوانـە وەک پێشهاتـەیـەكی ئاسـایی ڕۆژانـە لێی دەڕوانـن و سـەبارەت بـە پیرۆزی و گرینگی ژیانی مرۆڤایەتی بێبایـەخ دەبـن و ئیتـر هـەستیار نـابن. مانـەوەی مـن لـە ڕۆمانیـادا زۆری نـەخایانـد، بـەڵام هـەر ئـەوەنـدەی كـە لـەگـەڵ خـەڵكی ئـەوێ هەڵسوكەوتم هەبوو كە ئـەوان خـەریكە بـە توند و تیژی و هێرش كردنـە سـەر یەكتر عادەت دەگرن ؛ ئەویش هێرش كردنێكی نادڵخوازانە.

ـ بێگومـان ئـەمـە زۆر چـاكترە لـەوەی كـە خـەڵكـی عـادەت بگـرن كـە سەرشۆڕانە ببنە فەرمانبەری ئەو دەسەڵاتدارانە. ئەویش نەزانانـە و كوێرانـە ، هەنگاو نان بەرەو ناخی ئەو زەلكاوەیە.

ـ مـن وەک تـۆ بیـر ناكـەمـەوە، هـەمـوو عـادەتێكـی دوور لـە زەیـن و ئەندێشەداری خراپە ، ئەم یەكەشیان عادەتێكی درندەییە. هەڵبەتە ئـەگـەر تۆكاری كەسایەتییەكی شۆڕشگێڕ ببەستیەوە بەوەی كە بە زەبری توند و

---

شەیتانی دیكە گەڕاوە و بارگە و بنەیان لەوی خست و «لە ئاكامدا وەزعەكە لە سەرەتاكەی خراپتر بوو.»

تیژی بتوانێت خاڵ یا چەند بەندێکی ئەرێنی لە حکومەت بستێنێ، ئەوکات ئەو گرووپە نهێنییە و ئەو خەنجێرە دەبێتە باشترین گرووپ و پیرۆزترین ئەسڵەحە و کەرەسە ، چوونکە ئەوە تاقە شتێکە کە حکوومەتەکان یەکجار زۆر لێی دەترسن، بەڵام ئەگەر پێتان وایە کە منیش هەروا بیر دەکەمەوە ـ بە گشتی لابردنی ئەو جۆرە حکوومەتانە کۆتایی کار نییە بەڵکوو کەرەسەیەکە بۆ گەیشتن بە کۆتایی کار و نزیک بوونەوەیە لە ئامانج . ئەو خاڵە بە هێزەی کە لەڕاستیدا ئێمە بە شوێنییەوەین؛گۆڕانکاری بنەرەتی کۆمەڵایەتی و نوژەن کردنەوەی پێوەندی مرۆڤایەتیە . ئەو کاتە دەبێ بەشێوەیەکیتر تێوەچین. عادەت گرتنی بیرو هزری خەڵکی بە خوێن ڕشتن وشاغی بوون،شێوەیێکی پوزەتیڤ وئەقلانی نییە بۆ بردنە سەرێی ئاستی وشیاری جەماوەر و پڕ بایەخ بوونی ژیانی مرۆڤایەتیی.

ـ یان بایەخێکی کە بۆ ئایین هەیانە؟

ـ تێنەگەیشتم.

مێشەکەرانە بزەیەکی هاتێ: «بەڕای من لە سەر ئەوەی کە سەرچاوەی هەموو خراپەکان لە چیدایە لەگەڵ یەکتری کۆک و هاوبیرورِا نین. تۆ پێت وانییە کە سەرچاوەی ئەو خراپەکاریانە دەگەڕێتەوە بۆ بایەخنەدان و تێنەگەیشتن لە ژیانی مرۆڤایەتیی.

ـ کەمێکی دەگەڕێتەوە سەر پیرۆزی کەسایەتی مرۆڤ.

ـ چۆنت پێخۆشە شروبەی بکە. بەڕای من گەورەترین هۆ بۆ شڵەژاوی ژیانی ئێمە و هەڵەکانمان ، دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشی ڕۆحی و دەروونی کە سەرچاوەکەی ئایینە.

ـ مەبەستان ئاینێکی تایبەتیە؟

ـ نا، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ کاردانەوەی ڕواڵەتی ئەو نەخۆشینە. نەخۆشینەکە ئەوەیە کە شێوەی بیر کردنەوەی ئایینی نێو لێدەنرێ، دیاردەی ئەم نەخۆشینە وایە کە مرۆڤ لەپێش چاوی خۆی خوالەیەک بەرپا دەکا و دەست دەکات بە داخوازی و دۆعا و پاڕانەوە و لە سەر چۆک دانیشێتوو

شتێک بپەرستێت. تەوفیرێکی واشیان نییە کە ئەوشتە خاچ بێ یان بوودا و یان داری تام تام٥.

بێگومان لەگەڵ من هاوبیروڕا نیت. تۆ دەتوانی ببیە گنوستێک٦ یان هەر شتێکی کە پێتخۆش بێت، بەڵام من دەتوانم سروشتی تۆ کە سروشتێکی ئایینییە لە پێنج هەنگاویەوە هەست پێبکەم. باشە ئیدی قازانجێکی نییە کە قسەی لە سەر بکەین، بەڵام تۆ تەواو لە هەڵەدای کە پێتوایە من خەنجێر لێدانم پێ ئامرازێکي باش و پیرۆزە دژ بە کارمەندانی خراپ ـ ئەمە بالاتر لەوەیە کە وەک ئامرازێکی ئاسایی لێی بڕوانی، نە تەنیا شتێکی ئاسایی نییە بەڵکوو باشترین کەرەسەیەکە کە دەتوانرێ پشتی کلیسای پێشەق بکرێ و خەڵکی تێبگەیێنێ کە نوێنەرانی کۆمەڵگای ئایینی و کلیسا وەکوو دمەڵ و کارگەکولانە وان.

ـ ئەوکات کە ئەو کارەت ئەنجام دا، یانی ئەو بوونەوەرە درەندە خەوتووەی دەروونی خەڵکیت وەخەبەر هێنا و دژ بە کلیسا وروژاندت، ئەو کاتە....

ـ ئەو کاتە کارێکم کردووە کە بووەتە هۆی ئەوەی کە ژیان بایەخدار بێت و بۆی تێبکۆشی.

ـ ئایا ئەمە هەر ئەو کارەیە کە چەند ڕۆژ لەوە پێش سەبارەت بە ئەو قسەت دەکرد؟

ـ بەڵێ ڕاست ئەویە.

جما لەرزی و ڕووی وەرگێڕا.

مێشەکەرانە بە بزەیەکەوە چاوێکی لێ کرد: «تۆ لە من هیوابڕاو بووی؟»

ـ نە تەنیا لێت ناهومێد بووم، بەڵکوو... پێموایە... کەمێکیشت لێدەترسم.

دوای کەمێ ڕووی وەرگێڕا و بە شێوەیەکی تایبەتی خۆی کە لە هەموو دانوستاندنە پڕبایەخەکاندا هەیبوو گوتی: «باسێکی بێئاکامە. بیروڕای ئێمە تەواو دژبەری یەکتریە. من باوەڕم لە سەر پڕوپاگەندە و پڕوپاگەندە و

---

٥. نێوی دارێکە کە عەشیرە ڕەشپێستەکان لایان پیرۆزە.

٦. کەسێکی کە سەبارەت بە ڕاستیەکان شک و گومانی هەبێ.

دیسانەوەش پروپاگەندەیە، و هەرکاتێکیش سەرکەوتنت بە دەس هێنا شۆڕشەکە دەس پێبکە.»

- دەی ئەگەر وایە ئیزنم بدە با بگەڕێینەوە سەرباسی گەلاڵەکەی من، کە پێوەندییەکی کەمی بە پروپاگەندەوە هەیە و پێوەندییەکی زۆریشی بۆ شۆڕش و ڕاپەڕینەوە هەیە.

- دەی؟

- هەروەکوو گوتم کەسانێکی زۆر هەن کە بەتەمان دڵخوازانە لە رومانیاوە پێوەست بن بە شۆڕشي خەڵکي وێنێتیاوە. ئێمە هێشتا نازانین کە ڕاپەڕینەکە کەی دەست پێدەکات،ڕەنگە تا پایز یا زستان بخایەنێ، بەڵام ئەو داوتەڵەبانەی کوێستانەکانی ئاپنین ، دەبێ چەکدار و ئامادە بکرێن، تا بتوانن و توانایی ئەوەیان هەبێ کە بۆ ئەو جێگایانەی کە بۆیان دیاری کراوە بکەونە ڕێ، من عودەداری ئەوەم کە تفەنگ و تەقەمەنییان بۆ بەڕێ بکەم بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پاپ...

- کەمێک ڕاوەستە، تۆ چۆن ئەتوانی لەگەڵ ئەو گرووپەدا کار بکەی؟ هەموو شۆڕشگێڕانی میلباردی و وێنێتیا لایەنگرانی پاپن. ئەوان هاوتەریبن لەگەڵ ڕێکخراوی پێشکەوتنخوازانەی کلیسادا و بە ئاواتی ڕیفورمی ئازادیخوازانەن. چۆن دژە دینێک و ئاشتینەخوازێکي وەک تۆ دەتوانێ لەگەڵ ئەواندا هەڵکات؟

مێشەکەرانە شانی هەڵتەکان: «ئەوان ئەگەر توانایی ئەوەیان هەبێ کە کارەکەی خۆیان جێبەجێ کەن ئیتر چیان داوە بەسەر منەوە تا خۆیان بە بووکە شووشەیەکی کوتاڵییەوە سەرگەرم کەن؟بێ شک ئەوکات کەسایەتی پاپ زۆر سووکو بێبایەخ چاو لێ دەکەن. ئەگەر ڕاپەڕینەکە بە شێوەیەکی باش ڕێگای خۆی بدۆزێتەوە ئیتر ئەم کێشەیە پێوەندییەکی وای بە منەوە نامێنێ. بەڕای من بە داردەستێک دەتوانرێت سەگێک ڕاو بنرێت و بە گورە و هەرایەکی بەجێ دتوانرێت خەڵکی دژ بە ئوتریشیەکان ڕاپەڕێنین.»

- دەتەوێ من چی بکەم؟

- یاریدەم بدە تفەنگ و تەقەمەنییەکان لە سنوورەوە بپەڕێنینەوە.

- من چۆناو چۆن دەتوانم ئەوکارە بکەم؟
- تۆ ڕاست ئەو کەسەی کە دەتوانی ئەو کارە بە باشترین شێوە ئەنجام بدەی. بە تەمام تفەنگەکان لە ئینگلیستان بکرم، بەڵام هێنانی ئەوانە بۆ ئێرە لەگەڵ کێشە و کەند و کوسپی زۆر ڕووبەڕوویە. دەرباز کردنی ئەو بارانە لە هەرکام لەو لەنگەرگایانەی ژێردەسەڵاتی پاپ کارێکی چەتوونە، دەبێ لە ڕێگای توسکانییەوە بیانهێنین و لە کوێستانەکانی ئاپێنینەوە ڕەدیان کەیەن و بیانبەین.
- بەو شێوەیەی کە دەیڵێی بە جێگای سنوورێک دەبێ دوو سنوور ببەزێنرێت.
- بەڵێ، بەڵام ئەم ڕێگا چارەیە لە هەموو ڕێگاکانی دیکە چاکترە، تۆ ناتوانی بارێکی ئاوا گەورە بە قاچاخ بێنیتە لەنگەرگایەک ئەویش بەشێوەیەک کە توجارەتیی نەبێ. دەزانی کە هەموو کەرسەی هێنان و ڕاگوێستنی لەنگەرگەی چیوتیاوکی برێتیە لە سێ گەمی بادەوە و پاپۆڕێکی چکۆلەی ماسی‌گرتن. ئەگەر لە تووسکانی ڕەدبکرێن، من دەتوانم لە سنووری ژێر دەسەڵاتی پاپی تێپەڕێنم. هاوڕێیانی من تەواوی کوێرە ڕێگاکانی کوێستانەکان دەزانن. حەشارگەی زۆریشمان هەیە، بارەکە دەبێ لە ڕێگای دەریا بێتە لێگهورن و کوسپ و کێشەی گەورەی منیش هەر ئەمەیە. من لەگەڵ قاچاخچیەکانی ئەوێ ئاشنا نیم، بەڵام دەزانم کە تۆ لەگەڵ ئەوان ئاشنایەتیت هەیە.
- پێنج خولەکەم ئیزن بدەیە تا بیری لێ‌بکەمەوە.
جما کەمێ دانەوی و ئانیشکی نایە سەر ئەژنۆی و چەناکەی نایە سەر دەستی دوای کەمێ بێدەنگی سەری هەڵێنا و گوتی: «ڕەنگە لەم بەشە لە کارەکەداقازانجێکم هەبێ، بەڵام پێش‌ئەوەی هەنگاوێک بەرەو پێشەوە هەڵێنینەوە پرسیارێکت لێ‌دەکەم. ئایا دەتوانی قەولم پێ‌بدەی کە ئەم کارە هیچ پێوەندییەکی بە گرووپی خەنجێر وەشێنەکانەوە نییە بۆ هێرشی نهێنی؟»
- بەڵێ بۆ ئەو کارە نییە. بێ شک ئەگەر ئەو کارە دژی بیرو بۆچوونی تۆ بایە قەتم پێ نەدەگوتی و قەتم ڕوو لێ نەدەنای .

---

٧. لەنگەرگەیەکی پربایخی ژێردەسەڵاتی پاپە کە لە ڕۆژئاوای قەراغ دەریای ئیتالیادایە.

- کەی دەتەوێ وەلامی روونی خۆمت پێ بدەمەوە؟
- دەرفەتێکی زۆرمان نییە، بەلام دەتوانم چەند ڕۆژێکت مۆڵەت بدەم تانێ تەما و مەبەستی خۆتم پێ ڕابگەێنی .
- شەوی شەممەی داهاتوو کارێکی تایبەتیتان نییە؟
- ئیزنم بدە بیری لێبکەمەوە . ئەمڕۆ پێنجشەممەیە . نا.
- دە وەرە بۆ ئێرە. بە باشی بیر لەم مژارە دەکەمەوە و وەلام و ئاکامی تەواوی خۆمت پێڕادەگەینم.

جما لە ڕۆژی یەکشەممەی داهاتوودا بۆ نووسینی نامەیەکی شروڤە کراو کە دابووی بە کۆمیتەی فلورانس لە حیزبی مازینی، ئاگاداری کردنەوە لە مەڕ قەبووڵ کردنی کارێکی تایبەتی کە بۆچوونی سیاسی لەپشت بوو و دەبووە هۆی ئەوەی کە تانێ چەند مانگێکی‌تر ئەرکە حیزبیەکانی هەڵپەسێرێت و بکەوێتە شوێن ئەم کارە نوێیەی کە بۆی هاتووەتە پێشەوە. هەرچەندە ئەندامانی حیزب ئەم هەواڵەیان لا سەیر بوو ، بەلام کۆمیتە هیچ بەربەستێکی بۆ دانەنا. چوونکە ساڵیانێکی زۆر بوو کە بەراورد و لێکدانەوەی جمایان لاپەسند بوو و متمانەی تەواویشیان پێی بوو و ئەندامان بە گشتی لە سەر ئەوڕایە کۆک بوون کە ئەگەر سینیورابوولا بە تەمایە لە پڕێکدا کارێک بکات، بێشک دەبێ کارێکی پڕ بایەخ بێ و بێ‌هۆ نییە.

جما ڕێک و ڕاست بە مارتینی گوت کە بەڵێنی داوە تا لە ڕاپەڕاندنی برێک لە «کارە سنووریەکاندا» یاریدەدەری مێشەکەرانە بێت. جما ئەو حەقەی بە خۆی دابوو کە لانیکەم دۆستە دێرینەکەی خۆی ئاگادار کات. لەبەر ئەوەی کە خودا نەخواستە دڵی غایلە نەکات و شک و گومانێکی بۆ نەیەتە پێشەوە. ئەو پێی وا بوو کە ئارخایەن کردنی مارتینی زۆر پێویستە. مارتینی دوای بیستنی ئەو قسانە هیچ ڕوون کردنەوەیەکی لێی نەویست، بەلام جما بێ‌ئەوەی لە هۆی کێشەکە بگات تێگەیشت کە ئەم هەواڵە لە دڵی مارتینیدا زۆر گران و ناخۆش هات.

هەردووکیان لە ژێر کەپری ماڵی جمادا دانیشتبوون لە سەر شیروانییە سوورەکانەوە بەرەو فیزۆلیان دەڕوانی. دوای بێدەنگییەکی زۆر مارتینی

هەستایە سەرپێ و دەستەکانی خستە گیرفانییەوە و دەستی کرد بە فیتوو لێدان ـ کە نیشانەی دڵەکوتەیەکی زۆری ئەو بوو ـ ئارام لە ژوورەکەدا دەستی کرد بە پیاسە کردن.

جما قەدەرێک چاوی لێ کرد. ئاخرەکەی گوتی: «سزار تۆ بەم کارە پەرێشانی، زۆر بەداخم کە تۆ ئاوا هەست بە دڵنیایی ناکەی، بەڵام من تەنیا لەبەر ئەو هۆیە ئەو تەمایەم گرتووە چوونکە پێموایە کارێکی دروست و شیاوە.

مارتینی بە ناڕەحەتیەوە وەڵامی داوە: «من بۆ ئەو کارە پەرێشان نیم و سەبارەت بەو کارەش هیچ نازانم، کاتێ کە تۆ دەتهەوێ کارێک بکەی، بێشک ئەوکارە ئیشێکی باش و پەسندە من باوەڕم بەو کابرایە نییە.»

ـ پێموایە لەو بارەیەوە لە هەڵەدای. منیش تا ئەو کاتەی کە ئەوم بەباشی نەدەناسی وەکوو تۆ لە هەڵەدابووم. بێگومان ئەو بێعەیب و بێگرێ نییە، بەڵام لەوەی کە تۆ لێی تێ دەفکری وانییە .

ـ بەشکم قسەی تۆ بێ.

بە بێدەنگییەوە کەمێک پیاسەی کرد و لە پڕێکدا لەبەردەم ئەودا ڕاوەستا و گوتی: «جما ئەوکارە مەکە! تا درەنگ نەبووە دەستی لێهەڵگرە! مەهێڵە ئەو پیاوە کارێکت پێبکا کە دوایە پەشیمان بی و بەرد بە ئەژنۆی خۆتدا بکوتی.»

جما بە ئارامیەوە گوتی: «سزار ئەوەی دەیڵێی نایڵەیەوە، کەس بە زۆر ئەوکارەم پێناکات. من دوای ئەوەی تەواو ئەوکارەم تەواو تاووتوێ کرد ، بە ویست و دڵخوازی خۆم قەبووڵ کردووە. من دەزانم کە تۆ سەبارەت بە ڕیوارز ڕقێکی تایبەتیت لێی هەیە، بەڵام ئا ئێستا سەبارەت بە سیاسەت قسە دەکەم نە سەبارەت بە کەسایەتی.»

ـ مادونا! ئەو کارە مەکە! ئەم پیاوە مەترسیدارە. ئەو پیاوێکی بێبەزەیی و بێدینە کە کەس تێی ناگات ـ و ئاشقی تۆشە!

جما داچڵەکی: «سزار، چۆنە خەیاڵاتی وات بە مێشکدا هاتووە؟»

مارتینی دووپاتی کردەوە: «ئەو گیرۆدە و ئاشقی تۆیە، مادونا لێی دوور کەوەوە!»

ـ سزاری ئازیز، من ناتوانم لێی دوور کەومەوە، ناتوانم پێشت بڵێم لەبەر چیە، ئێمە زۆر لە یەکتری نزیک بووینەتەوە ـ نە وەک لەبەر ویستی دڵ و داخوازی خۆمان.

مارتینی بە پەرێشانییەوە وەڵامی داوە: «ئەگەر ئەوندە لە یەکتری نزیک بوونەتەوە ئیتر قسەیەکم نییە.»

دوای ئەوەی کە گوتی کارم هەیە، ڕۆیشت. مەودایەکی زۆر لە شەقامە پڕ لە گوڵەکاندا سەرێ و خوارێی کرد. ئەو شەوە دنیا لەبەر چاوی زۆر تاریک بوو.

ئەم بوونەوەرە درۆزن و فریوکارە هاتبووە نێوانیانەوە و تاقە گەوهەری ژیانی لە چنگ دەرهێنابوو.

# ١٠

له نیوەی مانگی فەوریەدا مێشەکەرانە بەرەو لێگهورن کەوتە ڕێ. جما ئەوی بە پیاوێکی لاوی بەریتانیای ناساند کە بیر و هزرێکی ئازادیخوازانەی هەبوو و نوێنەری پاپۆڕەوانی بوو. ئەوکات جما و هاوسەرەکەی لەگەڵ ئەم پیاوە گەنجە ئاشنا ببوون. ئەم پیاوە چەند جارێک کار و خزمەتی چکۆلەی بۆ گرووپە ڕادیکاڵەکانی فلورانس جێبەجێ کردبوو: بە قەرز پارەی پێدابوون تا پێداویستیەکانیانی پێ جێبەجێ کەن. ئیزنی ئەوەشی پێدان کە لەنێو نیشانی توجارەتی ئەو کەڵک وەگرن بۆ ناردنی نامە حیزبیەکان و ئا لەوجۆرە کارانە. ئەم یارمەتیانە هەمووی لەلایەن جماوە و بە هۆی دۆستایەتی نێوان ئەوانەوە ئەنجام دەدرا. هەربۆیە لە سەر شێوازی ڕابردوی حیزب جما ئازاد بوو کە هەرچۆنێک ئەو پێی باش‌بێ و هەر ڕێگایەک ئەو پێی ئاسان بێت کەڵکی لێوەرگرێت، بەڵام ئایا دەکرا کە لەم هەل و دەرفەتە بۆ هەر مەبەستێک کەڵکی لێوەربگرێت یان نا. داخوازی کردن لە هەوادارێکی پاک و بێگەرد بۆ ئەوەی نێونیشانی خۆی بەوان بدات بۆ هاتنی ئەو نامانەی کە لە سیسیلەوە دەهاتن، یان شاردنەوە و ڕاگرتنی چەند بەڵگە و سەنەدێک لە قوژبنێکی نووسینگەکەیدا ئەمانە هەمووی لەلایەک و داخوازی کردن لە ئەو بۆ هەڵگرتن و هێنانی چەک و تەقەمەنی بۆ ڕاپەڕینێکی چەکدارانە لەلایەکی‌ترەوە ، کە

ئەمەیان زۆر قورس و گەورە و گران بوو، هەربۆیە جماش زۆر دڵنیا نەبوو کە بەو کارە ڕازی ببێ.

ئەو بە مێشەکەرانەی گوتبوو: «لانیکەم دەتوانی تاقی کەیتەوە، بەڵام پێموانییە کە ئەوکارە بکات ئەگەر بچی بۆلای و داوای پێنج هەزار کوودی لێبکەی ڕەنگە بێ سێ و دوو پێت بدات ئەو یەکجار زۆر دڵئاوایە. دەتوانی خێرا پاسپۆرتەکەی خۆیت پێبدات یان وەک پەنابەرێک لە ئەنبارەکەیدا بتشارێتەوە، بەڵام ئەگەر شتێکی وەک تفەنگی پێ پێشنیار بکەی، لێت خورد دەبێتەوە و پێیوایە کە هەردووکمان شێت بووین.»

مێشەکەرانە ئاوای وەڵامی دابووەوە: «بەڵام وێدەچێت کە بتوانێ ڕێنوێنیم بکات و یان بە یەک دوو مەلەوانێکم بناسێنێت. هەرچی بێ تاقی کردنەوەکەی زەرەرێکی نییە.»

لە ڕۆژەکانی ئاخر و ئۆخری مانگدا، مێشەکەرانە بە جلوبەرگێکی کە زۆر ڕێکوپێک نەبوو هاتە ژووری کاری جماوە، جماش خێرا لە ڕوخساری ئەوی خوێندەوە کە هەواڵی خۆشی پێیە.

ـ ئاخرەکەی هاتی! وردەوردە وام بە خەیاڵدا دەهات کە بێگومان بەڵایەکت بەسەر هاتووە!

ـ پێموابوو لەو هەل ومەرجەدا نووسینی نامە زۆر مەترسیدارە، زووتریش نەمدەتوانی بگەڕێمەوە.

ـ ئێستا خۆ شوکور بە سلامەتی گەڕاویتەوە؟

ـ بەڵێ، ڕێک لە دلیجانەوە هاتووم، هاتوومەتە ئێرە تا پێت بڵێم کە کارەکە تەواو مسوگەر و جێبەجێ بووە.

ـ مەبەستت ئەوەیە کە هەر بە ڕاستی بیلی قەول و بەڵێنی یارمەتی داوە؟

ـ لە یارمەتی یەکجار زۆرتر، هەموو کارەکانی خستووەتە ئەستۆی خۆی: پێچاندنەوە و هەڵگرتنی هەموو شتێک، تفەنگەکان لە سندووقی گەورەدا دابین و دەشاردرێنەوە و ڕاست لە ئینگلیستانەوە دەیهێنن. ویلیامزی شەریکیشی کە دۆستی هەرە نزیک و خۆشەویستی ئەوە، قەولی داوە کە

---

١. قەرەپوولی نوقرەیی ئیتالیایە

بۆخۆی لە سوتامپتونەوە لەگەڵ بارەکە بێت. بیلیش بارەکان لە ئیدارەی گومرۆکی لێگهۆڕنەوە دەگووزەرێنێت. هەر لەبەر ئەوە بوو کە ئەوەندە زۆرم پێچوو. ویلیامز قەدەرێک لەوەپێش چووە بۆ سوتامپتون و منیش هەتا جێنوئا بەڕێم کرد.

-... کە لەنێو ڕێگادا لە سەر وردەکاریەکان قسە بکەن؟

- بەڵێ تا ئەوجێگایە توانیم قسە بکەم ؛ کە تووشی ناڕەحەتی کەش و هەوای دەریا (دریازدگی) نەببووم ، بەڵام دوایە کە دڵم لە ژێلا هات ئیتر نەمتوانی درێژە بە قسە و باسەکە بدەم.

جما هاتەوە بیری کە لە گەشتێکی دەریادا کە باوکی هەردووکیانی بۆ سەیاحەت بردبوو ئارتور بە هۆی کەش و هەوای دەریاوە چەندە ناڕەحەت ببوو. هەربۆیە خێرا پرسی: «لە سەفەری دەریادا ناڕەحەت دەبی؟»

- گەرچی یەکجار زۆر لە دەریادا بووم!، بەڵام ئەوەندە ناڕەحەت دەبم کە هەر باسی ناکرێ ، بەڵام ئەوکات کە لە جێنوئا خەریکی بار لێدان بوون قسەمان کرد. پێموایە ویلیامز دەناسی؟ شۆڕە لاوێکی زۆر چاک و جێگای متمانە و بە بیرێکی تیژەوە! بیلی‌ش هەروا پیاو خاسەیە، هەردووکیان باش دەزانن کە چۆناوچۆن دەبێ ئاگایان لە زمانیان بێ.

- بە گشتی پێموایە کە بیلی بە دڵخوازی و بە ویستی خۆی ئەوکارەی قەبووڵ کردووە و بەرەو کارێکی مەترسیدار هەنگاوی هەڵێناوەتەوە.

- منیش ئاگادارم کردەوە، بەڵام تەنیا لێم مۆڕ بووەوە و گوتی جا بە تۆچی! ڕاست ئەو شتەی کە چاوەڕوانیم دەکرد و لێم ڕادەدی ، ئەگەر بیلیم لە تیمبۆکتو ببینیایە دەچووم بۆلای و پێم دەگوت: «بەیانیت باش بەریتانیای.»

- بەڵام هێشتا من لێی حاڵی نەبووم کە تۆ چۆن توانیت ئەوان ڕازی بکەی، بەتایبەت ویلیامز، ئەو کەسێکە بوو کە درەنگ ڕازی دەبوو.

- بەڵێ، لەپێشدا زۆر ناڕازی بوو، نە وەک لە ترسانا بەڵکوو لەبەر ئەوەی کە دەیگوت ئەو کارە جێبەجێ نابێ، بەڵام دوای کەمێک بە جۆرێک ڕازیم کرد ، دەی باشە، ئێستا با هەموو کارەکە بە باشی هەڵسەنگێنین.

---

٢. Timbuktu: ناوەندێکی گەورەی توجارەتیە لە سنووری سەحرا و سوودان.

کاتێ کە مێشەکەرانە گەیشتەوە ماڵی خۆی ڕۆژ ئاوا ببوو و داری Pyrus[3]
Japonicaی پڕ لە شکۆفە ، بەسەر دیوارەکەدا دەلەراوە و لە ژێر زەردەی
هەتاودا وردە وردە بۆری دەنواند، چەند لقێکی لێ کردەوە و بردیەوە بۆ
ماڵێ، هەرکە درگای ژووری کار کردنی کردەوە زیتا کە لە سەر کورسییەک
لە سووچێکی ژوورەکەدا دانیشتبوو دەرپەڕی و بە ڕو گەشییەوە
ڕووبەڕووی هەڵات.
- ئاه فلیس، پێموابوو قەد ناگەڕێیتەوە!
یەکەم شتێک کە بیری لێ کردەوە ئەوە بوو کە بە تووڕەییەوە پێی بڵێ لە
ژووری کار کردنی ئەودا چی‌دەکات، بەڵام دوایە وەبیری هاتەوە کە
سێ‌حەوتەیە نەیدیتووە دەستی بۆ تەوقە بردە پێشەوە و بە ساردی و
سرپیەکەوە گوتی: «ئەو کاتەت باش زیتا، چۆنی؟»
زیتا سەری هەڵێنا تا مێشەکەرانە ماچی بکات، بەڵام وادیاربوو ئەو زۆر
سڕوسارد بوو. لەپەنایەوە گوزەرا و گوڵدانێکی هەڵگرت تا (Pyrus)ەکانی
بخاتە ناوی. دوای قەدەرێ درگاکە بە تەق و کوتێکەوە کراوە و سەگی
مێگەلەکە بە پەلە خۆی کرد بە ژووردا و لە خۆشیانا دەستی کرد بە وەڕین
و کلکەسووتێ و لە خۆشیانا لووراندی. مێشەکەرانە گوڵدانەکەی لە سەر
مێزەکە دانا و دانەوی تا دەست بەسەر و گوێلاکی سەگەکەدا بێنێ: «ئەی
شەیتان، هاوڕێی خۆم چۆنی؟ ئەرێ ڕاست خۆمم، دادەی وەک سەگی باش و
بە سفەت تەوقەم لەگەڵ بکە!»
تووڕەیی و ڕووتاڵی ڕوخساری زیتای داگرت.
بە بێ‌مەیلییەکەوە پرسی: «بڕۆین بۆ خواردنی شێو؟ چوونکە نووسیبووت
کە ئەمڕۆکە دەگەیتە ئێرە گوتوومە لە ماڵی خۆمدا شێوت بۆ سازکەن.»
مێشەکەرانە بە پەلە چاوی لێ کرد: «بمب - بمبورە، نەدەبوو مەحتەلی من
بی! هەر ئێستا خۆم ڕێکوپێک و شیک دەکەم و خێرا دێم بۆلات. پێ ڕەنگە
پێت‌خۆش بێت کە ئەم گوڵانە ئاو دەی.»

---

٣. بەهێی ژاپۆنی (لاتین)

کاتێ کە مێشەکەرانە چووە ژووری نانخواردنی زیتا، ئەوی دیت کە لە بەرانبەر ئاوێنەکەدا ڕاوەستاوە و گوڵێک لەو گوڵانەی لە جلوبەرگەکەی خۆی دەدات. وادیاربوو زیتا بە تەمابوو ڕووخۆش و خۆشئەخلاق بێت، هەربۆیە چەند گوڵێکی چکۆلە لە گوڵخونچەکانی گوڵاڵە سوورەکە کە پێکەوە بەسترابوون بۆلای ئەوی ڕاداشت: ئەم گوڵانەم بۆ تۆ هێناوە پێمخۆشە بیدەم لە سنگت.»

مێشەکەرانە لە کاتی شێوخواردندا تەواو تێکۆشا دڵۆڤان و ئارام بێت. پەیتا پەیتا قسەی بێبایەخی دەکرد. زیتاش بە بزەی پڕ لە هومێدەوە وەڵامی داوە. خۆشحاڵی و شڵەژاوی زیتا بە هۆی هاتنەوەی ئەو ئاشکرا دیار بوو. ئەو تازە خوو و عادەتی بەوە گرتبوو کە ژیانی زیتا لەگەڵ ژیانی ئەو جیاوازە. زیتا لەگەڵ هەوالان و هاوڕێیانی هاوتەریبی خۆی پێکەوە خۆشیان ڕادەبوارد. هەربویە قەد بە خەیاڵیشیدا نەدەهات کە زیتا لەپەنای خۆیەوە ببینێت. سەرەڕای ئەوە بێگومان زیتا حەتمەن پێی سەیر بوو کە مێشەکەرانە ئاوا شاد و بەکەیفە.

زیتا گوتی: «با قاوەکەمان لە ژێر کەپرەکەدا بخۆینەوە ئەمشەو زۆر گەرمە.»

- زۆرباشە گیتارکەشت بێنم؟ ڕەنگە پێتخۆش بێ کە گۆرانییەک بڵێی. زیتا لە خۆشیانا وەک گوڵ گەشاوە، مێشەکەرانە سەبارەت بە موسیقا توونەد و تیژی دەنواند و زۆر بە کەمی داوای لێدەکرد کە گورانی بۆ بڵێ.

لەژێر کەپرەکەدا، کورسیلەیەکی داری پانی لێبوو کە دەوراندەوری قەراخ دیوارەکانی گرتبوو. مێشەکەرانە ئەو لایەی هەڵبژارد بۆ دانیشتن کە تەواو دەیڕوانییە سەرتەپکەکان. زیتاش دوای ئەوەی کە لە سەر دیوارە نەویەکە دانیشت، لاقەکانی لە سەر کوسیلەکە دانا و پاڵی دا بە کوڵەکەیەکەوە. ئەو زۆر حەزی لە دیتنی سروشت نەبوو. پێی خۆش بوو کە چاو لە مێشەکەرانە بکات.

- جگەرەیەکم بدەیە، پێموانییە دوای ڕۆیشتنی تۆ بە لێومەوە نابێ.

- زۆر چاکە! تەنیا بە کێشانی جگەرەیەکە کە دەتوانم بڵێم بەختەوەریەکەم تەواو مسوگەر بووە. زیتا دانەوی و بە سەرنجێکەوە لێی ڕووانی: «بە ڕاستی خۆشبەختی؟»

مێشەکەرانە چاوی زەق کردەوە و بڕوی بردە سەرێ: «بەڵێ، بۆ خۆشبەخت نەبم؟ شێوێکی باشم خواردووە و دەڕوانمە سروشتێکی زۆر جوان و دڵفەریحی ئورووپا و ئێستاش بەتەمام قاوەیەک بخۆمەوە و گوێ لە گۆرانییەکی خۆشی ناوچەیی مەجارستان بگرم. ویژدانم ئاسوودە و دەزگای هەزم و خواردەمەنی دەروونیشم باش کار دەکا و تەواو تەیارە. مرۆڤ لەوە زیاتر بەتەمای چیە؟»

- دەزانم کە شتێکی دیکەت دەوێ.

- چ شتێک؟

- ئا ئەمە!. (قوتوویەکی کاغەزی چکۆلەی خستە ناو دەستیەوە.)

مێشەکەرانە بە خۆشحاڵیەوە گوڕاندی: «با ـ بادامی برژاو، ئەی بۆچی پێشئەوەی کە جگەرەکە بکێشم باست نەکرد؟»

- دەی دەی خۆشەویستە بیچکۆلەکەم! دوای ئەوەی کە جگەرەکەت کێشا دەتووانی بیخۆی ـ ئەوەش قاوە.

مێشەکەرانە بە خۆشی و چێژێکی زۆرەوە قاوەکەی خوارد وەک پشیلەیەک کە بە خۆشییەکی زۆرەوە سەرتوێی شیرێک بخوات. قاوە و بادامە برژاوەکانیشی خوارد و بە دەنگێکی نەرم و تامەزرۆوە گوتی: چەندە خۆشە کە دوای خواردنی ئەو خواردەمەنییە پیسانەی لێگهۆرن جارێکی دیکە قاوەیەکی ئاوا باش بخۆی!»

- هەر ئەوەی کە ئێستا لێرەی بۆخۆی بەهانەیەکی باشە کە لە ماڵەوە بمێنییەوە.

- ناتوانم زۆر بمێنمەوە، دیسان سبەینێ دەبێ بڕۆمەوە.

پەپوولەی شادی و بزە لە ڕوخساری زیتادا فڕی: «سبەینێ! بۆچی؟ بۆ کوێ دەچی؟»

- ئاه! لە دوو س ـ سێ جێگادا کارم هەیە.

ئەو و جما وایان قەرار دانابوو کە ئەو بۆخۆی بەتایبەتی بچێ بۆ کوێستانەکانی ئاپنێن و و لەمەڕ گواستنەوەی چەک و تەقەمەنییەکان لەگەڵ قاچاخچیەکانی سەرسنوور قسە بکات. پەڕینەوە لە سنووری ژێر دەسەڵاتی

پـاپ بـۆ ئـەو کێـشەیـەکـی زۆر مـەترسـیدار بـوو، بـەڵام ئـەگـەر قـەرارە ئۆپراسیونەکە بگاتە ئەنجام دەبێ ئەوکارەش بکرێت.

زیتا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «هەمیشە کار!» دوایە بە دەنگێکی بڵێندەوە لێی پرسی: «ئەم سەفەرەت زۆر دەخایەنێ؟»

- نا، ڕ. ڕەنگە دوو سێ حەوتە.

لە پڕێکدا پرسی: «پێم‌وایە ئەمەش هەر لەوجۆرە کارانەیە، وانییە؟»

- ئەو کارانە؟

- ئیش و کارێکی کە تەواو تێدەکۆشی سەر و گیانتی لە پێناودا دانێی و ئەوکارە سیاسیانەی کە کۆتایی هەر نایەت.

زیتا جگەرەکەی فڕێ دا و گوتی: «تۆ فریوم دەدەی ڕاستیەکەیم پێ ناڵێی، دەتەوێ کارێکی مەترسیدار بکەی.»

مێشەکەرانە بە ناقایلییێکەوە وەڵامی داوە: «بەتەمام یە یە یەکڕاست و بێ سێ و دوو بڕۆمە دۆزەخەوە، لەوێ پێت‌خۆش نییە کە ئەم گوڵە پاپیتاڵەم بۆ بنێری؟ دەی پێویست ناکا هەمووشی بێنییە خوارێ.»

زیتا کـە بـە تـووڕەییـەوە چنگێکـی لـە لاولاوەکـەی دەور گوڵـەکـە لێـی کردبووەوە بە توندی فڕێی دا سەر ئەرزی و دووپاتی کردەوە: «دەتەوێ کارێکی مەترسیدار بکەی تەنانەت ڕێک و ڕاستیش نایدرکێنی! پێت‌وایە من تەنیا شایانی فریودان و سووکایەتی پێ کردنم؟ هەر ئا لەم ڕۆژانەدا سەرت بە فەتەرات دەچێ. تەنانەت دەرفەتی خوداحافیزیشت نابێ. هەمیشە هەر کاری سیاسی و کاری سیاسی - من لە کاروباری سیاسی بێزارم.»

مێشەکەرانە بە بێزارییەکەوە باوێشکێکی دا و گوتی: «منیش وەک تۆ لە کێشەی ڕامیاری بێزارم. زۆرباشە، جا کەوایە با لە سەر بابەتێکی دیکە قسە بکەین - یان ئەوەی کە گۆرانییەک بڵێی.»

- دەی کەوایە گیتارەکەم بدەیە. چی بڵێم؟

- بالاد٤، کە ئەسپەکەی لێ‌پەڕەوازە بوو؛ پڕ بە پێستی دەنگی تۆیە.

---

٤. Baladجۆرە گۆرانییەکی ناوچەیی هەستبزوێنە کە زۆرتر لەگەڵ دوو ئامێری مۆسیقاوە دەگوترێ.

زیتا دەستی کرد بە گوتنی بالادێکی کۆنی مەجارستانی. ئەم بالادە بەسەرهاتی پیاوێکە کە لەپێشدا ئەسپەکەی، دوایە ماڵەکەی و پاشان گراوێکەی لەدەست دەدا و لای نامێنێت، دوای ئەوە لە سەر ئەو فکر و ئەندێشەیە کە «لە شەڕی موهاچ[5]دا زۆر لەوە زیاتر زەرەرخوردە بووە دڵخۆشی خۆی دەداتەوە.» ئەم گۆرانییە یەکێ لەو گۆرانیانە بوو کە مێشەکەرانە زۆر حەزی لێی بوو، میلودیە خەماویەکەی کە نیشانەی لەخۆبردوویەکی تاڵ و دڵتەزێنە لای مێشەکەرانە ئەوەندە خۆش و دڵڕفێن بوو کە هیچ مۆسیقا و گۆرانییەک نەدەگەیشتە ئاستی.

دەنگی زیتا زۆرخۆش و هەڵکەوتە بوو، نوتەکانی زۆر ڕوون و ئاشکرا و بەتوانا و کەیلی ئەشق و ژین و مانەوە بوون کە لە تاقگەی دەنگیەوە دادەباری.

ڕەنگە گۆرانی ئیتالیایی یان سلاونیک[6]ی باش نەگوتبایە، تەنانەت گۆرانی ئاڵمانی زۆر خراپتر دەگوت، بەڵام گۆرانییە خۆجێی و ناوچەیەکانی مەجارستانی زۆرچاک دەگوت. مێشەکەرانە بە چاوی زەق و دەمی کراوەوە گوێی دەدایە. تا ئێستا ئاوا باشی لێنەبیستبوو. هەر کە زیتا دوایین ڕستەی گۆرانییەکەی گوت، لەپڕێکدا دەنگی لەرزی.

- ئاه هیچ نییە لە شەڕی موهاچدا زۆر لەوە زیاترمان دوڕاندووە.

کەوتە هەنیسکدان و ڕوخساری خۆی لەنێو گەڵای پاپیتاڵەکەدا شاردەوە.

مێشەکەرانە هەستا سەرپێ و گیتارەکەی لێوەرگرت: «زیتا! چیە ئەوە؟»

زیتا کە سەری بە هەنیسکەوە هەڵدەکەندرا، دەم و چاوی بە هەردوو دەستیەیەوە داپۆشیبوو.

مێشەکەرانە دەستی بەسەر و قژ و قوڵیدا هێنا و گوتی: «پێم بڵێ چی بووە؟»

زیتا گریا و خۆی کێشایە ئەولاوە: «لێم گەڕێ! دەستم لێمەدە لێم گەڕێ!»

مێشەکەرانە خێرا گەڕاوە سەرجێگای خۆی و مەحتەل بوو تا گریانەکەی تەواوبێ. لەپڕێکدا زیتا دەستی لە گەردنی هاڵاند و بە ئەژنۆوە لەپەنایدا لە سەر ئەرزی دانیشت: «فلیس - مەڕۆ لێرە مەڕۆ!»

---

٥. Mohacz: ناوچەیەکی مەجارستانە کە لەوێدا مەجارەکان لە ساڵی ٥٦ ز لە شەڕ لەگەڵ توورکەکانی عوسمانیدا شکستیان خوارد.

٦. ئیسلاوی

مێشەکەرانە کە هەوڵی ئەدا بە ئارامیەوە، خۆی لە ژێر ئەو بازۆڵە بە گیرانە ڕزگار کات گوتی: «دوایە قسەی لە سەر دەکەین، لەپێشدا پێم بڵێ لەبەرچی ئاوا شڵەژای. شتێک بووە کە تۆی ئاوا ترساندووەو؟»

زیتا بە بێدەنگیەوە سەری بادا: «ئایا ئازارێکم پێگەیاندووی؟» - - - - - - - -

- «نا» دەستێکی لە سەر گەروی مێشەکەرانە دانا: «ئەی چی؟»

ئاخرەکەی لەبەر خویەوە گوتی: «تۆ دەکووژرێی، لەو پیاوانەی کە دێن بۆ ئێرە یەکێکیان دەیگوت گیانی تۆ لە مەترسی دایە - کاتێکی کە منیش لێت دەپرسم پێم پێ‌دەکەنی!»

مێشەکەرانە دوای کەمێ بەسەر سوورمانەوە گوتی: ئازیزم تۆ خراپی لێ حاڵیت ، بۆ مێشکی خۆت بەوشتە چەوتانەوە سەرقاڵ کردووە. ڕەنگە ڕۆژێکیش بکووژرێم - ژیانی شۆڕشگێڕێک هەر ئاوایە، بەڵام ئەمە ئەو فکرەیە مسوگەر ناکات کە من دەمهەوێ خۆم بە کووشتن بدەم. خۆ من زیاتر لە خەڵکی دیکە گیانی خۆم ناخەمە مەترسیەوە. منیش وەک ئەوان و ئەوانیش وەک من.

- خەڵکی؟ من چیمداوە بەسەر خەڵکیەوە؟ ئەگەر تۆ منت خۆش‌بویستایە ئەو ڕێگایەت هەڵنەدەبژارد و نەتدەهێشت کە شەوانە تا درەنگانێک بەخەبەر بم و هەمیشە تۆم لەپێش‌چاو بێ کە ئایا بڵەی نەگیرابێ و یان هەرکە سەر بنێمە سەر سەرین لە خەوما بە مردوویی بتبینم. تەنانەت تۆ ئەو سەگەت لە من خۆشتر دەوێ!

مێشەکەرانە هەستا سەرپێ و ئارام چووە ئەوسەری کەپرەکە. ئەو چاوەڕوانی بیستنی ئەو قسانەی نەدەکرد هەربۆیە سەری سوورمابوو کە چ وەڵامێک بداتەوە. بەڵێ قسەی جما بوو.ئەو ژیانی کردبووە گرێپووچکەیەکی ئاڵۆز، کە بۆ کردنەوەی ئەو گرێپووچکەیە دەبوو شەو و ڕۆژ هەوڵی هەموار کردنی بدات .

مێشەکەرانە پاشان گەڕاوە و گوتی: «وەرە دانیشە با بە ئارامیەوە قسەی لە سەر بکەین. پێم‌وابێ ئێمە یەکتریمان باش نەناسیوە. بێ‌گومان ئەگەر بمزانیبایە ئاوا سووری لە سەر قسەی خۆت پێنەدەکەنیم. ئادەی ڕێک و ڕاست پێم بڵێ چ شتێک شڵەژاندووتی دوایەش ئەگەر گلەیی و گازندەیەکیش لەبەینماندا هەبێ جێ‌بەجێی بکەین.»

ـ ئەوە شتێک نییە کە بکرێ جیبەجێی بکەی. من خۆم تێدەگەم کە تۆ بە قەدەر نووکە دەرزییەک سەرنج نادەیتە ئەمن.

ـ عەزیزم باشتر وایە کە سەبارەت بە یەکتری ڕووڕاست بین. من هەمیشە هەوڵم داوە نێوانمان خۆش و باش بێت و پێموایە قەد هەوڵی ئەوەم نەداوە کە فریوت بدەم...

ـ ئاخ نا! لەو بارەوە پاک و بێگەرد بووی، تەنانەت بەبیریشتدا نەهاتووە کە من وەکوو فاحیشەیەک چاو لێبکەی ـ لەتە قوماشێکی کۆنی پڕ لە زریقە و بریقە کە لەپێش تۆدا زۆر پیاوی دیکە...

ـ وستبە زیتا! من سەبارەت بە هیچ بوونەوەرێک ئاوا بیر ناکەمەوە.

زیتا بە ڕووتاڵیەوە پێیداگرت و گوتی: «تۆ قەت منت خۆش نەویستووە.»

ـ نا، قەد تۆم خۆشنەویستووە. گوێ بدەیە و هەوڵ بدە تا ئەو جێگایەی کە دەتوانی سەبارەت بە من خراپ بیر مەکەوە.

ـ کێ گوتوویە کە من سەبارەت بە تۆ لێکدانەوەیەکی خراپ و بە پەلەم هەبووە...

ـ کەمێ ڕاوەستە. ئەوەی کە دەمهەوێ پێتی بڵێم ئەوەیە کە من پێبەندی هیچ یاسا و ڕیسایەکی ئەخلاقی نیم و هیچ ڕێزێکیش بۆئەو شتانە دانانیم. بەڕای من پێوەندی نێوان ژن و پیاو تەنیا حەز و تاسە وویستی دڵە...

زیتا بە پێکەنینێکی بێڕۆح و ویشکەوە قسەکەی بڕی: «پارەش»

مێشەکەرانە هەڵبەزیەوە و بۆ ساتێک دوودڵ بوو: «هەڵبەتە ئەوەی گوتت دزێوترین پێوەندی نێوان ژن و پیاوە و ئەم قسەیە بە باشی لە من وەرگرە. ئەگەر بمزانیبایە کە منت خۆشناوێ و یان ڕقت لە پارەیە، قەتم پێشنیار پێ نەدەکردی و ناچارم نەدەکردی کە قەبووڵی بکەی. لە ژیانمدا قەت ئەوکارەم نە کردووە، قەتیش درۆم لەگەڵ ژنێک نە کردووە کە چ هەستێکم سەبارەت بە ئەو هەبێ. باوەڕت بە من هەیە کە من ڕاستیەکانت پێ دەڵێم...»

کەمێ ڕاوەستا، بەڵام زیتا وەڵامێکی نەداوە.

مێشەکەرانە درێژەی پێدا: «ڕای من ئەوەیە کە ئەگەر لەم دنیایەدا پیاوێک تەنیایە و هەست بە بوونی ژنێک دەکا کە هاوسەری ژیانی بێت و ئەگەر دەتوانێ

ئافرەتێک بدینێتەوە کە لەبەر چاوی ئەو جوان بێت و ئاگای لێی بێت و ڕق و بێزاری ئەو هەڵنەخڵەتێنێت، جێی خۆیەتی کە بە دڵفراوانییەوە چێژ و شیرنایی ژیانی پێببەخشێت و بێئەوەی کە پێوەندییەکی نزیکی دیکە هەڵبژێرێت. من هیچ کەم و کوڕییەک نابینم و شەرتی پێوەندی ئێمە ئەوە بوو کە بێعەدالەتی و ئیهانە کردن و فریوی تێدا نەبێت، بەڵام لە سەر ئەم کێشەیە کە لەپێش مندا لەگەڵ پیاوانێکی دیکە بووی، زۆر سەرنجم نەداوەتێ و لام سەیر نەبووە، تەنیا بیرم لەوە کردووەتەوە کە ئەم پێوەندیە بۆ هەردووکمان باش دەبێ و هیچ زەرەرێکیشی نابێ و هەردووکمان ئەو ئازادیە و ئەو مافەمان دەبێری، هەر وەختێک ئەو پێوەندیەمان پێناخۆش بێ بتوانین لە یەکتر جیا بینەوە. ئەگەر من لە هەڵەدا بووم...یان ئەگەر تۆ وەک هەمیشە بە چاوێکی دوو دڵیەوە لە نێوان خۆم و خۆتت ڕوانیوە... هەر بۆیە...

کەمێکیتر بێدەنگ بوو.

زیتا بێ ئەوەی سەری هەڵێنێ هێواش گوتی: «هەر بویە؟»

- هەر بۆیە من ددانی پێدا دەنیم ،کە لەگەڵ تۆ خراپ بووم؛ زۆریش بەداخم، بەڵام ئەم کارەم بە ئەنقەست نەکردووە.

- تەمای ئەوەت نەبووە و پێت وابووە - فلیس مەگەر تۆیان لە بەرد و دار دروست کردووە؟ مەگەر تۆ قەد ئافرەتێکت خۆش نەویستووە تا لە خۆشەویستی من سەبارەت بە خۆت تێبگەی؟

لەرزینێکی سەیر لەشی داگرت. لەوکاتەوەی کە نەفەرێک پێی گوتبوو :خۆشم دەوێی» زۆر دەگوزەرا. زیتا خێرا دەرپەڕی و دەستی لە گەردنی وەرهێنا: «فلیس، وەرە با پێکەوە لێرە بڕۆین. دەست لەم وڵاتە سامناکە و ئەم خەڵکە و سیاسەتەکانیان هەڵگرە! ئێمە کارمان بەوان چیە. پێکەوە بەختەور دەبین. وەرە با بچین بۆ ئەمریکای باشوور ئەو جێگایەی کە لەوەپێش لێی دەژیای.» ترس لە وەبیرهێنانەوەی ڕابردوو ناچاری کرد کە وەخۆ بێتەوە، دەستەکانی زیتای لە ملی خۆی کردەوە و توند گووشی: «زیتا! هەوڵ بدە ئەوەی دەیڵێم بە باشی تێی بگەی. من ئەتۆم خۆش ناوێ، ئەگەریش خۆشم بویستایەی لەگەڵتا نەدەهاتم، من لە ئیتالیادا کارم زۆرە هاوڕێکانم...» زیتا بە تووڕەییەوە گوڕاندی: «یان کەسێکی

دیکە کە لە منت زیاتر خۆش دەوێ! ئاخ بریا بمتوانیایە کە بتکوژم! تۆ خەمخۆری ڕفیقەکانت نیت مامەخەمەی کەسێکی‌تری ئەمە... دەزانم کێیە!»

میشەکەرانە ئارام گوتی: «وست بە، تۆ ئێستا تووڕەی و بیر لە شتی وا دەکەیتەوە کە هیچ ڕاست نییە.»

- پێتوایە سینیوراوولا دەڵێم؟ ئاوا سووک و ئاسان فریو ناخۆم! تۆ لەگەڵ ئەو تەنیا سەبارەت بە سیاسەت قسە دەکەی. هەر بە قەدەر من سەرنج بە ئەو دەدەی ئەو کەسە کاردیناڵە!

میشەکەرانە دەتگوت تیرێک ئەنگاوتوویەتی وا دەرپەڕی.

خێرا دووپاتی کردەوە: «کاردیناڵ؟»

- کاردیناڵ مونتانلی کە بۆ موعیزە کردن هاتبووە ئێرە. پێتوایە ئەو ڕۆژەی کە بە سواری عارەبانەکەوە دەگوزەرا ڕۆخسارتم نەدیت؟ ڕەنگ بە ڕوخسارتەوە نەمابوو وەک دەسماڵی گیرافانەکەی من سپی هەڵگەڕابووی، سەیرە ئێستاش کە نێوی ئەوم هێنا وەک مێوژۆکە دەلەرزی!

میشەکەرانە هەستا سەرپێ.

بەشێوەیەکی ئارام و هێدیەوە گوتی: «تۆ نازانی دەڵێی چی. من... ڕقم لە کاردیناڵە. ئەو دزێوترین دوژمنی منە.

- دوژمنت بێ یان نا، تۆ لەم دونیایەدا لە هەموو کەسێکت زیاتر خۆش دەوێ. ئەگەر دەتوانی چاوم لێبکە و بڵێ «ئەوە ڕاست نییە".

میشەکەرانە بەرەو باخەکە ڕووی وەرگێڕا. زیتا سەری سووڕمابوو لەوکارەی کە کردبووی و بە دزیەوە لێی دەڕوانی و هەڵی دەسەنگاند، شتێکی سامناک لە ناخ و دەروونی میشەکەرانەدا خۆی حەشار دابوو. ئاخرەکەی زیتا وەک منداڵێکی ترساو بە پێ‌دزە چوو بۆلای و هێواش قوڵی کراسەکەی کێشا. میشەکەرانە گەڕاوە و گوتی: «ڕاست وایە.»

# ١١

ئەرێ بڵەی نەتوانم لە چیاکاندا ببینم؟ بریزیگولا بۆمن زۆر مەترسیدارە.

- هەموو وڵاتی ڕۆمانیا بۆ تۆ مەترسیدارە، بەڵام ئا ئێستا بریزیگلولا لە هەموو جێگایەک بۆ تۆ خراپترە.

- چۆن؟

- هەر ئێستا پێت دەڵێم، ئەو کابرای کە کۆتی شینی لەبەردایە مەهێڵە ڕوخسارت ببینێ، لە گوماناوی ئەچێ. بەڵێ، توفانێکی سامناک بوو. زۆر لەمێژە شتی وام نەدیوە کە ئەو ڕەزانە بە دەستی ئەو «با»یەوە وا شێوابن.

مێشەکەرانە قۆڵی لە سەر مێزەکە دانا و وەک کەسێکی کە ماندوو بێ یان شەڕاب گێژی کردبێ سەری کردە سەر دەستەکانی. هەر بۆیە غەوارە مەترسیدارە شینپۆشەکە بە پەلە چاوێکی بە دەوروبەریدا گێڕا. جگە لە کابرایەکی دیهاتی خەواڵوو کە سەری نابووە سەرمێزەکە و دوو وەرزێری دیکە کەسێکی دیکەی لێ نەبوو کە ئەوانیش بە قاپێ شەڕابەوە سەبارەت بە حاسڵاتی خۆیان قسەیان دەکرد. ئەمە دیمەنێک بوو کە بە دایم لە جێگایەکی بچکۆلەی وەک مارادی دەبینرا! کابرای شینپۆشیش لێی حاڵی ببوو کە لەم گوێهەڵخستنە هیچی گیر ناکەوێ. هەر بۆیە یەکجێ شەڕابەکەی خواردەوە و چووە ژوورەکەی دیکە و لەوێ ڕاوەستا. لەبەردەم مێزی مشتەریدا (پێشخوان) ڕاوەستا و هەروا کە بە بێتاقەتیەوە لەگەڵ خاوەنی مەیخانەکە چەنەوەڕی دەکرد، جارجار لە کەلێنی درگاکەوە بە گۆشەی چاوێک

دەیڕوانییە ئەو سێ نەفەرەی کە لە سەر مێزێک دانیشتبوون. دوو وەرزێرەکە هەروا شەڕابیان دەنۆشی و بە زاراوەیەکی خۆجێیی سەبارەت بە کەش و هەوا قسەیان دەکرد. مێشەکەرانەش وەک کەسێکی بێخەم خرپ لێی خەوتبوو. مرخەی ڕۆژەڕۆیەک دەڕۆیشت. ئاخرەکەی سیخوڕەکە وای لێ حاڵی بوو کە شتێکی وای لێ نییە کە خۆی پێوە خەریک کات پارەی شەڕابەکەی دانا و بە بێوازی و بە بێتاقەتیەوە لە مەیخانەکە چووە دەرێ. بەرەولای خوارێی شەقامە تەسکەکە کەوتە ڕێ. مێشەکەرانە کە دەمی کردبووەوە و باوێشکی دەدا، سەری هەڵێنا و بەچاوی خەواڵووەوە بە قۆڵی کراسەکەی چاوەکانی خۆی ماڵی.

چەقۆکەی دەرهێنا و لەتە نانێکی کە لە سەر مێزەکە بوو لێی کردەوە و گوتی: «فیڵێکی لێزانانەیە میکل لەم ڕۆژانەدا دەبێ زۆرتان مزاحیم بێ وانییە؟»

- لە مێشولەکانی مانگی ئووتیش خراپتر بوون. پیاو ناتوانێ لە هیچ کویەک ئاسوودە بێ، بۆ هەر کوێ دەچی سیخوڕێکی بەڕەڵای لێیە. تەنانەت لە کێوەکانیش کە جاران نەیاندەوێرا بچنە ئەوجێگایانە، دایمە سێ سێ و چوار چوار دەگەڕێن - وانییە جینو؟ هەر بۆیە دیداری تۆ و دومینیکینومان لە شاردا ڕێکخست.

- باشە، بەڵام بۆ لە بریزیگولا؟ شارێکی ئاوا سەرسنوور بە دایم پڕ لە شوفار و سیخوڕە.

- ئێستا بریزیگولا شارێکی نیوبەدەرەوەیە، چوونکە پڕە لەو کەسانەی کە لە چوار قوڕنەی وڵاتەوە دێن بۆ زیارەت کردن.

- بەڵام خۆ لە سەر ڕێگای زیارەت کارەکاندا نییە.

- زۆر دوور نییە لە جادەی ڕۆمەوە زۆربەی زیارەتکارەکانی جێژنی پاکیش بۆ بیستنی کارووسی عیشای ڕەبانی دەچن بۆ ئەوێ.

- من نەمدەزانی کە ش شـ شتێکی تایبەتی لە بریزیگولادایە.

- کاردیناڵ لەوێیە. لەبیرت نییە کە لە دیسامبری ڕابردوودا بۆ موعیزە کردن چوو بۆ فلورانس؟ ئەمە هەر ئەو کاردیناڵە مونتانلیەیە. دەڵێن بە چوونی بۆ ئەو شارە خەڵکی چاک کەیفخۆش کرد.

- نازانم ڕەنگە وابێ، من بۆ بیستنی کارووسەکانی نەدەچووم.

- خۆ دەزانی کە ئەویان لا زۆر گەورە و پیرۆزە.

- چۆنە ئاوا بە ناوبانگ بووە؟

- نازانم پێموایە لەبەر ئەوەیە کە هەموو داهاتەکەی دەبەخشێتەوە و وەک قەشەی شاروچکەیەکی چکۆلە ساڵیانە بە چوارسەد یان پێنجسەد سولدیەوە ساڵ دەباتە سەرێ.

- «ئاە!» ئەو پیاوەی کە نێوی جینو بوو هاتە نێو قسەکانیانەوە: «زۆر لەوە زیاتر. بێجگە لەوەی کە پارە دەبەخشێتەوە، لە بەیانییەوە هەتا شەوێ خەریکی پێڕاگەیشتن و چاوەدێری کردن لە هەژاران و نەخۆشەکانە و گوێبیستی سکاڵا و گازندە و زوڵم لێچووەکانە. میکل منیش هەر بە قەدەر تۆ حەزم لە قەشاکانە، بەڵام منێسینیور مونتانلی وەک هیچیان نییە.»

میکل گوتی: «ڕەنگبێ بێئەقڵ بوونەکەی زۆرتر لە دەغەڵی و دووڕوویەکەی سەر بکات، بەڵام هەرچی بێ خەڵکی شێت و سەوداسەری ئەون. حەز و ئاواتی گەورەی ئەوکەسانەی کە دەچنە سەرشەخس و پیران ئەوەیە کە بچن و داوای دووعا و پاڕانەوەی لێ بکەن. دومینیکینو لە سەر ئەوڕایە بوو کە وەک چەرچییەک بە قەرتاڵەیەک لە تەسبێح و خاچی هەرزانەوە بچێ بۆ ئەوێ. خەڵکی پێیان خۆشە ئەوشتانە بکڕن و بیدەنە دەست کاردیناڵ تا مفەرک بێت و دوایە بیکەنە ملی منداڵەکەیان بەشکم ببێتە چاوەزار و لەچاوی پیس بەدوور بن.»

- ڕاوەستە بزانم چۆن دەتوانم بچم - ئەویش وەک زیارەتکارێک؟ پێموایە ئێستا ئەئاوا باشم، بەڵام من... ئەگەر لە بریزیگولادا هەر بەو نێونیشانانەی جارانەوە خۆم وەدەرخەم باش نییە، چوونکە ئەگەر بگیرێم دەبێتە بەڵگەیەکی باش دژی ئێوە.

- ناگیرێی، ئێمە جلوبەرگێکی زۆرباش کە شیاوی ئەوکارە بێت و ویزایەک و هەر شتێکی کە پێویست بێت بوتی ئامادە دەکەین.

- ئەو هەویە و ویزایە هی کێیە؟
- هی کابرایەکی زیارەتکاری ئیسپانیایە - ڕێگرێکی تۆبەکاری خەڵکی سیێرایە. ساڵی ڕابردوو لە ئانکونادا نەخۆش کەوت. هاوڕێیەکی ئێمە بە پیاوەتی خۆی سواری پاپۆڕێکی توجارەتی کرد و بە هۆی ئاشنا و دۆستانێکی کە هەیبوو لە وێنیز پیادەی کرد، ئەو وەک دەستخۆشانەیەک هەویە و پێناسەی خۆی بۆ ئێمە بەجێهێشت . ئەمانە کاروبارەکەی تۆ جێبەجێ دەکەن. ڕێگرێکی تۆبەکار؟، بەڵام ئەی پۆلیس چی لێبکەم؟
ئاه، ئەوەش ڕاستە، ڕاست دەکەی! ئەو زیندانییەکەی خۆی کە لە ژێر تەوژمی ئەشکەنجەدا بوو چەند ساڵێک لەوەپێش گوزەراندووە و دوای ئەوە بۆ پاک بوونەوەی ڕۆح و گیانی خۆی سەفەری کرد بۆ ئورشەلیم و چەند جێگایەکیتر. کوڕەکەی خۆی بەجێگای نەفەرێکی دیکە کووشتبوو و دەکەوێتە قەیرانێکی پەشیمانی و خۆی بە پۆلیس دەناسێنێ.
- زۆر پیر و بە ساڵاچوو بوو؟
- بەڵێ، بەڵام ڕیش و پەشمێکی سپی دەست کرد ئەوکارەی ئەو دەکات و زۆر نێونیشانەکانی دیکەشی لەگەڵ تۆدا یەکدەگرنەوە. ئەو سەربازێکی پیر بوو کە وەکوو تۆ لاقێکی دەشەلی و برینێکی کۆنی شمشێریش لە سەر گۆنای بوو. دوای ئەوە ئیسپانیاییش بوو. ئەگەر لەگەڵ زیارەتکارانی ئیسپانیایی ڕووبەڕوو بویتەوە زۆر ئاسایی دەتوانی لەگەڵ ئەواندا بە ئیسپانیایی قسە بکەی.
- دومینیکینو لە کوێ دەبێ ببینم؟
- لە چوار ڕێیانێکی کە لە سەر خەریتەکە پێتی نیشان دەدەم. لەگەڵ زیارەتکەرەکاندا ڕێکدەکەوی و دەڵێی کە لەو کێوانەدا ڕێگات لێهەڵەبووە. دوایە کە لەگەڵ ئەواندا دەگەیتە شاری. لەگەڵیاندا دەچیە بازاڕێکەوە کە ڕووبەڕووی کۆشکی کاردیناڵە.
- دەی دەی سەرەڕای پیرۆزی و نێوبەدەرەوەبوونی، لە کۆشک و تەلاریشدا دەژی؟

---

١. ئانکونا: لەنگەرگەیەکی کە لە ژێر دەسەلاتی پاپدایە لە ئادریاتیک

ـ لە جێگایەکی تەسک و تەنگەبەردا دەژی. دەنا زۆربەی زۆری کردووەتە نەخۆشخانە. دەی لەوەگەڕێ، هەمووتان چاوەڕوانی دیتنی ئەو دەکەن تا بێتە دەرێ و دوعای خێرتان بۆ بکات. دومینیکینو بە قەرتاڵەیەکی چکۆلەوە دێت بۆلات و دەڵێ: خاڵەگیان، تۆ هاتوی بۆ زیارەت کردن؟ و تۆش وەڵام دەدەیتەوە: من گوناحبارێکی بەدبەختم. ئەوجار ئەو قەرتاڵەکەی لە سەر ئەرزی دادەنێ و بە قۆڵی کراسەکەی ڕوخساری خۆی دەسڕێ و تۆش شەش سولدی دەدەیەی بۆ کڕینی تەسبیحێک.

ـ هەڵبەتە دوایە ئەو ، جێگا و مەکانی قسە کردن و دیدارەکەت پێ دەڵێ؟

ـ بەڵێ، لەو کاتەدا کە خەڵکی چوارچاو لە مونتانلی دەڕوانن، ئەو دەتوانێت بە ئیشتیا نێونیشانی جێگا دیاری کراوەکەت پێ بڵێ. ئەمە کۆی گشتی کارەکەیە. جا ئێستا ئەگەر ئەم جۆرەت پێباش نییە. دەتوانین بە دومینیکینو ڕابگەیەنین کە جێگایەکی دیکەمان بۆ دیاری بکات.

ـ نا، زۆرباشە ئەو جێگایە، تەنیا ئەوەت لەبیر نەچی کە سەرنج بدەیتە ڕیش و مووە دەسکردەکە تانێ زۆر سروشتی و ئاسایی بێ.

ـ خاڵەگیان هاتووی بۆ زیارەت؟

مێشەکەرانە کە لە سەر قەندەرمەکانی کۆشکی ئوسقۆفیدا دانیشتبوو لە ژێر قژ و کاکۆڵە سپی و هەڵشێواوەکانییەوە سەری هەڵێنا و بە زاراوەیەکی تەواو بیانی و دەنگێکی گیراو و بە دەستێکی لەرزۆکەوە ڕەمز و نیشانەکەی نیشان دا. دومینیکینو قایشە چەرمیەکەی لە شانی داگرت و قەرتاڵەکەی کە پڕبوو لە کەرەسە و تەسبیح و خاچی دینداران لە سەر پلیکانەکانی دانا. قەرەباڵغێکی زۆر لە وەرزێران و زیارەتکارەکان دروست ببوو کە لە سەر پلیکانەکان دانیشتبوون یان لە بازاڕدا دەگەڕان و سەرنجیان نەدەدایە سەر ئەوان، بەڵام ئەو دووانە بۆ شوێنەگومکێ وتووێژێکی بێبایەخیان دەست پێ کردبوو. دومینیکینو بە زاراوەی خۆجێی و مێشەکەرانەش بە ئیتالیاییکی سەر و پێشکاو کە وشەی ئیسپانیایی نێو ئاخنی بوو قسەیان دەکرد.

خەڵکێکی کە لە نزیک درگاکە بوون گوڕاندیان: «بڕۆنە ئەولاوە، کاردینالی بەڕێز! کاردینالی بەڕێز دێتە دەرەوە!»

هەردووکیان بە پێوە ڕاوەستان.

دومینیکینو هەروا کە ڕەسمێکی چکۆلە کە لە کاغەزەوە پێچرابوو و دەیدایە دەستی مێشەکەرانە گوتی: «دەی خاڵەگیان، ئەوەش بگرە و هەرکە گەیشتیە ڕۆم دوعام بۆ بکە.»

مێشەکەرانە خستیە باخەڵیەوە و گەڕاوە تا ئەو کەسە ببینێ کە هاودامێنێکی بەنەوشی دەورانی تۆبەکاری لەبەردا بوو و بە کڵاوێکی سوورەوە لە سەر پلیکانی سەرەوە ڕاوەستا بوو و بە دەستی ئاواڵاوە خەڵکی متەفەڕک دەکرد.

مونتانلی ئارام و هێواش لە قەندەرمەکان هاتە خوارێ. خەڵکی ئابڵوقەیاندا تا دەستی ماچ بکەن، بڕێکیان لە سەر ئەژنۆ دانیشتن تا ئاتەکی عەباکەی لە لێویان بکەوێت.

- ڕەحمەتی خۆداتان لێ بێ، ئازیزانم.

مێشەکەرانە بە بیستنی ئەو دەنگە ساف و بێگرێ و خۆشە سەری شوور کردەوە سەرسنگی و قژە سپیەکانی کەوتە سەر ڕووی. دومینیکینو کە دیتی دارەدەستە تایبەتیەکەی دەستی ئەو دەلەرزێ لە دڵی خۆیدا گوتی: «چ یاریزانێکی باشە!»

ژنێک کە لە نزیکی ئەوان ڕاوەستابوو دانەوی و منداڵەکەی هەڵێنا و گوتی: «چەکۆ، وەرە با کاردینالی بەرێز مەسیحئاسا ، کە بە دەست بەسەرهێنانیاندا منداڵەکانی متەفەڕک دەکرد، با ئەویش تۆ مفەڕک بکات.»

مێشەکەرانە پلیکانێک چووە سەرەوە ئاە، دیتنی ئەو دیمەنە ئاسان نەبوو! هەموو ئەم وەرزێر و چیانشینە ڕۆژەڕەشانە دەیانەوێ بچنە سەرەوە و قسەی لەگەڵ بکەن و ئەویش دەست بەسەر منداڵەکانیاندا بێنێ. ڕەنگە ئێستا بەو منداڵە هەژارە بڵێ: «کارینو» وەک زەمانێک کە...

مێشەکەرانە هاتەوە سەر پلیکانەکەی خوارێ و ڕووی وەرگێڕا تا ئەو دیمەنە نەبینێت. خۆزگە بیتوانیایەت بچێتە قوژبنێک و دەروازەی گوێچکەی بەسەر ئەو دەنگەدا ببەستێ! هەر بە ڕاست کەمکەس دەیتوانی ببینێت .

ئەوەندە نزیک ببوەوە کە دەیتوانی دەستی ئەو بگرێ. دەنگێکی نەرم گوتی: «دۆستی من نایتە ژوورەوە؟ پێموایە سەرماتە.»
میشەکەرانە لە حەیبەتا دڵی لە لێدان کەوت. بۆ ساتێک هیچ شتێکی نەدیت و هەستی بە هیچ نەکرد جیا لە گوشاری خوێنی دڵی کە دەیویست سنگی دوولەت کات دوایە کە گوشاری خوێن، سنگی وەژان خستبوو و هەموو ئازای لەشی وەکوو کوورە دایسا، وردەوردە ئەهون ببوەوە نیگایەکی تیژی دووچاوی بەرین کە لە سەر سەری ڕاوەستابوو لەپڕێکدا بە دیتنی ڕوخساری ئەو بە هۆی ڕابردوویەکی شیرین و ڕەحمێکی خودایی ، دڵی بۆی بزووت.
مونتانلی ڕووی کردە خەڵکەکە و گوتی: «ئازیزان، کەمێک بچنە دوواوە، دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم.»
خەڵکی هەروا کە پێکەوە سرتە سرتیان بوو چوونە دوواوە. میشەکەرانە کە حەپەسابوو و ددانەکانی لە حەیبەتا لە جیڕەوە بردبوو و بە چاوی زەقەوە لە عەرزی دەڕوانی و لە جێگای خۆی وشک ببوو. هەستی بە دەستی مونتانلی کرد کە هێواش دای بەسەر شانیدا.
- پێموایە دەبێ جەزرەبەیەکی زۆرت چێشتبێ. ئایا دەتوانم بە جۆرێک یاریدەت بدەم؟
میشەکەرانە ئارام سەری ڕاوەشاند.
- تۆ هاتوی بۆ زیارەت؟
- من گوناحبارێکی ڕووڕەشم.
هەست کردن بە دەستی مونتانلی لە سەر شانی، خۆی بووە هیوا و لەنگەرێک تا میشەکەرانە بتوانێت وەڵامی پرسیارەکەی مونتانلی بداتەوە.
کەمتاکورتێک قورسایی دەستی لە سەر شانی خۆی هەست پێ دەکرد.دەتگوت شانی دەسووتێتەوە،وردە وردە گیانی کەوتە مێلوورە و لەرزین .
کاردینال زۆرتر دانەوی و گوتی: «ڕەنگە پێت خۆشبێ کە بە تەنیایی قسەم لەگەڵ بکەی؟ ئەگەر بتوانم یارمەتیت بدەم...» بۆ هەوەڵین جار میشەکەرانە بێجووڵە و ڕێک چاوی لە چاوی بڕی. ئێستا ئیتر توانیبووی بەسەر خۆیدا زاڵ بێت و خۆڕاگر بێ.

- بێفایدەیە، دەردێکی بێدەرمانە.

ئەفسەرێکی پۆلیس هاتە نێو جەماوەرەکەوە و گوتی: «قوربان ببوورە کە هاتمە نێو قسەکانتانەوە، پێموایە ئەم پیاوە پیرە خرفاوە . زۆر بێدەنگ و بێ دەردی سەرە. هەویەکەشی ڕێکوپێکە و بێگرێیە، هەر بۆیە کارێکی وامان پێی نییە. بە هۆی کردەوەیەکی جەنایەتکارانە ، لە ژێر ئازاری ئەشکەنجە و قەمچیدا بووە و ئێستاش تۆبەی کردووە و پەشیمانە.»

مێشەکەرانە هەروا کە سەری ڕادەوەشاند دووپاتی کردەوە: «جەنایەتێکی گەورە.»

- زۆر سوپاس ملازم، تکایە کەمێ لەولاترەوە ڕاوستن. دۆستی بەڕێز ئەگەر کەسێک بە دڵ پەشیمانەوەبێ هیچ دەردێکی بێدەرمانی نامێنێت. ئەمشەو نایەی بۆلای من؟

- ئایا بەڕێزتان ، پیاوێکی کە بووەتە هۆی مردنی جگەرگۆشەکەی خۆی ئیزنی دیداری پێدەدی؟

ئەم پرسیارە ڕەگەی شەراژوێی تێدا بوو و مونتانلی وەک ئەوەی کە کزەبایەکی ساردی لە سەر بێ هەڵبەزیەوە و لەرزی. بەشێوەیەکی دڵسۆزانەوە گوتی: «هەر کارێکی کە کردبێتت خودای نەکردە من قەت ئیدانەت ناکەم! هەر لەلای ئەوە کە ئێمە هەموومان تاوانبارین و ئیمان و پاقژی کردەوەی ئێمە وەکوو جلوبەرگی کۆنە و شیتاڵەوە بوو وایە. ئەگەر بێی بۆلای من، هەرواکە دەپاڕێمەوە کە خودا ڕۆژێک من بباتەوە بۆلای خۆی، منیش ئاوا بە دڵفراوانییەوە ئەتۆ ڕادەگرم.»

مێشەکەرانە دەستەکانی ئاواڵە کرد و لەپڕێکدا بە وریاییەوە گوتی: «گوێ بدەیە! ئەی خاچپەرەستان هەمووتان گوێ بدەنێ! ئەگەر پیاوێک تاقانە کوڕی خۆی کووشتبێ - کوڕێکی کە باوکی خۆی پڕ بە دڵ خۆشویست بێ و جێگای متمانەی ئەو بێ، کوڕێکی کە گۆشت و پێستی ئەو لە گۆشت و پێستی باوکی بێت. باوکێکی کە کوڕەکەی خۆی بە درۆ و فێڵبازیەوە بخاتە زارکی خوێنمژی مەرگەوە. ئایا ئەو باوکە دەبێ هیوا و هومێدێکی بە دنیا و قیامەت هەبێ؟ من لە بەرانبەر خودا و مرۆڤەکانیدا دان بە گوناح و تاوانباربوونی

حومدا دەنێم و قورسایی باری ئەو گوناحەش کە ئینسانەکان ناویانەتە ـەرشانم هەڵیدەگرم. مرۆڤەکانیش منیان ئازاد کردووە، بەڵام خودا کەی ـزی دەبێ و دەڵێ بەسە؟ چ دوعا و پاڕانەوەیەک ڕق و بێزاری و تووڕەیی ـەو لە ڕۆح و گیانم دەرباز دەکا؟ بەخشینی چ شتێک دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم ـوانە گەورە و نگریسەی من بسڕێتەوە؟

بێدەنگییەکی خەفەتاوی و مەرگئاژۆ هاتە ئاراوە، خەڵکی ڕوانیانە سەر ـوخساری مونتانلی. قورسایی خاچەکەیان لە سەر سنگی هەست پێ کرد.

ئاخرەکەی چاوەکانی هەڵێنا و دەستەکانی بەرز کردەوە کە ماندوویەتیان پێوە دیاربوو دوعای خێر و چاکەی خوێند: «خودا گەورە و دەهەندەیە.دەبێ کۆڵو باری تاوانی خۆت لەپەنای سەرینەکەیەوە لە سەر عەرزی دانێی، چوونکە ئاوا نووسراوە: تۆ نابێ دڵێکی شکا و پەشیمان بڕەنجێنی و سووکایەتی پێبکەی.»

مونتانلی گەڕاوە و چوو بۆ بازاڕ، لە زۆر جێگادا ڕادەوەستا تا لەگەڵ خەڵکی قسە بکات و منداڵەکانیان بگرێتە ئامێز.

مێشەکەرانە شەوێ بە پێی نووسراوە فەرمیەکانی سەر وێنەکە بەرەو ئەو جێگایەی کە قەراریان دانابوو کەوتە ڕێ. جێگاکە ماڵی دوکتورێکی خۆجێی بوو کە لە ئەندامانی چالاکی شانەبەندیەکان بوو. زۆربەی ئەندامەکان وردەوردە کۆببوونەوە و بە هۆی هاتنی مێشەکەرانەوە هەموو زۆر شاد و بە کەیف بوون هەمووشی لەبەر خۆشەویستی ئەو بوو کە وەک ڕێبەرێکی شۆڕشگێڕ و بەوەج لێیان دەڕوانی.

دوکتور گوتی: «ئێمە بە دیتنی دووبارەی تۆ زۆر خۆشحاڵین، بەڵام ئەگەر لێرە بڕۆی زۆر خۆشحاڵتر دەبین، ئەم کارەی تۆ زۆر مەترسیدارە و من خۆم دژی ئەو گەلاڵەیە بووم. ئایا لەوە دڵنیای کە هیچکام لەو پۆلیسە نهێنیانە بە تۆیان نەزانیبێ؟»

ـ چوارچاو لەم لاولاوە گوێ قولاخ وێستا بوون، بەڵام نەیان ناسیم. دومینیکینو کارەکەی باش ڕێکخست. ئەی ئەو لە کوێیە؟ نایبینم.

---

٢ـ وتەی مەسیحە و لە کتێبی ئینجیل وەرگیراوە.

- هێشتا نەهاتووە بەو پێیە هەموو کوسپەکانت تێپەڕاندووە؟ کاردینال دەستی بەسەر تۆدا هێنا و مفەڕکی کردی؟

دومینیکینو هاتە ژووریێ و گوتی: «مفەرک کردن؟ ئەو زۆر لەوە بێبایەخترە کە ڕیوارز متفەڕک کات. ڕیوارز تۆ وەکوو کەیکێکی کریسمەس پڕ لە ڕەمز و ڕازی عەجایەبی، چ هونەرێکی دیکەت پێیە کە دەتهەوێ ئێمە سەرمان سووڕ بمێنێ؟»

مێشەکەرانە بە هێوریەکەوە گوتی: «ئێستا باسەکە لە سەر چیە؟

پاڵی دابووەوە بە کورسیلەیەکەوە و جگەرەی دەکێشا، هێشتا هاودامێنەکەی زیارەتکارەکانی لەبەردا بوو، بەڵام ڕیش و پەشمە دەست کردەکەی لەپەنای خۆیەوە دانابوو.

- بە خەیاڵیشمدا نەدەهات کە تۆ یاریزانێکی ئاوا لێهاتوو بی، قەتم نەدیتبوو کە کارێک ئاوا بە ڕێکوپێکی ئەنجام بدرێت، خەریک بوو مونتانلی بکەیتە گریان.

- چی بوو؟ ڕیوارز بۆ ئێمەشی بگێڕەوە.

مێشەکەرانە شانی هەڵتەکاند دەتگوت گێژ بووە زۆر ئیشتیای لە قسە و باس نەبوو و هەرکە زانیان کە قسەیەکی لێهەڵناوەرێت، دەستە و داوێنی دومینیکینو بوون تا ئەو بۆیان بگێڕێتەوە.

دوای ئەوەی کە قسە و باسی بازاڕ گێڕدرایەوە، کرێکارێکی لاو کە لە بزە و پێکەنینی ئەواندا بەشدار نەببوو لەپڕێکدا گوتی: «هەڵبەتە زۆر لێزانانە بوو، بەڵام من نازانم ئەم کار و یاری کردنە چ قازانجێکی هەبووە.»

مێشەکەرانە هاتە نێو قسەکانەوە: «ئەوەندەی قازانج هەیە کە من پێمخۆشبێ بۆ هەر کوێیەک بچم و بڕۆم و هەر کارێکی کە پێمخۆشبێ بتوانم بیکەم جا لە هەر جێگایەکی ئەم ناوچەیەدابێ، قەتیش بە خەیاڵی پیاوێک، ژنێک یا منداڵێک ناگات کە لە من زەنین بێت، سبەینێ ئەم ڕووداوە لە هەموو جێگایەکدا بڵاو دەبێتەوە و ئەگەریش تووشی سیخوڕێک ببمەوە تەنیا لەبەر خۆیەوە دەڵێ: «ئەمە ڕیکو شێتەکەیە کە لە بازاڕدا خۆی باسی تاوان و

گوناحەکانی خۆی دەکرد. بێگومان ئەمە پووەنێکە بە قازانجی من و بۆ بەرژەوەندی من.»

- بەڵێ تێدەگەم، بەڵام من پێمخۆش بوو ئەم کارە وا ئەنجام بدرێت کە سووکایەتی بە کاردینال نەکرێت - ئەو زۆر پاکتر و چاکتر لەو قسانەیە کە فێڵ و تەڵەکەی ئاوای لە سەر بکردرێت.

مێشەکەرانە بە بێ وازیێکەوە جەختی لە سەر ئەوە کرد: «منیش زەمانێک وەک تۆم بیر دەکردەوە کە ئەو مرۆڤێکی پاک و بێگەردە.»

دومینیکینو گوتی: «ساندرۆ، قسەی خۆڕایی مەکە! کار و ئیشی ئێمە لێرەدا پێویستی بە کاردینالەکان نییە! و ئەگەر منێسینیورمونتانلی ئەودەم شانسی هەبایە کە ئەو پلە و پایەیەی لە ڕۆم بەدەست بهێنایەت، ئێستا ڕیوارز نەیدەتوانی شۆخی پێبکات.»

- قەبووڵی نەدەکرد چوونکە نەیدەویست ئەم کارەی ئێرە بەجێبهێڵێ.

- بەڵێ وا وێدەچێ، چوونکە نەیدەویست بە دەست پاسەوانانی لامبروچینی دەرمانداو بکرێت. ئەوان بەڵگە و دکۆمێنتی ئەویان لەبەر دەستا بوو، ئەوە شتێکی ئاشکرا و حاشا هەڵنەگرە. کاتێ کە کاردینالێک، ئەویش کاردینالێکی ئاوا خۆشەویست بەجێگایەکی ئاوا دوور و چکۆلە ڕازی بووە هەموومان دەزانین کە ئەوە مانای چیە - وانییە ڕیوارز؟

مێشەکەرانە خەریکی دروست کردنی بازنەی دووکەڵی بوو بە دووکەڵی جگەرەکەی و هەروا سەری بەرەو دواوە دەبرد تا ئەو دووکەڵە خڕانە ببینێت گوتی: «ڕ ڕ ڕەنگە لەبەر دڵێکی ڕەنجاو و پەشیمان بێت. باشە لێی گەڕێن وەرن با خەریک کاری خۆمان بین.»

لە سەر ئەو گەڵاڵەیەی کە بۆ ڕاپەڕاندنی چەک و تەقەمەنییەکان لە سنوورەوە دانرابوون کەوتنە قسە و باس و شروڤە کردن.

مێشەکەرانە زۆر بە سەرنجەوە گوێی دەدایە. جارجارە بۆ ڕوون کردنەوەی خاڵە نهێنییەکان و بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکان خێرا دەپەڕیە نێو قسەکانەوە. کاتێکی کە هەموویان قسەکانیان تەواو کرد مێشەکەرانە چەند پێشنیارێکی بە کردەوەی خستە بەردەمیان کە زۆربەیان بێ سێ و دوو

پەسندیان کرد. دوایە کە کۆبوونەوەکە کۆتایی پێ هات. تەمای ئەوەیان گرت کە تا زەمانێک ئەو بە سلامەتی دەگاتەوە تووسکانی جارێکانی کۆبوونەوەی ئاوا نەگرن تا پۆلیس زەنین نەبێ. دوای کاتژمێری دەی شەوێ هەموویان بلاوەیان کرد بێجگە لە دوکتور و مێشەکەرانە و دومینیکینو کە وەک کۆمیتەیەکی تایبەتی مانەوە بۆ تاووتێ کردن و ڕاڤە کردنی برێک لە کێشە تایبەتیەکان. دوای قسە و باسێکی گەرم و درێژخایەن. دومینیکینو چاوی لە کاتژمێرەکە کرد: «یازدە و نیوە نابێ زۆرتر لەوە بمێنینەوە دەنا شەوگەڕ و گشتیارەکە دەمانبینێ.»

مێشەکەرانە پرسی: «کەی لێرەوە ڕادەبرێ؟»

- دەوروبەری کاتژمێری دوازدە، بەتەمام پێشئەوەی کە ئەو بگاتە ئێرە من لە ماڵەوە بم، شەوت باش جیوانی. ڕیوارز پێکەوە بڕۆین؟»

- نا باشتر وایە کە جیا جیا بڕۆین. دەی باشە دوایە دەتبینمەوە؟

- بەڵێ لە کاسێل بولونیز. هێشتا نازانم کە شێوازو قەیافەی خۆم چۆن دەبێ. بەلام تۆ ڕەمز و هێمای پێوەندی دەزانی. پێموایە تۆش سبەینێ لێرە دەڕۆی؟ مێشەکەرانە لەبەر ئاوێنەکە خەریکی دانانی ڕیش و پەشمەکەی بوو: «سبەینێ لەگەڵ زیارەتکارەکان - دووسبەی خۆم نەخۆشدەخەم و لە کوختەی شوانێکا دەمێنمەوە، دوایە قەدبڕ ڕێگای چیاکان دەگرمە بەر. لە پێش تۆدا من لەوێم، شەوت باش!»

کاتێ کە مێشەکەرانە لە کەلێنی درگای ئەنبارێکی خاڵی و گەورەی ڕوانی کە جێگای مانەوەی زیارەتکارەکان بوو ، سەعاتی دوازدە لە ناقووسی برجی کلیسای جامیعەوە ڕاگەیەندرا . سەر ئەرزی ئەنبارە دەشتەکیەکە پڕ بوو لە جەستەی ناحەزی کەسانێک کە زۆربەیان زۆر توند پرخەیان دەهات، بۆگەنێکی زۆر پیسی لێدەهات کە هەناسە هەڵکێشان زۆر زەحمەت بوو. مێشەکەرانە لەبەر پیسیەکەی تەزوویکی پێدا هات و خۆی کێشایە دواوە بێشک نەیدەتوانی لەوێدا بخەوێ. دەبوو بگەڕایەت ئەنبار یان کادێنێکی خاوێن و چۆڵ پەیدا بکات.

شەوێکی خۆش بوو، مانگی چاردە تەواو خەرمانەی دابوو، سەرگەردان لە شەقامەکاندا کەوتە گەڕان. بە خەمناکیەوە ڕووداوەکەی بەیانی وەبیر هاتەوە

وای بە خەیاڵدا هات کە خۆزگە قەت گەلالەی دومینیکینوی قەبووڵ نەکردبایە و نەهاتبایە بۆ بریزیگولا.

ئەگەر هەر لە هەوەڵەوە ئەم گەلالەیە مەترسیدار ڕابگەیەندرایەت، جێگایەکی تریان دادەنا و هەردووکیان هەم ئەو و هەمیش مونتانلی لەم یاریە دڵتەزێنە بە دوور دەبوون. پاپا چەندە گۆڕابوو!، بەلام سەرەڕای پیری دەنگی هیچ نەگۆڕدرابوو. ڕاست وەک ڕابردوو بوو ئەوکات کە دەیگوت: «کارینو»

لەنتەری گەشتیارەکە لەوسەری شەقامەکە وەدیار کەوت و مێشەکەرانە بەرەو کۆلانێکی باریک و خوار و خێچ لایدا. دوای ئەوەی چەند هەنگاوێک ڕویشت کە سەری بەرز کردەوە دیتی لە مەیدانی کلیسای جامیعەدایە. ڕاست نزیکی لای چەپی کۆشکی ئێسقونی. مەیدانەکە تەواو ڕووناک بوو و کەسیشی لێنەبوو، بەلام ئەو دیتی کە درگای ئەولاوەی کلیسا کراوەتەوە دەبێ درگاوانەکە لەبیری چووبێ کە بیبەستێ. بێگومان لەم نیوە شەوە درەنگەدا کەس لەوێ بەدیارەوە نەبوو و ئەویش دەیتوانی بچێتە ژووری و بە جێگای ئەو ئەنبارە بۆگەنە لە سەر کورسیلەیەک بخەوێ، و بەیانی پێش‌ئەوەی درگاوانەکە بێت بەدزیەوە بچێتە دەرەوە، تەنانەت ئەگەر کەسێکیش بیبینێت وا بیر دەکاتەوە کە ڕیکوی شێت لە قوژبنێکدا خەریکی پاڕانەوە بووە و درگاکەی لە سەر داخراوە.

لەبەر درگاکە هەستی ڕاگرت، دوایە لەپڕێکدا بە هەنگاوی بە پەلە و بێدەنگ سەرەڕای شەلینی چووە ژوورەوە. تیشکی مانگ لە پەنجەرەکانەوە دەچووە ژوورەوە و ئەو تیرێژ و هێلەنووریانە دەکەوتنە سەر ئەرزە مەرمەرینەکە، بە تایبەتی مێحرابەکە زۆر ڕوون

بوو لەجێگای قوربانی‌کردنەکەدا کاردینال مونتانلی تەنیا بەسەری ڕووت و بە دەستی ئاوالاوە بە ئەژنۆوە دانیشتبوو.

مێشەکەرانە بۆ تاریکایەکە کشایە دواوە. ئایا پێش‌ئەوەی کە مونتانلی بیبینێت دەبێ هێواش بچێتە دەرەوە؟ ئەمە بێگومان ئاقلانەترین کارێکە کە دەیتوانی بیکات، بگرە گەورەترین کاریش، بەلام سەرەڕای ئەوە ئەگەر کەمێک بچێتە پێشەوە چ زەرەرێکی بۆ ئەو دەبوو - ئێستا خۆ کەسی لێ نییە و ئیتر پێویستی بە دووپات کردنەوەی ئەو نمایشە کومێدیە ترسناکەی بەیانی نییە. ئایا دەیتوانی جارێکی دیکە لە ڕوخساری پاپا بڕوانێ. ڕەنگە ئەمە دوایین

شانسی ئەو بێ، پێویست ناکا کە پاپاش ئەو ببینێ، بە دزیەوە دەچێتە سەرێ و لێی دەڕوانێ ـ تەنیا ئەم تاقە جارە. ئەودەم دەگەڕێتەوە سەر ئیش و کاری خۆی، هەروا کە بە درێژایی سێبەری کۆڵەکەکاندا هەنگاوی هەڵدەهێناوە، هێواش لە میلەئاسنکانی میحرابەکە نزیک بووەوە، لەبەر درگای چوونە ژوورەوە و لەشوێنی قوربانیکردنەکە کەمێ ڕاوەستا. سێبەری تەخت و کورسي ئیسقوفیەکە ئەوەندە گەورە بوو کە دەیتوانی خۆی تێدا حەشار بدات و ئەویش لە تاریکاییدا چیچکانی کرد و هەناسەی لە سینگی خویدا حەبس کرد.

ـ کوڕە بێچارەکەم! ئاخ خودایا ڕۆلە هەژارەکەم!

قسەکەی ئەوەندە پچڕپچڕ دەکرد کە نیشانەی پانتایی هیوابڕاویێ بوو کە مێشەکەرانە سەرەڕای پێناخۆش بوونی لەرزی، بەدوایدا هەنیسکی پەیتا پەیتا و فرمێسکڕشتنی دەستی پێ کرد و ئەو دەیدیت کە مونتانلی وەک کەسێکی کە ئێش و ژان وتاو ویاوی بێت چۆن دەستەکانی لەیەک گرێداوە.

مێشەکەرانە پێیوانەبوو کە وەزعەکە ئەوەندە خراپە، زۆرجار بە دڵنیاییەوە دەیگوت: «نابێ نیگەران و پەرۆشی ئەو بم، ئەو برینە لەمێژە سارێژ بووەتەوە و منی هەر لە بیر نەماوە.» ئێستا پاشی ئەو هەموو ساڵە بە جوانی دەیدیت کە ئەو برینە هێشتا خوێن قەڵپەزە دەکات و ئێستا دەرمانەکەی چەند ئاسانە! تەنیا پێویستی بەوە هەبوو کە دەستی هەڵێنێ و هەنگاوێک هەڵێنێتەوە و بڵێ: «پاپا ئەوەتانێم» جماش بەو پرچەڕەشانەیەوە کە تاڵتاڵی سپی تێدا بوو لەوێ بوو، ئاخ خۆزگە دەیتوانی لێیان ببورێ، خۆزگە دەیتوانی ئەو ڕابردویەی لە ناخی بیر و هزریدا دەسووتا لەوانی جیا کاتەوە ـ ئەو لاسکایە، ئەو مەزرا قامیشەلانە شەکریانە و ئەو سیرکە کۆچەرە! بێگومان ئازارێک لەوانە گەورەتر لەئارادا نییە کە ئینسان بەدڵ بتوانێت بەخشین و لێبووردنی هەبێت و بزانێت کە ئەو هەموو جەزرەبەیە لە کوێی ژیاندا بێئاکام و بێبایەخە، بزانێت کە ناتوانێ لێبوردەیی نەبێت.

مونتانلی ئاخرەکەی خۆی هەستا و خاچێکی لە سەر سنگی کێشا و پشتی کردە میحرابەکە، مێشەکەرانە زۆرتر خۆی لە سێبەرەکەدا کۆکردەوە و لەترسی ئەوەی نەوەکا بیبینێت، یان نەکا ترپەی دڵی لێی لە هەڵادا، کەمێ

لەرزی، دوایە هێواش هەناسەیەکی توندی هەڵکێشا. مونتانلی لەپەنایەوە ڕەدبیوو ئەوەندەی لێنزیک ببوەوە کە عەبا ئەرخەوانییەکەی لە دەم و چاوی درا ـ مونتانلی لەپەنایەوە گوزەرابوو و ئەوی نەدیبوو. ئەوی نەدیبوو! ـ ئاه ئەو کارەی بۆ کرد؟ ئەمە ڕەنگە ئاخرین و باشترین دەرفەتی ئەوبێ، ئەمە ساتێکی بەدەگمەن و پڕبایەخە و ئەو لێ گەڕابوو تا هەروا ئاسان بێت و بڕوات. لە جێگای خوی دەرپەڕی و چووە ڕووناکایەکەوە.

ـ پاپا!

دەنگی ئەو بە درێژایی بنمیچەکەدا دەنگی دایەوە و ترسێکی خەیاڵی سەرتاپای مونتانلی داگرت. خێرا خۆی خستەوە تاریکایەکە.

مونتانلی بێدەنگ لەپەنای کۆڵەکەیەکەوە ڕاوەستا و بە ترسێکی مەرگئاسا و بە چاوی زەقەوە گوێی ڕاداشت. بێدەنگیەکە چەندی خایاند. مێشەکەرانە نەیدەزانی، ڕەنگە ئەو بێ دەنگییە ساتێکی کورت یان زۆر درێژ خایەن بووبێ، مونتانلی بە داچڵەکینێکی سەیر وەخۆ هاتەوە. وادیاربوو خەریک بوو دەکەوت، بەملاولادا لاتراسکەی دەبەست لێوە بێڕەنگەکانی کەوتنە لەرین.

ئاخرەکەی دەنگێکی ئارام گەیشتە گوێی: «ئارتور! بەڵێ، ئاوەکە قووڵە...»

مێشەکەرانە هاتە پێشەوە: قوربان بمبورە، وام دەزانی یەکێک لەو قەشانەیە.»

ـ ئاه هەر ئەو زیارەتچییەکەیە؟

مونتانلی خێرا بەسەر خۆیدا زاڵ بووەوە. گەرچی مێشەکەرانە لە شەوقی لەرزۆکی یاقووتی ئەنگوستیلەکەی دەستی تێگەیشت کە هێشتا دەلەرزێ: «دۆستی من پێویستیت بە شتێک هەیە؟ درەنگانێکە. کلیساش شەوانە دادەخرێت.»

ـ قوربان ئەگەر هەڵەیەکم کردووە بمبوورە. دیتم درگاکە کراوەتەوە هاتمە ژوورەوە تا دوعا بکەم، کاتێ کە قەشەیەکم بینی کە وادیارە خەریکی دوعا و پاڕانەوەیە، مەحتەل بووم کە ئەمەم بۆ متەفەڕک کات.

مێشەکەرانە خاچێکی چکۆلەی تەنەکەی کە لە دومینیکینوی کڕی بوو هەڵێنا. مونتانلی دەستی گرت. دیسان گەڕاوە بۆ ناو مێحرابەکە، خاچەکەی بۆ

ساتێک لە سەر جێگای قوربانی کردنەکە دانا: «هانێ کوڕم، بێخەم بە، چوونکە خوداوەند دڵۆڤان و بەخشەندەیە، بڕۆ و لە عیسای گەورە و پیرۆز داوای دوعای خێر و چاکە بکە. ڕەحمەتی خودات لێ بێ!»

مێشەکەرانە سەری دانەواند تا دوعای چاکەی بۆ بکات و دوایە هێواش دوور کەوتەوە.

مونتانلی گوتی: «ڕاوەستە!»

ڕاوەستا و دەستێکی لە سەر میلەئاسنەکانی مێحرابەکا دانا.

- کاتێ کە لە ڕۆم لە عیشای ڕەبانی پیرۆزدا وەرگیرای، بۆ کەسێکی کە خەمێکی گەورەی هەیە بپاڕێوە و دوعا بکە - چوونکە دەستی خودا لە سەر ڕۆحی ئەو قورسایی دەکات.

وردەوردە دەنگی لەگەڵ گریان تێکڵاو دەبوو و خەریکبوو خۆڕاگری مێشەکەرانەش تێکبشکێ. خەریکبوو جارێکی دیکەش خۆی بدۆڕێنێ. دیسانەوە بیرەوەری تاڵی سیرکەکۆچەرەکە لە مێشکیدا زیندو بووەوە و ئەویش وەکوو ژان وەبیری هاتەوە کە جێی خۆیەتی کە تووڕە بێ.

- من کێم کە ئەو گوێبیستی دوعاکانی من بێت؟ گولێک یان ڕاونراوێک! خۆزگە بمتوانیبایە، هەر وەکوو تۆی بەڕێز دەتوانیت، منیش بریا بمتوانیایە دیارییەک لە ژیانێکی پیرۆز و بەڕێزی ئاراستە بکەم - دیارییەک لە ڕۆحێکی پاک و بەدوور لە کردەوەی خراپ و شاراوە...

مونتانلی لەپڕێکدا گەڕاوە و گوتی: «من تەنیا دیارییەکم پێیە، ئەویش دڵێکی شکاوە.»

دوای چەند ڕۆژێک مێشەکەرانە بە فایتۆن لە پیستوباوە بۆ فلۆرانس گەڕاوە. یەکڕاست چوو بۆ ماڵی جما، بەلام ئەو لە ماڵی نەبوو. نووسراوەیەکی بۆ بەجێهێشت کە سبەینێ بەیانییەکەی دێتەوە، پاشان گەڕاوە بۆ ماڵی خۆی. بە دڵ ئاواتی خواست کە ژووری تایبەتی نووسینی نەکەوتبێتە بەر هێرشی زیتا. ئەگەر ئەمشەویش ناچاربێت سەرزەنشتە

---

٣. یەکێ لە کەسایەتیەکانی پەرتووکی پیرۆزی (ئینجیل) کە لە خودا تووڕە بووە.

ئێرەیەکانی ئەو ببیستێت، بێگومان ئەم سەرزەنشتانە وەکوو خۆرە مێشکی دەخوارد.

کاتێ کە خزمەتکارەکە درگاکەی کردەوە گوتی: «ئەو کاتەت باش بیانکا، مادام ڕێنی ئەمڕۆکە لێرەبوو؟»

بیانکا لێی وردبوەوە: «مادام ڕێنی؟ ئاغا، مەگەر ئەو گەڕاوەتەوە؟»

لەبەر درگاکە ڕاوەستا و بە سەیرێکەوە لێی ڕوانی و پرسی: «مەبەستت چیە؟»

ـ ڕاست دوای ئەوەی کە تۆ ڕۆیشتی، ئەویش خێرا ڕۆیشت و هەموو شتەکانیشی لێرە بەجێهێشت، تەنانەت نەیگوت کە دەیهەوێ بڕوات.

ـ ڕاست دوای ئەوەی کە من ڕۆیشتم؟ کەی ، دوو حەوتوو لەوە پێش؟

ـ بەڵێ ئاغا، هەر ئەو ڕۆژە، شتومەکەکانیشی هەروا تێکەڵ و پێکەڵە و هەموو جیرانەکانیش لەوبارەیەوە قسە دەکەن.

بێئەوەی قسەیەک بکات لە سەر پلیکانی درگاکە گەڕاوە و بە پەلە بەرەو خواروی کۆڵانەکە کە ماڵی زیتای لێبوو کەوتە ڕێ. لە ژوورەکەی ئەو هەموو شتێک وەکوو خۆی بوو، هەموو دیاریەکانی کە پێیدابوون هەر لە سەر جێگای خۆیاندا بوون هیچنامە و نووسراوەیەکی لێنەدەبیندنرا.

بیانکا لە کەلێنی درگاکەوە سەری هێنایە ژوورێ و گوتی ببورە، پیرێژنێک دەیەوێ...»

مێشەکەرانە بە توورەییەوە ئاوڕی داوە: «چی دەکەی لێرە؟ بۆچی بۆ هەر کوێ دەچم بە شوێنمەوەی؟»

ـ پیرێژنێک دەیهەوێ بتبینێ.

ـ چی دەوێ؟ پێی بڵێ نا، ناتوانم بیبینم، کارم هەیە.

ـ ئاغا لەو ڕۆژەوەی کە ڕۆیشتووی هەموو شەوێک دێت و هەمیشە دەپرسێت کە تۆ کەی دەگەڕێیتەوە.

ـ لێی بپرسە چ کارێکی هەیە. نا، لێی گەڕێ، پێموایە خۆم بچم بۆلای باشترە. پیرێژنەکە لە هاڵی نێومالێی مێشەکەرانە چاوەڕوان بوو. جلوبەرگێکی زۆر کۆن و فەقیرانەی لەبەردا بوو، ڕوخساری وەک بەڕووی برژاو و

چرچۆڵ بوو، لەچکەیەکی بوریشی لە سەری پێچابوو. هەر کە مێشەکەرانە هاتە ژوورەوە، هەستایە سەر پێ و بە چاوی ڕەشیەوە کە زیت و وریابوون لێی ڕوانی.

پیرێژنەکە گوتی: «تۆ هەر ئەو کابرا شەلەکەی؟» بە جۆرێکی سەرکۆنە کردن بە تەوسەوە لە سەر تا پێی ئەوی ڕوانی. «لە زیتاوە پەیامێکم بۆ هێناوی.»

مێشەکەرانە درگای ژووری کارەکەی کردەوە و ڕاوەستا تا ئەو بچێتە ژوورەوە دوایە بە شوێن ئەودا چووە ژووریَ و درگاکەی پێوەدا تا بیانکا گوێی لێ نەبێ.

- تکایە دانیشە، دەی تۆ کێی؟

- بە تۆچی کە من کێم؟ هاتووم پێت بڵێم کە زیتا ڕێنی لەگەڵ کوڕەکەی من ڕەدوو کەوتووە.

لەگەڵ - کوڕەکەی - تۆ؟

بەڵێ ئاغا، ئەگەر تۆ نازانی کە چۆن ئاگات لە گراوێکەت بێ، ئەگەریش پیاوانێکی دیکە لەگەڵ خۆیان بردیان نابێ گلەییت هەبێ، کوڕی من خوێن و غیرەتی مەردایەتی لە دەمارەکانی دایە، شیر و ئاو، ئەو لە عەشیرەتی ڕۆمانییە٤.

- تۆ قەرەچیت؟ دەی ئەگەر وایە زیتا گەڕاوەتەوە نێو خێڵ و عەشیرەتی خۆی؟

پیرێژنەکە لووتێکی سەیری لێبادا. لەلای ئەو وادیاربوو کە ئەم خاچپەرەستانە ئەوەندە غیرەت و پیاوەتیان نییە لە بەرانبەر ئەو سەرشۆڕی و ئیهانە کردنەدا توورە بن.

- تۆ چ ئینسانێکی کە دەبێ ئەو بە لاتەوە دانیشێ؟ ئافرەتانی ئێمە ڕەنگە جارجارە بە هۆی پارە و خەیاڵی کچێنیانەوە خۆیان بخەنە بەردەستی ئەم و ئەو، بەڵام کەسێکی کە خوێنی ڕۆمانی لە دەمارەکانیدا بگەڕێ ئاخرەکەی دەگەڕێتەوە نێو ڕۆمانییەکان.

---

٤. قەرەچی بوون

مێشەکەرانە هەروا هێدی و لە سەرەخۆ بوو: «لەگەڵ گرووپێکی قەرەچی ڕۆیشت یان تەنیا لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ کوڕەکەت بێ؟» پیرێژنەکە قاقایەکی کێشا: «بەتەمای بکەویتە شوێنی و بیگەڕێنیتەوە؟ نا، ئاغاگیان، زۆر درەنگە، دەبوو لەوەپێش لە فکری ئەوەدا بوایەی!»

- نا، ئەگەر پێتخۆشە پێم بڵێی، تەنیا دەمهەوێ ڕاستیەکەی بزانم.

پیرێژنەکە شانی هەڵتەکاند، ئیهانە کردن بە کەسێکی کە ئەوەندە لە سەرەخۆ و ئارام لەگەڵ ئەو کێشەیە ڕووبەڕوو بووەوە، بایی زەحمەتەکەی نەبوو.

- دەی دەی ڕاستیەکەی ئەوەیە! ئەو ڕۆژەی کە ئەوت بەجێهێشت کوڕەکەم لە سەر شەقام دیتی و لەگەڵیدا بە زمانی ڕۆمانی قسەی کرد، کوڕەکەم کە زانی سەرەڕای جلوبەرگی جوان و بۆشناخی لە خۆمانە، وەکوو دیکەی پیاوانی ئێمە کە ئاشق دەبن، شەیدای ئەو ڕوومەتە لاواز و کزانەی دەبێت و ئەوی هێنا بۆ خێوەتگاکەی خۆمان. زیتا هەموو پەژارە و نارەحەتیەکانی بۆ گێڕاینەوە. ئافرەتە بەستزمانە ئەوەندە ناڵە و کرووزە کرووزی کرد کە دڵی هەموومانی پەرێشان کرد. تا ئەوجێگایەی توانیمان دڵخۆشیمان داوە، ئاخرەکەی جلوبەرگە جوانەکانی لەبەر داکەند و وەک کچانی ئێمە جلوبەرگی پۆشی و لەگەڵ کوڕەکەم ڕێک کەوت و بوو بە خێزانی ئەو و کوڕەکەشم بووە مێردی ئەو. کوڕەکەم پێی ناڵێ کە خۆشم ناوێی و «کاری دیکەم هەیە کە دەبێ ئەوان جێبەجێ کەم» ژنێک کە جەحێڵە پێویستی بە پیاو هەیە، ئەی تۆ چ پیاوێکی کاتێک کە کچێکی جوان و لاو دێ بە لاتەوە و تەنانەت ئەو کاتەی کە دەست لە گەردنت وەردێنێ تۆ ناتوانی ماچی بکەی.

مێشەکەرانە قسەکەی بڕی و گوتی: «تۆ گوتت لەلایەن ئەوەوە پەیامێکم پێیە.»

- بەڵێ کاتێ کە کاروان کەوتە ڕێ، بۆ ئەوەی کە ڕاسپاردەکە بگەیێنم خۆم دواخست. پێی گوتم کە پێت بڵێم کە یەکجار زۆر دڵڕەق و ویشک وبێزەوقن و لە بابەت پێبەندبوونی خەڵکی ئێوە بە کێشە بچووک و بێبایەخەکانەوە

ڕەنج و ئازارێکی زۆرم کێشتووە و دەمەوێ بگەڕێمەوە نێو عەشیرەی خۆم ، تا لە هەموو ئەو پێبەند و کەلەپچانە ئازاد بێ. زیتا گوتی پێت بڵێم کە من ئافرەتێکم و ئەوم خۆش دەویست، هەربۆیە بەتەما بووم ئیتر وەک فاحیشەیەک لەلای ئەو نەبم. ئەو ئافرەتە ئازاد بوو کە لەگەڵ تۆدا هاتووە. بۆ کچێک ئەگەر بتوانێت بە جوانی و ڕوخساری دڵڕفێنی خۆی پارە و پووڵێک پەیدا بکات هیچ بەربەست یان زەرەرێکی نییە. جوانی کەرەسە و ئامرازێکە و هەر بە کار ئەوە دێ، بەڵام خۆشەویستی ئافرەتێکی ڕۆمانیایی لەگەڵ ڕەگەز و چینی ئێوەدا یەک ناگرێتەوە و زۆر لێکتر دوورن. مێشەکەرانە هەستایە سەرپێ و گوتی: «هەموو پەیام و ڕاسپاردەکە ئەوە بوو؟ دە تکایە پێی بڵێ بەڕای من کارێکی زۆر باشی کردووە و هیوادارم بەختەوەر بێت. هەموو قسە و ڕاسپاردەی منیش هەر ئەوەندەیە، شەو باش و خودات لەگەڵ بێ!»

تا ئەو کاتەی کە درگای باخەکە دوای چوونە دەرەوەی پیرێژنەکە داخرا، ئەو هەروا بە پاوە وێستا بوو، دوایە دانیشت و بە هەردوو دەستی ڕۆخساری خۆی داپۆشی. ئەوەش بەڵایەک و زەبرێکی دیکە بوو کە وەڕۆح و جەستەی کەوت! ئایا کەمێ پیاوەتی و تۆزقاڵانێک غیرەتی تێدا مابوو؟

بێگومان، هەرشتێکی کە مرۆڤ دەیتوانی لە بەرانبەریدا خۆڕاگری بکا لە دەروونی ئەودا کووژرا بوو و دڵی لەنێو قوڕ و لیتە و لە ژێر پێی ڕێڕەواندا دەینالاند، لە دیوەخانی ڕۆحیدا جێگایەکی تێدا نەبوو کە لەوێدا کەسێک سووکایەتی و ئیهانە کردنی پێ نەکردبێ، یان ، نێو و نێونێتکەی کەسێک هەڵینەقرچاندبێ و ئێستاش تەنانەت ئەم کچەتیوە قەرەچییە، کە بەخێری خۆی لە سەر ڕێگا هەڵیگرتبووەوە، فەرمانی پێ دەدا.

سەگەکە لەپەنای درگاکە دەیزنوزاند، مێشەکەرانە هەستا تا بیهێنێتە ژوورەوە، سەگەکە بە کلکە سووتێ و بە کەیف و شادییەکی زۆرەوە هەڵات بۆلای خاوەنەکەی، بەڵام خێرا زانی کە شتێکی ناخۆش ڕووی‌داوە، لە سەر فەرشەکە لەپەنای مێشەکەرانەوە دانیشت. قەپۆزی ساردی نایە نێو دەستی سڕ و ساردي مێشەکەرانەوە.

پاش سەعاتێک جما لەبەر درگای حەوشەدا ڕاوەستابوو، کەس نەبوو وەلامدەری لە درگادانەکەی بێ، بیانکا دوای ئەوەی کە زانی مێشەکەرانە خواردەمەنییەکی ناوێ، چووە ماڵە جیرانەکەیان بۆ دیتنی چێشتلێنەرەکەیان. درگای حەوشەی کردبووەوە و چرای سەرسەراکەی هەڵ کردبوو. جما دوای ئەوەی کەمێک چاوەڕوان بوو، ویستی کە بچێتە ژووری تا مێشەکەرانە ببینێ، چوونکە دەیویست لە سەر پەیامێکی کە لەلایەن بیلەوە هاتبوو و زۆریش بە بایەخ و جێگای سەرنج بوو قسەی لەگەڵ بکات لە درگای ژووری نیش کردنی مێشەکەرانەی دا و دەنگی مێشەکەرانە لە ژوورەوە هات: «بیانکا دەتوانی بڕۆی، هیچم ناوێ.» جما هێواش درگاکەی کردەوە، ژوورەکە تەواو تاریک بوو، بەڵام هەرکە چووە ژوورەوە، شەوقی چرای پێشخانەکە ژوورەکەی ڕووناک کرد.

مێشەکەرانەی دیت کە بە تەنیایی دانیشتووە و سەری بەسەر سینگیدا بەرداوەتەوە، سەگەکەش لەبەر پێیدا خەوتووە.

جما گوتی: «منم»

مێشەکەرانە داچڵەکی: «جما، جما! ئایش چەندەم پێویستی بە تۆ بوو!»

پێشئەوەی کە جما بیهەوێ قسە بکات، مێشەکەرانە لەبەر پێیدا ئەژنۆی دادا و ڕوخساری خۆی بە چینی داوێنی جلوبەرگەکەی ئەو داپۆشی. گریان و لەرزین ئازای ئەندامی داگرتبوو.

جما بێئەوەی بجوڵێت ڕاوەستا، هیچی لەدەست نەدەهات ـ هیچ ئەوەش لە هەموو شتێک ناخۆشتر بوو. دەبوو لە گۆشەیەک ڕاوەستێ و بە نابەدڵیەوە چاوی لێبکات ـ ئەوکە حازر بوو خۆی بمرێ و بەوشەرتەی مێشەکەرانە ئەو ئازارەی لێدوور کەوێتەوە خۆزگە ئەوەندەی غیرەت ببوایێ کە دانەویایێ و ئەوی لە ئامێز بگرتبایێ و توند بیکوشیایە بە سنگی خۆیەوە و ئەگەر بکرایەت لەشی خۆی بکات بە لەمپەرێک دژ بەو ئازار و مەینەتیانە. بێگومان دیسانەوە ئەو دەبووەوە ئارتورەکەی جاران، بێشک دیسانەوە هەتاوی شادی دەپشکوت و تاریکاییش دەڕەوی.

نا، نا! ئەو چۆن دەیتوانی ئارتور فەرامۆش کات؟ مەگەر ئەو نەبوو کە ئارتوری خستبووە نێو دۆزەخی خەم و مەینەتیەوە ـ ئەو بە دەستی ڕاستی خۆی ئەو کارەی کردبوو.

جما لێی گەڕا تا کات هەروا تێپەڕێت، مێشەکەرانە لەپڕێکدا هەستا سەرپێ و لەپشت مێزەکە دانیشت، چاوەکانی بە دەستێکی شاردەوە و لە حەیبەتا گازی لە جلوبەرگەکانی دەگرت. مێشەکەرانە سەری هەڵێنا و بە ئارامیەوە گوتی: «لەوەی کە دامچڵەکاندی بمبوورە.»

جما هەردوو دەستی بۆلای ڕاداشت و گوتی: «ئازیزم ئایا تا ئێستاش دۆستایەتیمان ئەوەندە لێکنزیک نەبووەتەوە کە باوەڕم من پێ بکەی؟ چی بووە؟»

ـ تەنیا ناڕەحەتییەکی تایبەتی خۆمە، من نازانم تۆ بۆ دەبێ نیگەران بی.

جما درێژەی دا: «گوێ بگرە» هەردووک دەستی ئەوی خستە نێو دەستەکانی خۆیەوە تا پێشی لەرزینەکەی بگرێ.

ـ من نەمویستووە لە کارێک سەردەربێنم کە هیچ پێوەندی بە منەوە نییە، بەڵام ئێستا کە بە ویستی خۆت ئەوەندەت باوەڕ بە من هەیە، ئایا ناتەوێ کەمێکیتر باسی بکەی ـ هەروا کە ئەگەر خوشکتبایەم زۆرترت بۆ باس دەکردم؟ ئەگەر سووکنایت دێت قەیناکە هەروا ڕوخسارت داپۆشە، بەڵام ئەگەر لەبەر خاتری خۆشت بووە ڕۆح و گیان و هەستت دامەپۆشە.

مێشەکەرانە پتر سەری دانەواند و گوتی: «تۆ دەبێ لەگەڵ من بی، بەداخەوە ئەمن ناتوانم برایەکی باش بم، بەڵام خۆزگە دەتزانی ـ لەم حەوتەی ڕابردوودا ئەوەندەی نەمابوو کە شێت بم دیسانەوە ڕاست وەک ئەمریکای باشوور شەیتان لەناخمدا کڵێشەی کردبوو...»

قسەکەی بڕی.

ئاخرەکەی جما سەر و پێ شکاو گوتی: «من ناتوانم بەشداری ناڕەحەتی و ئازارەکانی تۆ بم؟»

سەری نایە سەر دەستەکانی جما و گوتی: «دەستی خودا بە توانایە.»

# بەشی سێهەم

## ١

پێنج حەوتەی داهاتوو بۆ جما و مێشەکەرانە پڕاوپڕ بوو لە دڵەکوتێ و دڵەڕاوکە و کاری تاقەتپڕوکێن کە لەو بەینەدا ئەوان دەرفەتی ئەوەیان نەبوو بیر لە کارە تایبەتیەکانی خۆشیان بکەنەوە. دوای ئەوەی چەک و تەقەمەنییەکان بە سلامەتی و بە دزیەوە گەیشتنە ناوچەی ژێردەسەلاتی پاپ . ئەرکێکی مەترسیدارتر و قورستر مابووەوە: ئەویش ئەوە بوو کە ئەو چەکانە کە لە ئەنبارە نهێنییەکانی ناو ئەشکەوتەکانی کوێستانەکاندا شاردرابووەوە، دالبەش بکرێت بەسەر ناوەندە جۆراوجۆرە ناوچەیەکان و لەوێشەوە بڵاو بکرێتەوە بەسەر دێهاتە بەربڵاوەکاندا. سیخۆر و شوڤارەکان لە هەموو جێگایەکدا بەرەڵا و گوێ قوڵاخ بوون. دومینیکینو کە مێشەکەرانە ئەوی کردبووە بەرپرس و ئاگاداری تەقەمەنییەکان، بە پەلە و خێرا کەسێکی نارد بۆ فلورانس بۆ یارمەتیدانی کاری پێویست. مێشەکەرانە لە سەر ئەوە پێداگر بوو کە حەتمەن دەبێ لە نیوەڕاستی مانگی ژوئێندا کارەکان کۆتاییان پێ بێ و تەواو جێبەجێ کرابێ. دومینیکینو بە هۆی دڵەڕاوکە لەمەڕ کێشەی هەڵگرتنی ئەو بارە قورسانە ئەویش بەسەر ئەو ڕێگا و بانە خراپ و نالەبارانەدا و هەروەها بە هۆی کەند و کوسپ و لەمپەڕی زۆر و بە درەنگکەوتنی کارەکان کە شک و گومانی ئاشکرابوونی لێدەکرا وردەوردە

خەریکبوو دڵسارد دەبووەوە، هەربۆیە بۆ مێشەکەرانەی نووسی: «من ئێستا لەنێوان ئاو و ئاگردا گیرم کردووە. لە ترسی پشکنین ناوێرم لە کارەکەدا پەلە بکەم و ئەگەریش بمەوێ کاتی دیاری کراو شتەکان حازربن نابێ هێواش و لە سەرەخۆ کار بکەم. یان خێرا یاریدەدەرێکی ئازا و بەبڕشتم بۆ بنێرە یان بە وێنیزیەکان ڕابگەیەنە کە تا حەوتەی هەوەڵی ژوئێن ئامادە نابین.»

مێشەکەرانە نامەکەی برد بۆلای جما و لەوکاتەیدا کە ئەو خەریکی خوێندنەوەی بوو بە ڕوخسارێکی پەرێشانەوە لە سەر ئەرزی دانیشت و بە ئارامی دەستی بەسەر پشتی پشیلەکەدا هێنا.

جما گوتی: «ئەمە زۆر سەخت و خراپە، ڕاگرتنی وێنیزیەکان بۆ سێحەوتەی داهاتوو هەروا ئاسان نییە.»

ـ شک لەوەدا نییە کە ناتوانین ڕازیان بکەین، قسەیەکی خۆڕاییە. دومینیکینو دەبوو لەوە حا ـ حاڵی بایە. ئێمە دەبێ ڕێبەرایەتی و پێشڕەوی وێنیزیەکان بگرینە ئەستۆ، نە ئەوەی کە ئەوان ڕێبەری ئێمە بن.

ـ من دومینیکینو بە خەتابار نازانم، وادیارە ئەو تەواو توانایی خۆی وەگەڕ خستووە، بەڵام ناتوانێت کارێکی نەگونجاوو چەتوون جێبەجێ بکات.

ـخەتای دومینیکینو نییە. بەڵکوو کێشەکە لەوەدایە کە دومینیکینو بەجێی ئەوەی بەجێگای دوو نەفەر بێت یەک نەفەرە. ئێمە لانیکەم دەبێ نەفەرێکی باوەڕ پێ کراومان هەبێ بۆ پارێزگاری کردن لە ئەنبار و کەسێکیکەشمان هەبێ تا لەگەڵ بارەکان بێت. قسەکەی تەواو ڕاستە دەبێ یاریدەدەرێکی وریا و کارامەی لەگەڵ بێ.

ـ بەڵام ئێمە کێمان هەیە کە بینێرین بۆ یارمەتیدانی ئەو؟ کەسێکی وامان لە فلورانس نییە.

ـ هەر گاوایە دە ـ دەبێ بۆخۆم بچم.

جما پاڵی دا بە پشتی کورسیلەکەیەوە و بە پەرۆشێکەوە لێی ڕوانی و گوتی: «نا، ئەم کارە باش نییە زۆر مەترسیدارە.»

- ئەگەر نەتوانین ڕێگاچارەیەکی دیکە بۆ ئەم کێشەیە بدۆزینەوە، دەبێ من بچم بۆ ئەوێ.
- جا کەوایە تەنیا دەبێ ڕێگاچارەکە بدۆزینەوە، بۆ تۆ یەکجار مەترسیدارە کە دیسانەوە بچیەوە بۆ ئەوێ.
بزەی سەرلێوی مێشەکەرانە نیشانەی بە جیڕبوون و سووربوون بوون لە سەر قسەی خۆی: «بەڵام من پێموایە کە ئەوکارە جێبەجێ دەبێ.»
- دەیبینی، بەشەرتێکی کە تاقە یەک خولەک بە بیر و هزرێکی ئارامەوە بە جوانی لێی تێفکری.
پێنج حەوتە لەوەپێش تۆ لەوێ بووی، پۆلیس بەشوێن ئەو زیارەتکەرەوەیە و هەموو هێزی خۆی خستووەتە گڕ تا لە هەر کوێی ئەو وڵاتەدا بێ، نیشانەیەکی لێپەیدا بکات.
بەڵێ، من دەزانم کە تۆ لە قەیافەگۆڕیندا شارەزای، بەڵام ئەوەشت لەبیر نەچێ کە خەڵکانێکیش تۆیان دیتووە، چ لە جۆری جلوبەرگی ڕیکودا و یان بە هاوشێوەی دێهاتییێک. دوای ئەوە تۆ ناتوانی شەلینەکەت یان جێگای کۆنە برینەکەی سەرگۆنات بشاریتەوە.
ڕاستە، بەڵام لە ڕۆمانیادا کەسانێکی هاوشێوەی تۆی زۆر لێنییە کە لاقی شەل بێ و دەستی چەپی ناقیس و برینداربێ و گۆناشی برینێکی بە شمشێرپێ کراوی تێدا بێ یان چاوی شین و قژی سەری ڕەش بێ.
- ڕەنگی چاوم شتێکی زۆرگرینگ نییە، دەتوانم بە بلادۆنا بیگۆڕم.
- ناتوانی ئەوانەیتر بگۆڕی. نا، ئا لەم هەل و مەرجەی ئەم چەند ڕۆژەدا ڕۆیشتنی تۆ بۆ ئەوی هیچ باش و شیاو نییە. بەم هەموو نیشان کردنە ڕوونانەوە چوون بۆ ئەوێ ، خۆخستنە نێو تەڵەی دوژمنە، ئەویش لە دەستی خۆت و بە چاوی کراوە و ڕوونەوە. بێگومان دەتگرن.
- ئاخرەکەی خۆ دەبێ ک - کەسێک یاریدەی دومینیکینو بدات.
- دەسبەسەر کردنی تۆش لە هەلێکی ئاوا ناسکدا هیچ یارمەتییەک بە ئەو ناگەیەنێ. گرتنی تۆ بە مانای شکستی هەموو بەرنامە و پلانێکمانە.

بەڵام ڕازی کردنی مێشەکەرانە ئاسان نەبوو و بێئەوەی بە ڕێککەوتنێک بگەن قسە و باس لەمەڕ ئەو کێشەیە هەروا درێژەی هەبوو، جما وردەوردە لێی حاڵی دەبوو کە چەندە یەکهەوا و نەگۆڕ و سوورە لە سەر قسەی خۆی، و ئەگەر جیا لەو باسە مژارێکی دیکە لە ئارادا بووایە ـ کە ئەو یەکجار زۆر سەرنجی پێ بدات ـ بێگومان لەبەر ئەویش بایە بێقسە و باس قەبووڵی دەکرد، بەڵام لە سەر ئەم مژارە، ویژدانی ئیزنی بە جما نەدەدا کە تاقە هەنگاوێک پاشەکشێ بکات. بەڕای ئەو و لە ڕاستیشدا بایەخ و ئاکامی ئەرێنی ئەو سەفەرە ئەوەندە بەرچاو نەبوو کە ئەو دەبوو گیانی خۆی بۆ بخاتە دوو توێی مەترسیەوە. هەربۆیە وردەوردە شکی دەپەڕیە سەر ئەوە کە ڕۆیشتنی مێشەکەرانە بۆ ئەوێ زۆرتر بە هۆی ئیشتیا و نەخۆشینێکی دڵەڕاوکە و بەربەرەکانی لەگەڵ کوسپ و تەگەرە مەترسیدارەکانە تا هەست کردن بە کارێکی سیاسی یان بەرپرسیایەتی‌یەکی پێویست... مێشەکەرانە خوو و عادەتی بەوەوە گرتبوو کە گیانی خۆی بخاتە ئابلۆقەی کارە مەترسیدارەکانەوە و بەڕای جما ئیشتیا و پێخۆش بوونی ئەو لەمەڕ بەرەوپیری چوونی ئیشە مەترسیدارەکانەوەیە ،کە هیچ پێویستیش نەبوو، جۆرێک توند ئاژویی و لاساری لاگرتن بوو کە دەبوو بە هێوری، بەڵام بەبڕشتەوە بەربەرەکانیی لەگەڵ بکرێ. دوای ئەوەی هەموو هۆ و هۆکارەکانی خۆی لە بەرانبەر ئەو تەما سەرەڕۆیانەی ئەودا بێئاکام دی ؛ دوایین هێزی خۆی ئاوا خستە گەڕ: «ڕێک و ڕاست وەرە با لە سەر ئەم باسەدا لەگەڵ یەکتری ڕووڕاست بین و هەموو شتێک وەکوو هەن بیانبینین، ئەمە لە سەر دومینیکینو نییە کە تۆ ئاوا پێت چەقاندووە و دەڵێی دەچم، بەڵکوو حەز و ئیشتیای تایبەتی خۆتە بە...»

مێشەکەرانە وەک شیر هەڵچوو و قسەکەی بڕی: «نا ئەوە ڕاست نییە، ئەو لەلای من زۆر بێبایەخە ئەگەر قەتیش نەیبینم دڵم بۆی داناچڵەکێ» دوای ئەوەی لە ڕوخساری جمای خوێندەوە کە ڕاستی و نهێنی دڵی درکاندوە ـ وەک دەڵێ زمان درۆ ناکات ـ ئیتر قسەی پێنەکرا. بۆ ساتێک نیگاکانیان لێکتری گرێبەست بوو و دوایە هەردووکیان چاویان داخست. هیچیان

نەیانتوانی ئەو وشەیەی کە لە سەر شاشەی زەینیاندا بوو بە زمان بیدرکێنن. ئاخرەکەی مێشەکەرانە کە سەری نابووە سەر پشتی پشیلەکە و ڕوخساری خۆی لە تووکی پشیلەکەدا شاردبووەوە و بە تەتە پەتەیەکەوە گوتی: «ئـ ئێ ـ ئەمن بەتەمای نەجاتی دومینیکینو نیم بەڵکوو ترسم لەوەیە کە ئەگەر نەتوانرێ پاریدەی ئەو بدرێت شکست بخۆین.»

جما بە لەبەر چاو نەگرتنی ئەو فێڵە منداڵانەیەی ئەو، کە دەتگوت هەر گوێشی لەو قسانەی ئەو نەبووە درێژەی بە قسەکانی لەوەپێشی خۆی دا: «ئەمە حەزی تۆیە کە پێت‌خۆشە خۆت بخەیتە بازنەی ئیشە مەترسیداراکانەوە هەر ئەوەشە کە هانت ئەدا بچی بۆ ئەوێ. تۆ ڕاست بەقەدەر ئەو کاتەی کە نەخۆش بووی و پێویستیت بە تریاک بوو، هەر بەو پێیەش لە کاتی نارەحەتیدا پێویستیت بە کردەوەی مەترسیدار و پڕ کارەسات هەیە بە دڵ حەز و ئیشتیاشت لێیەتی.»

مێشەکەرانە دژ بەری ڕاوەستا و گوتی: «من داوای تریاکم نەکرد، ئەوە ئەوان بوون کە پێداگریان کرد کە بیخۆم.»

ـ ڕەنگە تۆ بەتوانایی وهێزی بەربەرەکانێ و داکۆکی کردنی خۆت دەنازی.بۆچی پێت وایە داوا کردنی دەوایەک کە ئێش و ئازارەکەت دامرکێنێ دەبێتە هۆی ئەوەی کە تەلی‌غیرەتت بلەرزێنێ، بەڵام ئەوەندە بزانە کە دامرکاندنی ئازارێکی لەشت؛زۆر باشتر لەوەیە کە تەواوەتی ژیانت بخەیتە مەترسیەوە. گرێیەک کە بەدەست دەکرێتەوە بۆدەبێ بەددان بیکەینەوە ، هەرچەندە دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو دوو بابەتە دوو شتی تەواو جیاوازن.

مێشەکەرانە سەری پشیلەکەی کەمێ بردە دواوە و ڕوانییە چاوەسەوز و خڕەکانی و گوتی: «پاشت! ئەوە ڕاستە؟ ئەم هەموو شتە خراپ و بێ‌ئینسافانەی کە خاتوونەکەی تۆ سەبارەت بەمن دەیڵێت ڕاستە؟ ئایا من تاوانبارم، هۆ گیاندارە ئاقڵەکە، تۆ قەد داوای تریاک ناکەی؟ باو و باپیرانی تۆ لە میسر خودا بوون و هیچ مرۆڤێک پێی لە سەر کلکیان دەنەدانا. هەرچەندە نازانم ئەگەر دەست و پیی تۆم لە سەر گرێ ئەم مۆمە دابنایە ئەوکات چۆن

دەتوانی بەسەر ئێش و ئازار و نەخۆشینەکانی ئەم گۆی زەویەدا زاڵبێ. ئایا ئەوکات بۆ سوکنایی دەروونیت داوای تریاکت لێدەکردم؟ تریاکت دەویست؟ یان مردنت لەئامێز دەگرت؟ نا، پشیلە خرپنەکە، ئێمە لەم جیهانەدا ناتوانین تەنیا لەبەر ئاسایش و ڕاحەتی خۆمان بمێنین یان بمرین. ڕەنگە ئێمە بتوانین بۆئەوەی سوکنایی کاتیمان هەبێ تفکەینەوە یان جارجارە جنێو بدەین، بەڵام ناتوانین بۆ سوکنایی ڕۆحی و دەروونی خۆمان پەنجە و دەستي تۆ لێبکەینەوە.»

- سس! (جما پشیلەکەی لە سەر لاقی هەڵگرت و لە سەر چوارپایەکەی دانا) دوایەش دەرفەتمان دەبێ لەمەڕ ئەوشتانە پتر بیربکەینەوە. ئەوەی کەدەبێ ئێستا لە فکریدا بین ئەوەیە کە دەبێ بزانین چۆن دەتوانین یاریدەی دومینیکینو بدەین و لەو گرفتە نەجاتی بدەین. کێتی چییە؟ میوان؟ نا، جارێ وەختم نییە.

- خانم کەسێک ئەمەی لەلایەن خاتووڕایتەوە بۆ هێناوی.

پاکەتەکە تەواو سەربەست و لاکومۆر کراو بوو. لە سەر پاکەتەکە پووڵی تایبەتی ناوچەی ژێردەسەڵاتی پاپی پێوەنرابوو لەگەڵ نامەیەک کە لەلایەن خاتووڕایتەوە نێردرابوو. دۆستانی دەورانی قوتابخانەی جما ئێستاش لەفلوڕانس دەژیان. زۆرجار برووسکە و نامە پڕ بایەخ و نەینییەکانی ئەو، لەبەرئەوەی بەڵا و ترسەڕاوکەیان لێدووربێ بەنێونیشانی ئەوان بەڕێ دەکران.

جما بەپەلە چاوێکی بەڕووکاری نامەکەدا خشاند، وادیاربوو هی کاتی هاوینەی ناوچەی ئاپێنێن بوو کە نرخی یەکپانسیونی لە سەر بوو. جما گوتی: «ئەوە نیشانەی میکلە" ئاماژەی بە دووپەڵەی بۆری گوشەی کاغەزەکە کرد و درێژەی پێدا: «جەوهەرێکی شیمیاییە کە ئەو نووسراوانەی بەنهێنی دەنووسرێن ئاشکرا و ڕوونیان دەکاتەوە، کە لە چەکمەجەی سێهەمی مێزی نووسینگەکەدایە. بەڵێ، ڕاست خۆیەتی.»

مێشەکەرانە نامەکەی لە سەر مێزەکە کردەوە. قلچەیەکی چکۆلەی بەسەر وەرەقەکەدا هێنا. کاتێ ناوەڕۆکی کاغەزەکە بەهێلێکی شینەوە وەدەرکەوت لە سەر کورسیەکەی پاڵی داوە و قاقایەکی کێشا.

جما بەپەلە پرسی: «چی بووە؟» مێشەکەرانە نامەکەی دایە دەستی.

ـ دومینیکینو گیراوە، خێرا خۆت بگەیێنە ئێرە.

جما نامەکەی بەدەستەوە گرت و دانیشت و بەناهومێدیەوە لە مێشەکەرانەی ڕووانی.

مێشەکەرانە، دوای قەدەرێک بەشێوەی ژوور پێکردنەوە گوتی: «د ـ دەی؟ ئایا ئێستا ڕازیبووی کە من بچم بۆئەوێ؟»

جما هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەڵامی داوە: «بەڵێ پێموایە دەبێ بچی، منیش دەبێ بێم.»

مێشەکەرانە هەڵبەزیەوە و سەری هەڵێنا: «تۆش؟، بەڵام...»

ـ بەڵێ من خۆم دەزانم کە بەجێهێشتنی فلوڕانس، بێئەوەی کەسێکی دیکەی لێبمێنێ زۆر مەترسیدارە، بەڵام تائێستا دەبێ هەمووکارەکان ڕاگرین و بە ئیش و کاری ئەوێدا ڕابگەین.

ـ لەوێ دەتوانین زۆرکەسی دیکە بۆ ئەوکارە بدۆزینەوە.

ـ بەڵام کەسانێکی وای لێنییە کە تۆ بە ئارخایەنییەوە بتوانی پشتیان پێببەستی. هەرئێستا خۆت نەتگوت کەدەبێ دوونەفەری باوەڕ پێ کراو ئەرکەکە بگرنە ئەستۆ، جا ئەگەر دومینیکینو نەیتوانی بە تەنیایی کارەکە جێبەجێ بکات، بەڕواڵەت وادیارە کە تۆش بە تەنیایی ناتوانی ئەنجامی بدەی. لەبیرت نەچێ کە کەسێکی دژەبەر و توندئاژوی وەک تۆ لەو جۆرە ئیش و ئەرکانەدا زۆرتر لە خەڵکی دیکە ڕوبەڕووی کەند و کوسپەکان دەبێتەوە، و لەخەڵکی ئاساییشیش زیاتر پێویستی بە یارمەتییە. بەجێگای تۆ و دومینیکینو دەبێ تۆ بیت و ئەمن.

مێشەکەرانە بەڕوخسارێکی پەرێشانەوە کەوتە گومێ ئەندێشەوە: «بەڵێ تۆڕاست دەکەی، جا کەوایە تا زووتر بڕۆین درەنگترە، بەڵام نابێ پێکەوە

بکەوینە ڕێ. بۆوێنە ئەگەر من ئەمشەو بەتەمای ڕۆیشتن بم، تۆ دەتوانی سبەینێ بەفایتونی پاشنیوەڕۆ بکەویتە ڕێ.»

- بۆکوێ؟

- لە سەر ئەوەش دەبێ قسە بکەین. پێموایە بۆمن زۆرباش دەبێ، ئەگەر یەکڕاست بچم بۆ فائێنزا. ئەگەر نیوەشەوی ئەمشەو بکەومە ڕێ بەسواری ئەسپ بچم بۆ بۆرگوسان لورێنزو لەوێ دەتوانم شێواز و قەیافەی خۆم بگۆڕم و خێرا خۆم حارز و بزر بکەم.

جما بەکەمێ دڵەڕاوکەوە گوتی: «من زیاتر لەمە ئەقڵم برناکات، نازانم بەجێگای ئەم کارە دەتوانین چ گەڵاڵەێکی دیکە بخەینە گەڕ، بەڵام تەیاربوونی ئاوا بەپەلەی ئەتۆ و باوەڕپێ کردن بە قاچاخچیەکان بۆ پەیدا کردنی جلوبەرگ و دەمامک لە بۆرگۆ، زۆر مەترسیدارە. تۆ پێشئەوەی کە بگەیتە سەرسنوور، بۆ شوێنەونکێ دەبێ سێڕۆژی تەواو وەختت هەبێ.»

مێشەکەرانە بەپێکەنینەوە وەڵامی داوە: «مەترسە، ڕەنگە دوای ئەوە بگیرێم، بەڵام نەک لە سەر سنوور. هەرئەوەندەی زەحمەتە کە بگەمە سەرچیاکان. ئیتر لەوێ بەقەد ئێرە ئارخایەن و بێخەمم لەناوچەی ئاپنینِدا ؛

هیچ قاچاخچییەک من بەدەستەوە نادات، خەمی ئەوەت نەبێ، ئەوەی کە تەواو لێی ئارخایەنم لە سنوور پەڕینەوەیە.»

ــ ئاە، شتێکی زۆر ئاسان! پاسپۆرتەکەی لوئیزڕایت وەردەگرم وەک گەشتیارێک دەکەومە ڕێ. لەڕۆمانیادا هیچکەس من ناناسێت، بەڵام هەموو سیخۆڕەکان ئەتۆ دەناسن.

- بە خۆ. خۆشیەوە هەموو قاچاخچییەکانیش دەمناسن.

جما کاتژمێرەکەی دەرهێنا: «دووونیوە، ئەگەر قەرارە ئەمشەو بکەوێتە ڕێ، پاشنێوەڕۆ و سەرەتای شەوێش دەرفەتمان هەیە.»

- دەی، باشتر وایە بچمەوە بۆماڵێ و کارەکانم ڕێکوپێک کەم و ئەسپێکی باشیش پەیدا بکەم. بەسواری ئەسپ دەچم بۆ سانلورتێز، ئاوا زۆر مەترسیدار نییە.

---

١. Faenza: شارێکە لە ئیتالیا کە لە هەورگەڕیدا زۆر بەناميەیە.

- بەڵام بەکرێگرتنی ئەسپ هەمیشە ترسی لەگەڵە، خاوەنی ئەو...

بەکرێی ناگرم، کابرایەک دەناسم کە بەئەمانەت ئەسپێکم دەداتێ لەویش دڵنیام و دەتوانم باوەڕی پێبکەم. لەوەپێشیش بڕێک کاری بۆ جێبەجێ کردووم. یەکێک لەشوانەکان دوای دووحەفتەیەک ئەسپەکەی بۆ دێنێتەوە. دەی، سەعات پێنج یان پێنجونیو دیسان دێمەوە ئێرە، تکات لێدەکەم تا ئەوکات مارتینی پەیدا بکە و هەموو ئەوشتانەی بۆ شی بکەوە.

- «مارتینی!» جما گەڕاوە و بەسەیرێکەوە لێیڕووانی.

- بەڵی دەبێ ئەوڕاز و نهێنییەی پێبڵێین، مەگین ئەوەیکە ئەتۆ کەسێکی دیکە بدۆزیتەوە.

- باش لەقسەکەت تێناگەم.

- لێرەدا دەبێ کەسێکی باوەڕپێ کراومان هەبێ، کە ئەگەر لەوێ کێشە و گرفتێکمان بۆ هاتەپێشەوە ئەو ئاگاداربێ و من لەنێوتەواوی ئەوکەسانەدا مارتینیم زۆر پێباشترە. هەڵبەتە هەرکارێکی کە ئێمە پێویستیمان پێیهەبێ ڕیکاردو دەتوانێ جێبەجێ کات، بەڵام بەڕای من مارتینی فکری باشتر کار دەکات. هەڵبەتە دەبێ ئەوەش بڵێم کە تۆ زیاتر لە من ئەو دەناسی! ئەوەش بەسراوەتەوە بەبیر و بۆچوونی تۆ.

- من بەقەدرای سەرەدەرزییەک شک و گومانم لە لێهاتوویی و متمانە پێکردنی ئەو نییە و بەڕای من هەرجۆرە یارمەتییەکی کە پێویست بێت ئەو درێغی لێناکات، بەڵام.

مێشەکەرانە خێرا لێی حاڵی بوو: «جما ئەگەر بتزانیبایە کە هاوڕێێکت لەکاتێکی قەیراناویدا پێویستی بەتو هەیە، بەڵام لەترسی ئەوەی دەکەویە دەردیسەریەوە، ئایا تۆ یاریدەی ئەوت دەدا، ئەوکات لە بەرانبەر ئەودا چهەستێکت دەبوو؟ ئایا دەتگوت ئەم کارە پڕاوپڕە لەبەزەیی و خۆشەویستییەکی پاک و بێگەرد؟»

جما دوای کەمێ بێدەنگ بوون گوتی: «زۆرچاکە، هەرئێستا کێتی دەنێرم بەشوێنیدا و تکای لێدەکەم کە بێ بۆئێرە، لەوبەینەشدا بۆ وەرگرتنی پاسپۆرت دەچم بۆلای لوئیز. قەول و بەڵێنی پێداوم کە هەرکاتێک پێویستیم

بە پاستۆرتەکەی بێت پێمبدات. ئەی پارە و پوول؟ لە سەر حیسابی بانکیم بڕێک پارە وەرگرمەوە؟»

ـ نا وەختی خۆت لەبەر ئەوە بە بەتاڵەت مەدە، من دەتوانم لەحیسابی خۆم ئەوەندە بێنمەوە کە بەشی هەردووکمان بکات. دوایە ئەگەر پارەکەی من بەرەو تەواوبوون ڕۆیشت دەستدەکەین بەخەرج کردنی پارەکەی تۆ. دەی تا کاتژمێر پێنج‌ونیو حەتمەن هەرلێرە دەت‌بینمەوە؟

بەڵێ. زۆر زووتریش دەگەڕێمەوە.

مێشەکەرانە، نیوسەعات زووتر گەڕاوە، جما و مارتینی دی کە لە ژێر کەپرەکەدا دانیشتبوون و خێرا زانی کە دانوستانێکی ناخۆشیان بووە. پەرێشانی و دڕدۆنگ بوون لەڕوخساری هەردووکیان‌دا دەباری و مارتینیش جیا لەجارانی دیکە بێ‌دەنگ و مات بوو.

جما چاوێکی لێ کرد و پرسی: «هەموو شتێکت جێ‌بەجێ کردووە؟»

ـ بەڵێ کەمێک پوول و پارەشم بۆهێناوی بۆ سەفەرەکەت. ئەسپەکەش ڕاست کاتژمێری یەکی نیوەشەو لەبەردرگای یەختەرمەخانەکەی پونتڕوسۆ حازر دەبێ.

ـ درەنگ نییە؟ تۆ دەبێ کەرڕەی بەیانی، پێش‌ئەوەی خەڵکی لەخەو هەستابێتن گەیشتبێتیە سان‌لورێنزو.

ـ ئەو کاتە دەگەمێ، ئەسپێکی زۆرچاک و توندئاژویە، ئێستاش لەبەر ئەوەی کەسێک نەم‌بینێ هەتا کاتی ڕۆیشتن لێرە دەبم. لەبەردرگای ماڵەوە سیخوڕێک ڕاوەستاوە و پێی‌وایە من لە ماڵێم.

ـ ئەی‌چۆن توانیت، بێ‌ئەوەی ئەو بزانێ، لە ماڵەوە هاتیتە دەرێ؟

ـ لەپەنجەرەی چێشت‌خانە بۆ باخچەکە و لەوێشەوە بەسەر دیواری باخەمیوەکەی جیرانەکەمان‌دا هاتمە خوارێ، هەرئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەوەندە درەنگ بکەوم. مەجبور بووم کە فریوی بدەم. بەخاوەنی ئەسپەکەشم گوتووە کە ئەمشەو تا دەمەوبەیان بەچرایەکی هەڵ کراوەوە لە ژووری کارەکەما دادەنیشی. کاتێ کە سیخوڕەکە لەدەرەوە ببینێ سێبەری

پیاوێک بەسەر پەردەکەوەیە، تەواو دڵنیا دەبێ کە ئەمشەو لە ماڵەوەم و خەریکی نووسینم.

- دەی، تا کاتی چوونت بۆ یەختەرمەخانە لێرە دەمێنییەوە؟

- بەڵێ، ئیتر نامەوێ ئەمشەو کەسێک لە سەر شەقام بمبینێ، مارتینی جگەرە دەکێشی؟ دەزانم سینیورابوولا بە دووکەڵ نارەحەت نابێ.

- من لێرە نابم کە پێیقەڵسبم، دەبێ بچمە خوارێ یاریدەی کێتی بدەم بۆ دروست کردنی نان و چایی شێو.

دوای رۆیشتنی ئەو، مارتینی هەستایە سەرپێ و کاتێ کە دەستەکانی لەپشتەوە گرێدابوو کەوتە پیاسە کردن.

مێشەکەرانە جگەرەی دەکێشا و بێدەنگ دەیڕوانییە تنوکی باران.

مارتینی لەبەردەم ئەودا ڕاوەستا و گوتی: «ریوارزا!»، بەڵام چاوەکانی بڕیبووە سەرئەرزی: «بەتەمای جما بکێشیتە ناو چکارێکەوە؟»

مێشەکەرانە جگەرەکەی لەلێوی کردەوە و هێڵێکی دووکەڵینی سازکرد: «ئەوبۆخۆی ئەو ڕێگایەی هەڵبژاردووە، بێئەوەی کەسێک هانی دابێ.»

- بەڵێ، بەڵێ... دەزانم، بەڵام بڵێ...

بێدەنگ بوو.

- ئەوەندەی کە لەو بارەیەوە بتوانم پێتی دەڵێم.

- زۆرچاکە، دە من زۆرشت لە سەر وردەکاریەکانی ئەوکێوانە نازانم - ئایا بەتەمای کە بیخەیتە ناوجەرگەی کارێکی مەترسیدارەوە؟

- ڕاستییەکەیت دەوێ؟

- هەڵبەتە.

- دەی - بەڵێ.

مارتینی گەڕاوە و دەستی کرد بەپیاسە کردن. دیسان خێرا ڕاوەستا: «پرسیارێکی دیکەم لێت هەیە. هەڵبەتە ئەگەر پێتخۆش نەبێ دەتوانی وەڵامم نەدەیتەوە، بەڵام ئەگەر وەڵامت داوە، دەبێ ڕێکوڕاست و ڕووڕاست بێت، تۆ ئاشقی ئەوی.»

مێشەکەرانە، بێئەوەی پەلە بکات سووتووی جەگەرەکەی تەکاند و بێدەنگ دەستی کرد بەکێشانی جگەرەکە.

- هەرگاوایە... پێتخۆش نییە وەڵام بدەیتەوە؟

- نا، پێمخۆشە، بەڵام پێموایە مافی ئەوەم هەبێ کە لێت بپرسم کە بۆ ئەوپرسیارە دەکەی.

- بۆچی! خودایە، پیاو، حاڵی نابی کە بۆچی لێت دەپرسم؟

- «ئاخ!» جگەرەکەی دانا و یەکڕاست ڕووانییە مارتینی. ئاخرەکەی ئارام و لە سەرەخۆ گوتی: «بەڵێ، من ئاشقی ئەوم، بەڵام وامەزانە کە من دەمهەوێ لەگەڵ ئەودا ئەشقێنی بکەم، نگەرانیش مەبە تەنیا لەبەر ئەوە دەڕۆم کە...»

دەنگی لە وڕێنەیەکی سەیر و نووزنـدا ونبوو. مارتینی هەنگاوێک هاتەپێشەوە، «تەنیا؟ لەبەر ئەوە دەڕۆی... کە...»

- بمرم.

بەنیگایەکی سارد و ناهۆمێدانەوە ڕووانییە ڕووبەڕووی خۆی، دەتگوت مردووە. کاتێ کە کەوتەوە قسە بەشێوەیەکی سەیر و سرووڕۆخێنەر بوو: «پێویست ناکا کە ئەو پەرێشان کەی، بەڵام من هیچ شانسێکی گەڕانەوەم نییە، ئەوکارە بۆ هەرکەسێک مەترسیدارە، ئەویش بۆخۆی ئەوە دەزانێ، بەڵام قاچاخچییەکان هەموو هەوڵ و توانایی خۆیان دەخەنە گەڕ تا ئەو نەگیرێت، هەرچەندە کە ئەوان کەمێک تووڕەن، بەڵام مرۆڤانێکی باش و دڵپاکن،ئێستا سەبارەت بە خۆم، تەنافەکە کەوتووەتە گەردنم و کاتێ کە سنوور ببەزێنم گرێی تەنافەکە دەجەڕێنم.»

- ڕیوارز. تێناگەم مەبەستت چیە؟ هەڵبەتە مەترسیدار هەیە بەتایبەتی بۆ تۆ، بەڵام ئەوەش دەزانین کە تۆ زۆرجاری دیکەش لەسنوور پەڕیویتەوە و هەمیشە سەرکەوتوو بووی.

مێشەکەرانە بە ناڕەحەتییەوە بزەیەکی هاتە سەرلێوی: «ئایا ئەوچیرۆکە ئاڵمانییەت لەبیر ماوە کە دەڵێ، پیاوێک دوای ئەوەی هاوشێوی خۆی دەبینێ دەمرێ؟ نا؟ شەوێک کە ناهومێدانە دەستەکانی خۆی لێکگرێ دابوو

لەقوژبنێکی چۆڵدا هاوشێوەکەی خۆی دەبینێ. بەڵێ جاری ڕابردوو منیش هاوشێوەی خۆمم لەوچیایانە دیت. هەربۆیە کاتێ کە لە سنوورەوە ئاوەژوی ئەودیو بووم، ئیتر ناگەڕێمەوە.»

مارتینی هاتە لای ئەو و دەستی خستە سەرپاڵپشتی کورسیەکەی: «ریوارز گوێ بگرە! من تاقە وشەیەک لەوقسە سەیرە و متافیریکیانەی تۆ تێناگەم، بەلام لە شتێک حاڵی بووم، ئەگەر سەبارەت بە ئەو ئاوا بیر دەکەیتەوە هەرگا وایە هیچ حاڵت باش نییە کە بچی بۆ ئەوێ. باشترین ڕێگا بۆ دەستبەسەربوون و گیران ئەوەیە کە ئینسان هاتبێتە سەر ئەوباوەڕە کە دەگیرێ. تۆ دەبێ نەخۆشبی کە ئەم خەیاڵ و بیرۆکە چەوتانە هاتۆتە نێومێشکتەوە. پێتچۆنە کە من بەجێگای تۆ بچم؟ هەرجۆرە کار و ئیشێکی بەکردەوەی ئەوێ بەباشی جێبەجێ دەکەم، دەتوانی بۆ ئەندامانی خۆت پەیامیشیان بۆ بنێرێ، و بۆشیان ڕاڤە بکەی کە...»

- یانی لێبگەڕێم کە تۆ بەجێگای من بکوژرێیت؟ کارێکی زۆر زیرەکانە دەبێ.

- خۆ ڕوونییە کە من دەکوژرێم! خۆ من وەک تۆ ناسیاو نیم بۆ ئەوان. دوای ئەوە ئەگەر من...

قسەکەی خۆی بڕی. مێشەکەرانە بەنیگایەکی سارد و گوماناویەوە لێی ڕووانی. مارتینی دڵی داخورپا . سەری داخست.

بەدڵنیاییەکی تەواوەوە گوتی: بێگومان مەرگی تۆ زیاتر ئەو ناڕەحەت دەکا هەتا مەرگی من، ڕیوارز دوای ئەوە ئەمە کارێکی گشتی و جەماوەریە و ئێمە دەبێ قازانج و بەرژەوەندییەکانی ئەو بەباشی هەڵسەنگێنین بەهرە و قازانجێکی زیاتر بۆ ئەندامانێکی زیاتر و کاراتر،هەبوونی تۆ لەبوونی من قازانجی زیاترە ؛ ئایا بوونی تو ڕاست ئەوقازانج و بەهرەیەیە کە پسپۆڕانی ئابووری قسەی لێدەکەن؟ من ئەوەندەم تێگەیشتن هەیە کە لەوە حاڵیبم. هەرچەند نازانم کە بۆچی و لەبەرچی خۆشم دەوێی. تۆ زۆر لە من بەکەڵک وپڕبایەختری . من زۆر لەوە دڵنیا نیم کە بوونی تۆ لەم هەلومەرجەدا بەجێگای من باشتر و پێویستتر بێ، بەلام ئەوەندە دەزانم کە تۆ زۆر کار و

ئەرکی باشترت پێ جێبەجێ دەکرێ و مردن و نەمانی تۆ کەلێنێکی گەورە و کوسپێکی قورس و گرانی لێدەکەوێتەوە، بەڵام مەرگی من و نەبوونی من بۆشاییەکی ئاوا بەرچاو و زەقی لێدروست نابێ.»

شێوەی قسە کردنەکەی وابوو کە دەتگوت لەبازاڕێکی بوورسدا لە سەر بەشە شەریکەکان قسەوباس دەکات، مێشەکەرانە کە دەلەرزی سەری هەڵێنا وەک بڵەی کەمێک سەرمای بووە.

ـ ئایا تا ئەو کاتەی کە دێوزمەی قەبرەکەم دەمدەکاتەوە و وەک زاخۆرانی هەڵمدەلووشێ چاوەڕوانی دیدار و دیسانەوە دیتنم دەبێ؟

ئەگەر قەرارە بمرم، شەو و تاریکی هەروەکوو بووکێکی ئازیز لەئامێز دەگرم...

ـ مارتینی، گوێت لێبێ، من و تۆ زۆر قسەی خۆڕایی و بێسەرەوبەرەمان کرد.

مارتینی بەتوورەییەوە گوتی: «تۆ ـ هەڵبەتە.»

ـ بەڵێ، تۆش قسەی خۆڕاییت کرد، تۆخودا با کارێک نەکەین کە وەکوو(دۆنکارلوس) و (مارکیزپوزا)مان لێبێ بۆ مردن نۆبە بڕی بکەین. ئێستا سەدەی نۆزدەهەمە، و ئەگەر قەرار وایە کە من بمرم، دەبێ بمرم ئیدی ئەو بێنە و بەرەی بۆچییە.

ـ وادیارە ئەگەر مانەوە و زیندووبوون بەشی من بێ، من دەبێ بە زیندویی بمێنمەوە، بەڵام ڕیوارز تۆ بەختەوەرتری.

ـ «بەڵێ» مێشەکەرانە بەکورتی جەختی کرد: «من هەمیشە بەختەوەربووم.»

هەردووکیان بەبێدەنگی دەستیان کرد بە جگەرەکێشان، دوایە کەوتنە تاوتوێ کردنی وردەکاریەکانی ئۆپراسیونەکە. کاتێ کە جما هات بانگیان کات بۆخواردنی شێو، ڕوخسار و هەڵسوکەوتیان نیشاندەری ئاخافتنێکی ناخۆش و چاوەڕوان نەکراو بوو. دوای خواردنی شێویش تا کاتژمێری یازدە

---

٢. وتەی کلاودیو لەدرامی Measure for Mwasure لە بەرهەمەکانی شکسپیر.

٣. دوو کەسایەتی بەرچاون لەتراژیدیای دونکارلوسی شیلێردا.

سەرقاڵی قسەوباس لەمەڕ پلان و قەرار و بڕیارەکان بوون. لەوکاتەدا مارتینی هەستایە سەرپێ و کڵاوەکەی هەڵگرت: «ریوارز من دەچمەوە ماڵێ و باڵتەی چوونەسەفەری خۆم هەڵدەگرم. پێموایە لەوبەرگەدا باش لەچاو نادەی و کەمتر دەناسرێی، هەروەها بەتەمام گەشتێک بەمدەوروبەرەدا لێدەم تا دڵنیا بم لەم دەوروبەرەدا سیخوڕێکی لێنییە.»

ـ هەتا یەختەرمەخانە لەگەڵم دێی؟

ـ بەڵێ دێم نەوەک بەشوێنتەوە بن، چوارچاو لە دووچاو باشتر کاردەکا. سەعاتی دوازدە دەگەڕێمەوە، لەبیرت نەچێ بەبێ من ناکەویتە ڕێ. جما بۆئەوەی ئەگەر هاتمەوە بەزەنگلێدانی درگا کەس هەڵنەستێنم باشتروایە کلیلی درگاکەم پێبێ.

کاتێ کە کلیلی درگای حەوشەی وەردەگرت، جما ڕووانییە چاوەکانی. تێگەیشت کە ئەو لەبەر ئەوەی ئەوان بەتەنیایی بەجێ بهێڵێ ئەوفێڵەی دۆزیوەتەوە: «من و تۆ سبەینێ پێکەوە قسە دەکەین. سبەینێ بەیانی کە پرێسکە و شتومەکەکانی من دابەسترا دەرفەتی قسە کردنمان زۆرە.

ـ بەڵێ، دەرفەتێکی زۆرمان دەبێ. ڕیوارز یەک دوو بابەتێکم لەزەیندایە کە پێمخۆشبوو سەبارەت بەوانە پرسیارگەلێکت لێبکەم، بەلام تا یەختەرمەخانەکە دەتوانین قسەیان لە سەر بکەین. جما واباشترە کە کێتی بنێری بخەوێ و هەردووکتان تا ئەوجێگایەی کە دەتوانن بەبێدەنگی ڕایبوێرن. دەی جارێ هەتا سەعات دوازدە خوداحافیز.

بەبزەییێکەوە ئاماژەیەکی بۆ کرد و چووە دەرەوە. بۆئەوەی کە جیرانەکان بزانن میوانەکانی سینیوراببوولا ڕۆیشتوون درگاکەی توند پێوەدا.

جما چووە چێشتخانە تا بەکێتی بڵێ بچێت بخەوێ و بەقاوەیەکی خەستەوە کە لە سەر کەشەفێکی دانابوو گەڕاوە: «پێتخۆشە کەمێ ڕاکشێی؟ چونکە ئەگەر بکەویتە ڕێ ئیتر ناتوانی بخەوی.»

ـ نا ئازیزم! لە سانلورێنزو کاتێ هاوڕێیان خەریکی هێنانی جلوبەرگ و جلوبەرگی تایبەتین دەخەوم.

ـ دەئەگەروایە کەمێ قاوە بخۆوە. کەمێ ڕاوەستە با برێک غوراییت بۆ بێنم.

کاتێ کە جما لەپەنای دۆلابەکەدا چۆکی دادا، لەپڕێکدا مێشەکەرانە لە سەرشانییەوە دانەوی و ڕووانییە پێشەوە: «ئەوانە چییە؟ خامە و نەقوڵی بریتانییە! سەیرە! ئەوشتانە بۆ پادشا و شازادە دەبێ!»
جما سەری هەڵێنا و بزەیەکی بۆ قسە گەرم و گوڕانەکەی ئەو لێدا: شیرینیت پێخۆشە؟ ئەمانە هەمیشە بۆ سزاریان ڕادەگرم، بۆ شیرینی وەک منداڵ تامەزرۆیە.»
- ب - ب - بەڕاستە؟ هەرگاوایە دەبێ سبەینێ کەمێک بۆ ئەو دروست کەی چونکە من بەتەمام ئەمانە لەگەڵ خۆمدا بەرم. نا، قەیناکە نەقوڵەکان دەخەمە گ گ گیرفانم، تامی ئەم نەقوڵانە سوکنایم دەدەن لە بەرانبەر هەموو ئەوخۆشی و شادی و کەیفانەی کە دوورەپەرێزبوون لە باخچەی ژیانمدا. هە - هە - هیوادارم ئەو کاتەی کە لە سێدارەم دەدەن کەمێ نەقوڵم بدەنێ تا بیمژم.
- لانیکەم لێگەڕێ با قوتوویەکی کاغەزیت بۆ بێنم بەوانەوە بیخە گریفانت! پێکەوە دەچەسپێن ئەونەقوڵانەی دیکەشیان بخەمە پاڵ ئەوانەوە؟
- نا پێمخۆشە ئێستا لەگەڵ تۆ بێخۆم.
- بەڵام من نەقوڵم پێخۆش نییە و دەمەوێ بێی و زۆر ژیرانە دانیشی و تانێ یەکێکمان نەکوژراوە با وتووێژێکی ئارام و تێر و تەسەلمان هەبێ و...
مێشەکەرانە ورێنەی کرد: «نەقوڵی پێخۆش نییە! هەرگاوایە من دەبێ بە تەنیایی هەمووی بخۆم ئەمە ڕاست وەک خواردنی شێوی ئیعدامییەکە، وانییە؟ ئەمشەو دەبێ هەموو کوڵ و کۆ و ئیشتیای ئەمن بە ئارەزووی دڵ دامرکێنێ. لەپێش هەموو شتێکدا داوات لێدەکەم لە سەر ئەم کورسیلە ڕاحەتیە دانیشی و هەروەکوو گوتت منیش دەبێ ڕاکشێم، لێرەدا درێژ دەبم و دەحەسێمەوە.»
مێشەکەرانە لەبەردەمی جمادا لە سەر فەرشەکە دانیشت و ئانیشکی نا بە کورسیەکەوە و ڕووانییە ڕوخساری ئەو: ڕەنگت چۆن هەڵبروسقاوە! بۆئەوەیە کە ژیان و گوزەرانت زۆر توند و سەخت دەگری و نەقوڵیشت پێخۆش نییە...»
- تەنیا بۆ پێنجخولەکیش بێ ئەوەندە بە شۆخی و جەفەنگی مەگرە. قسەی مان و نەمانە، بۆ شۆخی نابێ.

- ئازیزم تەنانەت بۆ دووخولەکیش دەست لەشۆخی و جەفەنگ هەڵناگرم. ژیان و نەمان هیچیان ئەوبایەخەیان نییە کە بە هەندیان بگری.

هەردووک دەستی ئەوی توند کوشی و بە نووکی قامکەکانی یاری لەگەڵ دە کردن:

- مینروا٤، ئەوەندە بەبڕشتەوە لێمەڕوانە! ئەوەندەی نەماوە کە دەستکەمە گریان و دوایەش بۆم بەداخبێ. پێمخۆشە دیسانەوە خونچەی بزەی سەرلێوت بپشکوێ چونکە بزەی سەرلێوت یەکجار شیرین و دڵگیر و بێوێنەیە. دەی ئازیزم ئیتر ئەوەندە بە دڵتەنگی و پەرۆشیەوە لێمەڕوانە! وەرە با وەک دوومنداڵی ژیکەڵە و باش تۆشە و غوڕابیەکانمان بخوین بێئەوەی لە سەریان دەستبکەین بەشەڕ و چەلەحانە - چونکینێ سبەینێ دەمرین.

مێشەکەرانە غوڕابیێکی لە سەر دەوریەکە هەڵگرت، بەوریاییەکی زۆرەوە کردی بە دوو لەتی بەرابەر و شەکراوی نێوەڕاستەکەشی بەجوانی بەسەر هەردووکیاندا دابەش کرد.

- ئەمەش جۆرە ڕێ و ڕەسمێکی ئایینیە، وەک ئەو ڕێ و ڕەسمەی کە ئەوخەڵکە پاقژە لەکلیسادا بەڕێوەی دەبەن. «فەرموو نۆشی گیانتی کە ئەمە لەشی منە٥.» دەزانی دەبێ هەردووکمان بە پێکێک شەڕاب بخوێنەوە - بەڵێ ئاوا «بۆ بیرەوەریش بێ ئەم کارە بکە...»

جما قاپەکەی لە سەر مێزەکە دانا. بەهەنیسکدانەوە گوتی: «وا مەڵێ!» مێشەکەرانە سەری هەڵێنا و دیسانەوە هەردووک دەستی گرتەوە.

- دەگەر وایە بێدەنگ دادەنیشین، با کەمێ هێور بینەوە. کاتێ کە یەکێکمان بمرین ئەوی‌ترمان ئەم ساتانەی لەبیر دەمێنێ. ئیتر ئێمە ئەم دونیایەی کە پڕ لەهەراو و هوریا و توند و تیژیە و لەگوێچکەماندا دەنگ دەداتەوە فەراموشی دەکەین. دەست لەناودەستی یەکدا پێکەوە دەڕۆین، دڕۆین و هەنگا دەنێینە دالانە سەیر و سەمەرەکانی مەرگەوە و لەئامێزی گوڵاڵەسوور و هەلاڵەکاندا دەڕازێین، ئارام بە! ئیتر تەواو بێدەنگ دەبین.

---

٤. خواوەند و خوالەی هزر و هونەر.

٥. وتەی مەسیحە کە لەدوایین خواردنی شێویدا کە بە هەوادارانی خۆی گوت.

سەری لە سەر ئەژنۆی جما دانا. ڕوخساری خوی داپۆشی، جماش بەبێدەنگی بەسەر ئەوا نووشتاوە، دەستی بەسەر قژەڕەشەکانیدا هێنا، ئەبەو شێوەیە کات و سات تێدەپەڕی و هیچیان نەدەجوولانەوە و نە قسەیەکیشیان دەکرد.

ئاخرەکەی جما گوتی: «ئازیزەکەم کاتژمێر نزیک دوازدەیە.» مێشەکەرانە سەری هەڵێنا: «تەنیا چەندخولەکێکمان ماوە، مارتینیش ئێستا دەگەڕێتەوە، ڕەنگە ئێتر قەت یەکتر نەبینینەوە. قسەیەکت نییە کە پێمبڵەی؟»

مێشەکەرانە ئارام هەستایە سەرپێ و بەرەو ژوورەکەی دیکە ڕۆیشت. کەمێ بێدەنگی دایگرتن.

بە دەنگێکی کە باش نەدەبیسترا گوتی: «قسەیەکم هەیە ـ قسەیەک کە ـ کە پێتی بڵێم...»

ڕاوەستا، نزیک پەنجەرەکە دانیشت و ڕوخساری خۆی لەدوولەپی دەستیدا شاردەوە.

جما گوتی: «زۆر لەوەپێشەوە بەتەما بووی کە دڵۆڤان و بەڕوحم و دڵ بی.»

ـ لەژیانی خۆمدا ڕوحم و دڵۆڤانیم نەدیتوە، لەپێشدا ـ وامدەزانی کە ـ تۆ ئەوەت هەر بەخەیاڵیشدا نایە و بیریشی لێناکەیتەوە...»

ـ ئێستا خۆ سەبارەت بە ئەمن وابیر ناکەیتەوە؟

جما کەمێ ڕاوەستا تا ئەو قسە بکات، ئەوجار هەستا و لەپەنایدا ڕاوەستا.

ئارام و بەنەرمیەوە گوتی: «پێموابێ ئێتر دەبێ ڕاستییەکانم پێبڵەی، فەڕزکە ئەگەر تۆ بکوژرێیت و من زیندوو بمێنم دەبێ درێژە بەژیانم بدەم و قەتیش نەزانم کە... قەتیش دڵنیانەبم کە...»

مێشەکەرانە هەردوو دەستی ئەوی گرت و توند گوشی: ئەگەر من بکوژرێم ـ دەزانی ئاخر ئەو کاتەی ڕۆیشتم بۆ ئەمریکای باشوور ـ ئەوەش مارتینی!»

یەکبەخۆی هەڵبەزییەوە و چووە ئەولاوە و درگای ژوورەکەی تەواو کردەوە. مارتینی خەریک ئەوەبوو کە چەکمەکانی بەحەسیرەکە خاوێن کاتەوە.

- وەک هەمیشە ڕاست سەری سەعات! ئای مارتینی تۆ کرۆنۆمیترێکی گیان لەبەری ئەوە ب. - باڵتە و شنێلە سەفەریەکەیە؟

- بەڵێ، دوو سێ شتی دیکەشم بۆ هێناوی. ئەوەندەی پێم کراوە نەمهێشتووە تەڕبن، بەڵام بارانێکی زۆرخەست دەبارێ، بەداخەوە سەفەرێکی ناخۆشت لەپێشە.

- گوێت لێنەبێ - شەقام چووڵ بوو؟

- بەڵێ، وادیارە هەموو سیخوڕەکان چوون بخەون. لەشەوێکی ئاوا ناخۆش شتێکی سەیر نییە. جما ئەمە قاوەیە؟ دەبێ پێشئەوەی کە لە ژێر ئەوبارانەیەدا بکەوێتە ڕێ شتێکی گەرم بخواتەوە، دەنا سەرمای دەبێ و نەخۆش دەکەوێ.

- قاوەکە ڕەشە و زۆریش خەستە، ئێستا کەمێک شیریش دەکوڵێنم.

لەگەڵ ئەوەی کە ددان و دەستەکانی توند بەسەریەکدا دەگوشی کە نەکەوێتە گریان چوو بۆ چێشتخانە. کاتێ کە بەشیرەکەوە گەڕاوە، مێشەکەرانە شنێلەکەی لەبەر کردبوو و خەریکی بەستن و خۆتوند و تۆڵ کردن بوو، بەپێوە فینجانێک قاوەی خواردەوە و کڵاوێکی پانی سوارکاری گەورەی هەڵگرت و گوتی: «مارتینی پێموایە کاتی ڕۆیشتنە، بۆئەوەی دڵنیا بین پێشئەوەی بچین بۆ یەختەرمەخانە گەشتێک بەمدەوروبەرەدا لێدەدەین. سینیورا جارێ خوداحافیز، ڕۆژی هەینی لەفورلی یەکتر دەبینینەوە، مەگەر ئەوەیکە ڕووداوێکی تایبەتی بێتە پێشێ. کەمێ ڕاوەستە، نێونیشانەکە ئە - ئەمەیە.»

پەڕێک لەدەفتەرەچکۆلەکەی گیرفانی لێ کردەوە و چەندوشەیەکی بەقەڵەم لە سەر نووسی.

جما بەدەنگێکی خەمگین و ئارامەوە گوتی: «لەوە پێش دەمزانی.»

- دەتزانی؟ زۆر چاکە، بەڵام ئەمەیە نیونیشانەکە لەبیرت نەچێ. مارتینی وەرە س ـ س! مەهێڵە درگاکە دەنگی بێ!» هێواش چوونە خوارێ. کاتێ کە داخرانی درگاکە دوای ڕۆیشتنەدەرەوەی ئەوان دەنگی هات. جما گەڕاوە ژووریَ و خێرا ئەوکاغەزەی کە نابویە ناودەستی کردیەوە.

لە ژێر نیونیشانەکەدا نووسیبووی: «لەوێ هەموو شتێکت پێ دەڵێم.»

## ٢

ئەو ڕۆژە لە بریزیگولا ڕۆژی هەینی بازاڕی حەوتە بوو. خەڵکی دێهات بە مریشک و بەرازی ماڵی و ماست و کەرە و مێگەلەحەیوانی شاغی خۆیان لەدێهات و ناوچەکانی خۆیانەوە هاتبوونە ئەوێ. جێگای هەینی بازاڕ پڕبوو لەوجەماوەرەی کە خەریکی هات و چۆ بوون. پێدەکەنین و شۆخیان دەکرد و خەریکی کڕین و فرۆشتنی هەنجیری وشک و تووگوڵەبەڕۆژە و کەیکی هەرزان و ئەلەوجۆرە شتانە بوون.

منداڵانێکی ڕەشتاڵە کە بە تیشکی هەتاو ڕەش داگەڕابوون بەپێخاوسی بەسەر ئەرزیدا درێژ ببوون و دایکەکانیشیان لە ژێر سیبەری دارەکان بە قەرتاڵەی پڕهێلکە و کەرەی خۆماڵیەوە دانیشتبوون.

سینیورمونتانلی کە بۆ گوتنی«بەیانی باش، هاتبووە دەرێ، لەپڕێکدا خەڵکانێک بەدەنگ و هەرایەکی زۆرەوە ئاپۆرەیان دا. ئەوخەڵکە بەچەپکەگوڵی سوور و سوێسنە و نێرگسی سپی داوێنی کێوانەوە کە بۆ بەخێرهاتنی بەرەولای ئەو ڕایان دەداشت کۆببوونەوە.

خەڵکی حەز و خولیای مونتانلی بەوگوڵە کێویانەیان وەک کردەوەیەکی بچووکی لاسارانە دەزانی کە ئەوکارە لە سەر هەرپیاوێکی زانا دەوەشێتەوە. لە ڕووی بەزەیی و خۆشەویستییەوە وەپشت گوێی خۆیان دەدا. ئەگەر کەسێکی دیکە کە لەلای خەڵکی ڕێزێکی کەمتری هەبوایە و ماڵەکەی خۆی پڕکردبایە لەوگوڵ و گیاکێویانە پێیپێدەکەنین، بەڵام «کاردینالی پیرۆز!» دەیتوانی زۆر کردەوەی سەیر و بێزەرەر ئەنجام بدات.

مونتانلی کە ڕاوەستا تا دەست بەسەر منداڵێکدا بێنێ گوتی: «دەی ماریوچیا لەوجارەی دیکەوە کە تۆم دیت گەورەتر بووی، ڕۆماتیسم و لاقێشەی دایەگەورە چۆنە؟»

- قوربان کەمێک باشترە، بەڵام ئێستا دایکم تەندروستی باش نییە.

- ئاخ زۆر بەداخم، بەدایکت بڵێ ڕۆژێک بێ بۆئێرە و خۆی پیشان دوکتورجوردانی بدات. بەشکم کارێکی بۆ بکات، جێگایەکی بۆ پەیدا دەکەم. بەشکم ئەو جێگۆڕکێیە بە قازانجی بێ. لویجی! وادیارە باشتری، چاوەکانت چۆنە؟»

هەروا کە قسەی لەگەڵ خەڵکی ئەو دێهاتە دەکرد، دەڕۆیشتە پێشەوە. ئەو هەمیشە نێو و تەمەنی ئەومندالانە و گیر و گرفتی ئەوان و گەورەکانیانی لەبیر بوو. بەسەرنجێکی ڕەحم و دڵۆڤانییەوە لە سەریان ڕادەوەستا و لەتەندروستی مانگاکە کە لەکریسمەس‌دا نەخۆش کەوتبوو یان بووکە شووشەیەکی کە لە هەینی بازاڕدا لە ژێر تگەری عەرابەیەکدا پان ببوەوە و لێی دەکوڵیەوە و لێی دەپرسین.

دوای ئەوەی کە گەڕاوە بۆ کۆشک، کاری بازاڕ دەستی پێ کرد. پیاوێکی شەل بەکراسێکی شینەوە، کە کەمێ مووی ڕەش بەسەر چاوەکانی‌دا هاتبووە خوارەوە و برینێکی قووڵ لە سەر گونای چەپی بوو، هێواش بەرەولای یەکێ لەدووکانەکان چوو و بەزمانێکی ئیتالیایی زۆرناخۆش داوای لیمۆترشی کرد.

ژنێک کە لیمۆکەی بو دادەنا، چاوێکی لێ کرد و گوتی: «تۆ خەڵکی ئەم ناوچەیە نییت.»

- نا، من خەڵکی کورسیکام.

- بەشوێن کاردا دەگەڕێی؟

- بەڵێ، نزیکەو وەرزی گیادوورینەوەیە، پیاوێک کە لە نزیکایی ڕاونا مەزرای هەیە ئەو ڕۆژە هاتبووە باستیا و پێی گوتم کە لەوێ کار زۆرە.

- هیوادارم هەروابێ، بەڵام تەواو دڵنیا نیم، لەم دەوروبەرەدا کاروبار باش نییە.

- دایەگیان، کورسیکا لێرە خراپترە، نازانم ئێمەی فەقیر و هەژار ئاخرەکەی چیمان بەسەردێ.

- بەتەنیا هاتووی بۆئێرە؟

- نا هاورێکەم لەگەڵم هاتووە. ئەوەتانێ کراسی سووری لەبەر کردووە!

Hola Paoio میکل دوای ئەوەی گوێی لێبوو، کاتێ کە دەستی لەگیرفانی نابوو هاتەپێشەوە. سەرەڕای ئەوەی کە قژێکی سووری دەست کردی لە سەر نابوو تا نەناسرێتەوە، کورسیکاییەکی تەواو تەواو بوو، مێشەکەرانەش لەچاوی نەدەدا و شکیان لێنەدەکرد. پێکەوە لەبازاڕدا کەوتنە گەڕان، میکل بەدەمی فیتوی لێدەدا. مێشەکەرانە کە لاقی بەسەر ئەرزیدا ڕادەکێشا تا شەلینەکەی دیار نەبێ، پرێسکەیەکی لە سەر شان بوو کە بە زەحمەتەوە دەڕۆیشت. ئەودووانە چاوەڕوانی کەسێکی نهێنیکار بوون تا دەستوور و فەرمانی زۆر پڕ بایەخی پێبدەن.

میکل لەپڕێکدا هێواش لەبەر خۆیەوە گوتی: «مارکون لەوێیە، بەسواری ئەسپەوە لەو گۆشەیە ڕاوەستاوە؛ مێشەکەرانە هەرواکە پرێسکەکەی پێبوو و لاقی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا بەرەولای سوارەکە ڕۆیشت.

دەستی برد بۆکلاوە کۆنەکەی سەرسەری، قامکێکی بەسەر هەوساری ئەسپەکەدا کێشا و گوتی: «ئاغاگیان کرێکارێکتان ناوێ گیاتان بۆ ویشک کاتەوە؟» ئەمە ڕەمزێک بوو کە لەوەپێش دایانابوو، سوارەش کە بەڕواڵەت وادیاربوو کوێخای ئاغایەکی ملکداربێ، دابەزی و هەوسارەکەی خستە ملی ئەسپەکەوە و گوتی: «کاکەگیان دەتوانی چکارێک بکەی؟»

مێشەکەرانە کە هەروا بە کلاوەکەی خۆی کایەی دەکرد گوتی: «دەتوانم قەرەقوڵ بم یان پەرژین دروست بکەم» و بێئەوەی ڕاوەستی درێژەی پێدا: «کاتژمێر یەکینیوەشەو لەبەردەم ئەشکەوتی گیرو. دەبێ دوو ئەسپی چاک و عەرابەیەکت پێ بێ. لەنێو ئەشکەوتەکەدا چاوەڕوان دەبم - دەتوانم زەویش هەڵکەنم...

- تەواوە ئیدی من تەنیا قەرقوڵێکم دەوێ. لەوەپێش ئەوکارەت کردووە؟

- جارێکم کردووە، جوان گوێت لێبێ، دەبێ تەواو بەچەکەوە خۆت تەیارکەی نەوەک ڕووبەڕووی سوارکارانی چالاک ببینەوە. لەڕێگای جەنگەڵ

---

١. هۆی پائولو (ئیتالیاییە)

و لێرەوارەوە مەڕۆ. ئەورێگایانەی دیکە سلامەتترە. ئەگەر سیخوڕێکت تووشبوو، لەگەڵی دامەمەزرێنە، بێ سێ و دوو بیکوژە ـ کاکەگیان ئەوکارەم زۆر پێخۆشە.

ـ بەڵێ، ڕەنگە تۆ پێتخۆشبێ، بەڵام من قەرقولێکی بە ئەزموون و کارامەم دەوێ. نا، ئەمڕوکە قەرەپوولم پێنییە.

سواڵکەرێکی زۆرچڵکن و شڕۆڵە بە ئاە و ناڵەیەکەوە کە یەکبین دەیوتەوە ، بە کۆمەکۆم بۆلای ئەوان هاتبوو: لەبەرخاتری حەزرەتی مریەم خێرێک بکەن بەم کوێرە بێنەوایە ـ خێرا لێرە بڕۆن ئەسوارانی سەبک بەرەو ئێرە دێن ـ پاکترین فریشتەی ئاسمان پاقژترین کچ ـ ڕیوارز ئەوانە بەشوێن تووەن. دووخولەکیتر دەگەنە ئێرە ـ هیوادارم مەسیح و خوداوەند چاکەتان بدەنەوە ـ دەبێ بەپەلە خۆت دەربازکەی، لەهەر قوژبنێکدا سیخوڕێکی لێیە.

لەوە گوزەراوە کە بێئەوەی بتبینن هەڵێ، زووکە هەڵێ» مارکون هەوسارەکەی دا بەدەستی مێشەکەرانەوە.

ـ زووکە! سواربە و بەرەو پردەکە هەڵێ و ئەسپەکە بەجێ بێڵە، لە دەربەند دەتوانی خۆت بشاریتەوە. ئێمە هەمووومان چەکمان پێیە، بۆ دەخولەک دەتوانین سەرقاڵیان کەین و ڕایانگرین.

نا، کوڕەکان نامەوێ ئێوە بگیرێن. لەپەنای یەکەوە ڕاوەستن. هەمووتان بەشوێن مندا یەکڕیز گوللەبارانیان کەن ـ دوایە بەرەو ئەسپەکانمان دەکەوینە ڕێ، ئەوێیان گرتووە، نزیکی پردەکانی لای کۆشکەکە خەنجێرەکانتان لەکالان دەرهێنن. هەوسارەکان هەڵبڕن و هەرکەسێک خۆی بخاتە سەرپشتی نزیکترین ئەسپ. بەو شێوەیە بەشکم هەمووومان بتوانین خۆمان بگەێنینە ناو جەنگەڵەکە.

ئەوەندە ئارام و لە سەرەخۆ قسەیان دەکرد کە خەڵکی زۆر نزیکی دەوروبەری ئەوان نەیاندەتوانی لەوە بگەن کە لە سەر ئاریشەیەکی گەورە و حەستەم دەدوێن ؛ یان قسەوباسەکەیان لە کۆ کردنەوەی گیاوگژ گەورەترە. مارکون هەرواکە هەوساری ماینەکەی گرتبوو و دەیکێشا و بەرەولای ئەسپە بەستراوەکان دەڕۆیشت. مێشەکەرانەش بەلارەلار و کۆمەکۆم لەپەنای ئەوەوە دەڕۆیشت.

سواڵکەرەکەش بەدەستی درێژکراوەی و بە ناڵە و پاڕانەوەی یەکرێزی بە شوێن ئەوانەوە بوو. میکل بە فیتو لێدانەوە هاتەپێشێ. بەدەم ڕێگاڕۆیشتنەوە سواڵکەرەکە باسەکەی پێگوتبوو و ئەویش هەواڵەکەی بەگوێی سێ پیاوەکە گەیاند کە لە ژێر دارێکدا خەریکی خواردنی نان و پیواز بوون. خێرا هەرسێکیان هەستانە سەرپێ و بەشوێنیدا کەوتنە ڕێ، پێشئەوەی شکی کەسێک بپەڕێتە سەریان، هەرحەوت نەفەرەکە دەستیان لە سەر پەلەپیتکەی دەمانچەکانی ژێر چاکەتەکانیان دانابوو، لەپەنای یەکتری و لەنزیک ئەسپەبەستراوەکانیانەوە ڕاوەستابوون.

میشەکەرانە ئارام و لە سەرەخۆ گوتی: «تا من دەست پێنەکەم کەس خۆی قوشقی نەکات ڕەنگە ئێمە نەناسن. دوای ئەوەی من تەقەم کرد ڕێک هەمووتان دەست پێبکەن. تەقە لە سەربازەکان مەکەن. لاقی ئەسپەکان شەلکەن. ئەوکات ناتوانن بکەونە شوێنمان. لەگەڵ ئەوەی کە سێنەفەر دەمانچەکان پڕدەکەنەوە سیانیترتان تەقە بکەن. ئەگەر کەسێک لەئەوان کەوتە نێوان ئێوە و ئەسپەکانتانەوە بیکوژن. من ئەسپە قزڵەکە هەڵدەگرم. هەرکە کڵاوەکەم خستە خوارێ هەرکەسێک لە ئێوە ڕێگا بگرێتە بەر و بڕوات، لەبەر هیچ شتێکیش ڕانەوەستێت.»

میکل گوتی: «هاتن.» میشەکەرانەش کە دیتی خەڵکی دەستیان لە کڕین و فرۆشتن هەڵگرت بەسەیرێکەوە ئاوڕی داوە.

پازدە پیاوی چەکدار ئارام دەهاتنە پێشەوە. ئاپۆرەی خەڵکی ببووە لەمپەرێک کە بەئاسانی نەیاندەتوانی خێرا بێنە پێشەوە و ئەگەر بە هۆی ئەوسیخوڕانەوە نەبوایە کە لەوگوشە و کەنارانەوە خۆیان مەڵاس دابوو، هەر حەوتیان دەیانتوانی لەوکاتەدا کە سەربازەکان بە ئاپۆرەی خەڵکەوە سەرقاڵ بوون خۆیان دەرباز بکەن.

میکل کەمێ لە میشەکەرانە نزیک بووەوە: «ناتوانین خۆمان دەرباز بکەین؟»

- نا، سیخوڕەکان چوار دەورەمانیان گرتووە، یەکێکیشیان منی ناسیوە. هەرئێستا کەسێکی ناردە لای مولازم تا جێگای من بە ئەو ڕاگەیێنێ. تەنیا شانسێکی کە هەمانە، شەل کردنی لاقی ئەسپەکانە.

- سیخوڕەکە کامەیە؟

- هەوەڵین کەسێکی کە تەقەی لێ دەکەم. هەموو ئامادەن؟ کوڵان و ڕێگایەکیان بە دڕدانی خەڵکی ڕێک بەرەو ئێمە دروست کردووە بەتەمان لەپڕێکدا هێرش بکەنە سەرمان.

ملازم گوڕاندی: «بەنێوی پاپەوە، لە سەر ڕێگاکە لاچن!»

جەماوەر بەسەرسووڕمانەوە کشانە دواوە، سەربازەکان بەپەلە هێرشیان بردە سەر ئەوکەسانەی کە لەنزیک پەردەکانی کوشکەکە ڕاوەستابوون. مێشەکەرانە دەمانچەکەی لە ژێر کراسەکەی دەرهێنا و تەقەی کرد نە ڕووبەڕوی ئەو سەربازانەی کە دەهاتنە پێشەوە، بەڵکوو ڕوو بەو سیخوڕە خۆفرۆشەی کە لەئەسپەکان نزیک دەبووەوە. گوللەکە ئێسکی گەردنی پێکا و بەپشتدا کەوت. خێرا دوای ئەوتەقەیە لەکاتێکدا حەوت خەباتکارەکە لە ئەسپەبەستراوەکان نزیک دەبوونەوە، هاوکات شەش‌گوللەی دیکە تەقێندرا.

ئەسپی یەکێ لە سوارکارەکان خزی و بەسەرەوە بەئەرزیدا کەوت، یەکێکی دیکەشیان بە حیلاندنێکی ترسناکەوە کەوتە سەرئەرزی، دوایە لەنێو هەرا و هوریای خەڵکی ترساودا، گوڕە و فەرمانی ئەفسەری فەرماندە کە لە سەر ئاوزەنگی ئەسپەکەی هەستابوو و شمشێرەکەی بەسەریەوە هەڵێنابوو هاتە گوێ: «سەربازەکان وەرن ئالێرەوە!»

ئەفسەرەکە بەپشتا کەوت و بەتلاوتل کەوتە سەرئەرزی. مێشەکەرانە بوو کە بەنیشانەگیری ڕێکوپێکی نەفسەرەکەی پێکابوو، هێڵێکی باریک لەخوێنی ئەفسەرەکە بەسەر یونیفۆرمەکەیدا دەهاتە خوارێ، بەڵام ئەو بە چنگەکرێ خۆی ڕاگرتەوە و دوای ئەوەی یالی ئەسپەکەی توند بەچەنگەوە گرت و وەک شاغێیەک نەڕاندی: «ئەگەر ناتوانن ئەوشەیتانە شەلە بە زیندوویی بگرن بیکوژن، ئەوە ڕیوارزە!»

مێشەکەرانە بە هاوڕێکانی گوت: «دەمانچەیەکی دیکەم بدەنێ، خێرا! بڕۆن!» کلاوەکەی فڕێدایە سەر ئەرزی. وەختێکی زۆرچاک بوو، چونکە سەربازە توڕەکان بەشمشێری ئاوەلاوە بەرەوڕووی دەهاتن.

- چەکەکانتان دانێن، هەمووتان!

کاردینال مونتانلی لەوکاتەدا لەپڕێکدا کەوتە نێوان هەردوودەستەکەوە، یەکێ لە سەربازەکان کە ترسێکی زۆر ڕژابووە نێودەنگییەوە گوراندی:
«قوربان! ئەی خودای من دەکوژرێی!»
مونتانلی هەنگاوێکی هەڵێناوە و نزیکتر بووەوە و ڕاست ڕووبەڕووی دەمانچەکەی مێشەکەرانە ڕاوەستا.
ئێستا پێنج نەفەر لەشۆڕشگێڕەکان بەسواری ئەسپەکانیان بەرەو شەقامی بەرەوژوور دەئاژوان. مارکونیش خۆی فڕێدایە سەر پشتی ماینەکەی. لە کاتی ڕۆیشتندا، ئاوڕێکی داوە تا بزانێ ڕێبەرەکەی پێویستی بەیارمەتی نییە. ئەسپە قزڵەکەی لەبەردەستا بوو و جارێکی دیکە لەگیران و دەستبەسەری ڕزگاریان دەبوو، بەڵام هەرکە ئەوکاڤرایە هاتە بەردەمی کە عەبایەکی ئەرخەوانی لەبەردابوو، مێشەکەرانە لەپڕێکدا دەستی لەرزی و بەدەمانچەکەوە دەستی دانەواند. ئەوساتە کەمە هەموو شتێکی تێکدا. خێرا دەوری گیرا و زۆر بەتوندی فڕێدرایە سەر ئەرزی. سەربازێک بەپانایی شمشێرەکەی لەدەستی دا و دەمانچەکەی پێ فڕێدا، مارکون بەجووتلاقی لە ژێر زگی ماینەکەیدا. دەنگی سمی ئەسپی سەربازەکان لەپشت سەریەوە دەهاتە گوێی کە چوارناڵ کەوتبوونە سەری. زۆر بێبایەخ دەبوو ئەگەر ئەویش ڕاوەستایەت و بگیرایەت. کاتی تاودانی ماینەکەی کە لە سەر زینەکە ئاوڕی داوە تا دوایین گوللە بەرەو ئەوسەربازەی کە لێی نزیک ببووەوە بەڕێ بکات. مێشەکەرانەی دیت کە بەدەم و چاوێکی خوێناویەوە کەوتۆتە بەرپێی ئەسپەکان و سەربازەکان و سیخوڕەکانیش بەسەریەوە ڕاوەستابوون و هەروەها گوێی لەجنێوی زۆر پیسی سەربازەکان و سیخور و شوڤارەکان بوو کە دەنگی توورەیی و پیرۆزییان تێکەڵ بوو.
مونتانلی سەرنجی نەدایە سەر ئەوەی کە چ ڕووداوێک خوڵقاوە، لەقالدەرمەکە هاتبووە خوارێ و هەوڵی ئەدا ترس و دڵەخورپەی خەڵک دامرکێنێ. خێرا دوای ئەوەی لە سەر سەری سیخوڕەبریندارەکە ڕاوەستا، شێواندنی ئاپۆرەکە ناچاری کرد سەرهەڵێنێ. سەربازەکان لەگەڵ ئەوەی کە بە پەتێک دەستی دیلەکەیان بەستبوو لەمەیدانەکەوە دەگوزەران و دیلەکەیان

بەشوێن خۆیاندا دەکێشا. ڕوخساری مێشەکەرانە بەهۆی ئێش و ئازارەوە شین و ڕەش ببووەوە و بەباشی هەناسەی بۆ نەدەکێشرا، بەوپێیە ڕووی کردە کاردینال و بزەیەکی مانادار هاتە سەرلێوە ویشک و بێڕەنگەکانی و بەهێواشیەوە گوتی: «قوربان بۆ ئەوکارە باشەت دەستخۆشیت پێ دەڵێم.»

دوای پێنجڕۆژ مارتینی گەیشتە فورلی. لەلایەن جماوە بەپۆست بەستەیەک پروپاگەندەی چاپی پێگەیشتبوو، ڕەمز و نیشانەیەکی کە لە سەریان نووسرابوو نیشاندەری ئەوەبوو کە بە زووترین کاتی پیویست خۆی بگەیێنێتە جێگای مەبەست؛ کە بە وەبیرهێنانەوەی وتووێژەکەی ژێر کەپرەکە، خێرا هەستی بە شتێکی ناخۆش کرد. بەدرێژایی سەفەرەکەی پەیتا پەیتا بەخۆی دەگوت: «هیچ پێویست نییە کەمن وابیر بکەمەوە کە خودای نەکردە مێشەکەرانە ڕووداوێکی ناخۆشی بەسەرهاتبێ، هەروەها بەهاپێدان بەخەیاڵاتی هیچوپووچ و منداڵانەی کەسێکی تووڕە زۆر بێبایەخە، بەڵام هەتا زۆرتر دژی ئەوبیر و خەیاڵاتەی خۆی ڕادەوەستا پتر بیر و هزری سەرقاڵی ئەوفکرە دەبووەوە.

کاتێکی کە چووە واتاغەکەی جماوە گوتی: «هەستم کردووە کە چیبووە. یانی ڕیوارز گیراوە؟»

ڕۆژی پێنجشەممە لە بریزیگولا گیراوە، تا ئەوجێگایەی توانیویەتی بەربەرەکانێی کردووە فەرماندەی سوارکارەکان و سیخوڕێکی بریندار کردووە.

- بەربەرەکانێی چەکدارانە، کاری کۆتایە!

- فەرقێک ناکا، تا ئێستا زۆرجاری دیکە بە هۆی تەقە کردن بەدەمانچەوە گیانی کەوتووەتە مەترسیەوە، کە ئیتر ئەم جارەیان کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر وەزعی ئەو نابێ.

- بەڕای تۆ چی بەسەر دێنن؟

ڕەنگی ڕوخساری جما هەر بەجارێ تێکچوو: «بەڕای من ئێمە نابێ چاوەڕوانی ئەوان بین تا بزانین ئەوانە چی بەسەر دێنن و چمەبەستێکیان هەیە.»

- پێتوایە بتوانین گەلاڵەیەکی دەربازبوون و هەلاتنێکی بۆ ڕێک بخەین؟
- دەبێ ئەو کارە بکەین.
مارتینی گەڕاوە و دەستەکانی لەپشتەوە گرت و کەوتە فیتوو لێدان. جما لێیگەڕا تا ئەو بەئاسوودەیی تەواوەوە بیری لێبکاتەوە.
بێدەنگ دانیشتبوو سەری نابوو بەپشتی کورسیەکەیەوە و بێئەوەی چاوبترووکێنێ دەیڕوانییە خاڵێکی نادیار. هەرکاتێک کە ڕوخساری ئاوای لێدەهات زۆرتر وەک ماتەمینی دورێری وابوو.
مارتینی کەمێ ڕاوەستا و پرسی: «ئەوت دیت؟»
- نا، قەرار وابوو بەیانی ئەو ڕۆژە ئالێرە من ببینێت.
- بەڵێ لەبیرمە، ئێستا لەکوێیە؟
- لەقەلایە، چوارچاو ئاگایان لێیەتی و دەڵێن بەزنجیر بەستراوەتەوە.
مارتینی قەیافەیەکی بێلایەنی گرت و گوتی: «شتێکی وا نییە، برِبەندێکی باشی پێبێ، کەم و زۆر زەنجیرەکان دەبڕێ، خۆزگە بریندار نەبوایە...»
- کەمێک ئازاری پێگەیشتووە، بەلام نازانم ئازار و برینەکانی چەندەیە. بەڕای من واباشترە کە ئەووەزعە لە میکل بپرسی، ئاخەر ئەو لەکاتی گیرانیدا لەوێ بووە.
- ئەی خۆی بۆچی نەگیراوە؟ ڕیوارزی خستە نێو گڕکانی ئەوانەوە و خۆشی هەلات؟
- خەتای ئەو نەبووە. ئەویش بە قەدەر هەموویان جەنگاوە و دەستوور و فەرمانەکانی یەکبەیەک پێڕەو کردووە. دەبێ بگوترێ هەموویان بوێرانە و ئازایانە تێکۆشاون. وادیارە تەنیا کەسێک کە بەجۆرێک کار و ئەرکەکەی فەرامۆش کردووە و لەدەمە دەمەی کۆتایی ئۆپراسیۆنەکەدا هەڵەی کردووە ڕیوارز بووە. بەگشتی لەوبەینەدا خاڵێکی گوماناوی تێدایە، تاوێ ڕاوەستە میکل بانگ دەکەم.

---

٢. Durer: ئوبریخت دورێر، وێنەگەری بەنامیەی ئالمانی (٥. ٤) دامەزرێنەری شێوازی ڕئالیسم لە وێنەگەری ئالمانیدا.

جما لەژوورەکە چووە دەرێ و خێرا لەگەڵ میکل و کابرایەکی کێونشینی چوارشانە گەڕاوە: «ئەمە مارکونە  ـ نێوی ئەوت بیستووە؟  ـ یەکێ لەوقاچاخچیانەیە. هەرئێستا گەیشتووتە ئێرە. ڕەنگە بتوانێ زانیارییەکی زۆرترمان لەوبارەوە پێبدات. میکل ئەمە سزار مارتینییە کە سەبارەت بەوی قسەم لەگەڵ کردووی. پێتخۆشە سەبارەت بەو ڕووداوە و ئەوەی دیتووتە بۆی بگێڕیەوە؟»

میکل سەبارەت بە شەڕو تێک هەڵچوونەکە لەگەڵ سوارکارە چالاکەکان بڕێکی بۆ گێڕاوە و کۆی قسەکانی گەیشتە ئەوێ کە: «من ئێستاش تێناگەم کە چۆن ئاوای لێهات. ئەگەر بمانزانیایە کە ئەو دەگیرێ هیچمان ئەومان بەجێ نەدەهێشت. فەرمانەکانی ڕوون و ئاشکرا بوو و ئێمە بە بیریشمانندا نەدەهات کە ئەو دوای فڕێدانی کڵاوەکەی مەحتەل دەبێ تا دەوری بگیرێ. ئەو لەنزیک ئەسپە قزڵەکە بوو ـ بۆخۆم دیتم کە هەوساری ئەسپەکەی هەڵبڕی  ـ و خۆم بەتایبەتی پێشئەوەی کە سواری ئەسپەکەم بم دەمانچەیەکی پڕم پێدا. تاقە شتێک کە فکرم بۆی دەچێ ئەوەیە کە لەکاتی سواربووندا ـ چونکە شەل بووە ـ لاقی خزابێ، بەڵام تەنانەت لەوکاتەشدا دەیتوانی تەقە بکات.»

مارکون هاتە نێو قسەکانییەوە: «نا وانەبوو، نەیدەویست سوار بێ. من لەدوای هەموویانەوە بووم کە دەبوو بڕۆم. چونکە ماینەکەم بە هۆی تەقە کردنەکانەوە دەسڵەمیەوە، و گەڕامەوە تا بزانم کە ئایا بریندارە یان ساخ و سلامەتە. ئەگەر بە هۆی کاردینالەوە نەبوایە بێگومان بەئاسانی ڕزگاری دەبوو.»

جما ئارام و بەسەیرێکەوە گوتی: «ئاە!» و مارتینیش بەسەیرەوە دووپاتی کردەوە: «کاردینال؟»

ـ بەڵێ ئەو هاتە بەردەمانچەکەی ـ خودا لەبەینی بەرێ! پێموایە دەبێ ڕیوارز ترسابێ، چونکە ئەودەستەی کە دەمانچەکەی پێگرتبوو داینەواند و ئەودەستەی دیکەی ئاوا هەڵێنا ـ پشتی دەستی چەپی نا بەچاویەوە ـ «هەڵبەتە ئەوانیش هێرشیان بردە سەری.»

میکل گوتی: «من تێناگەم. شتی وانابێ کە ڕیوارز لەوکاتە ناسک و هەستیارەدا دڵی داخورپابێ و نەتوانێ بەسەر خۆیدا زاڵبێ.»

مارتینی گوتی: «ڕەنگە لەترسی کوشتنی پیاوێکی بێچەک دەمانچەکەی بەردابێتەوە.»

میکل شانی هەڵتەکاند: «کەسانی بێچەک نابێ لەکاتی شەڕی ئاوادا خۆیانی تێهەڵقوتێنن شەڕ شەڕە. ئەگەر ڕیوارز بیتوانیبایە بەجێگای ئەوەی وەک مشکی نێوماڵەوە بگیرێ گوللەیەکی لە مونتالی بدایەت، پیاوێکی بەشەرەف زۆرتر و قەشەیەکی مێشکویشکیش کەمتر دەبووەوە.»

ئاوڕی داوە و سمێڵی بەددان گەست. ئەوەندە تووڕە بوو خەریکبوو دەست کاتە گریان.

مارتینی گوتی: «تازە هەرچیبێ کارێکە کە کراوە و هیچ قازانجێکیشی نییە کە ئێمە کات و ساتی خۆمان بەگێڕانەوە و تاوتوێ کردنی ئەوڕووداوە بەفیڕۆ بدەین. ئەوەی کە جێگای باس و لێوردبوونەوەیە ئەوەیە کە ئێمە ڕێگایەک بۆ دەرباز کردنی بدۆزینەوە. من پێموایە ئێوە هەمووتان حازر و ئامادەن بۆ ئەوکارە خۆتان بخەنە مەترسییەوە؟» میکل ئەوەندە تووڕە و نارەحەت بوو کە نەیتوانی وەڵامیشی بداتەوە. قاچاخچییەکەش تەنیا بەزەردەخەنەیێکەوە گوتی: «ئەگەر براکەشم ئەوکارەی پێخۆش نەبێ بە یەکگوللە دەیکوژم.»

ـ زۆرباشە. هەنگاوێ هەوەڵ، ئایا ئێوە خەریتێکی ئەو قەڵایەتان لەبەردەست دایە؟

جما چەکمەجەی مێزەکەی کردەوە. دوو سێ کاغەزی دەرهێنا: «من هەموو نەخشەکانم کێشاوەتەوە ئێرە قاتی ژێرەوەی قەڵاکەیە، ئەمانەش قاتی یەک و دووی برجەکانن، ئەمەش خەریتی یاساوڵ و قەروڵەکانە. ئەم شەقامانە دەگەنە ناو ئەودوڵ و دەڕانە. ئەمانەش ئەوکوێرە ڕێگایانەیە و حەشارگەکانی چیاکان و ڕێڕەوی ژێرزەمینەکەیە.»

ـ دەزانی کە ئەو لە کامیەک لەوبرجانەدا ڕاگیراوە؟

- برجی ڕۆژهەلات، لە ژوورێکی خڕ کە دووسێ پەنجەرەی ئاسنی تێدایە بەمیلەئاسنی قایمی ئاسنینەوە. لە سەر خەریتەکە دەست نیشانم کردووە.
- ئەم زانیاریانەت چۆن بەدەستهێناوە؟
- لەلایەن پیاوێکەوە کە پێی دەڵێن «سیسرک» سەربازێکی گاردە، ئەو ئامۆزای جیسمرە یەکێک لەئەندامانی ئێوەیە.
- لەم بارەوە کارێکی خێرا و باشت کردووە.
- هەل و دەرفەتێکی وامان نییە کە بەفیڕۆ بڕوات. جینو خێرا چوو بۆ بریزیگولا، کەمێک لەم خەریتانەمان لەوەپێش هەربوو. لیستەی حەشارگەکانیش لەلایەن ڕیوارزەوە لەوەپێش جێبەجێ کرابوون. دەستنووسەکە پێمان نیشان دەدا کە کاری ئەوە.
- سەربازە گاردەکان چۆن کەسایەتییێکن؟
- لەم بارەوە زانیاری باشمان نییە. «سیسرک» تازە هاتووەتە ئەم قەلایەوە و هێشتا زانیارییێکی زۆری لە سەر ئەو سەربازانە نییە.
- دەبێ لە جینو بپرسم کە سیسرک بۆخۆی چۆناوچۆنە. هیچ زانیارییێکتان سەبارەت بەوە نییە کە حکومەت بەتەمایە چیبکا؟ ئایا دەیانەوێ ڕیوارز لە بریزیگولا محاکمە بکرێ یان دەیبەن بۆ ڕاونا؟
- نازانم. هەڵبەتە ڕاونا شارێکی گەورەی پارێزگارییە و بەپێی یاسا تەنیا دۆسیە گەورە و هەندەکان لەودادگا گشتیەدا بەڕێوە دەبرێ، بەلام لەپارێزگا چوارینەکان یاسا بایەخێکی وای نییە و بەستراوەتەوە بەدەسەلاتی ئەوکەسانەوە کە لەو پارێزگایانەدا ئیش دەکەن.
میکل هاتە نێوقسەکانەوە: «ئەو نابەن بۆ ڕاونا؟»
- لەبەر چ هۆیەک وابیر دەکەیتەوە؟
- تەواو دڵنیام. سەرهەنگ فێراری٤، فەرماندەی لەشکری بریزیگولا مامی ئەوئەفسەرەیە کە بەدەستی ڕیوارز بریندار بووە. ئەو وەک وشتر حەیوانێکی

---

٣. چوار پارێزگای خودموختار و ئۆتۆنۆمی کە لەلایەن نوێنەرانی پاپەوە بەڕێوە دەبرێ.
٤.Ferrari

قینلەزەگە و لە هەردەرفەتێک و هەلێک کەڵک وەردەگرێ تا لەدوژمنی خۆی تۆڵە بکاتەوە.

«بەڕای تۆ ئەو هەوڵئەدا کە ڕیوارز لێرە بهێڵێتەوە؟»

- بەڕای من ئەو هەوڵ ئەدا کە ڕیوارز ئێعدام کەن.

مارتینی خێرا چاوێکی لە جما کرد، جما ڕەنگی تەواو پەڕیبوو، بەڵام ڕوخساری بەمەوشانە لەوەزیاتر نەگۆڕدرا. وادیاربوو ئەم بۆچوونە لەلای ئەو شتێکی سەیر و تازە نەبوو

بەئارامیەوە گوتی: «بەبێ تێپەڕ کردنی تەشریفاتی ئیداری ناتوانێ بەئاسانی ئەوکارە بکات، بەڵام ڕەنگە بتوانێت بە بیانووێکەوە دادگایێکی لەشکری پێکبێنێ و دوایە بەپێی ئەوەی کە بڵێ ئاسایشی شار پێویستی بەو کارەیە کارەکەی خۆی باش و شیاو نیشان بدات.»

- لەوبەینەدا کاردینال چی دەتوانێ بکات؟ ئەوڕازی دەبێ کە کارێکی وابکرێت؟

- ئەو ناتوانێ دەست لەکاروباری لەشکری وەردات.

-- نا، ناتوانێ، بەڵام لەوێ دەستی زۆر دڕوا، بێگومان قایمەقام بەبێڕەزامەندی ئەو هەنگاوێک هەڵناهێنێتەوە.

مارکون قسەکەی ئەوی بڕی: «قەت ناتوانێ ئەو ڕازی بکات. مونتانلی هەمیشە بەرهەڵستکار و دژی دادگای لەشکری و هەرجۆرە کارێکی هاوشێوەیە. ئەگەر ڕیوارز لە بریزیگولا بمێنێتەوە هیچ ڕووداوێکی ناخۆشی لێناکەوێتەوە. مونتانلی هەمیشە لایەنی دیلی گرتووە. ئەوەی کە من لێی دەترسم بردنی ئەو بۆ ڕاونایە. ئەگەر بێتو بگاتە ئەوێ ئیتر نایبینینەوە.»

میکل گوتی: «ئێمە ناهێڵین بیبەن بۆئەوێ. دەتوانین کارێک بکەین کە لەڕێگادا ڕزگاری بکەین، بەڵام هێنانەدەرەوەی ئەو لەوقەڵایەدا کوسپێکی دیکەیە.»

جما گوتی: «بەڕای من ئەگەر بەهیوای ئەوە دانیشین تا بیبەن بۆ ڕاونا کارێکی بێئاکام و خۆڕاییە. ئێمە دەبێ هەوڵ و کۆششی خۆمان لە بریزیگولادا وەگەڕ بخەین. زۆرکەمیش وەخت و مەودامان هەیە. سزار

واباشتره من و تۆ خەریتی قەلاکە تاوتوێ بکەین و بزانین ئایا دەتوانین ڕێگا چارەیەک بدۆزینەوە. من گەلالەیەکم لەزەین‌دایە، بەلام شتێک هەیە کە من لێی‌حالّی نیم و تێی‌ناگەم.»

میکل هەستا سەرپێ و گوتی: «مارکون وەرە، ئێمە با ئەوان بەجێ‌بێڵین تا لە سەر گەلالّەکەیان بەجوانی بیر بکەنەوە. پاش‌نیوەڕۆی ئەمڕۆکە دەبێ بچم بۆ فونیانۆ و پێمخۆشە کە تۆش لەگەلّمدا بێی. وینجێنزو فیشەکەکانی ناردووە. دەبوو دوێنێ ئەوفیشەکانە بگەیشتایەنە ئێرە.»

پاش ڕۆیشتنی ئەو دووپیاوە، مارتینی چووە لای جما و بەبێدەنگی دەستی بردەپێشێ. جما بۆ ساتێک قامکەکانی خۆی لەنێو دەستی مارتینی‌دا هێشتەوە و ئاخرەکەی گوتی: «سزار تۆ هەمیشە دۆستێکی باش و ئامادە بووی کە لەهەموو کێشە و کوسپەکانی ژیانمدا یاریدەم بدەی ئێستا وەرە با لە سەر ئەونەخشە و خەریتانە قسە بکەین و تێ فکرین.»

## ٣

- من جارێکی دیکەش بەڕێز مونتانلی ئاگادار دەکەمەوە کە ناڕازی‌بوونی ئەو ئاسایشی شار دەخاتە مەترسیەوە.

قایمەقام هەوڵی ئەدا شێوەی بەیانی ئارام و سەنگین بێ و شایانی کەسایەتییەکی بەڕێزی کلیسا بێت، بەڵام تووڕەییەکی ئاشکرا لەدەنگیدا بەدی دەکرا. جەرگ و هەناوی بەباشی کاری نەدەکرد. ژنەکەی زۆری قەرزدار کردبوو. هەڵسوکەوت و ئەخلاقیشی بەدرێژایی ئەوسێ حەوتەیە زۆرخراپ ببوو. جەماوەرێکی تووڕە و ناڕازی کە سروشتی تووڕە و مەترسیداربوونی ئەوان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زۆرتر ئاشکرا دەبێ، ناوچەیەکی پڕاوپڕ لەدژ کردەوە و حەشارگەی زۆری تەقەمەنی، کە تەنیا بنکەیەکی سەربازی کە لەوەفاداربوونی ئەوانیش‌دا دەبێ شک و گومانت هەبێ و کاردینالێک کە بە هۆی دڵسۆزیەوە نێوی «پەیکەرەی دوژمنی پاقژیان» لە سەر دانابوو. ئەوانە ئەوکێشانە بوون کە قایمەقام بۆ سەربازە بەردەستەکەی خۆی باسي کردبوو. کە هەموو ئەوانە ، ماندوو و شەکەتیان کردبوو. ئێستاش ئەوە بەرپرسیارەتی مێشەکەرانە. کە نیشاندەری ڕۆحێکی سەرکێش و سەرەڕۆ بوو کە کەوتبووە سەرشانی.

مێشەکەرانە دوای زامدارکردنی برازای خۆشەویستی قایمەقام و باشترین سیخوڕەکانی ئەو. ئەم «شەیتانە کارپیسە ئیسپانیاییە» دوای ئەو هەڵا و هەنگامەیەی بازاڕ و فریودانی پاسەوانەکان، تووڕەبوون و بە گژدا چوون دژ بە ئەفسەرانی لێکۆڵێنەر و «تێکدانی باری ئاسایشی گرتووخانە بە هەرا و هوریا»و

بە بێ هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەک دژبەری ئەوان ڕادەوەستا . ئێستا سێ‌حەوتە بوو کە لەوقەڵایەدا دەس‌بەسەر بوو و بەرپرسانی بریزیگولا بەدڵ لەکردەوەی خۆیان نارازی بوون. چەندین‌جار لێ‌پرسینەوەیان لەگەڵ کردبوو، بەڵام دوای ئەوەی کە دەیانهێنا بۆ پێلێنان، هیچیان دەس‌نەدەکەوت. بەهەڕەشە و گوڕەشە و بەتووڕەیی و بەفێڵ و تەڵەکە و بەزمانی خۆش و هەرشتێکی کە بەئەقڵیان دەگەیشت لە سەر ئەو تاقیان دەکردەوە، بەڵام مێشەکەرانە دیسانەوە بەقەدەر ڕۆژی هەوەڵ ئاقڵتر و قورس و قایمتر ڕادەوەستا.

وردەوردە هاتبوونە سەر ئەوڕایە کە ڕەنگە واباشتر بووایە خێرا وبێ ڕاوەستان بیاناردایە بۆ ڕاونا، بەڵام بۆ ڕاست کردنەوەی هەڵەکانیان زۆر درەنگ‌بوو. قایمەقام کاتێ ڕاپۆرتی گیرانەکەی بۆ نوێنەری پاپ نارد، وەک ڕێزلێ‌نانێک داوای کردبوو بۆخێرا جێ‌بەجێ کردنی ئەوکارە ئیزنی بدەن بۆخۆی بە تایبەتی بەسەر ئەو دۆسیەدا ڕابگا. ئەوانیش بە ڕێزێکی تایبەتییەوە ڕازی بوونی خۆیان لە سەر داواکاریەکەی ڕاگەیاند،هەر بۆیە ئێستا دەبوو ڕاشکاوانە ، لە مەڕ ئەو دۆسیە شکستی خۆی ڕابگەیاندایە جا دوایە پاشەکشێی بکردایە.

ئەوکات کە جما و میکل پێش‌بینی ئەوکارەیان کردبوو. بۆیە قایمەقام تاقە چارەی ئەوکارەیان لەدروست کردنی دادگاییەکی سەربازی‌دا دەدۆزیەوە. کاردینال هەرکە بە توندی ئەو ڕێگاچارەیەی ڕەد کردەوە، تووڕەییەکەی گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. قایمەقام گوتی: «بەڕای من ئەگەر بەڕێزتان بتانزانیایە کە ئێمە چ‌دەرد و ئازارێکمان لەدەستی ئەو کێشتووە، لەوبارەوە بیروڕاتان دەگوڕا. من لەدژ کردەوەی ئێوە دەگەم سەبارەت بە ناحەزی و نالەباری کاری دادگا و لێ‌پرسینەوە و ڕێزبۆ بیروڕای بەڕێزتان دادەنێم، بەڵام ئەمە شتێکی تایبەتییە و دەبێ یاسا و دادگاییەکی تایبەتی هەبێ.» ؛

مونتانلی وەڵامی داوە: «هیچ شتێکی تایبەتیمان نییە کە ببێتە هۆی ئەوەی‌کە بێ‌عەداڵەتی لە سەری بەکار ببردرێ. دادگاییکردن و مەحکوومکردنی کەسێکی ئاسایی و ناسەربازی لە ژێر دادوەری دادگایەکی نهێنی لەشکری‌دا، بێ‌عەداڵەتیە و دژە یاسایە.»

- قوربان کێشەکە ئاوایە: ئەم زیندانییە بەئاشکرا چەندین تاوان و کردەوەی خراپ و جەنایەتی گەورەی ئەنجام داوە. لەهەڵمەتبردنە سەر ساوینیۆدا بەشدار بووە و ئەگەر ئەودەم نەیتوانیایێ هەڵێ بۆ توسکانی. دادگای لەشکری کە لەلایەن سینیور سپینولاوە پێیسپێردرابوو ئەگەر بیگرتایەت بێشک یان دەیکوشت یان دەکەوتە بەرقەمچی و لێدان و زەبر و زەنگ. لەودەمەوە تا ئێستا دەستی لەدژ کردەوەی ناجوامێرانەی خۆی هەڵنەگرتووە. دەگوترێ کە ئەوئەندامی کارای گرووپێکی ترسناکی نهێنی وڵاتە. شک و گومانی ئەوەی لە سەرە کە لانیکەم سێنەفەر لەئەندامانی پۆلیسی نهێنی کوشتوە یان فەرمانی ئەوکوشتنانەی داوە. بەگشتی دەتوانین بڵێین کە لەکاتی قاچاخی چەک و تەقەمەنی بۆ پارێزگادا دەسبەسەر کراوە. بەرپرسانی ناچار کردووە کە ڕووبەڕووی بەربەرەکانییەکی چەکدارانە ببنەوە و دوو کارمەندیشی لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا بەتوندی بریندار کردووە و ئێستاش بۆ هێوربوونەوە وئاسایشی شار مەترسییەکی دایمی بەحیساب دێت. هەربۆیە دادگاییەکی لەشکری زۆر پێویستە.»

مونتانلی وەڵامی داوە: «ئەم کابرایە هەرتاوانێکی کە کردبێتی دیسانەوە مافی خۆیەتی کە لە ژێر سێبەری یاسادا دادگایی بکرێ.»

- قوربان دادگا و یاسای ئاسایی و گشتی زەمانێکی درێژخایەنی دەوێ و لەم بەینەدا هەرچرکەیەک بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە. دوای ئەوە من ترسی هەڵاتنی ئەوم هەمیشە لەبەرچاوە.

- ئەگەر مەترسییەکی ئاوا لەئارادایە، ئەرکی سەرشانی ئێوەیە کە بەوریاییەکی زۆرترەوە ئاگاداریی لێبکەن.

- قوربان، من هەموو هەوڵ و کۆششی خۆم بەکار دێنم تەواو پشت ئەستووری کادری گرتووخانەم .بەڵام وادیارە ئەم کابرایە هەموویانی بە سێحر و جادووی خۆیفریو داوە. لەو سێحەوتەیەدا چوارجار پاسەوان و یاساوڵەکانمان گۆڕیوە. ئەوەندەم ئەوسەربازانە تەمێ کردووە کە ئیتر وەڕەز بووم. هەمووی ئەوانە بێئاکامە. من ناتوانم پێشي ئەو نامە بردن و نامە

هێنانە بگرم ئەو بێئەقڵانە ئاشقی ئەون، هەردەڵێی ژنە و بەدەوریدا هەڵدەخولێن.

- زۆرسەیرە، دەبێ تایبەتمەندییەکی زۆر تایبەتی هەبێ.

- شەیتانێکە و لەوێ دانراوە - بمبوورە قوربان، بەڵام بەڕاستی ئەم پیاوە توانایییەکی سەیری هەیە لە تێکشکاندنی بیروباوەڕێکی پیرۆزی ئایینی. باوەڕ کردنی ئەوشتە تۆزێ قورسە و قەبووڵ کردنی ئەو ئەرکە خۆش نییە، بەڵام ناچاربووم کە بەتایبەتی لێپرسینەوەی بگرمە ئەستۆ چونکە ئەفسەری ئەوکارە ئیتر نەیتوانی خۆی ڕاگرێ - بۆچی؟ قوربان باسکردنی ئاسان نییە، بەڵام ئەگەر تاقەجارێک بیستبایەت کە چۆن قسە دەکات لێتحاڵی دەبوو. ئینسان وا دەزانێ کە ئەفسەرەکە تاوانبارە و ئەو دادوەرە.

- بەڵام ئەودەبێ چ کردەوە و تاوانێکی ترسناکی کردبێ؟ هەڵبەتە دەتوانێ کە وەڵامی پرسیارەکانی ئێوە نەداتەوە، بەڵام تاقە چەکی بەربەرەکانێی ئەو بێدەنگ بوونە.

- زمانێکی وەکوو خەنجەریش. قوربان هەموومان ڕۆژێک دەمرین، هەمووشمان بەدرێژایی تەمەنمان هەڵە و تاوانمان بووە. کە نامانەوێ دنیای لێئاگادار بێ. ئەمە تایبەتمەندی سروشتی مرۆڤایەتیە و بۆ پیاوێکیش زۆر قورس و ناخۆشە کە هەڵە و تاوانی زۆر چکۆلەی ئەو کە لەبیستساڵ لەوەپێشەوە ئەنجام دراوە لەپڕێکدا لە دەهۆڵی ئاشکرابوون بدرێ...

- ئایا ڕیوارز نهێنییە تایبەتیەکانی یەکێ لەئەفسەرەکانی کە لێپرسینەوەیان بەعودەیە ئاشکرا کردووە؟

- یانی - لەڕاستیدا - لاوێکی بێچارە کاتێ کە ئەفسەری سوارکاری لەشکری بووە بە هۆی قەرزداربوونییەوە لە پارە و سەرمایەی هەنگ و لەشکر بڕێک پارەی بەقەرز هەڵگرت...

- لەڕاستیدا پارەی نەتەوە و وڵاتێک کە بەویان سپاردبوو دزی؟

- قوربان،هەڵبەت ئەمە کارێکی زۆر ناشیرین بوو، بەڵام هاوڕێکاني خێرا پارەکەیان بەجێگای ئەو داوە و دەرخونەیەکی بێدەنگیشیان لە سەردانا - ئەو لەبنەماڵەیەکی بەڕێزە - لەوکاتەوە هەرگۆشەگیرە. ڕیوارز چۆن توانیویەتی

ئەو ڕاز و نهێنییە بدۆزیتەوە، لەزەینی مندا ناگونجێ، بەڵام هەوەڵین کاری ڕیوارز لە لێکۆڵینەوەدا ئاشکرا کردنی نهێنی ئەوئەفسەرە بووە ـ ئەویش لەلای ئەفسەری ژێردەستی خۆی! ـ ئەوەندە بەئارامی و بەڕوخسارێکی پاکەوە بەیانی کرد کە دەتگوت دوعا دەکات! بێگومان ئێستا ئەم هەواڵە لە سەرتاسەری پارێزگادا بڵاو بووەتەوە. قوربان بۆخۆتان تاقەجارێک لەو لێپرسینەوەیەدا بوایەن بە دڵنیاییەوە ڕازی دەبوون ـ ئەوەشی ناوێ کە ئەو لەپێش‌دا لەهاتنی ئێوە ئاگادار بێ، ڕەنگە قسەکانی ئەو لە...

مونتانلی گەڕاوە ڕوخساری تێکنا و لە قایمەقام مۆڕ بووەوە: «من تەنیا نوێنەرێکی ئایینیم، نە وەک سیخوڕێکی پۆلیس، گوێقوڵاخ‌ویستان ئەرک و ئیشی من نییە.»

ـ من، خودای نەکردە بەتەمای سووکایەتیکردن نەبووم...

ـ پێم‌وابێ لەوە زیاتر لەم بارەوە ئیتر با نەدوێین چونکە هیچ ئاکام و قازانجێکی نییە. ئەگەر ئەوزیندانییە بێنن بۆ ئێرە قسەی لەگەڵ دەکەم.

ـ سەرەڕای ڕێزیکی تایبەتی کە بۆ جەنابتانم هەیە، داوات لێدەکەم کە ئەوکارە مەکە. بەگشتی دەبێ بگوترێ کە ئەم پیاوە نایەتە سەرڕێی چاکە. پێش‌ئەوەی کە کردەوەیەکی دزێوی دیکە ئەنجام بدات، با پێ لە سەر سنگی یاسا دانێین ئەگەر بۆ تاقەجارێکیش بێ. تا بە یەکجارەکی لەدەستی ئاسوودەبین. ئەمە باشترین و ئاقڵانەترین ڕێگایە. ئەوی کە جەنابتان فەرموتان وێڕای ڕێزێکی تایبەتی لە سەر ئەوقسەیە پێدادەگرم، بەڵام لەوەش زیاتر، من لە بەرابەر منێسینیور نوێنەری پاپادا لە سەر ئاسایشی شار بەرپرسیارم...

مونتانلی قسەکەی بڕی: «منیش لە بەرانبەر خوداوەند و پاپدا بەرپرسیارم کە نابێ لەناوچەی ژێردەسالاتی ئۆسقوفی مندا بەنهێنی کارێک بکرێت. سەرهەنگ! چونکە لە سەر ئەوبابەتە من دەخەیتە ژێرگوشار و گێژەنەوە. منیش ناچارم بۆ ئەوکارە لەپلە و پایەی کاردینالی خۆم کەڵک وەرگرم و لە سەری سووربم. من ناهێڵم لەکاتی ئاشتیدا لەم شارەدا بەنهێنی

دادگایەکی لەشکری پێکبێ. سبەینێ کاتژمێری دەی بەیانی زیندانییەکە بەتەنیایی لێرە دەبێ و من لەگەڵیدا دەدوێم.»

قایمەقام بەڕێزێکی ڕووتاڵانەوە وەڵامی داوە: «هەرچونێک کە ئێوە پێتان خۆشە قوربان.» لەکاتێکدا کە بەدەم بۆڵەبۆڵەوە دەچووە دەرێ لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «لە سەرەڕۆییدا هەردووکیان وەک یەک وان.»

سەبارەت بە دیداری داهاتووی لەگەڵ کەس قسەی نەکرد. تا ئەوەی بە کردەوە کاتی کردنەوەی زەنجیری پێی زیندانییەکە و ڕۆیشتن بەرەو کۆشک گەیشت.

هەروا کە بە برازا بریندارەکەی خۆی گوتبوو، تەنیا شتێک کە پێویست بوو ئەوەبوو کە ئەم جاشکەکەرە نائینسانە ڕازیبێت تا یاسا بخەینە پشتگوێ، تا پیلانی سەربازەکان و ڕیوارز و دۆستەکانی بۆ دربازکردنی ڕیوارز پووچەڵ بکەینەوە.

کاتێ کە مێشەکەرانە بەچاوەدێرییەکی زۆرەوە بردیانە ئەوژوورەی کە مونتانلی لەپشت مێزێکی پڕلەنامە دانیشتبوو خەریکی نووسین بوو. لەپڕێکدا بیرەوەری نیوەڕۆیەکی نێوەڕاست مانگی هاوینی بیر کەوتەوە، ئەوکات کە ئەو ڕاست لە نووسینگەیەکی هاوشێوەی ئێستادا دانیشتبوو خەریکی ئەم بارە و بارکردنی کاروو سە دەستنووسەکان بوو. پەردەکڕکڕەییەکان ڕاست وەک ئێرە بۆئەوەی گەرما نەیەتە ژوورێ بەسترابوون و دەنگی میوەفرۆشێک لەدەرەوە دەهاتە گوێ: «فراگولا! فراگولا قژی سەری لە سەر چاو و هەنییەی لادا و زەردەخەنەیەک هاتە سەرلێوی.

مونتانلی سەری لە سەر نامە و برووسکەکان هەڵێنا.

بە یاساوڵەکانی گوت: «ئێوە دەتوانن لەڕاڕەوەکە چاوەڕوان بن.»

سەرپەلەکە (گروهبان) بەئارامی و بە نیگەرانییەکی ئاشکراوە گوتی: «ببورە قوربان سەرهەنگ ڕای وایە کە ئەم دیلە مەترسیدارە واباشترە کە...»

مونتانلی چاوی لێزەق کردەوە.

---

١. ئاماژەیەکە بە چیرۆکی کەرێک کە بە زمانی مرۆڤایەتی و ئینسانی خاوەنەکەی سەرکۆنە دەکات (لە کتێبی پیرۆز واتا ئینجیل وەرگیراوە.)

ئارام دووپاتی کردەوە: «ئێوە دەتوانن لەڕێڕەوەکەدا چاوەڕوان بن.»
سەرپەلەکە دوای ئەوەی کە ڕوخساری ترسی تێڕژابوو سلاوێکی لەشکری کرد و بەترسێکەوە داوای لێبووردنی کرد. لەگەڵ سەربازەکانی چوونە دەرەوە.
کاتێ کە درگاکە بەسترا کاردینال گوتی: «تکایە دانیشە» مێشەکەرانە بەبێدەنگی بەقسەی کرد.
مونتانلی پاش کەمێ بێدەنگی گوتی: «سینیور ڕیوارز من پێمخۆشە پرسیارگەلێکت لێبکەم. زۆرت سوپاس دەکەم ئەگەر وەلامم بدەیتەوە.»
مێشەکەرانە بە بزەیەکەوە گوتی: «گـ ـ گـ ـ گەورەترین کێشە و کۆسپی ئێستای من ئەوەیە کە لـ لـ لە ژێر تەوژمی پرسیاردام.»
ـ وەلامیشیان کە نادەیتەوە؟ وامبیستووە، بەلام ئەوپرسیارانە لەلایەن ئەوکەسانەوە دەکرێن کە بەرپرسی دۆسیەکەی تۆن و کار و ئەرکیان ئەوەیە کە لەوەلامەکانی تۆ وەک بەڵگە و دکومێنتێک دژی خۆت کەڵکی لێوەرگرن.
ـ ئەی پرسیارەکانی جەنابت؟
لەشێوەی بەیانی‌دا بێجگە لەوشە و ڕستە سووکایەتیشی تێدا بەدی دەکرا. کاردینال خێرا تێگەیشت، بەلام ڕوخساری هەروا دلۆڤان و پڕلەڕەحم بوو:
ـ پرسیارەکانی من، وەلامیان پێبدەیتەوە یان هەروا بێوەلام بمێنەوە هەر لەبەین خۆم و خۆتدا دەمێنێتەوە. ئەگەر پرسیارەکان باڵی کێشایە سەرکار و تێکۆشانی سیاسی تۆ، بێشک دەتوانی وەلامی نەدەیتەوە! بەلام جیا لەوانە ئەگەر پێت‌خۆش‌بێ و پیاوەتی بکەی هیوادارم کە وەلامیان بدەیتەوە. ئەگەرچی ئێمە سەبارەت بە یەکتری نامۆ و بێگانەین.
ـ من تـ ـ تـ ـ تەواو لەئیختیاری جەنابتدام.
ئەم ڕەستەیەی بەکەمێ سەردانەواند و ڕوخسارێکی ئارامەوە بەیان کرد کە مرۆڤی وا لێدەکرد تا لەکچانی بیتاریش داوای بەش بکات.
ـ لەپێش هەمووشتێک‌دا دەڵێن کە تۆ بەقاچاخی ، چەک و تەقەمەنی دێنیتە ئەم ناوچەیەوە. بۆ چ کارێک کەڵکیان لێوەردەگیرێ؟
ـ بۆکـ ـ کـ ـ کوشتنی خۆفرۆشەکان.

---

٢. کەسایەتییەکە لەکتێبی پیرۆزدا. لێرەدا مەبەست لەمرۆڤانی چاوپیس و نیەت‌ناپاکە.

ـ وەڵامێکی ترسناکە. ئەگەر تەواوی هاوڕێیانی ئێوە نەیانەوێ وەکوو تۆ بیربکەنەوە، لەلای ئێوە خۆفرۆشن؟

ـ ب ـ ب ـ بڕێکیان.

مونتانلی لە سەر کورسیەکەی پاڵی داوە و قەدەرێک بەبێدەنگییەوە لێی ڕووانی.

لەپڕێکدا پرسی: «سەر دەستان چی لێهاتووە؟»

مێشەکەرانە چاوێکی لەدەستی چەپی خۆی کرد: «جـ ـ جـ ـ جێی کەڵپەی خۆفرۆشەکانە.»

ـ ببوورە، ئەودەستەی دیکەت دەڵێم، دەڵێی برینێکی تازەیە.

دەستی ڕاستی لاواز و باریکەڵە بوو و بەشێوەیەکی زۆر خراپ هەڵدڕابوو و قەتماخەی بەستبوو.

مێشەکەرانە ئەودەستەی هەڵێنا، مەچەکی ماسیبوو. برینێکی گەورەی شین و ڕەش بۆەوەی لە سەر بوو.

ـ هەروەکوو بۆخۆت دەیبینی، شتێکی زۆر بێبایەخە. ئەو ڕۆژەی کە گیرام ـ ئەویش لەسایەی سەری جەنابتانەوە (بەڕێزەوە سەری دانەواند) یەکێک لە سەربازەکان لەقەی لێدا.

مونتانلی مەچەکی گرت و بەجوانی لێی ڕووانی، پرسی: «چۆن دوای سێحەوتە ئاوای لێهاتووە؟ دەبێ هەموو دەوروبەری گفەگفی بێ.»

ـ ڕەنگە گوشینی کەلەبچەکەی زۆر پێخۆش نەبووبێ.

کاردینال بەڕووتاڵییەکەوە سەری هەڵێنا: «چۆن کەلەبچەیان لە سەر برینێکی ئاوا تازە داوە؟»

ـ قوربان ئەوە سروشتییە، برینەتازەکان هەر بەکار ئەوەدێن، ئەوە، برینە کۆنەکانە کە هیچ بایەخێکیان نییە. ئەوانە تەنیا کەمێک ژان دەکەن، تۆ نـ ـ نـ ـ ناتوانی لەو برینە کۆنانە ئێش و ئازارێکی زۆریان لێ پەیداکەی.

مونتانلی دیسانەوە بەوردی لێی ڕووانی ، دوایە هەستا سەرپێ و سندووقێکی کە پڕ لەکەرەسەی پزشکی بوو کردەوە و گوتی: «دەستت بێنە پێشێ.»

مێشەکەرانە بەڕوخسارێکی وەک ئاسنی کوتراو دەستی بردە پێشێ و مونتانلیش دوای ئەوەی کە دەوروبەری برینەکەی شتەوە ،بەئارامی بەکەرەسەی پێویست بەستی ـ وادیاربوو لەوکارەدا شارەزا بوو.

ـ سەبارەت بەو کۆت و زنجیرانەش قسەیان لەگەڵ دەکەم. ئێستاش دەمهەوێ پرسیارێکی دیکەت لێبکەم: بەتەمای چ بکەی؟

ـ قوربان، وەڵامەکەی ڕوون و ئاشکرایە، ئەگەر توانیم هەڵدێم و ئەگەریش نەمتوانی ئەوە دەمرم.

ـ بۆ دەبێ بمری؟

ـ چوونکە ئەگەر قایمەقام نەتوانێ بمکوژێ، دەمنێرن تا بکەومە ژێر ئەشکەنجە و ئەمەش بەلای منەوە هەردوو وەکیەکوان. من ئەوەندە لەشساخ و تەندروست نیم کە لە ژێر ئەشکەنجەدا بە سلامەتی ڕۆح دەربەرم.

مونتانلی ئانیشکی نایە سەرمێزەکە و بێدەنگ کەوتە فکرەوە، مێشەکەرانە لێی تێکنەدا. چاوەکانی چکۆلە کردبووەوە و پاڵی دابووەوە و دڵخۆش بوو بەوەی کە لەبەندی زنجیر ڕزگاری بووە.

مونتانلی دیسانەوە درێژەی پێدا: «گریمان کە توانیت هەڵێی، ئەی ژیانت چۆن ڕادەبوێری؟»

ـ قەدەرێک لەوەپێش بەجەنابتم کوت، خۆفرۆشەکان دەکوژم.

ـ خۆفرۆشەکان دەکوژیت. یانی ئەگەر من بمهێشتایەت کە لێرەوە هەڵێی ـ گریمان کە تواناییەکی ئاوام هەبێ ـ ئازادیی خۆت لەڕێگای هێرش و خوێنڕشتندا خەرج دەکرد، نەوەک لەڕێگای نەهێشتنی شەڕاژۆییدا؟

مێشەکەرانە چاوێکی لەخاچی سەردیوارەکە کرد: «نەک ئاشتی، بەڵکوو شمشێر- لانیکەم خۆ دەبێ هاودەمێکی باشم هەبێ. هەرچەندە من بەنۆرەی خۆم دەمانچەم لەشمشێر پێباشترە.»

مونتانلی، بێئەوەی بشەمزێ وتی: «سینیور ڕیوارز من تا ئێستا ئیهانەیەکم بە ئێوە نە کردووە و هیچ سووکایەتییەکیشم نە بەبیروڕا و نە

---

٣. وتەی عیسا وەرگێراو لەئینجیل.

بەهاوڕێیانتـان نـەکردووە. ئایا منیش نـابێ هـەر بـەو شـێوەیە چـاوەڕوانـی هـەڵسوکـەوتێکی ئـەخلاقـی بـاش بـم لـەلایـەن تـۆوە ، یـان پێتخۆشـە وابیـر بکەمەوە کە کافرێک ناتوانێ لەخۆبردوو و مەزن بێت؟»

ـ ئاه من تـ ـ تـ ـ تەواو لەبیرم چووبووەوە. کە بەڕێزتان چاکە و کـردەوەی چاکەتان لە چڵەپۆپەی ئـەرکـەکانی پیرۆزی مـەسیحییەت داناوە. لـەفلـوڕانس گوێم لەکارووسی ئیوە بوو. کە سـەبـارەت بـە شـرۆڤـەی مـن لـەگـەڵ داکۆکی کارە نەناسراوەکە کردبووتان.

ـ ئەمە یەکێ لەو تەوەرانـە بـوو کـە دەمویـست لـە بـارەیـەوە قـسەت لـەگـەڵ کەم. ئەگەر دەکرێ تکایە پێمبڵێ هۆی ڕق و بێزاری تۆ سەبارەت بەمن لەبـەر چییە؟ ئەگەر ئەمنت وەک ئامانجێکی باش هەڵبژاردووە، شتێکیترە، شـێوازی بـاسوخواسـی ڕامیـاری تـۆ پێوەنـدی بـەخۆتـەوە هـەیـە و بـاسێکی جیـاوازە و ئێستە ئێمـە سـەبـارەت بـەسیاسـت قـسە نـاکـەیـن، بـەڵام لـەوکاتـەدا وامهـەسـت دەکرد کە تۆ زۆرت ڕق و نفرەت لە منە. ئەگەر وابێ پێمخۆشە بزانم کە ئایـا قەدبووە سەبارەت بەتۆ تاوانێک یان هـەڵـەیـەکم کـردبێ یـان بـوومـەتـە هـۆی داگیرسانی هەستێکی ئاوا؟

بڵـەی سـەبـارەت بـە ئـەو هـەڵـەیـەکی کـردبێ! مێشەکـەرانـە دەسـتـەدەرمـان کراوەکەی نا بەملی خۆیەوە و بەپێکەنینەوە گوتی: «من دەبێ زەینی جەنابتان بەرەولای شکسپێر ڕاکێشم٤. ئەمـە وەک چیرۆکـی ئـەوپیـاوە وایـە کـە نـایـەوێ پشیلەیەکی بێئازار و پێویستی لە لابێ. من لـەقـەشـە بێـزارم، دیتنـی عـەبـایـەک توورەییم هەڵدایبیسێنێ.»

ـ ئەگەر تەنیا لەبەر ئەوەیە...

مونتـانلی خـۆی لـێ نـەبـان کـرد و قـسەکـەی ئـەوی بـڕی و درێـژەی پێـدا: «بەڵام سەرەڕای ئەوە جنێودان شتێک و ئاوەژوو کردنـی بابـەتێکیش شـتێکی دیکەیە. ئەو کـات کـە لـە وەڵامـی کاروسـەکـەی منـدا گـوتبـوت کـە گـوایـە مـن نووسەرە نەناسراوەکە دەناسم. هەڵەیەکی گەورەت کردبوو، هەڵبەت من نـاڵێم کە تۆ بەئانقەست درۆت کردووە. شتێکت گوتووە کە دوور لـەڕاستیە. من تـا

٤. بازرگانی ڤینیزی، پەردەی چوارەم، بەشی هەوەل.

ئێستاش ئەوکەسەم نەناسیوە. مێشەکەرانە سەری بۆلایەک وەرسووڕاند. وەکوو باڵندەیەکی دەستەمۆ قەدەرێک لێی ڕووانی، دوایە بەقاقاکێشانێکەوە خۆی خست بەپشتدا.

- S_ S_ Senta _ Simplicitas! ٥ ئاه، هۆکابرای پاک و دڵۆڤان - قەت ئەوەت بە خەیاڵدا نەهات؟ قە قەت کاریگەری ئەوسەممە ڕژاوەت نەدیت٦؟

مونتانلی هەستا سەرپێ: «سینیور ڕیوارز ئایا دەبێ باوەڕم بەوە هەبێ کە هەردوولایەنی باسەکە هەرخۆت بووی؟»

مێشەکەرانە بەو چاوەشین و گەورانەیەوە کە نیگای بێتاوانیان لێدەرژا لە مونتانلی ڕووانی و وەڵامی داوە: «دەزانم کە زۆر عەیب بوو و تۆ هەمووی ئەوانەت هـ - هـ - هەڵدەلووشی ڕاست وەک سەدەفێکی خواردەمەنی دەریا، شتێکی زۆرناشیرین و دزێو بوو!»

مونتانلی لێوی خۆی گەزی و دیسانەوە دانیشت. هەر لەهەوەڵەوە لەوە حاڵی ببوو کە مێشەکەرانە بەتەمایە کە ڕقی هەستێنێ. هەربۆیە بەتەما بوو کە هەرچونێک بێت لە سەرەخۆ بێت، بەڵام وردەوردە تێگەیشت کە قایمەقام بۆ بەزیوە. نابێ لۆمەی ئەو پیاوە بکەیت کە جنێوێکی لەدەم دەرپەڕیوە پیاوێکی کە لە سێحەوتەی ڕابردوودا هەموو ڕۆژێ دوو کاتژمێر لە سەر مێشەکەرانە لێپرسینەوەی کردووە.

هێواش گوتی: «لەم باسە دەگەڕێین، بۆیە پێمخۆشبوو بە تایبەتی بتبینم لە بەر ئەوە بوو کە: «پلە و پایەی کاردینالی من ڕێگای ئەوەم پێدەدا کە ئەگەر بمەوێ لەوکارەی خۆم کەڵکی پێویست وەرگرم - لەوە بپرسمەوە کە دەیانەوێ چیت لێبکەن. تەنیا کارێکی کە من دەتوانم بیکەم ئەوەیە کە پێشی ئەوتوند و تیژیانە بگرم کە بیانەوێ لە سەر تۆ بەڕێوەی بەرن بۆ ئەوەی کە بە خەیاڵی خۆیان بەربەستێک بێ تا تۆ زەرەر و زیانێک بە خەڵکی نەگەیێنی. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە بانگم کردی بۆ ئێرە. ئەگەریش سەبارەت بەم زنجیر و کەلەبچەیە شکایەتێکت هەیە من لێی دەکۆڵمەوە، بەڵام ڕەنگە تۆ

---

٥. بێتاوانێکی پاک و پیرۆز (لاتین).

٦. جن پێی بەجێ ماوی شەیتان.

گلەیی یان باسێکی دیکەشت هەبێ کە بیڵێی ـ لەلایەکی دیکەشەوە پێش ئەوەی کە من بیروڕای خۆمت پێ بڵێم بەپێویستم زانی کە بزانم تۆ کێیی و چ کەسایەتییەکی.»

ـ قوربان من لەکەس و لەهیچ شتێک شکایەتێکم نییە!

ـ A La guerre comme a la guerre! ، من منداڵێکی قوتابخانە نیم کە پێموابێ حکومەتێک بە هۆی قا ـ قاچاخی چەک و تەقەمەنی لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتی خۆیدا دەسخۆشانەم پێبڵێ. شتێکی زۆرئاسایی و سروشتیە کە ئەوان تا ئەوجێگایەی ئەتوانن لەگەڵ مندا توند و تیژی بنوێنن، بەڵام لە سەر ئەوەی کە من چۆن ئینسانێکم، من یەکجار زۆر شاعیرانە لە سەر تاوان و گوناهەکانی خۆم بۆ تۆ دوواوم. ئەمە تەواوە یان دەتەوێ دیسانەوە دەست پێبکەم؟

مونتانلی پێنووسێکی هەڵگرت و لە نێوقامکەکانیدا هەڵیسووڕاند و بەهێوریەوە گوتی: «باش لەقسەکەت تێنەگەیشتم.»

ـ بێگومان قوربان تۆ ئەوکابرا پیرە زیارەتکارە بەنێوی دیگۆت فەرامۆش نەکردووە، لە پڕێکدا دەنگی خۆی گۆڕی و وەک دیگۆ دەستی کرد بەقسە کردن: من گوناحبارێکی بەدبەخت و ڕۆژەڕەشم...

مونتانلی پێنووسەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە: «زۆرسەیرە!»

مێشەکەرانە بەپێکەنینەوە سەری بەپشتدا خست و ڕووانییە مونتانلی کە بەبێدەنگییەوە ئەم سەرە و سەری ژوورەکەی دەپێوا.

ئاخرەکەی مونتانلی لەبەردەم ئەودا ڕاوەستا و گوتی: «سینیور ڕیوارز، تۆ کارێکت لەگەڵ من کرد، کە هەرکەسێک کە لەژن لەدایک بووبێ بەدووڵیەوە ئەوکارە لەگەڵ دوژمنانی خۆی دەکات. تۆ قامکت لە سەر خەمێکی دەروونی و قووڵی من دانا و خەمی مرۆڤێکی وەک خۆتت کردە شۆخی و جەفەنگ. من جارێکی دیکە تکات لێدەکەم پێم بڵێی: «ئایا بەدرێژایی تەمەنت سەبارەت بەتۆ من هەڵە و خراپەیەکم کردووە؟ ئەگەر شتێکی وا نەبووە، ئەی بۆچی ئاوا بێبەزەیانە ژوورم پێدەکەی؟»

---

٧. لە شەڕدا دەبێ یاسای شەڕ ڕەچاو کەی.

مێشەکەرانە پاڵی دا بەپشتی کورسیەکەوە و بەزەردەخەنەیەکی مانادارەوە لێی ڕووانی.

ـ قوربان ئەو کارە منی سەرگەرم دەکرد، تۆ یەکجار زۆر بایەخت پێداوە و ئەم کارەی تۆ من دەخاتە یادی ـ یادی سیرکێکی گەڕۆک... .

مونتانلی کە تەنانەت لێوەکانیشی سپی هەڵگەڕابوون گەڕاوە و زەنگەکەی لێدا. کاتێ کە یاساوڵەکان هاتنە ژوورێ، گوتی: «دەتوانن بەندییەکە بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆی.»دوای ئەوەی کە ئەوان ڕۆیشتن، لەپشت مێزەکە دانیشت. هێشتا لەبەر ئەو تووڕەییەی کە خووی پێنەگرتبوو دەلەرزی. ئەو کۆمەڵە ڕاپۆرتەی کە لەلایەن قەشە و ئۆسقۆفەکانی دەوروبەرەوە نێردرابوو هەڵی گرتن.

بەتووڕەییەکەوە خێرا نایە ئەو لاوە، بە هەردوو دەستی ڕوخساری خۆی داپۆشی و پاڵی دا بەمێزەکەوە، وا دیاربوو مێشەکەرانە بێچم و سێبەرێکی سامناکی لەخۆی و کەسایەتیی خەیاڵی خۆی بەجێهێشتبوو تا لە ژوورەکەدا بسەکنێ، مونتانلی کە دەلەرزی و نوشتابووەوە دانیشت و لەترسی ئەوەی کە نەکا ئەوکەسایەتییە خەیاڵیە ـ کە دەیزانی لەوێ نییە ـ بێتە پێش‌چاوی، نەیدەوێرا سەرهەڵێنێ، ئەم فکر و خەیاڵاتە خەریک‌بوو ترس و خۆفی لەدڵیدا دروست دەکرد. کە هەمووی ئەوانە نیشانەی مێشک و زەینێکی ماندوو بوو، لە کەسایەتی خەیاڵی مێشەکەرانە ترسێکی سەیر دایگرتبوو ـ لەو دەستە بریندارە، ئەو دەم و لێوە بەبزە ترسناکە و نیگای ئەوچاوە سەیر و سەمەرانە کە وەک ئاوی زەریا قووڵ بوون، ئەوترس و خۆفەی لەخۆی دوور کردەوە و بەکارکردن خۆی سەرقاڵ کرد. بە درێژایی ئەو ڕۆژە زۆرکەم بێکاربوو و ئەوەش هیچ ماندووی نەکرد، بەڵام دوای ئەوەی کە درەنگانێکی شەو چووە ژووری نوستونی خۆی، لە پڕێکدا ترسێک دایگرت و لەبەر درگاکە ڕاوەستا. ئەی ئەگەر ئەوبێتە خەوی چی بکا؟ خێرا بەخۆیدا چووەوە و قورس و قایم لە بەرانبەر خاچەکەدا چۆکی دادا تا بپاڕێتەوە، بەڵام بەدرێژایی شەو بەخەبەر بوو.

# ٤

تووڕەیی مونتانلی نەبووە هۆی ئەوەی کە لە قەول و بەڵێنی خۆی پاشگەز بێتەوە. بەتووڕەییەکی واوە دژی بەزنجیربەسترانەوەی مێشەکەرانە بووەوە کە قایمەقامی ڕۆژەڕەش هیچی پێنەگوتراو هەموو زەنجیرەکانی بەبێترسێکی ئاوێتەی ناهومێدیەوە فڕێی دایە ئەو لاوە. بەمنگەمنگەوە بەسەربازەکەی ژێردەستی خۆی گوت: «چۆن دەبێ بزانم کە بەڕێز مونتانلی دژی شتێکی دیکەش ڕاناوەستێ؟ ئەگەر ئەو ، دووکەلەبچەی سووک و سادەی پێ زوڵمبێ، بێگومان لەمەڕ میلە و بەربەستەکانی پەنجەرەکەش هەڵا و هەنگامەیەک ساز دەکا و یان داوام لێدەکا کە مێشەکەرانە بەسەدەفی خوراکی و جەرگ و گواندێن بەخێو بەکەم. لەدەورانی لاویەتی مندا تاوانبار تاوانبار بوو؛ بەپێی کردەوەی خۆی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد. هیچکەسیش خۆفرۆشێکی لەدزێک پێباشتر نەبوو، بەڵام ئەمڕۆکە ئاژاوەگێڕیی بووەتە باو و وادیارە بەڕێز مونتانلی بەتەمایە هەموو بەرەڵا و دز و ئاژاوەگێڕان هانبدا و دەستخۆشانەیان پێبڵێ.»

ئاجودانەکە گوتی: «من نازانم کە کاردینال مونتانلی چیداوە بەسەر ئەوکارانەوە کە خۆی تێهەڵدەقوتێنێ، خۆ ئەو نوێنەری پاپ نییە و هیچ ئیختیار و دەسەڵاتێکی لەمەڕ کاروباری لەشکری و نالەشکریدا نییە، بەپێی یاسا...»

ـ قسە کردن لە سەر یاسا چقازانجێکی هەیە؟ تۆ ناتوانی چاوەڕوانیی ئەوەت هەبێ کە کاتێ پاپای بەڕێز درگای گرتوخانەکانی کردەوە و هەموو ئەولیبراڵە خوێڕ و خراپکارانەی بەردایە گیانی ئێمە نابێ لەوە دڵنیابێ کە کەس ڕێز بۆ یاسا دانێ! ئەمە تەواو لەخۆبایی بوونە! هەڵبەتە ئیدی لەوکاتەدا

سینیور مونتانلی زۆر بەخۆی دەنازێ . ئەو سەردەمی خوالێخۆشبوو پاپای بەڕێزی ئەوکاتدا زۆر بێدەنگ بوو، بەڵام ئێستا کەسایەتییەکی گەورە و بە ناوبانگە. لەپڕێکدا وای لێهات و کەوتە بەر سەرنجی کاربەدەستان و هەرکارێکی پێیخۆشبێ دەتوانێ بیکات. چاچۆن دەتوانم دژایەتی لەگەڵ بکەم؟ شایەد ئەوەندەی کە من بیزانم لەلایەن ڤاتیکانەوە ئیختیار و دەسەلاتێکی تایبەتی و نهێنی هەبێ. ئێستا هەموو شتێک گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە: ئینسان ناتوانێ پێشبینی بکات کە سبەینێ چشتێک دەقەومێ. لەدەورەی خۆشی ڕابردوودا مرۆڤ دەیزانی کە چیدەکات، بەڵام ئێستا...

قایمەقام بەناڕەحەتییەوە سەری ڕاوەشاند. دنیایەکی کە کاردینالەکان لە سەر وردەکاری ڕێکوپێکی گرتوخانە خۆیان دەخستە ئاستەنگ و زەحمەتەوە و سەبارەت بە «مافی» تاوانبارانی ڕامیاری قسەیان دەکرد، وردەورردە ئەوچەمکە بۆ ئەو، دنیایەکی سەیر و پێچلاوپووچ بوو.

مێشەکەرانە بەشبەحاڵی خۆی لەگەڵ شڵەژانێکی دەروونی و ڕۆحی کە نزیک بەجەڵخە بوو، بۆ قەڵا گەڕایەوە. دیداری ئەو لەگەڵ مونتانلی ورەی ئەوی تا خاڵی سیفر دابەزاندبوو. تووڕەیی و شەڕاژویی ئەو بەقسە کردن لە سەر سیرکی گەڕوک و لەچوارچێوەیەکی تەواو هیوابڕاویدا کۆتایی پێهات و گوتنی ئەوبابەتە تەنیا لەبەر ئەوە بوو کە دانوستاندنەکە کۆتایی پێبێ چونکە ئەگەر پێنجخولەکیتری بخایاندایە بێشک دەگریا.

کاتێ لەپاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا بۆ لێپرسینەوە بانگ کرا، هەر پرسیارێکی کە لێیدەکرا وەڵامەکەی تەنیا پێکەنینێکی سەرشێتانە بوو، قایمەقام دوای ئەوەی کە لەبەر ئەو وەڵامانە ئارامی و لە سەرەخۆییەکەی وشکایی هات تووڕە بوو و دەستی کرد بەجنێودان. مێشەکەرانەش تەنیا خرابتر لەپێشو پێکەنی، قایمەقامی ڕۆژەڕەش زۆرتووڕە بوو و گوڕاندی و هەڕەشەی لە زیندانییە سەرەڕۆکەی کرد کە زۆرپیس تەمێی دەکات، بەڵام ئاخرەکەی بەوئاکامە گەیشت، هەروەک جیمزبێرتین کە تاوێ لەوەپێش گەیشتبوە ئەوێ، کە بەڵگە و دکومێنت هێنانەوە بۆ کەسێکی ئاوا خرفاو تەنیا خۆماندوو کردنێکی بێبایەخە.

مێشەکەرانە جارێکی دیکەش بردیانەوە بۆ بەندە تاکەکەسیەکە و بە خەمگینی و ناهومێدییەکی زۆرەوە کە هەمیشە بەشوێن ئەوحاڵەتەدا شەپۆلانی ئێش و ئازار دایدەگرت لە سەر دۆشەک و پێخەفەکەی کە لە کاێ ساز کرابوو وەرکەوت و تا شەوێ، بێئەوەی بجووڵێت یان تۆزقاڵانێک بیری لێبکاتەوە ڕاکشا، دوای شڵەژانێکی دەروونی زۆر، دەمەدەمی بەیانی کەوتە کەوانی بێهۆشی و بێداریەوە. لەو کاتەدا وای بەبیردا هات کە ڕۆژەڕەشی و چەرمەسەریی ژیانی خۆی زۆر لەجەستەی نیوەمردووەکەی پتر بەسەر ڕۆحیدا قورسایی دەکات. قورسایی شتێکی وا کە ڕۆح و گیانی خۆی لەبیر چووبووەوە. ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە ، چۆناوچۆن بوو کە هەموو شتێک ئاوا کۆتایی پێهات بۆ ئەو زۆربایەخدار نەبوو، ئەوەی کە بۆ ئەو جێگای سەرنج و بایەخ پێدان بوو ئەوەبوو کە لەچنگ ئەو ئێش و ئازارە بێ دەرمانە ڕزگاری بێت. ڕزگاربوون لەو کەند و کۆسپ و بەند و کەلەبچەیەش لەو کاتە هیوابڕاویەدا ئاسایش و ئارامیی دەروونی ئەوی مسوگەر نەدەکرد.

ڕەنگە بتوانێ کە هەڵێت، یان دەرەتانی نەبێتوو بیانکوشتایەت، هەرچی بایە ئێتر پاپای نەدەدیت، خواردنی شێویان بۆهێناو مێشەکەرانە بەچاوانێکی ماندوو وقورس و بە بێتاقەتییەوە سەری هەڵێنا: «کاتژمێر چەندەیە؟»

- شەشە ئاغا، شێوم بۆ هێناوی.

بەرق و قیزێونێکەوە لەشێوەکەی ڕووانی کە بۆگەن و ساردەوە بووبوو ڕووی لێ وەرگێڕا بەلەش هەستی بەنەخۆشی و وەڕەزی دەکرد. دیتنی خواردەمەنی شێویش ئەوەندەی دیکە شەمزاندی.

سەربازەکە بەپەلەگوتی: «ئەگەر نانەکەت نەخۆی نەخۆش دەکەوی، بەزۆریش بێ پەنجەنانێک بخۆ، بەقازانجتە.» سەربازەکە بەشێوەیەکی دڵسۆزانە و بەبڕشتەوە قسەی دەکرد. هەر لەو کاتەدا لەتەنانێکی نەبڕژاوی لە سەر دەوریەکە هەڵگرت و دیسانەوە نایەوە سەرجێگای خۆی. نرکەی شۆڕشگێڕێک لەناخی مێشەکەرانەوە سەرێهەڵدا، خێرا تێگەیشت کە دەبێ لەنێو نانەکەدا شتێک شاردرابێتەوە، بەبێوازییەکەوە گوتی: «زۆر باشە دەتوانی لێرەی دانێی، وردەوردە کەمێکی لێدەخۆم.» درگاکە کرابووەوە و

ئەو دەیزانی کە سەرپەلەکەیان لە سەر پلیکانەکانە و لەهەموو قسەکانی ئەوان حاڵی دەبێ.

دیسانەوە کاتێ درگاکە داخراوە، میتشەکەرانە خۆی ڕازی کرد بەوەی کە کەس لە کەلێن و درزی درگاکەوە چاوەدێری ناکات، ئەو کوتە نانەی هەڵگرت و زۆر بە وردی لەتی کرد. لەنێو نانەکەدا ڕاست ئەو شتەی کە چاوەڕوانی دەکرد، چەند بڕبەندێکی* چکۆلەی تێدا بوو. بڕبەندەکان لە کوتە قاقزێکەوە پێچرابوون کە چەند وشەیەکیان لە سەر نووسرابوو. قاقزەکەی زۆر بەئارامی و بەسەرنجەوە ڕێکوپێک کرد و بردیە ژێر ئەو ڕۆشنایە کەمەی کە باڵی کێشابووە نێو بەندەکەوە. قاقزەکە ئەوەندە ناسکبوو و بەو پێیەش هێند بەوردی لە سەری نوسرابوو کە خوێندنەوەکەی هەڵەی زۆری تێدەکەوت.

- درگاکە کراوەتەوە، ڕۆشنایی مانگیش بەدەرەوە نییە. خێرا بە بڕبەندەکە کارەکە تەواوکە کاتژمێر دوو یان سێی نیوەشەو لەڕێگای ڕێڕەوی ژێرزەمینەکەوە وەرە، ئێمە هەموو ئامادەین. ڕەنگە دەرفەتێکی دیکەی ئاوامان بۆ هەڵنەکەوێ زووکە.

بەدڵەکوتێ و دڵەڕاوکێیەوە قاقزەکەی پێچاوە. وادیارە هەموو شتێک ساز و تەیارە و تەنیا دەبێ بەبڕبەند میلەئاسنکاني پەنجەرەکە ببڕێتەوە. شانسێکی زۆرباشە، زنجیرەکانی دەست و پێشی لێ کراوەتەوە! ئیدی پێویست ناکا کە بۆ بڕینەوەی ئەوانە کات و ساتی خۆی بەفێڕو بدات. چەند میلەئاسنێ پێوەیە؟ دووان، چوار و هەرکامەیان دەبێ لەدوو جێگاوە ببڕێنەوە، دەبێتە هەشت. ئەها ئەگەر پەلە بکات دەتوانێ بەدرێژایی ئەو شەوە هەموویان ببڕێتەوە - جما و مارتینی چۆن توانیبوویان ئاوا خێرا هەموو شتێک ئامادە بکەن - جلوبەرگی تایبەتی، پەساپورت و حەشارگە؟ دەبێ هەروەکوو ئێستر و بارگین کاریان کردبێ و ئەوەش نەخشەی جمایە کە هەموویان پەسندیان کردووە، کەمێ بەخۆی پێکەنی. ئەگەر نەخشە و خەریتی کارەکە بەباشی بەڕێوە ببردرێ فەرقی چیە کە جما دایڕشتبێ یان یەکێکی دیکە!، بەڵام نەیدەتوانی خۆشحاڵ نەبێت کە بەجێگای ئەوەی بە نەردیوانی لە گوریس و

---

*بڕبەند: ئەو ئاسنە زبرەی بۆ هەڵبڕینە و لووسکردنی ئاسن کەڵکی لێ وەردەگرن

تەناف ساز کراو بچمە خوارێ ـ کە ئەوە پێشنیاری قاچاخچییەکان بووە ـ لە سەر پێشنیاری جما لەڕێگای ڕێڕەوی ژێرزەمینەکەوە ئەوکارە بکەم. گەلالەکەی جما زۆرگران و سەخت و پێچەڵاوپووچتر بوو، بەڵام وەک ئەوەی دیکە نەدەبووە هۆی ئەوەی کە گیانی یاساوڵەکەی دەرەوەی شوورەی ڕۆژهەڵاتی قەڵاکە، کە پاسەوانی و قەرەوڵی دەدا نەدەکەوتە مەترسیەوە: هەربۆیە ئەودووگەلاڵەیە کە لەبەردەمی‌دا دانرا خێرا گەلاڵە و خەریتی جمای هەڵبژارد. کارەکە ئەبەو شێوەیە بوو کە ئەویاساوڵەی کە دۆستی ئەوان بوو و بەنێوی «سیسرک» ناسرابوو، بەبێ‌ئەوەی سەربازەکانی دیکە ئاگاداربن لەپڕێکدا دەروازەئاسنینەگەورەکەی حەوشەی بۆ دەکردەوە کە ڕێگایەکی لێ‌دەبووەوە بۆ ڕێڕەوی ژێرزەمینەکە و دیسانەوە یاساوڵەکە دەبێ کلیلەکە بەرێتەوە بۆ ژووری تایبەتی یاساوڵەکان و لەجێگای خۆی‌دا هەڵی‌واسێتەوە. مێشەکەرانە دەبوو دوای بیستنی ئەوهەواڵە دەست بکات بەبڕینەوەی میلەئاسنی پەنجەرەکە دوایە دەبێ کراسەکەی لەتلەت بکات و پێکیانەوەی ببەستێ و بیکاتە تەنافێک تا پێیدا شۆڕ بێتەوە بۆسەر دیوارەپانەکەی رووبەڕۆژهەڵاتی لای حەوشەکە. دەبێ بەدرێژایی ئەودیوارە کاتێ کە یاساوڵەکە ئاگای لەوبەرە بەدەست و پێ و سنگەخشکێ هێواش بڕوات، هەرکە زانیشی کە یاساوڵەکە بۆلای دیوارەکەی ئەوگەڕاوەتەوە؛ لە سەر بەردی سەردیوارەکە خۆی ڕاکێشێ. لەگۆشەی باشووری ڕۆژهەڵات برجێکی داڕووخاوی لێیە. ئەم برجە داڕووخاوە پڕە لە گژو گیا و دڕک و داڵی پاپیتال، خرکە بەردێکی زۆر ڕووخاوەتە نێوبرجەکەوە و هەروەها ڕووخاوەتە حەوشەی پشت برجەکە. قەرار وایە کە دەبێ لەم برجەچکۆلەوە و بەیارمەتی ئەوگژ و گیا و خڕکەبەردانەوە بچێتەخوارێ بۆنێو حەوشەکە، هێواش دەروازەئاسنینەکە کە قفڵەکەی هەڵگیرابوو بکاتەوە و لەڕێگای ڕێڕەوەکەوە بەرەو تونێلی ژێرزەمینەکە بکەوێتە ڕێ.سەدان ساڵ لەوەپێش ئەم تونێلە مەودای نێوان ئەم قەڵایە و ئەوبرجەی سەر ئەوتەپکەی ڕووبەڕوو بووە کە دەبێ ڕێگایەکی نهێنی بووبێ، بەڵام ئێستا ئیتر بێ‌کەڵک بوو و لەدووسێ جێگاش‌دا بە هۆی داڕمانی بەرد و نزاری قەدپاڵی تەپکەکە گیرابوو و تەنیا قاچاچچییەکان بوون کە لەداوێنی کێوەکەدا ڕێگایەکیان هەڵکەندبوو کە دەچووە

سەرتونێلەکە و هەرئەوانیش بوون بەتەنیا کە لەبوونی ئەورێگایە ئاگاداربوون. کەس شکی بۆ ئەوە نەدەچوو کە جاریوابوو بۆچەندین حەوتوو باری قاچاخچییەکان لەوژێرزەمینەی قەڵاکەدا دەشاردراوە، لەولاشەوە ئەفسەرانی گومروک لەخۆڕایی ماڵ و حاڵی ئەوکێونشین و گوندنشینە ڕۆژەڕەشانە و بەشمەینەتیانەیان دەپشکنی. ئا لەورێگایەوە بوو کە دەبوو مێشەکەرانە وەک مار بخزێت و بەرەوداوێنی کێوەکە هەڵزنێت و دوایە بەرەو جێگایەکی چۆڵ و هۆڵ بڕوات کە مارتینی و قاچاخچییەک چاوەڕوانی ئەویان دەکرد. کێشەی گەورە ئەوەبوو کە کردنەوەی قفڵی درگاکە لە گەشتی شەوانەدا هەلێک بوو کە هەموو شەوێک ڕێک نەدەکەوت. دوای ئەوە هەموو شەوێ ئەوهەلە نەدەڕەخسا کە کاتێ هاتنەخوارێ لەپەنجەرەکە ئاوا تاریک بێ ئەگەر شەوێکی ڕووناک و مانگەشەو بێ بێگومان یاساوڵەکە دەیبینێ و ڕووبەڕووی مەترسیەکی گەورە دەبێتەوە. ئێستا کە دەرفەتێکی ئاوا باشی بۆ هەڵکەوتووە دەبێ بەباشی بیقوزێتەوە. دانیشت و وردەوردە خەریکی خواردنی نانەکە بوو، ئەم پێخۆرە لانیکەم وەک خواردمەنییەکانی دیکەی گرتووخانەکە بێزی هەڵنەدەستاند، بەلام بۆ ئەوەی گوڕ و تینێکی تێبێ، دەبێ کەمێک بخوات.

باشتر وابوو کە چاوێک لە سەر یەکدانێ و هەوڵبدات کە کەمێک خەوی لێبکەوێ ، کار کردن بەبڕبەندەکە تا کاتژمێری دە مەترسیدار بوو. دوایە ئیش و کارێکی تاقەتپڕوکێنی لەپێش بوو.

دوای ئەوەش پاپاش بە تەما بوو کە دەربازی بکات! پاپا دەیتوانی ئەو کارە بکات، بەلام ئەو بۆخۆی ئەم پیاوەتیەی پێخۆش نەبوو. پێیخۆش بوو جیا لەو، هەرکەسێکیتر کە هەبێ یاریدەی هەلاتنی بدات، دەبێ ئەم کارە بەدەستی خوی یان یاریدەی دۆستان و هاوڕێیانی خۆی جێبەجێ بکرێ. ئەو یارمەتی قەشەکانی نەدەویست.

هەوا چەندە گرم بوو! بێگومان هەورەتریشقە دەستی پێدەکرد، کەش و هەوا چەندە خەفە و ساماڵ و کپ بوو. بە بێوازیەوە لە سەر دوشەکە کاییەکەی گێنگڵێکی دا و دەستی ڕاستی کە پێچرابوو نایە ژوورسەری خۆی، دوایە دیسانەوە دەستی لابردەوە. دەستی وەک ئاور دایسا و چڵی دەدا! دەرد

و ئازاری هەموو کۆنەبرینەکانی زیندوو ببوونەوە و دەستەملانی ئەوژان و ئێشەی برینە تازەکەی ببوون، چیبوو کە ئەوانیش کەوتبونە جووڵە، خۆ ئەوان هیچ پێوەندیان بەوزامە نوێیەوە نەبوو! تەنیا لەبەر ئەوکەش و هەوا ناخۆش و توفانییەوە بوو. دەبوو هەرچۆنێکبێ کەمێک بخەوێ و پێشئەوەی کە دەستبەکاری بڕبەندکێشان بێ کەمێ بحەسێتەوە و پشوویەک بدات.

هەشت میلەئاسن و هەمووشیان زۆر ئەستوور و قایم! چەند میلەئاسنیەکی دیکەی مابوو کە دەبوو ببڕدرێنەوە؟ بێگومان زۆر نەبوو، دەبێ کات و ساتێکی زۆر بێ کە خەریکی بڕینەوەیە- کات و مەودایەکی کە کۆتایی هەر نایەت - بەڵێ بێشک هەر لەبەر ئەوەبوو کە بازۆڵەکانی دەیێشان - یەکجار زۆریش دەیێشا: ژانەکەی تا مۆخی ئێسکێ دەڕۆیشت!، بەڵام بڕبەند لێدان قەت نەیدەتوانی ئەوەندە کەلەکەی بێنێتە ژان ، تۆ بڵەی ژان و برک و چڵدانی لاقەشەلەکەشی هی بڕبەندکێشانەکە بێت؟ لەپڕێکدا دەرپەڕێ، نا، نەخەوتبوو بەڵکوو بەچاوی کراوەوە خەوی دەدیت خەوی بڕبەندکێشان، ئێستاش هەموو ئەو نەردانە دەبێ ببڕدرێنەوە.

میلەئاسنی پەنجەرەکە هەروا قیت و قۆز و قایم لە سەر جێگای خۆیان بوون ولە دەمژمێری برجە دوورەکەوە زەنگی سەعاتی دە لێدرا. دەبوو دەستبەکاربێ و لەدرزی درگاکەوە چاوی لە دەرێ کرد و دوای ئەوەی کە دیتی کەس چاوەدێری ناکات، یەکێ لەبڕبەندەکانی لەباخەڵی دەرهێنا.

نا، هیچ کێشە و ناڕەحەتییەکی نەبوو - هیچ! لە گەڕیانی خەیاڵی خۆیدا بوو. ئێشی کەلەکەشی بە هۆی سەرما و باپەرەوە بوو، سێحەوتە لەگەڵ ئەوخوراکە خاوێنە! و ئەو بۆن و بەرامە پیسەی گرتووخانە دەبێ شتێکی ئاسایی بێ، بەڵام ئێش و ژانی هەموو لەشی و چڵدانی برینەکانی بە هۆی ئازاری دەروونی و ڕۆحی و بەشێکیشی بە هۆی زۆردانیشتن و بێجووڵەیی بوو. بەڵێ بێگومان هەردەبێ وابێ، هۆی زۆردانیشتن بوو، بەداخەوە کە لەوەپێش نەکەوتبووە بیری بۆچارەسەر کردنی!

دەبوو کەمێ دانیشێ و لێیگەڕێ تا ئەو هەڵچوون و داچوونەی ئازاری لەشی تۆزێ بڕەوێ جا دوایە دەستبەکار بێ، بێگومان تا یەکدوو

خولەکیتر کەمێ دادەمرکا. دانیشتن بەبێ جووڵە کردن لە هەموو شتێک خراپترە. کاتێ کە دانیشت، کەوتە ئامێزی تەمبەڵی ئەودانیشتنە بێجووڵەیەوە و ڕوخساری لەترسانا ڕەشداگەڕا. نا دەبێ ڕاچەنێ و دەستبەکاربێ و ئەومۆتەیە لەخۆی دوورکاتەوە. هەست کردن بەو ئازارە یان گوێ پێنەدانی بەستراببووەوە بە ورە و ویستی ئەو،، نا هەستی پێناکا و بە ورەیەکی بەرزەوە ڕاوی دەنێ. دیسانەوە هەستایە سەرپێ و قورس و قایم و بوغور لەگەڵ خۆی کەوتە قسە کردن: «من نەخۆش نیم، کاتی ئەوە نییە کە من ئێستا نەخۆش بم. دەبێ ئەونەردانە ببڕمەوە و بەوەش هیچم لێنایەت.»

ئەوجار دەستی کرد بەبڕبەند لێدان.

دەوچارەگێک ـ دەونیو ـ چارەگێکی ماوە بۆ یازدە ـ بڕی و دیسانەوە بڕی، بەدەنگی بڕبەندەکە کە بەسەر ئاسنەکەیدا دەکێشاو دەتگوت کەسێک بڕبەند بەسەر مێشک و لەشیدا دێنێ. بە شلە بزەییێکەوە بەخۆی گوت: «نازانم کامیان زووتر دەبڕدرێنەوە. من یا میلەئاسنکان؟» ددانەکانی لە چیرەوە برد و خەریکی بڕبەندلێدان بوو.

یازدەونیو، گەرچی دەستی وشک ببوو و ماسیبوو و زۆر بەزحمەت دەیتوانی بڕبەندەکان توونند لەدەستیدا ڕاگرێ، دیسانەوە هەروا خەریکی بڕینەوەی بوو، نا، نەیدەویرا کە پشوویەک بدات. ئەگەر تاقەجارێ ئەوشتە ترسناکەی ناو دەستی دابنایەت بێگومان غیرەتی هەڵگرتنەوەی نەدەبوو کە دیسانەوە دەستي پێبکاتەوە. یاساوڵەکە دەستی کرد بە پیاسە کردن، قونداخی تفەنگەکەی بە بەردی سەردرگاکەدا خشا، مێشەکەرانە ڕاوەستا و چاوێکی لەدەوروبەری خۆی کرد، دەستی بەبڕبەندەکەوە هەروا بە حەواوە وشک بوو، بڵەی پێیان زانیبێت؟

شتێکی خڕ لەکەلێنی درگاکەوە خرایە ژوورێ و کەوتە سەرئەرزی. بڕبەندەکەی دانا و دەستی لەکار کێشاوە تا ئەو شتەخڕە هەڵگرێتەوە.

قاقزێکی چکۆلەی لوول کراوە بوو.

مەودایەکی دوور و درێژ بوو کە دەبوو بچێتە خوارەوە، شەپۆلانێکی ڕەش و تاریک کە بەتوندی بەدەوروپشتی‌دا دەگوزەران - چۆن دەیانلووراند هاوار! - ئاه، بەڵێ! ئەو دانەویبوو تا قاقزەکە هەڵگرێتەوە. کەمێ گێژ بوو و بەرچاوی تۆزێ تاریک بوو. زۆربەی خەڵکیش کاتێ کە دادەنەون سەرەگێژە دەگرن. هیچ جێگای ناڕەحەتی نەبوو - هیچ.

قاقزەکەی هەڵگرت و بردیە ژێرڕۆشنایەکە و زۆر بەوردی و بەئارامیەوە کردیەوە.

- هەرچونێکی کە بۆت دەکرێ ئەمشەو وەرە. سبەینێ سیسرک بۆ جێگایەکی دیکە دەگوێزرێتەوە. لەبیرت نەچێ ئەو تاقە شانسی ئێمەیە.

قاقزەکەی لەبەین برد، هەروەکوو قاقزەکەی دیکەی شرت و گوم کردبوو، دیسانەوە بڕبەندەکەی هەڵگرت و گێژ و ناهومێد، بەڵام قورس و قایمتر دەستی پێ کردەوە. کاتژمێر یەکی نێوەشەوە. تا ئێستا سێ‌سەعاتی کار کردبوو و شەش‌میلەئاسن لە هەشت‌میلەئاسن‌کان‌ی بڕیبۆوە، دوودانەی دیکەی مابوو، سەرکەوتەوە - وردەوردە شەپۆلانی ئێش و ئازاری پڕ لە ترس و خۆفی لەوەپێشێ وەبیر هاتەوە، ئاخرین جار لەم ساڵە نویەدا بوو. بەوەبیر هێنانەوەی ئەوپێنج‌شەوە لەحەیبەتا لەرزی، بەڵام ئەو جارە ئاوا لەپڕێکدا نەبوو. قەت ئاوا کوت‌وپڕ ئەوکی نەگرتبوو.

بڕبەندەکەی خستە خوارێ و لەداخا دەستی بەم‌لاولادا فرێ‌دا. بۆ هەوەڵین‌جار دوای ئەوەی کە بێ‌دین و لائیک ببوو، لەناخی هیوابڕاوی‌دا کەوتە دۆعا کردن و پاڕانەوە، دەستەو داوێنی هەموو شتێک بوو- ڕووبە هەمووشتێک دۆعای کرد، هەموو شتێک...

- ئەمشەو لێم‌گەڕێ! با سبەینێ نەخۆش کەوم! سبەینێ هەموو ئازارێک بەشان هەڵدەگرم - تەنیا ئەمشەو و هەر ئەمشەو لێم‌گەڕێ!

هەردوو دەستی بەئەملاولای سەریەوە نا و بۆ ساتێ بەبێ‌جووڵە ڕاوەستا، دوایە بڕبەندەکەی هەڵگرت و جارێکی دیکە گەڕاوە سەرکارەکەی. یەکونیوی نیوەشەو بوو . هاتە سەروکاری هەشتەمین میلەئاسن. کراسەکەی شیتاڵ شیتاڵ ببوو. لێوەکانی خوێناوی بوون و تارمایەکی سوور بەرچاوی

گرتبوو. هەروا بڕبەندی لێدەدا و کاری دەکرد و دیسانەوە کاری دەکرد. ئارەق لە هەنییەیەوە دەتکایە خوارێ.

مونتانلی دوای ئەوەی هەتاو لەئاسۆگەوە سەری هەڵدا خەوی لێکەوت. لەبەر ڕەنج و ئازاری شەوێ تەواو تێکچووبوو، قەدرایەک بەئاسوودەگیەوە خەوی لێکەوت، بەڵام دوایە دیسانەوە خەودیتنەکەی دەستی پێ کردەوە.

لەپێش‌دا خەوێ ئاڵۆزی دەدی، لەتلەت بوونی وێنەی کەسێک و ترس و خۆف کە هەموویان ڕێچکەیان بەستبوو بەشوێن یەکتردا، هەموویان سەرچاوەکەیان دەگەڕایەوە سەر ئەوئێش و ئازار و هەوڵدانە، هەر ئەوسێبەرە ترسناکە سەیر و سەمەرەیە. خێرا خەیالاتێکی سەیر هەروژمیان بۆ هێنا، ئەوخەیالاتە ترسناکە دیرینەیەی کە لەمێژ ساڵ بوو ئاشنای بوون. تەنانەت لەوکاتەیدا کە خەویشی دەدیت، زانیی هەمیشە و لە هەموو کاتێکدا ئەوە، کە ئەوکی بەرنادا، لەپانتایەکی گەورە و بەرفراوان‌دا سەرگەردان و ئاوارە بوو، دەیویست قوژبنێکی ئارام بدۆزێتەوە تا لەوێ‌دا ستاربگرێ، و بخەوێ، سەیر بوو لە هەموو جێگایەکدا خەڵکی خوار و ژووریان دەکرد و وتووێژیان دەکرد، پێدەکەنین، دەیان گوڕاند، دۆعا و پاڕانەوەیان دەکرد. زەنگەکانیان دەزڕاند و کەرەسەو شتی ئاسنینیان لێکدەکوتا، جاریوابوو مەودایەکی کەمکپ و بێ‌دەنگ دەبوو و دەخەوت، جارێک لە سەر چیمەن، جارێکی دیکە لە سەر کورسیلەی داری، دوایە لە سەر تەختە بەردێکی پان چاوەکانی دەقوچاند و بەهەردوودەستی دای دەپۆشی تا پێشی هروژمی تیشکی پێ‌بگرێ و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «ئێستا دەخەوم.» لەپڕێکدا خەڵکی بە هەڵا و هەنگامەوە بەرەوڕووی دەهاتن، بانگیان دەکرد و داوایان لێ‌دەکرد: «هەستە! هەستە. زووکە، ئێمە پێویستیمان پێت‌هەیە!» جارێکی دیکە لەتەلارێکی پڕپڕ لەهۆدە و ژووری خۆش و ڕازاوە بە باڵنج و پشتی و کورسیلە و کورسی نەرم و نیان‌دا ڕای‌دەبوراد. کات شەو بوو بەخۆی گوت: «ئیتر ئالێرە جێگایەکی ئارام و بێدەنگ دەدۆزمەوە بۆ خەوتن.»، بەڵام کاتێ کە ژوورێکی تاریکی دیتەوە تا لێی بحسێتەوە، نەفەرێک بەچرایەکەوە هاتە ژوورێ، شەوقی چراکەی لەچاوی‌دا و گوتی: «هەستە پێویستیان بەتۆ هەیە،

هەستا سەرپێ، بەلاتەلات و لاتراسکەبەستن وەک بوونەوەرێکی کە برینێکی کوشەندەی تێکرابێ بێ مەبەست کەوتە ڕێ، زانی کە زەمەن وەستاوە و چەندین کاتژمێر بەحاڵ جووڵەیەک دەکا ، تێگەیشت کە تا ئێستا تازە نیوەی شەو تێپەڕ بووە . شەوێکی گەورە و پڕقیمەت کە ئاوا زوو تێپەڕ بوو.

دوو، سێ، چوار، پێنج، سەعاتی شەش هەموو شار بەخەبەر دێن و ئیتر ئەوبێدەنگیە نامێنێ.

چووە ژوورێکی دیکە و ویستی لەپێخەفی ئەوێدا بخەوێ، بەڵام نەفەرێک لە سەر باڵنجەکان هەستایە سەرپێ و گوڕاندی: «ئەمە جێ خەوی منە،» ئەویش بەدڵێکی کەیلیخەمەوە چووە ئەولاوە.

تیکتاکی سەعات یەک لەدوای یەک لێدەدرا و ئەویش هەروا سەرگەردان و پەرێشان دەخولاوە. لەم ژوورە بۆ ژوورێکیتر، لەم ماڵ بۆ ئەوماڵ، لە سەرسەرایەک بۆ سەرسەرایەکی دیکە، هەتاو ئارام خۆی هەڵدەکێشا و هەنگاوەکانی خێراتر دەکرد. کاتژمێرەکان پێنججار لێدرا، شەو گوزەرابوو، بەڵام ئەو هێشتا ئارام نەببوەوە، ئایش چڕەنج و ئازارێک! ڕۆژێکی دیکە - ڕۆژێکی دیکە. لەدالانێکی درێژی ژێرزەمینیدا بوو، ڕێڕەوێکی باریک و چکۆلە و بنمیچێکی وادرێژ و بێکۆتایی کە ئەوسەری نادیار بوو و ڕێرەوەکە بەچرا و مۆمێکی هەڵکراوی زۆرەوە ڕووناک کرابوو و لەبنمیچە کونکونەکانییەوە، دەنگی گورانی و سەما و هەڵپەڕکێ و موسیقایەکی خۆش و بلاوێن پەردەی گوێی دەلەراندەوە، بێگومان لە سەرەوە لەدونیای ئەوخەڵکەی سەرەوە کە زیندوو بوون جێژن و شادی لەئارادا بوو، خۆزگە دەیتوانی لەجێگایەکدا خۆی بشارێتەوە و بخەوێ، جێگایەکی زۆرچکۆلە تەنانەت ئەگەر قەبرێ بێ! هەروا کە قسەی دەکرد قەبرێک دەمی کردەوە و بەسەروە کەوتە ناوی، قەبرێکی زار داپچڕیو، کە بۆنی مەرگ و پوواویی لێوە دەهات. قەیناکە لانیکەم دەیتوانی لێرە بخەوێ!» «ئەم قەبرە هی منە». گلادیس بوو و گلادیس سەری هەڵێنا و لەنێو کفنە پوواوەکەدا لێی ڕووانی. ئەوجار ئەو کەوتە سەرچۆک و دەستەکانی بەرەولای گلادیس کردەوە: «گلادیس! کەمێ ڕۆحمم پێبکە و بەزەییت پێمدا بێتەوە، لێگەڕێ با لەم

کەلەبەرە تەنگ و باریکەدا بخەوم. ئەشقێنیت لەگەڵ ناکەم دەستیشم وێتناکەوێ، تەنانەت قسەیەکیشت لەگەڵ ناکەم، تەنیا تەنیا ئەوەم لێتدەوێ لە تەنیشتت وەرکەوم و برازێم! ئاخ ئەوینی من، زۆر لەمێژە کە نەخەوتووم! ناتوانم تاقە ڕۆژێکی دیکە خۆم ڕاگرم، تیشکی ڕووناکایی ڕۆح و ڕەوانم دەسووتێنێ، غەڵبەغەڵب و هەرا و هوریا مێشکم دەکاتە قەقنەس و دەیهارووژێنێ. گلادیس لێمگەڕێ با بێمە ئێرە و بخەوم!» ویستی کفنەکەی بێنێتە سەر دەموچاوی، بەڵام گلادیس زیقاندی و خۆی وەرسووڕاند: «ئەم کارە کفرە بۆتۆ، تۆ قەشەیەکی!»

دیسان سەرگەردان و سەرلێشێوا کەوتە ڕێ، هەرکە سەری هەڵێنا لەقەراخ زەریا و لە سەر نزارێکی ڕۆخی زەریا بوو. لەوێ کە تیرێژی خۆر وەک بزمار دادەچەقی و ئاوی زەریاش ئارام و لە سەرەخۆ دەیناڵاند و خۆی دەلاواندەوە و شەپۆلانی ڕادەژەند. مونتانلی گوتی: «ئاخ!» زەریا دەبێ بەبەزەیی و سنگفراوانتر بێ، ئەویش پیر و کەلەلا و ماندوو و شەکەتە و ناتوانێ بخەوێ.

لەپڕێکدا ئارتور لەناخی زەریاوە ڕاسا و گوڕاندی: «ئەم زەریایە هی منە!»

- قوربان! قوربان!

مونتانلی ڕاچڵەکی و خەبەری بووەوە، پێشخزمەتەکەی بە ئەنگوستی لەدرگاکەی دەدا. لەپڕێکدا هەستا سەرپێی و درگاکەی کردەوە، دیتی کە مونتانلی چەندە شێواو و پەرێشانە و ترسی تێزاوە: «قوربان نەخۆشی؟»

هەردوو دەستی بەنێوچاوانی خۆیدا هێنا: «نا، خەوتبووم، ترساندمت.»

- بمبوورە پێموابوو بەیانی زوو دەنگی ڕێگا ڕۆیشتنی تۆم گوێ لێبووە پێموابوو...

- درەنگە؟

- سەعات نۆیە، قایمەقامیش هاتووە بۆ دیدارت، دەڵێ ئیشێکی زۆرگرینگی پێتە، چوونکە وایزانیوە کە جەنابتان زوو لەخەو هەڵدەستن...

- لەخوارێیە؟ خێرا دێمە خوارێ.

جلوبەرگی لەبەر کرد و چووە قاتی خوارێ.

قایمەقام گوتی: «بمبوورە کە هەروا سووک و سادە و دوور لەڕێ و ڕەسمی فەرمی هاتمە دیدارتان.»

- هیوادارم کە هیچ ڕووداوێک نەخوڵقابێت؟

- ڕووداوێکی زۆرگرینگە. ڕیوارز خەریکبوو لەهەڵاتنەکەیدا سەرکەوێ.

- دەی زۆر باشە، خۆ هێشتا نەیتوانییەوە هەڵێ،خۆ هیچ زیانێکی لێ نەکەتووەتەوە، ڕووداوەکە چۆناوچۆن بووە؟

- لە حەساری ڕاست لە پەنای دەروازە ئاسنینە گەورەکەدا دۆزیویانەتەوە، کاتێ گەشتیارەکە لەسەعاتی سێی نیوەشەوێدا لەحەساری دەگەڕێ، لاقی یەکێ لە سەربازەکان وەشتێک دەکەوێ، دوای ئەوەی کە چرایەک دێنن دەبینن کە ڕیوارز لەچەقی ڕێگاکەدا بێهۆش کەوتووە. خێرا ئاژیر دەکێشن و من بانگ دەکەن. کاتێ کە چوومە ژوورەکەی دیتم کە میلەئاسنکانی بڕدرابوونەوە، تەنافێک کە لە لەتوکوتی کراسێک پێکەوە گرێ درابوو و بەپەنجەرەکەوە بەسترابووەوە و شۆڕکرابووە خوارێ. خۆی بەوێدا شۆڕ کردۆتەوە و چووەتە سەردیوارەکە. دەروازە ئاسنینەکەی کە بەرەو تونێل و دالانەژێرزەمینییەکە دە کراوە هەڵگیرابوو، وادیارە کە یاساوڵەکان فریودرابوون.

ئەی لەبەرچی لە سەر ئەو ڕێگایەدا کەوتبوو؟ ئایا لە سەر دیوارەکە کەوتبووە خوارێ و ئازاری پێگەیشتووە؟

- قوربان، لەپێشدا منیش وام دەکوت، بەڵام دوکتوری گرتووخانەکە هیچ نیشانەیەکی لە کەوتنەخوارەوە لە سەر لەشی بەدیێ نەکرد. ئەوسەربازەی کە دوێنێ یاساوڵ و قەرەوڵ بووە دەیگوت: «دوێشەو کە شێوم بۆ ڕیوارز برد دیاربوو کە زۆر نەخۆش بوو و هیچی نەخوارد، بەڵام ئەم قسەیە بێبایەخە و هیچ ڕێی بەقا نییە، پیاوێکی نەخۆش ناتوانێ ئەونەردانە ببڕێتەوە و بچێتە سەربان، ئەقڵ بۆی ناچێ کە وابووبێ.

- خۆی هیچی نەگوت؟

- قوربان بێهۆشە.

- ئێستاش هەر بێهۆشە؟
- تەنیا جارجارەیەک وەهۆش دێتەوە و ناڵەناڵێک دەکا و دیسانەوە وەک خۆی لێدێتەوە.
- زۆرسەیرە! دوکتۆر چی دەڵێ؟
- نازانێ چی بڵێ. هیچ نیشانەیەک لەجەڵغە و سەکتەی دل نابیندرێ کە بڵەی هێنئەوەیە، بەڵام هەر دەردێکی بێت تازە لێیڕوداوە. ڕاست لەوکاتەیدا کە ویستوویەتی هەڵێت من بۆخۆم لە سەر ئەو بڕوایەم کە دەستێک و وزەییەکی خوڵقێنەر و بەخشێنەر خستوویەتە خوارەوە.
مونتانلی کەمێ ڕووی تێکنا و پرسی: «دەتانەوێ چی لێبکەن؟»
- هیچ نییە چەند ڕۆژێکی دیکە خۆم جێبەجێی دەکەم، ئێتر تەمێ بووم. ئەوەش ئاکامی لێ کردنەوەی زنجیرەکانە - هەرچەند کە ئەوە ویست و بیروڕای جەنابتان بوو.
مونتانلی قسەکەی ئەوی بڕی: «هیوادارم تا ئەو کاتەی کە نەخۆشە زەنجیرەکانی لێنەبەستنەوە. پیاوێکی کە ئاوای لێهاتبێ - بەقەوڵی تۆ- زۆر چەتوونە کە بتوانێ هەڵێ.»
قایمەقام هەروا کە دەڕۆیشتە دەرەوە، بەخۆی گوت: «زۆر بەتوندی چاوەدیری لێدەکەم کە نەتوانێ هەڵێ. بەڕێز مونتانلیش هەر کارێکی کە پێیخۆشە دەتوانێ بیکات بەودڵە ناسک و هەستیارەیەوە کە من هیچ بایەخێکی پێنادەم. ڕیوارز ئێستا توند بەزنجیر بەستراوەتەوە. چنەخۆش بێ و چساخ بێ هەروا دەمێنێتەوە.»
- ئاخەر چۆن بوو کە وایلێهات؟ لەو کۆتایە ناسک و هەستیارەدا کە هەموو شتێک ئامادە بوو ئەو بێهۆش بووە، ڕاست ئەو کاتەشی کە لەپەنای دەروازەکە بووە! زۆرتر وەک گاڵتە و پێکەنین و یارییەکی ترسناک دەچێ.
مارتینی وەڵامی داوە: «چاو لێکەن، تەنیا شتێکی کە بەبیر و مێشکی مندا دێ ئەوەیە کە دەبێ ئەوهێرشە ئازارانەی دەروونی، ڕاچەنیبێ و ڕوویان تێی کردبێ و بێگومان تا ئەو جێگایەی کە توانیویەتی بەربەرەکانی لەگەڵ

کردووه و دوای ئەوەی کە هاتووەتە حەساریّ، بە هۆی بیّهیّزی و ئازارەوە بیّهۆش بووە.»

مارکون بەتوورەییەوە سووتووی قەنەکەی تەکاند: « یانی بە ڕاستی ئیدی کاری کۆتایە، ئیستا ئیتر ناتوانین هیچکاریّکی بۆ بکەین، داماوی بیّچارە!»

مارتینی لە ژیّر لیّویەوە دووپاتی کردەوە: « بیّچارە!» وردەوردە بەوئاگامە گەیشت کە ئەودونیایە بەبیّ بوونی میّشەکەرانە زۆرناخۆش و پڕوپووچە. قاچاخچییەکە هەروا کە لەوبەری ژوورەکەی دەڕوانی، جما بە تەنیایی دانیشتبوو بەوەڕەزیەوە دەستەکانی لە سەر کراسەکەی بەملاولادا کەوتبوون و لەخالیّکی قوول و بیّبن و بیّکۆتایی دەڕوانی پرسی: «بیر لەچی دەکەیتەوە؟»

- لیّم نەپرسیووە، لەوکاتەوە کە ئەو هەواڵەم پیّداوە، تا ئیّستا قسەیەکی نە کردووە. باشتر وایە جاریّ با سەرودلّی نەگرین.

وادیاربوو کە جما واچووبووە مالّی فکرەوە کە دەتگوت ئاگاداری بوونی ئەودووانە نییە، ئەوانیش دەتگوت لەتەرمیّک دەڕوانن، زۆر بەهیّواشی قسەیان دەکرد.

مارتینی دوای بیّدەنگییەکی خەفەتاوی، هەستایە سەرپیّ و قەنەکەی دانا.

قاچاخچییەکە گوتی: «ئەمشەو دەگەڕیّمەوە.»، بەلاّم مارتینی ئاماژەی بۆکرد کە ڕاوەستیّت و پەلە نەکات:

- جاریّ وازوومەڕۆ، دەمهەویّ قسەت لەگەڵ بکەم.

دیسان دەنگی هیّواشتر کردەوە و هەرئەوەندەی کە بەحاڵ لیّوی لە یەکتر جیا دەکردەوە: «هەربەڕاست تۆ پیّتوایە هیچ ڕیّگا چارەییّک نییە؟»

- من نازانم کە ئایا ئومیّدیّک هەیە بۆ ڕزگاری کردنی ئەو یان نا، بەلاّم ئیّمە ناتوانین دیسانەوە ئەوکارە دووپات کەینەوە. تەنانەت ئەگەر ئەوەندە ساخ و سلامەت بووایەت کە بیتوانیایە ڕۆلّی خۆی بەباشی بگیّڕیّ. بەسەر ئەو حالّەشدا ئیّمە ناتوانین گەلاّلەی خۆمان مسوگەرکەین. چونکە بڕیاروایە کە یاساولەکان بگۆڕن بە هۆی شک و گومانـاوی بوونیان. تۆ لەوە ئارخایەنبە کە سیسرک ئیتر دەرفەتیّکی باشی بۆ ناڕەخسیّ.

مارتینی لەپڕێکدا پرسی: «پێت‌وانییە دوای ئەوەی کە چاک‌بووەوە بشێ کە پاسەوان و یاساوڵەکان فریودەین و کارێکی بۆ بکەین؟
، فریودانی یاساوڵەکان؟ مەبەستت چییە؟
- بەڵێ، وام بەزەین گەیشت کە ئەگەر لەکاتێ ڕابردنی گروپ و دەستەکەدا لە ڕۆژی Courpus Domini[1] لەنزیک قەڵاکەوە بێمە سەرڕێگای قایمەقام و تەقەی لێبکەم. هەر لەو کاتەش‌دایە هەموو یاساوڵەکان بۆ گرتنی من هێرش دێنن. ئەوجار لەو شێواویەدا چەند نەفەرێکتان بتوانێ ڕیوارز ڕزگار بکات. هەڵبەتە ئەمە ناتوانرێ وەکوو گەڵاڵەیەکی لەوەپێش‌داڕێژراو لێی بڕوانی، تەنیا شتێک بوو کە بەزەینم گەیشت.
ماركون بەڕوخسارێکی بیرمەندانەوە وەڵامی داوە: «من بەگومانم لەوەی کە بکرێ ئەم پێشنیارە لەکاتی خۆیدا و بەڕێک‌وپێکی گەڵاڵە و جێبەجێ بکرێ. بێ‌گومان بۆئەوەی کە بتوانرێ ئاکامێکی باش و ئەرێنی لێبکەوێتەوە دەبێ بەباشی هەڵسەنگێندرێ، بەڵام... قسەکەی خۆی بڕی و لەمارتینی ڕووانی: «یانی ئەگەر جێبەجێ بوایەت - ئەم کارەت دەکرد؟»
مارتینی لەکاتی ئاساییدا پیاوێکی خۆپارێز بوو، بەڵام ئێستا کات‌وساتێکی ئاسایی نییە ڕێک چاوی بڕییە نێوچاوانی قاچاخچییەکە و دووپاتی کردەوە: «ئەم کارەم دەکرد؟ چاوێک لەئەو بکە.»
پێویست بەلێکدانەوەیەکی زۆرتر نەبوو. بە گوتنی ئەو قسەیە هەموو شتێکی ڕوون کردەوە. ماركون گەڕاوە و لەوبەری ژوورەکەی ڕووانی.
لەمەودای قسە کردنی ئەودووانە تا ئێستا جما وەک مقەبا دانیشتبوو. لەڕوخساریدا هیچ ترسێک و تەنانەت هیچ خەمێکیشت لێ بەدی نەدەکرد. تەنیا و تەنیا سێبەری مەرگ بوو بەسەریەوە دەگەڕا. قاچاخچییەکە هەرکە چاوی لێ کرد، فرمێسک پیاڵەی چاوەکانی پڕکرد. هەروا کە درگای هەیوانەکەی دەکردەوە و چاوی لە دەرێ دەکرد، گوتی: «میکل زووکە هێشتا هەردووکتان کارەکەتان تەواو نە کردووە؟ زوو کەن زۆرمان کار ماوە!»

---

١- جێژنی لەشی(پاکی) مەسیح و یەکێ لەگەورەترین و خۆشترین جێژنەکانی کلیسای کاتولیکە.

میکل هەستاو جینوش بەشوێنییەوە. لەهەیوانەکەوە هاتنە نێو ژوورەکە و میکل گوتی: «ئێستا ئیتر ئامادەم. تەنیا دەمهەوێ لە سینیورا بپرسم کە...»

بەرەولای جما دەڕۆیشت کە مارتینی قوڵی گرت: «لێیگەڕێ باشتروایە کە بە تەنیابێ.»

مارکون درێژەی دا: «لێیگەڕێ با تەنیابێ! ئاوا هیچ قازانجێکی پێناگەیێنین. خودا لەوسەرە ئاگادارە کە بۆ هەموومان خەمێکی گورچووبڕە، بەڵام بۆ ئەو زۆرناخۆشترە. بەستەزمانە!»

# ٥

مێشەکەرانە یەکحەفتەی عەلەن‌تەواو لە سەر گازەرەی پشت لەبەین خەو و بێ‌هۆشی‌دابوو. هێرشی ئازاری ئەمجارەی عەجایەب توند و بەژان بوو. قایمەقامیش لەترسانا وەک شاغییەکی لێ‌هاتبوو هەڵسوکەوتێکی ناجوامێرانەی لەگەڵ دەکرد و نە تەنیا دەستوپێی بەزنجیر بەستبووەوە، بەڵکوو وەک کەری‌دێز پێی چەقاند تا بە تەنافی چەرمی زۆرتوند بەدۆشەکە کایەکەوەی ببەستنەوە. واتوند بەسترابووەوە مەگەر بە پچڕپچڕ بوونی لەشی، ئەینا نە یدەتوانێ توسقاڵێک بجووڵێت. مێشەکەرانە شەش‌ڕۆژی ڕەبەق بەدەم ئازاری دەروونییی و ئەشکەنجەی تەنافەکانەوە بەڕۆح ناڵاندی و مەردانە خۆی ڕاگرت.

بەڵام ئاخرەکەی ورە و توانایی تێکشکا و بەهاوار و ناڵە و پاڕانەوە داوای لە دوکتۆری گرتووخانەکە کرد کەمێکی تریاک بداتێ، دوکتۆر ڕازی بوو کە بیداتێ، بەڵام قایمەقام کە ئەو داوایەی بیست نەیەێشت و«ئەوجۆرە کارە قوڕانەی» قەدەغە کرد: چووزانی کە ئەوتریاکەی بۆچی دەوێ؟ واوێدەچێ کە لەوچەندڕۆژەدا لە سەر فێڵ و تەڵەکە بووە و دەیهەوێ یاساوڵەکان دەرمان‌داو بکات یان لەفکری هەر کارێکی پیسی لەو جۆرەدا بێ. ڕیوارز بۆ هەر کارێک کە تۆ بڵەی زۆر فێڵبازە و ئامادەیە.»

دوکتۆرەکە نەیتوانی بزەی سەرلێوی بشارێتەوە، وەڵامی داوە: بەو تریاکە کەمەی کە من دەی‌دەمێ قەت ناتوانێ پاسەوانەکە دەرمان‌داوکات، بەڵام سەبارەت بەفێڵ و تەڵەکەکەی ـ جێگای مەترسی نییە،چونکە لەمردنەوە زۆرنزیکە.»

هەرچی بێ پێمخۆش نییە کە تریاکی پێبدرێ. هیچ کەس بۆی نییە و ناتوانێ بەنەرمی و دڵۆڤانییەوە لەگەڵی هەڵسوکەوت کات، دەبێ ئەوشێوەیە ڕەچاوکات کە بۆم داناوە. ئەو توند و تیژیانە بۆ ئەو تەواو پڕبەپێستیەتی . با ببێتە ئەزموونێک تا جارێکی دیکە فێرنەبێ دەستبەرێ بۆ میلەئاسنەکانی پەنجەرەکە.

دوکتور بوێرانە گوتی: «بەڵام یاسا ئەشکەنجە ڕەددەکاتەوە، ئەم ئیش و کارانە لەسنوور و حدودی یاسادا نییە.»

قایمەقام بەتووڕەیی و ڕقهەستاویەوە گوتی: «پێموایە یاسا شتێکی سەبارەت بە تریاک نەوتووە.

ـ بەڵێ سەرهەنگ ئەو لە ژێر ئەرک و بەرپرسیارەتی تودایە، تۆ دەتوانی کە ڕێگا و شوێنی بۆ بکێشی؟، بەڵام لانیکەم هیوادارم کە ئیزنی ئەوە بدەی کە پەتو بەندەچەرمیەکانی لێبکەینەوە. ئەوانە شتێکی زیادین کە لە سەر ڕۆژەڕەشی و بەدبەختی ئەو قورسایی دەکەن. ئێستا خۆ ئەو ناتوانێ ببزوێ، چبگا بەوەی کە هەڵێ، ئەگەر ئازادیشی بکەی ناتوانێ خۆی بەسەر پێوە ڕاگرێ.

ـ ئاغای بەڕێز بەڕای من، دوکتۆریش وەک خەڵکی ئاسایی هەڵە دەکات. ئێستاش بەڕۆحێکی ئاسوودەوە ئەوم بەستۆتەوە و دەبێ هەر ئاواش بمێنێتەوە.

ـ دەلانیکەم ئەوپەت و گوریسانەی کەمێ شلکەوە. ئاوا توندبەستنی بەندییەکی زەلیل کارێکی شاغیگەریە.

ـ چۆن بەستراونەتەوە هەروا دەمێنەوە ئاغاگیان زۆرسوپاسیشت دەکەم کە سەبارەت بە شاغی بوون و ناجوامێری ئەو شتە قۆڕانە لەگەڵ مندا نەدوێی، من هیچکارێکی بێمەبەست و بێهۆ ناکەم.

بەو شێوەیە شەوی حەوتەم بەئازار و دوور لە هەرئاساییشێک گوزەرا، و ئەوسەربازەی کە لەبەردرگای ژوورە تاکەکەسیەکەیدا قەرەوڵ بوو لەبەر ناڵە و هاواری جەرگبڕی ئەو بەدرێژایی شەو لەرزی و خاچی لە سەر سینگی کێشا. مێشەکەرانە هەروا خۆڕاگر بوو. ناڵەناڵی مێشەکەرانە ئاخرەکەی سەربازەکەی وا

لێ کرد تا لە ئەرکی خۆیدا کەمێ کۆتا بێ و دڵسۆزیی بۆ بکات. یاساوڵەکە کاتژمێر شەشی بەیانی، پێشئەوەی دەوامەکەی تەواو بێ هێواش درگاکەی کردەوە و سووکێک چووە ژووری. ئەو دەیزانی کە کارێکی نابەجێ دەکات، بەڵام نەیتوانی خۆی ڕازی بکات بەوەی پێشئەوەی کە پۆستەکەی تەواو بێ نەچێ و بەتاقە وشەیەکیش بێ دڵ خۆشیی نەداتەوە.

مێشەکەرانەی دیت کە بەچاوی قووچاو و بەدەمی کراوەوە بەبێجووڵە ڕاکشاوە. ساتێ بەبێدەنگی ڕاوەستا، دوایە دانەوی و پرسی: «ئاغا، چۆنت یارییدە بدەم تاکەمێ لەو ئازارەت کەم بێتەوە؟ تەنیا خولەکێکم ماوە.»

مێشەکەرانە چاوەکانی کردەوە و بەدەم ئاە و ناڵەوە گوتی: «لێمگەڕێ! بڕۆ و لێمگەڕێ!»

مێشەکەرانە ئەوەندە ماندوو بوو، پێش ئەوەی سەربازەکە بگەڕێتەوە سەر پۆستەکەی خۆی خەوی لێکەوتبوو.

قایمەقام دوای دەڕۆژی دیکە دیسانەوە چووەوە بۆ کۆشک، بەڵام زانی کە کاردینال چووە سەر لەنەخۆشێک هەڵێنی لەپیودوتاو Pieve Dottavo وادیاربوو هەتا پاشنیوەڕۆ ناگەڕێتەوە بۆماڵێ. هەر ئەو شەوە پێشئەوەی کە دەست بکات بەشێوخواردن، خزمەتکارەکەی هاتە ژووری و ڕایگەیاند:«قوربان نەفەرێک هاتووە و دەیهەوێ قسەتان لەگەڵ بکات.»

قایمەقام دوای ئەوەی کە بەپەلە چاوێکی لەئاوێنەکە کرد تا دڵنیابێ کە یونیفورمەکەی ڕێکوپێکە، بە قەیافەیێکەوە بەرەو ژووری پێشوازی کردنی میوان کەوتەڕێ.

مونتانلی لە ژووری پێشوازی کردنی میوان دانیشتبوو، ئارام دەستی دەدا بەسەر دەسکی کورسیەکەدا ، هێڵێکی پەرێشانی لەتەوێڵیدا بەدیار دەکەوت. لەپەنجەرەکەوە لە دەرێی دەڕوانی.

مونتانلی قسە ماقووڵەکانی قایمەقامی بەشێوەیەکی سووک و بێحورمەتانە و بەتووڕەییەوە وەڵام داوە، وەکئەوەی لەگەڵ گوندییەک ئاخافتن بکات و گوتی: «وامبیست کە ئەمڕۆکە هاتبووی من ببینی. دەبێ هەر لە سەر ئەوباسە بێ کەمن پێمخۆشبوو لەگەڵت بدوێم.»

- قوربان باسەكە لە سەر ڕیوارز بوو.
- شكم بۆی چووبوو، لەم چەند ڕۆژەی دواییدا بیرم لێ كردووەتەوە، بەڵام پێشئەوەی كە لە سەر ئەوباسە بدوێین، دەمهەوێ بزانم كە ئایا شتێكی تازەی وا هەیە كە پێم ڕابگەیێنی.»
قایمەقام بەشێوەیەكی داهێزراوانە سمێڵی خۆی كێشا: «ڕاستیەكەی ئەوەیە كە من بوێ هاتبووم بۆ لات تا بزانم ئێوە بابەتێك یان باسێكت هەیە كە پێمی بڵێی. ئەگەر ئێستاش دژی ئەو گەلاڵەی منی كە دەمویست جێبەجێی كەم، زۆرخۆشحاڵ دەبم كە گوێبیستی ڕێنوێنییەكانت بم، چونكە بەڕاستی ئیتر نازانم كە چی بكەم.»
- بۆ كێشەیەكی تازە هاتووەتە ئاراوە؟
تەنیا ئەوەی كە پێنجشەممەی داهاتوو سێی ژوئێنە Courpus Domini و دەبێ پێشئەوەی ئەو ڕۆژە بێت ئەم كێشەیە جێبەجێ بكرێ و كۆتایی پێبێ.
- وایە پێنجشەممە Courpus Dominiیە، بەڵام بۆچی بەر لە هاتنی ئەو ڕۆژەدا دەبێ كۆتایی پێبێ؟
- قوربان ئەگەر بەڕواڵەت وادیارە كە دژایەتیت لەگەڵ دەكەم بە دڵ داوای لێبوردنت لێدەكەم، بەڵام ئەگەر تا ئەو ڕۆژە كێشەی ڕیوارز كۆتایی پێ نەیێت، ناتوانم بەرپرسیارەتی ئاسایش و هێوربوونی شار بگرمە ئەستۆ. هەروەكوو بۆخۆتان ئاگادارن لەو ڕۆژەدا، هەموو مرۆڤە تووڕە و تۆسن و شەڕاژۆكانی ناوچە كوێستانییەكان لێرە كۆ دەبنەوە و زۆر لەوە دەترسم كە دەروازەكانی قەڵاكە بشكێنن و ڕیوارز ببەنە دەرەوە. هەڵبەتە سەركەوتوونابن، من بە تەواوەتی ئاگاداری لێدەكەم، گمانەت ئەگەر بكرێ بە باڕووت و گوللە و فیشەك خاشەبڕیان دەكەم، بەڵام ڕەنگە لەوڕۆژەدا لەگەڵ ڕووداوێكی هاوشێوەی ئەو ڕۆژە ڕووبەڕوو ببینەوە. لێرە، لەڕۆمانیادا مرۆڤ گەلێكی زۆر توندەتەبیعەت و شەڕانخێوي تێدایە و ئەگەر ئەو ڕۆژە بێت كە خەنجەرەكانیان لەكالان دركێشن...
- بەڕای من بەچاوەدێرییەكی باشتر دەتوانین پێشی كێرد و خەنجەر بگرین. من هەمیشە لە سەر ئەوڕایە سووربووم كە ئەگەر بەشێوەیەكی ژێر

و بیرمەندانە لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچەیە هەڵسوکەوت بکریّ، زۆرئاسان
بەکریّ ئیش و کارەکان ڕەوتی ئاسایی خۆیان تیّپەڕیّنن. هەڵبەتە ئەگەر
زەمانێک لەگەڵ ڕۆمانیاییەک بەتووندی و هەڕەشە و گوڕەشە هەڵسوکەوت
بکەی، بیّگومان لیّتڕاست دەبیّتەوە و دەبیّتە بەرهەڵستکارت. جیا لەوە، ئایا
بەڵگەیەکت پیّیە بۆ ئەوەی کە گەلاڵەیەکی نوێی هەلاتن لەئارادایە؟

ـ من هەمئەمڕۆکە و هەمدوێنەکە لەسیخوڕەکانی خۆمانم بیستووە کە
دەنگویەکی وا لەتەواوی ئەم ناوچەیەدا بلاو بووەتەوە، کە گوایا خەڵکی ئامادەی
ڕاپەڕین و ئاژاوەیەکی گشتین، بەلام زانیارییەکی وامان لە سەر وردەکاریەکانی
نییە. ئەگەر زانیارییەکی زیاترمان هەبایەت، ئاسانتر دەمانتوانی بەربەرەکانی لەگەڵ
بکەین. من بۆخۆم پاش ئەوترسەی کە ئەو ڕۆژە داوێنی گرتین وامپیّباشە
دەسپیّش خەرییەک بکەین.هەر بۆیە لە ڕێوییەکی فیّڵبازی وەک ڕیوارز ناتوانین
بەباشی و بەجۆرەی پیّویست چاوەدێری بکەین.

ـ تازەترین زانیاری سەبارەت بە ڕیوارز کە بیستوومە ئەوەیە کە بە هۆی
نەخۆشیەوە نەدەتوانیّ بجووڵیّت و نەدەتوانیّ قسە بکات. یانی کەسێکی کە
ئاوابیّ بەرەوچاک بوونەوە هەنگاو دەنیّ؟

ـ قوربان وادیارە کە حاڵی بەرەوباشی دەڕوات و دەبیّ ئیّستا زۆر
باشتربیّ. بیّگومان لەوەپێش زۆربەتوندی نەخۆش بوو ـ مەگین ئەوەی کە
لەوماوەیەدا درۆی کردبیّ و فیّڵ و تەڵەکە بیّت.

ـ ئایا بۆ ئەو بەشک بوونە هۆ و بەڵگەیەکیشت هەیە؟

ـ ڕاستیەکەی ئەوەیە کە دوکتۆر لە سەر ئەو بڕوایەیە کە بەڕاستی
نەخۆش بووە و ئەم نەخۆشیە کوتوپڕە شتێکی زۆر سەیرە، بەلام ئێستای
وانەماوە و وردەوەردە خەریکە باشتر دەبیّ و زیتتر و سەربزیّوتر لەجاران.

ـ چی دیکەشی کردووە؟

قایمەقام کە بەند و تەناف و بەستنەکانی دەهاتەوە یاد بەشلەبزەیەکەوە وەلامی
داوە: «بەخۆشییەوە دەبیّ بلێم کە ئیتر ناتوانیّ کاریّکی خراپ و بەرچاو بکات،
بەلام ڕەفتار و هەڵسوکەوتی زۆر نابار و خراپە. دوێنیّ بەیانی کە چوومە
ژوورەکەیەوە تا پرسیارگەلیّکی لیّبکەم، ـ هیّشتا تەواو باش نەبۆەتەوە کە خۆی

بەسەر پێوە بگریّ و بۆ لێپرسینەوە بێت بۆلای من ـ ڕاستیەکەی ئەوەیە کە گوتم باشتر وایە تا تەواو سەرپێ نەکەوتۆتەوە، خۆم نەخەمە ئەوترس و دڵەڕاوکێیە کە خەڵک و جەماوەر بەو شێوەیە ببینن، ئەو جۆرە حەقایەتە سەیر و درۆیانە زۆر زوو لەنێو خەڵکیدا بڵاو دەبێتەوە.»

ـ یانی بۆ لێپرسینەوە چووی بۆئەویّ؟

ـ بەڵێ قوربان، پێموابوو باشتر ئامادە بووە بۆ بیستنی قسەی حیسابی و باوەڕپێکراو.

مونتانلی وەکئەوەی بوونەوەرێکی نوێی، نفرەتاوی هەڵسەنگێنێت بەئەنقەست سەرتاپاژوور لێیڕووانی. هەرچەند بەخۆشییەوە قایمەقام خەریکی بەندی شمشێرەکەی بوو و گۆشەنیگاکەی نەدیت، هێواش و بەئارامییەوە دەرێژەی پێدا: «سەبارەت بە ئەو هیچ ئەشکەنجە و شەڕاژوییەکی تایبەتیم نەنواندووە، بەڵام ناچاربووم کە کەمێک توند و سەختی بگرم ـ بەتایبەتیش کە ئێرە گرتووخانەیەکی لەشکرییە. هەروەها پێموابوو کە ئەگەر کەمێ نەرم ونییانی لە گەڵ بکریّ ،بەشکم ڕەنگدانەوەیەکی باشی هەبیّ،هەر بۆیە ئەمرم کرد، ئەگەر بۆخوی بیهەویّ و ڕەفتارێکی ژیر و ئاقڵانەی هەبیّ. ئەوە یاسای توند و تیژی زۆر کەم دەبێتەوە، جا قوربان ئێوە پێتانوایە چ وەڵامێکی پێدامەوە؟

هەروا کە ڕاکشابوو وەک گورگێکی نێو ڕکە، برێک لێم وردبووەوە و دوایە زۆر بەئارامی و لە سەرەخۆییەوە گوتی: «سەرهەنگ من ناتوانم هەستم و بتخنکێنم، بەڵام ددانەکانم زۆرتیژن، باشتروایە کە کەمێک گەردنت لەدەمم دوور ڕاگریّ.» ڕاست وەک پشیلەیەکی شاغی وایە کە ماڵی نابیّ.

مونتانلی بەهێواشییەکەوە گوتی: «ئەگەر وایپێگوتبێتی شتێکی سەیر نییە، بەڵام من هاتووم پرسیارێکت لێبکەم. تۆ شەرەفت تۆ لە سەر ئەوبڕوایەی کە بوونی ڕیوارز لەوگرتووخانەیەدا هۆی شڵەژان و ئاژاوەی ئەم ناوچەیە و جێگای مەترسییە؟

ـ قوربان پڕبەدڵ دڵنیام و ڕاموایە.

- بەڕای تۆ بۆئەوەی کە هەلا و هەنگامەیەک سازنەبێ و مەترسی خوێنڕژان نەیەتە ئاراوە، سەداسەد پێویستە کە تانێ هاتنی ڕۆژی Courpus Domini دەبێ کارێک بکرێ کە لەشەڕ و بەلای ڕێوارز خۆمان ئاسوودە کەین؟

- من تەنیا دەتوانم دووپاتی کەمەوە ئەگەر ئەو لەڕۆژی پێنجشەممەدا لێرەبێ پێموانییە کە ئەو جێژنە بەبێ شەڕ و ئاژاوە کۆتایی پێبێ، شایەدیش تێکهەڵپڕشانێکی زۆرخراپیشی لێ بقەومێ.

یانی تۆ پێتوایە کە ئەگەر ئەو لێرە نەبێ کێشەیەکی مەترسیداری ئاوا ناقەومێ؟

- ئەگەر وابکەین، یان ئاژاوەیەکی گەورە نایەتە ڕۆژەڤەوە یان لانیکەم هەرا و هوریایەکی چکۆلە و بەردەفڕکەیەکی کەم دەبێ. ئەگەر بەڕێزتان ڕێگەچارەیەک بۆنەقەومانی ئەوئاژاوەیە بدۆزنەوە، من هێوربوون و ئاسایشی شار دەگرمە ئەستۆ. خودا لەوسەرە ئاگادارە کە دڵەخورپێمە و چاوەڕوانی ڕووداوی زۆرمەترسیدار دەکەم. من پێموایە گەلاڵەی دەربازبوونێکی نوێ لەئارادایە، پێنجشەممەش ئەوڕۆژەیە کە دەبێ چاوەڕوانی بین و ئەگەر بەیانی ئەو ڕۆژە بزانن کە ڕێوارز لەگرتووخانەکەدا نییە، گەلاڵە و فڕوفێڵەکەیان دەبێتە بڵقی سەرئاو، ئیتر هیچ بەهانە و هۆیەکیان نابێ بۆ دەستپێ کردنی شەڕ و ئاژاوە، بەلام ئەگەر قەرار وابێ کە پاشەکشێیان پێبکەین و ئەوانیش لەنێو ئاپۆرەی جەماوەردا خەنجەرەکانیان لە کالان دەرئەکێشن،ئیدی ڕەنگە تا ئێوارێ هەموو جێگایەک لەنێو گڕوکڵپەی ئاگردا بسووتێ.

- ئەیبۆچی نایێنێرن بۆ ڕاونا؟

- قوربان، خودا دەزانێ کە زۆرم پێخۆش دەبێ!، بەلام چۆن دەتوانم ئاگاداری لێبکەم کە خەڵکی دەربازی نەکەن؟ من بەقەدەر پێویست سەربازم نییە کە لە بەرانبەر هێرشێکی چەکدارانەدا بەربەرەکانی بکات. هەموو خەڵکی گوندنشین و داوێنی چیاکان یان کارد و خەنجەرە یان تفەنگی سەرپڕ، یان شتێکی ئەلەوچەشنەیان هەیە.

- یانی هێشتا سووری لە سەر پێکهێنانی دادگاییەکی لەشکری و پێداگری لە سەر ئەوەی کە ئێزن لە من بخوازی؟

- قوربان ببوورە، من تەنیا داواکارییەکم لە ئێوە هەیە - یاریدەم بدە تا سەرهەڵدان و خوێنڕشتنێک نەخوڵقێ. من تەواو ئەوەم قەبووڵە کە دادگا لەشکریەکان، وەک دادگای سەرهەنگ فەردی، زۆرجار بێئەوەی پێویست بێ توندئاژو بوون و بەجێگای ئەوەی خەڵکی بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، بوونەتە هۆی ڕاسانی جەماوەر، بەڵام بەڕای من پێکهێنانی دادگایەکی لەشکری ئا لەم هەلومەرجەدا کارێکی ئاقڵانە و زۆرپێویستە کە دەبێتە هۆی لەمپەڕێک و بەربەستێک دژ بەوئاژاوە و ڕاپەڕینە ترسناکە و ببێتە هۆی ئەوەی کە لەلایەن پاپای بەڕێزەوە یاسای داخرانی دادگا لەشکریەکان هەڵپسێردرێت.

قایمەقام بەلووتبەرزییەکەوە بەدەرپەڕاندنی سنگەوە قسەکانی خۆی تەواو کرد و چاوەڕوانی وەڵامی کاردینال بوو، وەڵامدانەوەکەی زۆری خایاند، کاتێکیش کە وەڵامی داوە بەشێوەیەکی زۆر سەیر و چاوەڕوان نەکراو بوو: «سەرهەنگ فێراری ئایا باوەڕت بەخودا هەیە؟»

سەرهەنگ بەشێوەیەکی سەرسوورهێنەرەوە گوتی: «قوربان!»

مونتانلی هەروا کە هەڵدەستایە سەرپێ بەچاوێکی بیرمەندانەوە لە سەرەوە لێیدەڕوانی دووپاتی کردەوە: «ئایا باوەڕت بەخودا هەیە؟»

سەرهەنگیش هەستا سەرپێ: «قوربان، من خاچپەرەستێکی ڕاستەقینەم و هەمیشە بەسنگفراوانییەوە گوناحەکانی من بەخشراوە.»

مونتانلی خاچەکەی سەرسنگی ئەوی هەڵێنا: «دەئەگەروایە بەوخاچە سوێندبخۆ، - کە لەبەرخاتری ئێوە مرد - سوێند بخۆ درۆت لەگەڵ نەکردووم و ئەوەی گوتووتە ڕاست بووە.» سەرهەنگ ڕەق ڕاوەستا، بەسەرسوورمانێکەوە لێیڕووانی. ئەو، نەیدەتوانی تەواو لەوە دڵنیابێ کە کامەیان شێتن، ئەو یان کاردینال.

مونتانلی درێژەی بەقسەکانی دا: «تۆ داوام لێدەکەی کە ڕازیبم بەمردنی پیاوێک، ئەگەر ناترسی و دەوێری ئەوخاچە ماچ بکە و پێمبڵێ کە باوەڕت بەوە هەیە کە بێجگە لەوکارەی کە گوتت هیچ ڕێگایەکی دیکە نییە بۆئەوەی

پێشی ئەوخوێنڕشتنە بگیردرێ و لەبیریشت نەچێ ئەگەر درۆم لەگەڵ بکەی، ڕۆحی هەرمانی خۆت دەخەیتە گێژاوی مەترسیەوە.»

قایمەقام کەمێ ڕاما و دوایە دانەوی و خاچەکەی نایە سەرلێوی و گوتی: «ئیمانم پێی هەیە.»

مونتانلی ئارام ڕووی‌وەرگێڕا: «سبەینێ وەڵامی ئەسێجیت دەدەمەوە، بەڵام لەپێش‌دا دەبێ ڕیوارز ببینم و بەتەنیایی قسەی لەگەڵ بکەم.»

- قوربان، ڕێگەم پێ‌بدە تا پێت‌ڕابگەیەنم - دڵنیام کە پەشیمان دەبیتەوە. هەر لەوبارەیەوە دوێنەکە بە یاساوڵەکەدا خەبەری ناردبوو و داوای دیداری لەگەڵ جەنابتانی کردبوو، بەڵام من گوێم نەدایە، چونکە...

مونتانلی قسەکەی ئەوی دووپات کردەوە: «گوێت نەدایە! کەسێک لەوهەل‌ومەرجە تاڵەدا پەیامێک دەنێرێ و تۆش هیچ بایەخێکی پێ‌نادەی؟»

- ئەگەر بەڕێزتان ئەوکارەی منتان پێ‌باش نەبووە، داوای لێبووردن دەکەم. نەمدەویست کەسێکی ئاوا ڕووهەڵماڵدراو ببێتە هۆی سەرئێشەی ئێوە و کات‌وساتتان بەفیڕۆ بدات، من ئێستاکە زۆر باش ڕیوارز دەناسم، لەو ناسینەش ئەوەندە دڵنیام کە ئەو، بەتەمای ئیهانە کردن بە جەنابت بووە و ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە سەر ئیزنی بەڕێزتان پێتان ڕادەگەیەنم کە تەنانەت نابێ بە ئارخایەنییەوە لێی نزیک ببیەوەۆ بەڕاستی کەسایەتییەکی مەترسیدارە و ئەوەم بە پێویست زانی کە بە حاڵ ڕێگەی جووڵە و بزواندنی بۆ بهێڵمەوە...»

- هەر بەڕاستی پێت‌وایە کە پیاوێکی نەخۆش و بێ‌چەک، کە لە ژێر کۆت و بەنددایە مەترسیدارە؟»

مونتانلی زۆر بەهێوریەوە قسەی دەکرد، بەڵام سەرهەنگ بەبزەکەی‌دا هەستی بە سووکایەتی شلەبزەی سەر لێوی مونتانلی کرد، هەربۆیە دڵی لێی ڕەنجا و سوورهەڵگەڕا و بەبێ‌مەیلیەوە گوتی: «هەرجۆرێکی کە پێت‌خۆشە من تەنیا دەمویست کە جەنابتان گوێ‌بیستی کفر و دەم‌شڕی ئەو نەبن.»

- بەڕای تۆ کامیەک لەوقسانە بۆ پیاوێکی خاچپەرەست بەدبەختی و خەماویە: بیستنی کفرێکی کە بگوترێ، یان ڕزگار کردنی مرۆڤێک کە لەپەرێشانی و ئاڵۆزیدایە؟

قایمەقام بەقەیافەیەکی فەرمی خۆی وەک داوەڵێکی وشک و بێڕۆح ڕاوەستا. ئەو پڕبەدڵ بەقسە و ڕەفتاری مونتانلی دڵمەند بوو، و ئەوەی لە ژێر پەردەی شەرم و ئەدەبی خۆیدا - کە دژایەتی لەگەڵ کەسایەتی ئەو بوو - شاردبووەوە.

پرسی: «قوربان کەیدەتانەوێ زیندانییەکە ببینن؟»

- هەر ئێستا دەچم بۆلای ئەو.

- هەرچونێک جەنابتان پێتان خۆشە. ئەگەر دەکرێ کەمێک ڕاوەستن تا کەسێک بنێرم بۆلای تا خۆی حازر و بزر و ئامادە بکا.

قایمەقام بەپەلە لەپشت مێزەکەی هاتە ئەولاوە. ئەو نەیدەویست کە مونتانلی ئەو بەند و تەنافانە ببینێ.

- سوپاست دەکەم، پێمخۆشە لەوەپێش چۆن بووە هەروا بیبینم. ڕاست بەرەوقەڵا دەڕۆم. شەوباش و خوداحافیز سەرهەنگ. سبەینێ بەیانی دەتوانی چاوەڕوانی وەڵامەکەی من بی.

# ٦

مێشەکەرانە دوای ئەوەی کە بیستی قفڵی درگای ژوورە تاکەکەسیەکەی هەڵگیراوە، بەبێتاقەتی و بێزارییەوە چاوێکی گێڕا، ئەو پێیوابوو کە قایمەقامە کە دیسان هاتووەتەوە تا بە لێپرسینەوەیەکی دیکە ئازاری بدات. چەند سەربازێک کە تفەنگە درێژەکانیان وەدیوارەکان دەکەوت لەپلیکانەکان سەرکەوتن، دوایە گوێی لە دەنگێک بوو کە بە ڕێزێکەوە دەدوا: «قوربان، ئێرە کەمێک خلیسکە.»

مێشەکەرانە داچڵەکی و هەڵبەزییەوە، دوایە هەرچەند کە لە ژێر ئازاری ئەوپەت و گوریسانەدا بەباشی هەناسەی بۆ هەڵنەدەکێشرا، هەستێکی ڕاگرت و برێک خۆی کۆ کردەوە.

مونتانلی لەگەڵ سەرپەل و سێیاساوڵەکەهاتە ژوورێ.

سەرپەلەکە بەناڕەحەتییەکەوە گوتی: «قوربان ئەگەر قەدەرێک ڕاوەستن یەکێ لە سەربازەکانی من کورسییەکتان بۆدێنێ. چووەتەخوارێ کە بیهێنێ. قوربان بەگەورەیی خۆتان ببورن ـ ئەگەر لەوەپێش ئاگادار بکرایەین خۆمان تەیار و ئامادە دەکرد.»

ـ پێویستی بەخۆئامادە کردن نییە. سەرپەل تکایە خۆت و سەربازەکان بچنە سەر پلیکانەکان چاوەڕوانم بن پێمخۆشە بە تەنیا بین دەکرێ ئەو کارە بکەن؟

ـ بەڵێ قوربان، کورسیەکەی هێنا، لەپەنای ئەوی دانێم؟

مێشەکەرانە چاوەکانی قووچاندبوو و ڕاکشابوو، بەڵام هەستی دەکرد کە مونتانلی چاوی لێدەکا.

سەرپەلەکە گوتی: «قوربان پێموایە کە خەوتووە.»، بەڵام مێشەکەرانە چاوەکانی هەڵێنا و گوتی: «نا»

سەربازەکان کاتێ کە لە ژوورەکە دەچوونە دەرەوە، بە هۆی گوڕەی مونتانلییەوە ڕاوەستان، کاتێ کە ئاوڕیان داوە، ئەویان دیت کە دانەویوە و پەتوگوریسەکان دەپشکنێ.

مونتانلی پرسی: «کێ ئەو کارەی کردووە؟»

سەرپەل بەشڵەژاوییەکەوە کە کڵاوەکەی ئەم دەست و ئەودەست دەکرد: «قوربان ئەمر و فەرمانی قایمەقام بوو.»

مونتانلی بەدەنگێکی تووڕە و ناڕەحەتییەوە گوتی: «سینیور ڕیوارز من لەم کارە ئاگادار نەبووم.»

مێشەکەرانە بە تەوسێکەوە بزەیەکی تاڵی هاتێ و گوتی: «ئەودەم بە بەڕێزتانم گوت کە قـ ـ قەت چاوەڕوانی ئەوەم نییە بەدڵۆڤانییەوە دەست بێنن بەسەرمدا.»

ـ سەرپەل ئەم فەرمانە کەی ڕاگەیێندراوە؟

ـ قوربان هەر لەوکاتەوە کە ویستی هەڵێت.

ـ زیاتر لەدووحەوتەیە؟ چەقۆیەک بێنە و هەموو ئەو پەتانە هەڵبڕە.

ـ بمبورە قوربان، دوکتۆر ویستی کە ئەوانە لابردرێن، بەڵام سەرهەنگ فێراری، نەیهێشت.

ـ خێرا چەقویەک بێنە!

مونتانلی دەنگی هەڵنەهێنا، بەڵام سەربازەکان دیتیان کە ئەو لەتووڕەیی‌دا وەکوو گەچ سپی هەڵگەڕاوە. سەرپەل خێرا چەقۆیەکی لەگیرفانی دەرهێنا. دانەوی و تەنافە بەستراوەکانی سەر بازوڵەی بڕی. ئەوَ پیاوێکی بەشێنەیی بوو و دەستی تێکەڵاو هات و تەنافەکەی توندتر کرد. مێشەکەرانە لەحەیبەتا خۆی کێشاوە و هەرچەند خۆڕاگربوو، بەڵام لێوی خۆی گەست. مونتانلی خێرا هاتەپێشەوە: «تۆ نازانی کە چۆن ئەوانە ببڕی، چەقوکەم بدەیە بزانم.»

ـ «ئایش!» هەر کە پەت و تەنافەکان لێکرانەوە، مێشەکەرانە بەخۆشییەکی زۆرەوە دەستەکانی تەواو ئاواڵە کرد. دوایە مونتانلی تەنافێکی دیکەی کە پاژنە و لاقی مێشەکەرانەی پێوە بەسترابوو بڕی.

- سەرپەل! زەنجیرەکان لێ بکەوە و دوایە وەرە بۆئێرە دەمهەوێ قسەت لەگەڵ بکەم. لەپەنای پەنجەرەکە ڕاوەستا و چاوی لەکاری سەرپەل کرد. سەرپەل زەنجیرەکانی خستە خوارێ و لێی نزیک بووەوە.

مونتانلی گوتی: «دەی ئەوەی لەم چەند ڕۆژەدا ڕوویداوە بۆم باس بکە.»

سەرپەل هەرچەند پێیخۆش نەبوو، بەڵام ئەوەی سەبارەت بە نەخۆشی مێشەکەرانە و «کردەوە و بەربەستەکانی گرتووخانە» و هەوڵی بێئاکامی دوکتور بۆ پێشگیری لەئەشکەنجە و نەخۆشی دەیزانی باسی کرد و درێژەی پێدا: «بەڵام قوربان بەڕای من، سەرهەنگ دەیویست ئەو کۆت و بەندانە هەروا بمێننەوە بۆ پێلێنان و قسە لێدەرکێشان.»

- پێلێنان و قسە لێدەرکێشان؟

- بەڵێ قوربان، پێرەکە بیستم کە سەرهەنگ دەیگوت ئەگەر ئەم (چاوێکی لە مێشەکەرانە کرد)وەڵامی پرسیارەکەی ئەوی دابایەتەوە کۆت و بەندەکەی لادەبرد.

مونتانلی دەستی بەلێواری پەنجەرەکەوە نا، سەربازەکان چاویان لە یەکتری دەکرد، ئەوان قەت کاردینالی دڵۆڤان و لە سەرەخۆیان نەدیبوو کە ئاوا تووڕە بێ. مێشەکەرانە لەبیریشی چووبووەوە کە ئەوانە لێرەشن، ئەو هەموو شتێکی لەبیر چووبووەوە بێجگە لەڕزگاربوونی لەشی لە ژێر ئازاری کۆت و نیر. سەرتاپای لەشی ماسیبوو، ئێستاش بەدەرچوونی تەزووی لەشی وردەوردە هەستەدەمار و مێشکی هێور دەبووەوە، گێنگڵی دەدا و بەملا و ئەولادا خۆی دەسووڕاند.

کاردینال گوتی: «سەرپەل، ئێستا ئیتر ئێوە دەتوانن بڕۆن. پەرۆشی ئەوەش مەبن کە ئەم کارەتان کرد. ئەوەش یەکێ لە ئەرک و بەرپرسیارەتی ئێوەیە کە من لێمپرسیون و ئێوەش وەڵامتان داوەتەوە. وریابن کە کەس نەیەتە ژوورەوە. کارەکەم کە لێرە تەواوبوو بۆخۆم دێمە دەرەوە.»

دوای ئەوەی سەربازەکان چوونەدەرەوە و درگاکە پێوەدرا، مونتانلی ئانیشکی لە سەر لێواری پەنجەرەکە دانا و بۆئەوەی مێشەکەرانە دەرفەتێکی

زۆرتری هەبێ بۆ هەناسە هەڵکێشان مونتانلی ڕووانییە هەتاو کە وردەوردە خۆی لەپشت کێوەکان دەشاردەوە. خێرا گوتی: «بیستوومە کە...» لای پەنجەرەکەی بەجێهێشت و لای دۆشەکەکەی دانیشت. «دەتویست بە تەنیایی لەگەڵ من دانوستانت هەبێ. ئەگەر حاڵ و وەزعت کەمێک باشە و دەتوانی قسەم لەگەڵ بکەی من لەخزمەتت دام.»

مونتانلی بەشێوەیەکی زۆرسارد و سرِوخۆبەزلزانینەوە قسەی دەکرد کە مێشەکەرانە زۆری پێسەیر بوو. پێشئەوەی کە کۆت و بەندەکانی بکرێنەوە، لەزەینی ئەودا مێشەکەرانە تەنیا بوونەوەرێکی ئازار چێشتوو و ئەشکەنجە کراو بوو، بەڵام ئێستا ئەو وتووێژەی ئاخری هاتەوە یاد کە مێشەکەرانە ئیهانەیەکی سەیری پێ کردبوو. مێشەکەرانە دوای ئەوەی کە بەبێ وازییەوە سەری نایە سەرباسکی خۆی و بۆ سەرێی ڕووانی، ئەو بۆخۆی ئەو توانایە دەروونییەی بوو کە خۆی فەقیرکاتەوە و ڕوخساری دلۆڤان و دڵسۆزانە بنوێنێ. کاتێ کە ڕوخساری خۆی لەسێبەرەکەدا شاردبووەوە، کەس نەیدەتوانی هەست بەوە بکات کە ئێش و ژان چۆن دەیگەزێت، بەڵام کاتێ بۆ سەرەوەی ڕووانی، ڕووناکایی مانگەشەو دەم و چاوێکی ڕەنگپەڕیو و تێکسمڕاوی خستە ڕوو. مونتانلی تووڕەییەکەی دامرکا: «زۆر بەداخم لەوەی کە نەخۆش بووی. سەدحەیف و مەخابن لەوەی کە نەمزانیوە کە ئەوبەڵایانەیان بەسەر هێناوی. بێگومان ئەگەر بمزانیبایە پێشی ئەوکارانەم دەگرت.»

مێشەکەرانە شانی هەڵتەکاند و بە لە سەرەخۆییەوە گوتی: «لەشەڕدا هەموو شتێک بەقەدەریەک دابەش بووە. قوربان ئێوە لەڕووانینی خاچپەرەستانەوە دژی کۆت و بەندن، بەڵام ئەوەڕێگای ئینساف نییە کە بەتەما بی سەرهەنگیش وابیر بکاتەوە. ئەو لانیکەم ئەگەر زۆر باوەڕی بەوە هەبێ پێیخۆشە ئەوکارانە لە سەر پێست و لەشی ئەوتاقی نەکرێتەوە، شتێکی کە ڕێک و ڕ- ڕاست لە سەر من بەڕێوەبراوە، بەڵام ئەمە شتێکە پێوەندی بەئاسایشی ئەوەوە هەیە. ئێستا من ژێردەستەم و چیم لەدەست دێ؟ هەرچەندە کە بەڕێزتان گەورەییتان بەخەرجداوە و هاتوون بۆئێرە هەرچەند ڕەنگە ئەم کارەش بەپێی بیروڕای خاچپەرەستیەوە ئەنجام درابێ .

چوون بۆلای زیندانی  ـ بەڵێ! فەرامۆشم کردبوو چونکە ئێوە لەبەر چکۆلەترینی ئەوان ئەوکارەتان کردووە[1]. ئەمە ئیدی جێگای شەرم و شاردنەوە نییە، بەڵام بێگومان یەکێ لەوکەسە هەرە بچووکانە بەدڵ سوپاستان دەکات.»

کاردینال هاتە نێوقسەکانییەوە: «سینیور ڕیوارز من لەبەر تۆ هاتووم بۆئێرە ـ نە لەبەر خۆم. ئەگەر تۆ هەروەکوو گوتت، ژێرەدەستەی ئێمە نەبوایەی، ئیتر دوای ئەوەی کە ئەوقسانەت بەمن گوت، منیش قەت لەگەڵ تۆ قسەم نەدەکرد، بەڵام تۆ دووخاڵی بەرچاوت هەیە، یەکیان زیندانی و دیلی و ئەوی دیکەشیان نەخۆشیەکەت. هەربۆیە من ناتوانم نەیەم بۆئێرە. ئایا ئێستا کەمن لێرەم قسەیەکت هەیە کە من گوێم لێبێ و یان تەنیا لەبەر ئەوە ناردووتە بەشوێن مندا کە بەسووکایەتی کردن بەپیاوێکی پیری وەکوو من دەتهەوێ خۆت سەگەرمکەی؟»

وەڵامێک نەدراوە. مێشەکەرانە ڕووی‌وەرگێڕا و دەستی لە سەر چاوی دانا و ڕاکشا. ئاخرەکەی بەدەنگێکی گیراوەوە گوتی: «من زۆربەداخم ئەگەر ئێوەم پەرێشان کردووە. ئەرێ دەکرێ کەمێ ئاو بخۆمەوە؟»

لەنزیک پەنجەرەکە جەڕەیەک ئاوی لێبوو، مونتانلی هەستا و هێنای. کاتێ کە پشتی مێشەکەرانەی گرت تا هەڵی‌بستێنێ، لەپڕێکدا هەستی بەوە کرد کە پەنجە تەڕ و ساردەکانی ئەو وەک گیرەیەک مەچەکی ئەویان توند گرتووە.

مێشەکەرانە هێواش گوتی: «دەستت بێنە بۆلای من ـ خێرا ـ تەنیا ساتێک، چفەرقێکی بۆتۆ هەیە؟ تەنیا خولەکێک.» سەری دانەواند و ڕوخساری لەنێو دەست و باسکی مونتانلی‌دا شاردەوە و هەموو ئازای لەشی کەوتە لەرزین و هەنیسک‌دان.

مونتانلی دوای کەمێک گوتی: «تۆزێ ئاو بخۆوە» مێشەکەرانەش بێدەنگ بەقسەی کرد دوایە چاوەکانی قووچاند و ڕاکشا. ئەو بۆخۆی نەیدەتوانی و نەیدەزانی سەبارەت بەدەستی مونتانلی کە بەسەر گونای‌دا خشا شتێک بڵێ، تەنیا ئەوەی دەزانی کە بەدرێژایی تەمەنی لەوە ناخۆشتر و تاڵتری نەدیتووە.

---

[1]. وتەی مەسیح، لەکتێبی ئینجیل وەرگیراوە.

مونتانلی کورسیەکەی لەدۆشەکە کاییەکەی ئەو نزیک کردەوە و دانیشت. مێشەکەرانە وەک مەیتێک، بێ‌ئەوەی بجوولێت ڕاکشابوو و ڕوخساری ڕەنگ‌پەڕیو و بەقولاچوو و درێژ ببووەوە. دوای بێدەنگییەکی درێژخایەن چاوەکانی هەڵێنا و بەنیگایەکی سیحراوەیەوە ڕووانییە کاردینال.

وتی: «زۆرسوپاس، داوای لێبووردن دەکەم. پێم‌وابێ پرسیارێکت لێ کردم؟»

- هیچ لە باش ناچی و تاقەتی دانوستانت نییە. ئەگەر قسەیەک یان وتەیەکت هەیە کە بیڵەی من گوێم لێتە و هەوڵ‌ئەدەم کە سبەینێ دیسان بگەڕێمەوە لات.

- قوربان تکایە مەڕۆن - لەڕاستی‌دا هیچ نارەحەتی و کێشەیەکم نییە. لەم چەندڕۆژەی دواییدا بڕێک شلەژابووم. هەرچەندە زۆر کەڕەت خۆم وەک نەخۆش نیشان دەدا ئەینا ئەوەندەش ناساخ نەبووم - ئەگەر لە سەرهەنگ بپەرسن ئەو دەڵێ خۆی لەنەخۆشی داوە.»

مونتانلی بەهێواشی وەلامی داوە: «من پێم‌خۆشە بو خوم ئاکامی ئەم کارە دیاری بکەم .»

- سەرهەنگیش هەروا دەکا. دەزانی، جاری‌وا هەیە بەدەست‌هێنانی ئەو ئامانجانە زیرەکییەکی فێلاویانەیە. پیاو ناشزانێ کە ئەو بە تەمای کاری واشە ، بەلام جارجار بیروڕاکەی زۆر تایبەتی و جیاوازە. بۆوێنە ڕۆژی هەینی - پێم‌وابێ هەینی بوو ئێستا گێژبووم و ڕەوتی زەمەنم بڕێک لێ‌تێک‌چووە - بەڵێ، داوای کەمێ تریاکم کرد - ئەمەم جوان لەبیرە، ئەو کات هات بۆئێرە و گوتی ئەگەر من پێی بڵێم کێ بوو کە قـ - قفڵی درگاکەی شکاندووە تریاکی دەدەمێ.

لەبیرمە کە گوتی: «ئەگەر ڕاست بکەی کە نەخۆشی، بەقسەم دەکەی، ئەگەریش ڕاستییەکەی نەڵێی نیشانەی ئەوەیە کە تۆ خەریکی فێڵ و تەڵەکەی،» لەوەپێش قەت بیرم لەشتی‌وا نەکردبووەوە کە ئەمە چەندە بێ‌مانا و بێ‌تامە، ئەمە ئیدی لەوشتانەیە کە بەڕاستی قۆڕ و بێ‌مانایە...

مێشەکەرانە لەپڕێکدا قاقایەکی سەیری کێشا، دوایە لەپڕێکدا ڕووی کردە کاردینال و بەپەلەپەلێکی سەیر درێژەی بەقسەکانی دا و زمانی واگیرا کە وشەکانی بەپچڕپچڕەوە دەگوت وەک لاڵەپەتەیەک: «تۆ پێت‌وانییە کە ئـ - ئەمە هیچ

و پـ ـ پووچ و بێمانایه؟ هـ ـ هەڵبەته که پێتوا نـ ـ نییه، کەسایەتیه ئـ ـ ئایینییەکان قـ ـ قەت جەفەنگ و شـ ـ شۆخی نازانن ـ ئێوه هەموو شتێک له ژـ ژەنگی خەمدا دەبینن. بۆ و ـ وێنه ئەو شەوه له کـ ـ کلیسای جامیعه ـ چەند و ـ وشک و مڕومۆچ بووی؟ دوای ئەوه ـ من بۆدەبێ قەیافەیەکی مات و خـ ـ خەماویم هەبێ لەکاتێکدا که لەجلوبەرگی ز ـ زیارەتکارێکدا بووم! من باوەڕ ناکەم که تۆ تەنانەت ئەمشەو که هاتووی بۆئێره قسه و نوکتەیەکی خۆشت پێبێ.»

مونتانلی هەستا سەرپێ: «من بۆیه هاتووم بۆئێره تا بزانم که تۆ چقسەیەکت هەیه، بەلام پێموایه که تۆ زۆر لەوه شڵەژاوتربی که بتوانی ئەمشەو پێمبڵەی. واباشتره که دوکتۆر بێت و دەرزیەکت لێدا تا کەمێ هێور ببیەوه و دوای ئەوەی که ئەمشەو خەوتی سبەینێ قسەی له سەر دەکەین.»

ـ خەو؟ زۆر به ڕاحەتی دەخەوم. قوربان ئەو کاتەی که بەگەلاڵەکەی سەرهەنگ، ڕازی بوونی خۆتت ڕاگەیاند چـ ـ چەند گرەم لەسـ ـ سورب هێورم دەکاتەوه. مارتینی هەروا که بەڕوخسارێکی سامناک و سەیرەوه ڕووی لەئەو کرد گوتی: «لەمەبەستەکەت تێناگەم.»

مێشەکەرانه دیسانەوه قاقایەکی کێشا: «قوربان هەر بەڕاست، ئـ ـ ئەوه گەورەترین و بەرزترین چاکەکاری خاچپەرەستی و ئایینییه، ئـ ـ ئایا پێتوایه من نـ ـ نازانم که قایمەقام چۆن خۆی بەدار و بەردد ا دەکوتێ تا تۆ ڕازی بکات بۆ پێکهـ ـ هێنانی دادگاییەکی لەشکری، ئەمه ڕاست ئەوکاره گەورەیه که هەموو برا پـ ـ پاک و بێگەردەکانی هاوشێوەی خۆت ـ که له پلەوپایەی تۆدان ـ ئەنجامی دەدەن و ئەنجامیان دەدا، Coso Fon Tutti[۲] و تۆش خەریکی چاکەکارییەکی زۆر و خراپەکارییەکی کەمی! ئایا بەڕاستی ئەمه بایەخی ئەم هەمووه شەو نەخوونییەی نییه که بەخەبەر بووی!»

مونتانلی پێکەنینەکەی ئەوێ بڕی: «تکایه بۆ ساتێکیش بێ پێمەکەنه و پێمبڵێ ئەوانەت لەکوێوه بیستووه. لەم بارەوه کێ قسەی لەگەڵ کردووی؟»

---

۲. ئەم وشانه ئیتالیایین و بەم مانایەیه: هەموویان وادەکەن.

مەگین سەرهەنگ پێی‌نەگوتووی کە من مرۆڤ نیم و شـ ـ شەیتانم؟ نا؟ زۆرجار ئەوەی بە خۆم گوتوە! بەڵێ من ئەوەندە شەیتانم کە تەنانەت هزر وبیری خەڵکیش دەخوێنمەوە.بەڕای بەڕێزتان من مایە فیتنەیەکی بێ‌دینم و پێت‌خۆشە کە بێ‌ئەوەی ویژدانی هەستیاری تۆ خەوش‌داربێ کەسێکی دیکە ـ ئەوەی کە دەبێ لە سەر من بەڕێوە ببردرێت ـ بگرێتە ئەستۆ. ئەم پێش بینییەی من تەواو ڕاستە. وانییە؟»

کاردینال هەروا کە بەقورس و قایمیەوە لەپەنای‌دا دانیشتبوو گوتی: «گوێ‌بگرە، هەر چۆنێک لەم بارەوە تو ئاگاداربووی باوابێ ،بێ گومان وایە.ڕاستییەکەی ئەوەیە، سەرهەنگ فێراری لەوە دەترسێ کە هاوڕێیانی تۆ بەتەمان کە دەربازت کەن و ئەویش دەیهەوێ ڕێگایان لێ‌بگرێ ـ هەروەکوو خۆت گوتت. چاوت‌لێیە من لەگەڵ تۆ چەند ڕێک‌وڕاست قسە دەکەم.»

مێشەکەرانە بەتەوسەوە گوتی: «قوربان ئێوە لە ڕاستگۆییدا بە ناوبانگ بوون.»

مونتانلی درێژەی بەقسەکانی‌دا: «هەڵبەتە بۆخۆت دەزانی کە من مافی ئەوەم نییە کە خۆم لە کاروباری سیاسی هەڵقوتێنم. من ئۆسقۆفێکم، نە نوێنەری پاپ، بەڵام لەم ناوچەیەدا دەستم زۆر دەڕوا، پێم‌وایە کە سەرهەنگ لانیکەم هەتا من ڕازی بەوکارە نەکات ناوێرێ هەنگاوێک بەرەوپێشەوە هەڵێنێتەوە. بۆ جێ‌بەجێ کردنی ئەوکارە دواکەوتوویانە من تا ئێستا بەگشتی دژایەتی خۆمم ڕاگەیاندووە و ئەویش هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی وەگەڕ خستووە تانێ من دڵنیاکات لەوەی کە ڕۆژی پێنج‌شەممە، ئەو کات کە خەڵکی پۆل‌پۆل کۆڕ دەبەستن،ئەو پێی وایە مەترسییەکی گەورە دێتە ئاراوە بە هۆی کردەوەیەکی چەکدارانە، دەیهەوێ کە من بەرهەڵستکاری نەکەم، ئەو کارە ڕەنگە ببێتە هۆی کوشت و کوشتار و خوێن‌ڕشتن ـ گوێت لە منە؟»

مێشەکەرانە بەفکر و خەیاڵێکی پەرێشان و ئاڵۆزەوە لەپەنجەرەکەوە بۆدەرێی ڕووانی. ئاوڕی داوە و بەدەنگێکی کە ڕەگی ماندوویەتی پێوە دیاربوو گوتی: «بەڵێ گوێم لێیە.»

- وادیاره ئەمشەوحاڵت زۆر باش نییە وبیستنی ئەم بابەتەش کار تێکەری خراپی دەبێ لە سەر لەش ساخیت . ئەگەر پێتخۆشە با سبەینێ بێمەوە؟
باسێکی زۆرپڕ بایەخ و تایبەتیە، من پێمخۆشە پڕ بە دڵ سەرنجی بدەیتێ.
مێشەکەرانە هەروا بە وەرەزیەوە وەڵامی داوە:«پێمخۆشە هەرئێستا هەموویم گوێ لێبێ و ڕزگاریم بێ لەدەستی. ئەوەی کە دەیڵێی تەواو گوێم بۆ ڕاداشتووە.»
مونتانلی درێژەی پێدا: «باشە، ئەگەر بە ڕاستی تۆ، هەوێنی ئەو شەڕ و شۆڕ وئاژاوەو خوێن ڕشتنە دەبی و ئەگەر منیش لەگەڵ سەرهەنگ دژایەتی بکەم، ئەودەم بەرپرسیارەتییەکی گەورە و مەترسیدارم دەکەوێتە ئەستۆ، من هاتوومەتە سەر ئەوباوەڕە کە لانیکەم لەقسەکانیدا سەرهەنگدا ڕاستییەکی تێدایە، لەلایەکی دیکەوە لە سەر ئەوباوەڕەم کە لێکدانەوەکانی ئەو بە هۆی قین و بوغزێکی تایبەتی سەبارەت بەتۆیە کە ئەوی وا لێ کردووە ڕەوتی کارەکە بەرەولاڕێ لابەرێ و مەترسی ئەوسەرهەڵدانەش،لە وەی هەیە زۆر گەورەتری نیشان بدات. لەوکاتەوەی کە ئەم کۆت و بەند و ئەشکەنجانەم لەسەر تۆ بینی شاغی بوون و دوژمنانەبوونی ئاکاری سەرهەنگم باشتر بۆ دەرکەوت.»
چاوێکی لە کۆت و بەند و زەنجیرەکانی سەرئەرزی کرد و درێژەی بەقسەکانیدا: «ئەگەر بەوکارە ڕازی بم ئەوە منم کە تۆ دەکوژم، ئەگەریش دژایەتی بکەم ترسی کوشت و کوشتاری خەڵکی بێتاوانم دێتە ئەستۆ، من ئەم مژارەم زۆر بەوردی تاوتوێ کردووە و هەموو هێزی خۆم خستووەتە گەڕ تا لەچنگ ئەم دووئازارە جەرگبڕە خۆم ڕزگارکەم و ئێستا ئیدی تەمای یەکجارەیی خۆمم گرتووە.»
- بێگومان دەبێ من بکوژیت و ئەوخەڵکە بێتاوانە تـ ـ نەجات بدەی. - ئەوە تەنیا تەما و بەڵێنییەکە کە پیاوێکی خاچپەرەست دەتوانێ بیگرێ. ئەگەر دەستی ڕ ـ ڕاستت ئازارت دەدات و هەتا دوایی. من شانازی ئەوەم نییە کە دەستی ڕاستی بەڕێزتان بم و ئازاریشم داوی، ئـ ـ ئاکامەکە زۆرڕوون و

---

٣. وتەی مەسیح بەقەولی ئینجیل.

ئاشکرایە. نەتدەتوانی بێئەوەی کە ئەم هەمووە شێر و ڕێویەم بوبێنییەوە خێرا ئاگامەکەم پێبڵەی؟

مێشەکەرانە وەک پیاوێک کە لەهەمووی ئەومژارە ماندوو بووبێ، بەبێزاری و سووکایەتی پێ کردنێکی هەڵیتوپڵیتەوە قسەی دەکرد.

دوای کەمێ بێدەنگ بوون گوتی: «بەڵێ؟ تەما و مەبەستی تۆ ئەوە نەبوو قوربان؟»

- نا.

مێشەکەرانە شێوەی ڕاکشانی خۆی گۆڕی، هەردوو دەستی خستە پشتسەری و بەچاوی نیوەبەستراویەوە لە مونتانلی ڕووانی. کاردینال سەری داخستبوو لە دەریای شڵەژاوی ئەندێشەدابوو. بەدەستێکی هێواش لە سەر کورسیەکەی دەدا. ئاخ هەر ئەوکارە کۆنە،چەندە ئاشنایە!

ئاخرەکەی سەری هەڵێنا و گوتی: «پێموایە بەتەما بووم کە کارێکی بێوێنە بکەم. کاتێ بیستم کە ویستووتە دیدارێکت لەگەڵ من هەبێ، بڕیارمدا کە بێم بۆئێرە. ئەوەی کە کردوومە بۆتانی دەگێڕمەوە و کێشەکە دەخەمە بەردەم خۆت.»

- بەردەم - من؟

- سینیور ڕیوارز من نەوەکوو کاردینالێک، ئۆسقۆفێک یان قازییەک، بەڵکوو وەکوو ئینسانێک کە بۆلای ئینسانێکی دیکە دەچێ هاتووم بۆلای تۆ. من داوات لێناکەم کە چۆناوچۆنە لەوکەلالەیەی سەرهەنگ ئاگاداری. من هەروەها زۆرباش لەوە ئاگادارم کە ئەگەر تۆ لەوبارەیەوە زانیارییەکت هەبێ ئەوە ڕاز و نهێنی خۆتە و بەمنی نالێی، بەڵام داوات لێدەکەم کە خۆت بخەیتە جێگای من. من پیرم و بێگومان بەرەوئاخری تەمەنم هەنگاو دەنێم، پێمخۆشە بێئەوەی دەستەکانم تاوان و گوناحی خوێنڕشتنی کەسێکیان بێتە ئەستۆ، گۆڕەوشار بدرێم.»

- قوربان ئایا تا ئێستا خوێنی کەسێکتان نەڕشتووە؟

مونتانلی ڕەنگی زۆرتر پەڕی، بەڵام هەروا بەهێوریەوە درێژەی بەباسەکەدا: «من بەدرێژایی تەمەنم، لە هەرکوێیەک لەگەڵ زوڵم و

بێعەداڵەتی ڕووبەڕوو بوومەتەوە. دژایەتیم لەگەڵ کردووە. قەت سزای قورس و گرانم لە هەر شێوەیەکیدا پشت ڕاست نە کردووەتەوە، من لەحکومەتی پێشوودا سەبارەت بە دادگالەشکریەکان بەشێوەیەکی تووند و بەبڕشتانە دژایەتیم لەگەڵ کردووە، هەربۆیە هەمیشە کەوتوومەتە بەرتیر و توانجی ئەوان. ئەم پلەوپایە و دەستڕۆیشتنەی من هەمیشە لەڕێگای قازانج و لێبووردنی گشتیدا بووە. لانیکەم داواکاری ئەوەم لێت هەیە قسەکانی من بەڕاست بزانی، من ئێستا لەنێوان ئاو و ئاگردام. ئەگەر دژایەتی بکەم، شار دەخەمە بازنەی مەترسی سەرهەڵدان و ئاژاوەوە و هەموو ئەنجامە چاوەڕوان نەکراوەکانی و ئەوەش بە هۆی ڕزگاری پیاوێکەوەیە کە سووکایەتی بەئایینی من دەکات، پیاوێک کە بوختانم بۆ هەڵدەبەستێ، زوڵمی کردووە و جنێوی داوە (هەرچەندە ئەمەیان بایەخێکی زۆری نییە)، پیاوێکی کە دڵنیام ئەگەر ئازادی خۆی بەدەست بهێنێ، ژیانی لەڕێگای خراپەکاریدا بەکار دەهێنێ.بەڵام هەرچی بێ ڕزگاری ژیانی مرۆڤێک لەئارادایە.»

کەمێ ڕاوەستا و دوایە درێژەی پێدا: «سینیور ڕیوارز، ئەوەندەی کە من سەبارەت بەوکارەی تۆ زانیاریم هەبێ، کارێکی خراپ و شەڕاژۆیانەیە، هەروەها لەوەپێشەوە لە سەر ئەو باوەڕە بووم کە تۆ سەرەڕۆ و بێدین و خراپەکاری، ئێستاش بڕێک کەمتر، بەڵام هەر لە سەر ئەوباوەڕەم. هەرچەند بەدرێژایی ئەم دووحەوتەی ئاخری پێت نیشان داوم کەزۆر بەجەرگ و ئازای و ئەتوانی هەروا بە هاوڕێیان و دۆستانی خۆت وەفاداربی، هەروەها ئەوسەربازانەت وا لێ کردووە کە تۆیان خۆش بوێ و ئەوەش کار و ئیشی هەموو کەسێک نییە. پێموایە لێکدانەوەکانم دروست نەبووە و لەناخ و دەروونتدا شتێکی گەش و ڕوون هەیە کە باشتر لەوەیە کە لە ڕواڵەتتدا خۆی نیشان دەدا. من پەنا دەبەمە بەر لایەنە چاکەکەی ئەتۆ و بەفەرمی داوای لێدەکەم کە ویژدانی خۆی بکاتە قازی و ڕاستیەکەم پێبڵێ کە ئەگەر بەجێگای من بووایەی چیت دەکرد؟»

بێدەنگییەکی درێژخایەن هاتە ئاراوە، دوایە مێشەکەرانە سەری هەڵهێنا: «من لانیکەم لە سەر کار و کردەوەکانی خۆم تەمام دەگرت و هەموو

ئەنجامەکانیشم بەگیان و بەشان هەڵدەگرت. ئیدی بەوترسەنۆکیە خاچپەرەستانەیەوە و بەدزییەوە نەدەچووم بۆلای خەڵکی و داوام لێنەدە کردن کە گرفت و کێشەکانم جێبەجێ کەن!»

ئەم قسەیە ئەوەندە گورچوبڕو لەپڕدابوو، گەرم و گوڕی و لەڕووبوونی ئەوەندە زەق و ڕوون وبەر چاو بوو ؛کە لەگەڵ قسەی بێڕۆح و خۆڕێکخەرانەکەی لەوەپێشی عەرز وئاسمانی فەرق بوو واتدەزانی ئەو، دەمامکی لەڕوخساری خوی لابردووە.

مێشەکەرانە بەتووڕەییەوە درێژەی بەقسەکانیدا: «ئێمەی بێدین لە سەر ئەوباوەڕەین ئەگەر پیاوێک توانایی شتێکی نییە، دەبێ ورە بەرنەدا و بەباشترین شێوە توانایی و خۆڕاگری خۆی بنوێنێ و مەردانە لە بەرانبەر ئەو کارەی کە مەبەستیەتی دەبێ قورس وقایم ڕاوەستێ، ئەگەریش لە ژێر ئەوبارەدا پشتی پچەمێتەوە، ئیدی نابێ هێوات پێیبێ، بەڵام پیاوێکی خاچپەرەست، بەگریان و ناڵە و هاوارەوە پەنا دەباتە بەرخودا و چەمکە پیرۆزەکان و ئەگەر ئەوانیش یارمەتییان نەدا، دەستەودامێنی دوژمنەکانی دەبێ ـ ئەو هەمیشە بەشوێن پشتێکدا دەگەڕێ کە بارەکەیخۆی بخاتەسەر ئەو و لەکۆڵخۆی بکاتەوە. مەگەر لەکتێبی پیرۆزی یامیسال٤ و یان هەرکام لەکتێبەئایینییەکانی ئێوەدا، ڕێ و شوێنێکی وای تێدانییە کە دەبێ بێن بۆلای من تا ڕێنوێنیتان کەم؟ سەیرە! ئایا بەڕاستی من خۆم، پێشئەوەی کە تۆ بێیوو قورسایی باری بەرپرسیارەتی خۆت بخەیتە سەرشانی من، من هیچ ئەرک و بارێکی و خۆمم لە سەرشان نییە؟ بگەڕێنەوە بۆلای خاچ و مەسیحی خۆتان، ئەو تا ئەوجێگایەی توانی لەفکری کۆ کردنەوەی ماڵی دونیادا بوو؛ تۆش باشتر وایە کە هەر ئەوکارە بکەی٥. دوای ئەوە، تۆ تەنیا کافرێک دەکوژی ـ پیاوێکی کە ناتوانێ وشەی "تاقی کردنەوە"٦ بەیان کات، بێگومان ئەمە تاوانێکی گەورەر نییە!

---

٤. کتێبی دۆعا و پارانەوەی کاتۆلیکەکان بەزمانی لاتین.

٥. بەسووکایەتی ڕووانینە سەر ئەوباسەی کە مەسیح بە هەوادارانی خۆی دەڵێ ئەوەندەی کە دەتوانن پووڵ و پارە دابنێن.

٦. بەپێی ئەفسانەکانی کتێبی پیرۆز. عیبریەکان لەو وشەیە کەڵکیان وەردەگرت بۆ دۆزینەوەی سیخورەکان. چونکە گوتنی ئەو وشەیە بۆ بیانیەکان گران و سەخت بوو.

قسەکەی خۆی بڕی، ماندوو ببوو و کەوتە هەناسەبڕکێ، دوایە درێژەی بەقسەکانیدا:

«جا سەیر ئەوەیە قسە لەزوڵم و زۆریش دەکەی، ئەو کەرونەفامە ئەگەر یەکساڵی تەواو هەوڵیبدایەت بەقەدەر تۆ نەیدەتوانی ئازارم بدات، ئەوخۆ مێشکی نییە. ئەوسەری کارەکەی ئەوەیە کە کۆت و بەندەکە توندتر دەبەستێ. کاتێکیش کە نەیدەتوانی لەوە توندتری ببەستێ دەستەوەستان دادەما. کارێکی ئاوا هەر بێئەقڵ و نەفامێک دەتوانێ ئەنجامی بدات!، بەڵام تۆ «تکایە حوکمی مەرگی خۆت واژۆ بکە، من زۆر دڵناسکم و ناتوانم بۆخۆم ئەوکارە بکەم» ئەم بیرۆکەیە تەنیا دەتوانێ فکر و ئەندێشەی کەسێکی خاچپەرەست بێ ـ خاچپەرەستێکی نەجیم و دڵسۆز کە بەدیتنی دیمەنی کەلەبچە و بەندێکی توندپێچراو ڕەنگی ڕوخساری تێک دەچێ! ئەوکات کە تۆ وەک فریشتەی خێروچاکە هاتیە ژوورێ و ـ لەشاغی بوونی سەرهەنگ سەرت سووڕما ـ دەبوو بمزانیبایە کە ئەشکەنجەی سەرەکی و ڕاستی تازە دەست پێدەکات! بۆچی ئاوا لێم دەڕوانی؟ بەڵێ ڕازی بە، بڕۆوە ماڵی خۆت و بەئاسوودەییەوە نان و چایی خۆت نۆشیگیان کە، ئەم باسە هەڵگری ئەو هەمووە سەرنج و هایت و هووتە نییە. بە سەرهەنگ بڵێ دەتوانێ ئەمن گوللەباران کات، پەتی سێدارەم بۆ هەڵواسێ، یان هەرکارێکی کە ئاسانترە بیکات ـ ئەگەر پێیخۆشە خۆی زۆر بەمنەوە سەرقاڵ کات بڵێ با بەزیندویی بمکاتە کەباب و خۆی لە دەست من ئاسوودە کات!»

ناسینی مێشەکەرانە زۆر ئاسان نەبوو ، لەبەر تووڕەیی و ڕقهەستاوی شێت ببوو،زۆرتوند کەوتبووە هاسکە هاسک و هەناسەبڕکێ و دەلەرزێ، چاوەکانی وەک چاوی پشیلە دەدرەوشانەوە.

مونتانلی بەپێوە وەستابوو و بەبێدەنگی لە سەرەوە بۆ ئەوی دەڕوانی. ئەو لەوسەرکۆنە کردن و قسە سەرشێتانەیە باش حاڵی نەدەبوو، بەڵام دەیزانی ئەم سەرکۆنە کردنە لەشڵەژانی ناخی دەروونییەوە هەڵدەقوڵێ، جابۆیە هەر لە سەر ئەم بۆچوونە هەموو ئیهانە کردنەکانی ئەوی بەخشی.

وتی: «سس! خۆ من نەمدەویست ئاوا ناڕەحتت کەم. هەر بەڕاستی بەتەمای ئەوە نەبووم کە کۆڵ و باری خۆم بەتۆ هەڵگرم، ئەویش تۆ، کە تا

ئێستا شەکەتی قورسایی باری خۆتی‌و من قەت بەئاشکرا و بەئەنقەست نەمویستووە کاروباری خۆم بخەمە سەرشانی کەسێکی دیکە...»

مێشەکەرانە بەچاوی دەرپەڕیوەوە گوڕاندی: «درۆیە! ئەی سەبارەت بە پلەوپایەی ئیسقوفی؟»

- پلەی ئیسقوفی؟

ئەها! لەبیرت چووەتەوە؟ فەرامۆش کردنی زۆر ئاسانە! «ئارتورا ئەگەر پێتخۆش بێ پێت دەڵێم کە بۆچی ناتوانم بڕۆم،» من دەبوو بۆ ژیانی تۆ بڕیار دەربم - من، لەتەمەنی نۆزدە ساڵیمدا، ئەگەر ئەوەندە سەیر و دزێو نەبایە، لە کایەیێکی منداڵانە دەچوو.

- «بەسە ئیدی!» مونتانلی بەهێوابڕاویەوە گوڕاندی و هەردوودەستی نا بە سەریەوە. دوایە دەستی دانەواند و هێواش چوو بۆلای پەنجەرەکە. لەوێ لە سەر لێواری پەنجەرەکە دانیشت باسکی نا بەمیلەئاسنی پەنجەرەکەوە و هەنیەشی نایە سەر دەستی. مێشەکەرانە بەڕاکشانەوە دەلەرزی و لەوی دەڕوانی.

مونتانلی خێرا هەستایە سەرپێ، بەولێوە وشک و بێڕەنگانەیەوە گەڕاوە لای ئەو.

هەرچەند بەشێوەیەکی زۆرخراپ و ناشیانە دەیویست وانیشان بدا کە هەروا هێدی و هێمنە، گوتی: «زۆربەداخم، بەلام دەبێ بڕۆمەوە بۆماڵێ. تەندروستیم هیچ باش نییە.»

دەتگوت لەتەب و نۆبەتی‌دا دەلەرزێ. هەموو توورەیی و هەڵچوونی مێشەکەرانە نیشتەوە: «پاپا، تێناگەی...»

مونتانلی داچلەکی و ڕەق ڕاوەستا.

ئاخرەکەی بە غەڵدەغەڵدێکەوە گوتی: «خۆزگە ئەو نەبێت، خودایە هەرکەسێکە قەی‌ناکە، بەلام ئەو نا! خەریکە شێت دەبم...»

مێشەکەرانە بەهێزی دەستێکی هەستا و هەر دوو دەستی گرت کە دەلەرزین: «پاپا قەت ناتەوێ لەوە حاڵی‌بی کەمن نەخنکاوم؟»

ئەودوودەستە لەپڕێکدا سارد و بێجووڵە و وشک بوون، بۆساتێک هەموو شتێک کەوتە ئامێزی بێدەنگی مەرگەوە،ئەژنۆکانی کەوتنە لەرزین،جەغزێکی

تەمتومانی خەفەتاوی تاقەت پڕوکێنی ڕابردوو گرتبوویە ئامێز و لەشی دەرزی ئاژن دەکرت. ئەوجار مونتانلی لە سەر ئەرزی ئەژنوی دادا و ڕوخساری خۆی لەباوەشی مێشەکەرانەدا شاردەوە.

کاتێ کە سەری هەڵێنا، ڕۆژئاوا ببوو، تیشکی ڕۆژ بەسەرلێوی کێوەکانی ڕۆژئاواوە ئارام لە ئامێزی مەرگدا ستاری دەگرت و وردەوردە دەچووە دڵی چیا سەرکەشەکانەوە. ئەوان کاتوسات و مەرگ و ژیانیان لەبیر چووبووەوە، تەنانەت لەبیریشیان چووبووەوە کە دوژمنی یەکترین.

مونتانلی ئارام ورێنەی کرد: «ئارتور ئایا ئەوە ڕاستە؟ ئایا لەدونیای مەرگ و نەمانەوە بۆلای من گەڕاویتەوە؟»

مێشەکەرانە بەلێوەلەرزەوە وەلامی داوە: «لای مردن...» وەک منداڵێکی نەخۆش کە لەئامێزی دایکیدا جێگای خۆش کردبێ! سەری نابووە سەردەستی مونتانلی و ڕاکشابوو.

- گەڕایتەوە - ئاخرەکەی گەڕایتەوە!یانی باوەڕ بکەم کە بۆخۆتی!

مێشەکەرانە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی: «بەڵێ، تۆش هیچ ڕێگایەکت نییە یان دەبێ لەگەڵ مندا شەڕ بکەی، یان دەبێ بمکوژی.»

- ئاه، سس، کارینۆ! ئەوقسانە چییە دەیکەی؟ ئێمە وەک دوومنداڵ واین کە لەتاریکاییدا ڕێگایان لێهەڵە بووبێ. ئێمە یەکتریمان وەک دووسێبەری ترسناک دەهاتە بەرچاو، ئێستە یەکتریمان دۆزیوەتەوە و کەوتووینەتە ڕووناکایی. کوڕە جوانەکەم چەندە گۆڕدراوی - چەندە گۆڕدراوی! وانیشان دەدەی دەڵێی هەموو ئەقیانووسی ڕەنج و مەینەتی ئەودنیایە لە سەر تۆوە دەگوزەرێ - ئەوە تۆی کە هەمیشە کەیلی شادی و خەندە و ژیانەوە بووی! ئارتور هەر بەڕاست بۆخۆتی؟ زۆرجار لەخەودا دەمدی کە گەڕاویتەوە بۆلام، دوایە خەبەرم بووەتەوە و، بەلام جیا لەتاریکی و بۆشایی و دەرەگف هیچم نەدیوە. چۆن دەتوانم بزانم جارێکی دیکە، دوای ئەوەی کە لەخەو ڕاسام ئەوەی دیومە هەمووی خەون و خەیاڵ بووە، بەڵگەیەکی زیندووم بدەدەست - پێمبڵێ کە چۆناوچۆن بوو کە ئەو هەمووە ڕووداوە خوڵقا.

- زۆر سادە و ئاسان لەپاپۆڕێکی بارکێشاندا خۆم شاردەوە و چووم بۆ ئەمریکای باشوور.

- ئەی لەوێ؟

- لەوێ دەژیام، هەڵبەتە ئەگەر بکرێ نێوی ژیانی لێ بنرێت، پاش ئەوهەموو یانە فەلسەفیانەی پێتگوتبوومەوە، لەوێ زۆرشتی دیکەم دەدیت جیا لەسمیناریەکانی زانستی ئایینی! دەڵێی کە منت لەخەودا دەدیت - بەڵێ، منیش تۆم...

بەلێوەلەرێوە قسەکەی خۆی بڕی.

لەپڕێکدا دیسانەوە دەستی پێ کرد: جارێکیان لەیەکێ لەکانگاکانی ئێکوادۆردا ئیشم دەکرد...

- خۆلەوێ کرێکاری کانگا نەبوی ؟

- نا، وەک یاریدەدەری کرێکاران - لەگەڵ کوڵکێشەکان هەموو کارێکم دەکرد. لەبەردرگای تونێلەکەدا، ژوورێکی کرێکاریمان هەبوو کە لەوێدا دەخەوتین، شەوێکیان نەخۆش بووم» وەکوو ئەم چەندڕۆژەی ئێستا. لە ژێر گڕوتینی هەتاودا بەردم دەکێشا، بێشک دەبێ لەخەو و بێداریدا بووبێتم. چونکە تۆم دیت کە لەدرگاکەوە هاتیتە ژوورێ. خاچێکت بەدەستەوە بوو وەک ئەوەی بەسەر دیوارەکەوە؛ دەپاڕایتەوە و بێئەوەی لام لێبکەیتەوە لەبەردەم منەوە تێپەڕیت. من بەهاوارەوە داوای یارمەتیم لێ کردی تانێ سەم، یان خەنجەرێکم بدەیتێ - شتێکی وام دەویست کە بمکوژێت و ئەجاتم بێ. چونکە خەریک بوو شێت دەبووم و تۆش - ئاخ -!» (دەستێکی بەسەر چاویدا هێنا. مونتانلی هێشتا ئەودەستەی دیکەی توند گرتبوو) لەڕوخساری تۆم خوێندەوە کە گوێت لەدەنگی من بووە، بەڵام لایەکیشت لێنەکردمەوە، هەروا خەریکی دۆعا کردن بووی. کاتێ کە دۆعا و پاڕانەوەکەتان تەواو بوو، خاچەکەت ماچ کرد، چاوێکت لە من کرد و هێواش گوتت: «ئارتور، من زۆر بەداخم بۆتۆ، بەڵام ناوێرم کە ناڕەحەت و بەپەرۆش بم، چونکە ئەو تووڕە دەبێ.» منیش چاوێکم لەئەو کرد و دیتم کە ئەو پەیکەرە دارینەیە پێدەکەنێ.

دوایە کە وەهۆش هاتمەوە و ئەو کوختە کرێکارییە و کۆڵهەڵگرە قۆڕبەسەرانەم بینی، تێگەشتم کە تۆ بەجێگای ئەوەی لەفکری ڕزگار کردنی من لەودۆزەخ و جەهەندەمە دابی، خەریکی زمانلووسی و خۆ ڕێکخەریی

لەگەڵ ئەوخودا هیچوپووچەی خۆتدایی و ئەوەم هەمیشە لەزەیندابوو. ئێستا لەپەناتدا دانیشتووم ئەوەم لەبیر چووەتەوە، من نەخۆش بووم. دەوروزەمانێک بوو کە تۆم زۆر خۆشدەویست، بەڵام ئێستا مەودای نێوانمان تەنیا شەڕە و شەڕ و دیسانەوەش هەر شەڕ. بۆ دەتهەوێ کە دەستی من بگرێ؟ مەگەر نازانی تائەو کاتەی کە تۆ باوەڕ و ئیمانت بەخاچپەرەستی هەبێ، ئێمە دوژمن و بەرهەڵستکاری یەکترین ؟

مونتانلی دانەوی و دەستە بریندارەکەی ماچ کرد: «ئارتور، چۆن دەتوانم باوەڕم بەو نەبێ، ئەگەر بەدرێژایی ئەوساڵە ترسناکە باوەڕی خۆم ڕاگرتووە، ئێستا کە تۆی بۆگەڕاندووەمەتەوە چۆن دەتوانم نکوڵی لێبکەم؟ لەبیرت نەچێ من پێموابوو کە تۆم کوشتووە.»

- هیچ فەرقێک ناکات، ئێستاش ئەوە منت لە بەر دەست دایە .

- ئارتور!

ئەم گورەیە نیشاندەری گەورە ترسێکیناخی دڵی مونتانلی بوو، مێشەکەرانە بێئەوەی سەرنجی بداتێ هەروا درێژەی پێدا: «هەرکارێکی کە دەیکەین با لە گەڵ یەک ڕاست و دروست بین وڕاڕا نەبین. من و تۆ لەم بەر و ئەوبەری چاڵێکی قووڵدا ڕاوەستاوین و تائێوارە ئەگەر دەست بۆلای یەکتر ڕادێرین، دەستمان بەیەکتری ناگات. ئەگەر دەزانی کە ناتوانی بەرەنگاری ببیەوە و یان ناتەوێ کە دەستی لێبکێشییەوە (جارێکی دیکە چاوێکی لەخاچی سەردیوارەکە کرد) دەبێ ئەوەی سەرهەنگ دەیهەوێ ڕازی...»

- ڕازی بم! خودایە! ڕازی بم... ئارتور، بەڵام من تۆم خۆشدەوێ!»

ڕوخساری مێشەکەرانە بەشێوەیەکی سامناک مۆڕ بووەوە: «کامەمانت زۆرتر خۆشدەوێ؟ من یان ئەو؟»

مونتانلی هێواش هەستایە سەرپێ، ڕۆح و گیانی لەترسانا ژاکا، دەتگوت جەستەشی وەک گەڵایەکی سەرمابردوو وشک و بێتین و توانایە و پیربووە. ئەو لەخەون و خەیاڵی خۆی ڕاچەنیبوو و جیا لەتاریکیایی و دەرەگف هیچی دیکەی نەدەدیت: «ئارتور تەنیا کەمێک بەزەییت پێمدا بێتەوە...»

ـ ئەی ئەوزەمانە کە تۆ بەدرۆکانت منت کردە بەردە و ناردمتە مەزرا قامیشەڵانە شەکریەکان، بەزەییت پێمدا هاتەوە؟ لە وەبیر هێنانەوەشیدا دەلەرزی ـ داد و هاوار لەدەست ئەو کەسایەتییە ئایینییە دڵناسکانە! ئەمە پیاوێکە کە تەواو جێگای ڕێز و خۆشەویستی خودایە، پیاوێکی کە لەگوناحەکانی خۆی پەشیمان بووەتەوە و ئێستاش ژیان دەباتە سەر. ئەوەی دەمریّ کوڕەکەیەتی. دەڵێ کە من تۆم خۆشدەویّ، خۆشەویستی تۆ بۆمن ئازار و دەرد و مەینەتی بووە! ئایا پێتوایە کە من دەتوانم ئەو گێوە مەینەتییانەی ڕابردووم هەروا بە ئاسانی بفەوتێنم و بەچەندوشەیەکی نەرم و نیان ببمەوە ئارتورەکەی جاران؟ منێکی کە لەفاحیشەخانە پیسەکاندا قاپشۆر بووم و بۆ خاوەنمەزراکان کە لەحەیوانەکان شاغیتربوون مەیتەریم دەکرد؟ منێکی کە بەزەنگوڵە و کڵاوەوە بۆسیرکێکی کۆچەر حەنەکچییەتیم دەکرد، کرێکاری و کارەکەری ماتادورەکان بووم لەمەیدانی یاریگای جوانەگادا. منێکی کە لە بەرچاوی هەرکەسێک کە بیویستایە پێ لە سەر گەردنم دانێ و منیش ببوایەمە بەردە و نوکەری. منێکی کە برسیەتیم چێشت، سووکایەتیم پێکرا، لە ژێر شەق و پێلاقەدا تلاندمیانەوە، منێکی کە دەپاڕامەوە بۆ ئەو بەر ماوانەی کە تەم و برشیان هێنابوو، بەڵام نەیاندەدامێ چوونکە سەگەکان لە من بەڕێزتربوون؟ قازانجی ئەوانە چییە؟ چۆن و بە چزمانێک دەتوانم بڵێم کە چیم بەسەرهاتووە؟ ئێستاش ئەوە منت خۆشدەویّ! چەندەت من خۆشدەویّ؟ ئەوەندەی کە بتوانی لەبەر من دەست لەخودای خۆت هەڵگری؟ ئاخ، ئەوخاچ و مەسیحە هەرمانە، ئەریّ چی بۆ کردوون؟ لەبەرخاتری تۆ و مرۆڤانێکی وەک تۆ مەسیح چڕەنج و ئازارێکی چێشتووە کە دەبێ ئەوت لە من زۆرتر خۆش بویّ؟ لەبەرچی ئەودەستە کون کراوانە، ئەوەندە لەپێشچاوی تۆ خۆشەویست و ئازیزە؟ چاوێک لەدەستەکانی من بکە ،چاوێک لە ئەم برینە قەتماخە بەستووانەی جەستەی من بکە...»

کراسەکەی دڕاند و جێگای داغ و سووتانی زۆرناحەز و سامناکی نیشان دا کە هەموو گوشتپارەیان کردبوو: «پاپا خودای تۆ ساختەچییە. برینەکانی ئەوسروشتی نییە و دەست کردە. ڕەنج و ئازارەکەی شتێکی خەیاڵییە! ئەوە

منم کە دەبێ لە دڵی‌تۆدا جێ‌گیربم، ئەوە منم کە ویست وماف و داخوازیم هەیە! پاپا هیچ ئەشکەنجەیەک نەماوە کە پێشکەشی منت نەکردبێ! خۆزگە دەتزانی کە ژیان و گوزەرانی من چۆن بووە!، بەڵام دەمبینی کە هێشتا نەمردووم! لە ژێر ئەوبارە قورسانەدا کۆڵم نەداوە و بەورەی بەرزەوە لە بەرانبەریاندا ڕاوەستام. چونکە دەمویست کە بگەڕێمەوە باوەشی ژیان و دژبەخوداکەت بەربەرەکانی بکەم. من ئامانجەکەم کردووەتە قەڵغانی کوشکی دڵم. هەرئەوەش منی لەشێت بوون و دووبارە مردن پاراستووە. ئێستا کە گەڕاومەتەوە، دەبینم کە ئەو، وەکوو جاران هەروا جێگا و مەکانی منی داگیر کردووە ـ ئەم قۆچی قوربانییە درۆیینیە کە تەنیا شەش‌کات‌ژمێر بەخاچەوە هەڵواسراوە و دیسانەوە لەئامێزی مردنەوە هەستایەوە!، بەڵام پاپا، من بەدرێژایی پێنج‌ساڵ لەخاچ درام، منیش لەلای مەرگەوە هاتوومەتەوە. لەگەڵ من چی دەکەی؟ ها، لەگەڵ من چی دەکەی؟

تەواو تێک‌شکا. مونتانلی وەک پەیکەرەیەکی بەردین یان وەک مردوویەک ڕاست دانیشت. لەپێشدا لە ژێر گڕکانی ناهومێدی مێشەکەرانە سەبارەت بەپاپا، دەتگوت کەوتووەتە بەرلێدانی قەمچی، کەمێک لەرزی، بەڵام دوایە تەواو ئارام بووەوە. دوای بێدەنگییەکی درێژخایەن، سەری هەڵێنا و ئارام و لە سەرەخۆ دەستی بەقسە کردن کرد: «ئارتور ئاشکراتر بۆم شی بکەوە؟ بەوقسانەت گێژ و وڕ بووم و ترس و خۆف ئازای لەشمی دەرزی‌ئاژن کردووە، هیچ تێ‌ناگەم، هەر تەقە لە سەرمەوە دێ. پێم بڵێ بزانم چیت لە من دەوێ؟»

مێشەکەرانە ڕوخساری ترسێنەر و مۆڕەوەبووی تێ کرد: «هیچم ناوێ. کێ خۆشەویستی بەسەر یەکێکدا دادەسەپێنێ؟ تۆ ئازادی لەوەی کە هەرکامێکمان کە بۆ تۆ ئازیزترین هەڵمان‌بژێری. ئەگەر ئەوت زۆرتر خۆش‌دەوێ هەڵیبژێرە.»

مونتانلی بەداڕمانێکەوە دووپاتی کردەوە: «تێ‌ناگەم، چی دەتوانم هەڵبژێرم سەرە چەرمەکە تازە ئاو بردوویە.»

ـ دەبێ یەکێکمان هەڵبژێری. ئەگەر منت خۆش‌دەوێ، ئەوخاچەی گەردنت لێکەوە و لەگەڵ ڕێبازی من ڕێکەوە. هاوڕێیانی من خەریکی جێ‌بەجێ کردنی

گەلاڵەیەکی دیکەن و بەیارمەتی تۆ دەتوانن زۆر بەئاسانی مسۆگەری کەن، ئەوکات کە توانیمان بەسلامەتی پێکەوە لەسنوور بپەڕینەوە، من وەک کوڕی خۆت بەخەڵکی بناسێنە، بەڵام ئەگەر ئەوەندەت خۆش ناوێم - ئەگەر ئەم خواڵە دارینەیە بایەخێکی زۆرتری بۆتۆ هەیە، بڕۆ بۆلای سەرهەنگ و پێی بڵێ کە بەوکارە ڕازیت و ئەگەریش دەڕۆی هەرئێستا بڕۆ و من لەچنگ دیداری خۆت ڕزگارکە. چونکە بێجگە لە دەرد و ئازارئەم دیدارە، بەشی‌خۆم مەینەتیم زۆرە.

مونتانلی کەمێ لەرزی و سەری هەڵێنا. وردەوردە شتێکی لێ‌حاڵی دەبوو: «هەڵبەتە لەگەڵ دۆستانی تۆ پێوەندی دەگرم، بەڵام، بۆمن ناگونجێ... لەگەڵ تۆ بێم - ئاخەر من قەشەیەکم.»

- منیش بەتەمانیم یارمەتی لەقەشەکان بخوازم. پاپا ئیتر هیچ ڕێکەوتنێکم لەگەڵیان نابێ، تاڕادەیەکی زۆر لەدەست ئەوان و دەستڕۆیشتنیان کوێریم دیتووە. یان دەبێ دەست لەقەشەیی هەڵگری یان دەست لە من بکێشیتەوە.

- چۆن دەتوانم دەست لە تۆ هەڵگرم؟ ئارتور چۆن دەتوانم دەست لە تۆ هەڵگرم؟

- دەکەوایە ئەو فەرامۆش کە و دەستی لێ‌هەڵگرە. دەبێ لایەنێکمان هەڵبژێری. دەتەوێ بەشێک لەئەشق و خۆشەویستی خۆت بۆمن تەرخان کەی - نیوەی بۆمن و نیوەشی بۆ خوداکەت؟ من بەرماوی ئەوناخۆم. ئەگەر هی ئەو بێت، لەلای من جێگایەکت نییە.

- دەتهەوێ دڵی من بکەیتە دوولەت؟ ئارتور! ئارتور! دەتهەوێ کە من شێت‌کەی؟

مێشەکەرانە دەستی بەدیوارەکەوە گرت.

جارێکی دیکە دووپاتی کردەوە: «دەبێ لەوبەینەدا یەکێکمان هەڵبژێری.»

مونتانلی قوتوویەکی چکۆلەی دەرهێنا کە کوتەقاقزێکی پیس و چرچ و لۆچ کراوی تێدابوو.

وتی: «چاو لێکە!»

- هەروەکوو ئیمان و باوەڕم بەخودا هەبووە باوەڕیشم بەتۆ هەبووەو خودا دەست کردێکە لە قوڕ دروست کراوە دەتوانم وردی‌کەم، تۆش بەدرۆیەک منت فریودا.

میشەکەرانە پێکەنی و قاقزەکەی پێداوە: «مرۆڤ لەتەمەنی نۆزدەساڵیدا لاوێکی چەندە لەکوڵ و جۆشە! لەلای وی چەندە ئاسانە هەڵگرتنی چەکوشێک و شکاندن و ورد کردنی کەرەسەیەک. ئێستاش هەروایە ـ بەڵام ئەوە منم کە لە ژێر چەکوشەکەدام، بەڵام تۆ، خەڵکێکی زۆر هەن کە تۆ دەتوانی بەقسەی درۆ فریویان بدەی بێئەوەی لەڕاز و نهێنی تۆ ئاگاداربن.

مونتانلی گوتی: «چیت پێخۆشە بیڵێ، ڕەنگە ئەگەر منیش بەجێگای تۆبایەم وەک تۆ بێبەزەیی بوایەم ـ خودا بۆخۆی زانا و تێگەیشتووە، ئارتور من ناتوانم ویست و داخوازیەکەت جێبەجێکەم، بەڵام ئەوەی پێمبکرێ بۆتی دەکەم یارمەتیت دەدەم کە هەڵێی، دوایە لەکوێستانەکان ڕووبەڕووی ڕووداوێک دەبمەوە، یان بەقەستی و بەهەڵە دەرمانی خەو دەخۆم . هەرکامێکیان کە تۆ پێتخۆشبێ، ئەم کارە ڕازیت دەکا؟ من ئەم کارەم بۆ دەکرێ و دەتوانم جێبەجێی کەم. گوناحێکی گەورەیە، بەڵام پێموایە خودا دەمبەخشێ ئەوزۆر بەخشەندەیە...».

میشەکەرانە گوڕاندی و هەردوودەستی بەملاولادا فڕێدا: «ئاخ، من تێناگەم! بۆم قەبووڵ ناکرێ! من چیم کردووە کە دەبێ سەبارەت بەمن ئاوا بیربکەیتەوە؟ حەقت چییە بەسەر منەوە ـ دەڵێی من بەتەما بووم تۆڵەت لێبکەمەوە! مەگەر نابینی کە تەنیا بەتەمای ئەوەم کە ڕزگارت بکەم؟ قەت ناتەوێ لەوە حاڵی بی کە خۆشم دەوێی.»

توند هەردوودەستی مونتانلی گرت گوڵی ماچ و بارانی فرمێسکی بەسەریاندا باراند.

ـ پاپا وەرە و ڕێگای ئێمە هەڵبژێرە! وەرە و خۆت ڕزگارکە لەدەست دونیای وشک و مردووی قەشەکان و خوالەکانیان! ئەوان لێپاولێپن لەژەنگی دوواکەوتوویی سەدەکانی ڕابردوو، هەموو گنخاون و گەنیون! لەم کلیسایە تاعوون لێدراوە وەرە دەرەوە ـ وەرە ڕیزی ئێمەوەو بەرەو ڕووناکایی هەنگاوبنێ! پاپا، ژیان و هەرمان و گەشە و نەشە و جوانی و بزە لەلای ئێمەیە، ئێمەین کە ژیانی هەمیشە بەهارین، کڵپە و گڕوتینی داهاتووین! پاپا ئاسۆی ڕوون لە سەرسەری ئێمە دەڕوێ ـ ئایا بەتەمای کاتی پشکووتنی

هەتاو لێی بەهرەمەند نەبێ؟ هەستە و خەوبەسە و با ژەنگی ترسناکی ئەوخەونانە لەزەینمان بڕەوێ و بتارێ ـ لەخەو ڕابەوە دیسانەوە سەرلەنوێ ژیانێکی نوێ دادەمەزرێنین! پاپا، من هەمیشە تۆم خۆشویستووە ـ هەمیشە، تەنانەت ئەوکات کە ئەمنت کوشت ـ ئایا دەتهەوێ کە جارێکی دیکە بمکوژی؟

مونتانلی دەستی کێشاوە و گوڕاندی: «ئاخ، خودایە ڕوحمم پێبکە! چاوەکانت لەچاوی دایکت دەچێ!»

بێدەنگییەکی سەیر و درێژخایەن لەپڕێکدا هەردووکیانی داگرت. لەو ڕۆژئاوا خۆڵەمێشییەدا چاویان لەچاوی یەکتری بڕیبوو و لەترسانا دەتگوت دڵیان لەلێدان کەوتووە.

مونتانلی وەک وڕێنە کردنێک گوتی: «ئیتر شتێکت نەماوە کە بیڵەی، هیوایەک... کە پێی دڵخۆش بم؟»

ـ بەبڕوای من ژیانی من بێجگە لەبەربەرەکانی لەگەڵ قەشەکاندا هیچ قازانجێکی دیکەی نییە. من ئینسان نیم، خەنجەرێکم. ئەگەر بتهەوێ کە بمێنم ئەوە خەنجێرەکانت بەرز و پیرۆز ڕاگرتووە.

مونتانلی ڕووی کردە خاچەکە: «خودایە، ئەمەت گوێ لێبێ...!»

لەبێدەنگییەکی زۆرقووڵدا دەنگی بەبێوەڵام مایەوە.

جارێکی دیکە شەیتانی سەرەڕوو لەناخی مێشەکەرانەدا ڕاچەنی: «بەدەنگێکی بڵیندترەوە بانگی لێ کرد،ڕەنگە خـ ـ خەوتبێ...»

مونتانلی وەک ئەوەی کە گورزێکی وێکەوتبێ، دەرپەڕی. بۆساتێک کە لەڕووبەڕووی خۆی دەڕووانی ڕاوەستا، دوایە لە سەر لێواری دۆشەکە کایەکە دانیشت، چاوەکانی بە هەردوودەست گرت و کەوتە گریان. لەرزینێکی سەیر هەموو ئازای مێشەکەرانەی داگرت، ئارەقە و جۆگاوێکی سارد بەتەوێڵ و لەشیدا داشۆڕا. ئەو مانای ئەوگریانەی دەزانی. پەتووەکەی بەسەرخۆیدا کێشا تا بەشکەم نەیبیستێ. هەرئەوەندەی کە قەرار وابوو بمرێ ئیتر بەسی بوو، ئەو کە دڵێکی پڕکەیلی شادی و گەشە و خۆشی هەبوو، بەڵام نەیدەتوانی ئەودەنگە بێدەنگ کات، لەگوێچەیدا دەنگی دەداوە، لەمێشکیدا

زرمەی دەهات، ئەودەنگە لە سەر هەموو دەمارەکانی لێیان دەدا و مونتانلیش هەروا دەگریا، و لەبەینی قامکەکانییەوە فرمێسک دەهاتەخوارێ.

ئاخرەکەی هێور بووەوە و هەروەک منداڵێکي گریاو بە دەسرەیەک فرمێسکەکانی سڕی. کاتێ کە هەستا دەسرەکە لە سەر ئەژنۆی خزا و کەوتە سەرئەرزی.

وتی: «ئێتر لەوەزیاتر قسە کردن بایەخێکی نییە، تێدەگەی؟»

مێشەکەرانە بەبێوازییەوە بەقسەی کرد و وەڵامی داوە: «تێدەگەم، خەتای تۆ نییە خوداکەی تۆ برسیە و دەبێ تێربێ.»

مونتانلی گەڕاوە بۆلای ئەو. بە قەدەرایی گۆڕێکی کپ و تاریک بێدەنگ بوون، بێدەنگ، وەک دوو ئاشقی شەیدای لێکهەڵبڕاو کە هەرکامێکیان لەجێگایەکی بڵیندەوە لە یەکتری بڕوانن و دەستیشیان بەیەکتری ڕانەگا. بەنێگاکانیان لەچاوی یەکتردا شۆڕبوونەوە ناخی یەکتریەوە. ئەوە مێشەکەرانە بوو کە لەپێش‌دا سەری داخست. خۆی کۆکردەوە و ڕوخساری خۆی شاردەوە، مونتانلی تێگەیشت کە ئەم کارەی ئەو بەمانای ئەوەیە کە «بڕۆ!» گەڕاوە و لە ژوورەکەی چووە دەرەوە.

دوای کەمێک مێشەکەرانە دەرپەڕی: «ئاخ ناتوانم خۆم ڕاگرم، پاپا بگەڕێوە! بگەڕێوە!»

درگاکە بەسترابوو. ئارام و لە سەرەخۆ بەنیگایەکی بێجووڵە و حەپەساو بەدەوروبەری خۆیدا ڕووانی و زانی کە هەموو شتێک تەواو بووە. جەلیلی۷ سەرکەوتوو بوو.

بەدرێژایی ئەو شەوە چیمەنی حەسارەکە ئارام کەروێشکێکی دەکرد - چیمەنێکی کە دەبوو زۆر زوو بژاکێ و بەدڵخوازی خۆی دەبوو لە ڕیشەوە هەڵقەندرێ، بەدرێژایی شەو مێشەکەرانە لەتاریکایی شەودا ڕاکشا و بەهەنیسکەوە گریا.

---

۷. نێوێکە کە بەسووکایەتی وەپاڵ مەسیح دراوە دەڵێن کە مەسیح لەجەلیلە لەدایک بووە.

## ٧

دادگای لەشکری لە بەرەبەیانی ڕۆژی سێشەممەدا دامەزرا، کارێکی زۆر کەم و ئاسان بوو. بەتەشریفاتێکی نهێنی کە ٢٠خولەکی نەخایاند.

ڕاستییەکەی ئەوە بوو کە باسوخواسێکی وانەبوو کە کاتێکی زۆربەخۆیەوە بگرێ،چونکە هیچ داکوکیکارییێکی تێدا نەگونجاندرابوو، شاهیدەکانیش تەنیا ئەو سیخوڕ و ئەفسەرەبریندارە و چەند سەربازێک بوون.

لەوەپێش حوکمەکە درابوو. مونتانلی ڕازی بوونی نارەسمی خۆی ـ کە داوایان لێ کردبوو ـ ناردبووی بۆ دادگا، و قازیەکانیش (سەرهەنگ فێراری، سەرگوردی سوارکاری لەشکەری ناوچەیی، و دووئەفسەری گاردی سویس)بوون،کە کارێکی زۆر و بەرچاویان نەبوو. داخوازییەکەی دادگا بەدەنگێکی بەرز خوێندرایەوە. شاهیدەکانیش شایەدییان‌دا و واژۆکانیش لەگەڵ حوکمەکە پێوەست کرا. دوایە حوکمەکە بە نەرم و نیانییێکی سەیرەوە بۆکابرای ئیدانە کراو خوێندرایەوە. مێشەکەرانە بەبێدەنگی گوێی ڕاگرت و دوایە کە بەپێی ڕەسمی دادگا، لێیان پرسی کە ئایا وتەیەکی هەیە کە لەوبارەوە بیڵێ، تەنیا بەبزوواندنی دەستی ئەویش بەپەلە وەڵامی «نا»ی داوە. دەسرەکەی مونتانلی کە لێیداکەوتبوو لە باخەڵیدا شاردبوویەوە. دەسرەکە بەدرێژایی شەو وەک بوونەوەرێکی زیندوو خۆی لە سەروچاوی مێشەکەرانە هەڵسوو و لە فرمێسک و ماچدا تەواو خووسابوو. مێشەکەرانە بە ڕواڵەت ماندوو و ڕەنگ‌هەڵبزرکاودیار بوو. هێشتا گریان و فرمێسکڕشتنەکەی

بەگوشەی چاوییەوە دیاربوو، بەلام وشەی «گوللەباران دەکرێ» وادیار بوو کارتێکەرییەکی زۆری لە سەر دانەنابوو. کاتێ کە ئەو وشانە گوتران و خوێندرانەوە هەرئەوەندە کە چاوەکانی برێک زەق بوونەوە و ئیتر هیچی دیکە.

دوای ئەوەی کاری دادگاکە تەواو بوو، قایمەقام گوتی: «بیگەڕێنەوە بۆ ژوورەکەی خۆی» و سەرپەلەکە کە زۆر ڕوون و ئاشکرا دیاربوو کە لەحەیبەتا خەریکە ئەژنۆی بنوشتێتەوە، دەستی لە سەر ئەوپەیکەرە بێجووڵەیە دانا... مێشەکەرانە بەحاڵ داچڵەکی و چاوێکی لێ کرد . گوتی: «بەڵێ، لەبیرم چووبووەوە.»

لەڕوخساری قایمەقامدا شتێک وەک بەزەیی بەدی دەکرا. ئەو لە ڕاستیدا بەگشتی پیاوێکی خوێنڕێژ و پیس نەبوو، لەمانگی ڕابردووەوە کە ئەوڕۆڵەی گێڕا لە ناخی دڵیدا وەک بڵەی کەمێک هەستی بەشەرمەزاری دەکرد. ئێستا ویست و داخوازی ئەو مسۆگەر ببوو و دەیویست لانیکەم کارێکی چکۆلەشی ئەگەر پێبکرێ بۆی بکات.

چاوێکی لە مەچەکە ماسیی‌و و تێککوتراوەکانی کرد و گوتی: «پێویست ناکا کە دووبارە زەنجیرەکانی لێببەستنەوە، دەتوانێ هەرئاوا لە ژوورەکەی خۆیدا بمێنێ. ژووری ئیدانە کراوەکە زۆرتاریک و خەمۆکیە.» چاوێکی لەبرازاکەی کرد و گوتی: «ئەم کارانەش هەر بەڕاست شتێکی تەشریفاتییە.»

کەمێ کوخی و بەناڕەحەتییەکی ئاشکراوە کەمێ ئەم لا و ئەولای کرد، ئەوجار بانگی لە سەرپەلەکە کرد کە خەریکبوو لەگەڵ ژیان و هەرمان و سەربەرزیدا بچێتە دەرەوە: «سەرپەل ڕاوەستە، دەمهەوێ قسەی لەگەڵ کەم.»

مێشەکەرانە نەبزووت و لە ڕواڵەتدا وا دیار بوو کە قسەکەی قایمەقامی نەشبیستووە.

ـ ئەگەر پەیامێک یان ڕاسپاردەیەکت هەبێ کە بتەوێ بیگەیێنی بەهاوڕێیانت یان کەس و کارت ـ پێموایە کە دەبێ خزم و کەست هەبێ؟

وەلامێکی وەرنەگرت.

ـ زۆرباشە لە سەر ئەم پێشنیارەم بیر بکەوە و بە من یان قەشە ڕابگەیێنە لەوە دڵنیا بە ئەگەر ڕاسپاردەیێک یان کارێکت هەبێ جێبەجێ دەکرێت بەبێ

هیچ قسوریەک. واباشترە کە پەیامەکانت بەگوێی قەشەکە بگەیێنی. هەرئێستا دێ، و شەوێ لەلای تۆ دەمێنێتەوە، ئەگەر داخوازییەکیتریشت هەیە...

میشەکەرانە سەری هەڵێنا: «بە قەشە بڵێ پێمخۆشە کە بەتەنیا بم. من نەدۆست و نە هاوڕێیەکم هەیە و نە پەیامێکیش.»

- بەڵام خۆ دەتهەوێ لەلای قەشەیەک پێ لەگوناح و تاوانەکانت بنێی.

- من کافرم، بەس تەنیا دەمهەوێ ئاسوودەبم.

ئەم ڕەستەیەی بەبێ‌هیچ تووڕەییەک و بەدوور لەڕق و قین و بەدەنگێکی ئارام و بێ‌هێزەوە بەیان کرد و بە ئەسپایی گەڕاوە. لەنزیکی درگاکە دیسانەوە ڕاوەستا: «سەرهەنگ لەبیرم چوو، داخوازییەکم لێت‌هەیە. تکایە سبەینێ مەهێڵە کە دەست و چاوم ببەستن. تەواو ئارام و لە سەرەخۆ ڕادەوستم.

لە ڕاپەڕینی تیشکی هەتاوی بەیانی چوارشەممەدا،لەگەڵ هەڵزنانی ڕووناکایی تیرێژی ڕۆژ، میشەکەرانەیان هێنا بۆحەساری. زۆر لەجاران ئاشکراتر دەشەلی و قورسایی خۆی خستبووە سەرباسکی سەرپەلەکە، زۆر بەقورسایی و بەزەحمەتەوە هەنگاوی هەڵدەهێناوە، بەڵام ڕوخساری ڕوون وگەش ودوور لە هەر جۆرە ئازارێک‌وماندوویەتییک بوو. ئەوترسە خەیاڵیانە کە لە بێدەنگی و تەنیاییدا ئەویان تێک‌شکاندبوو، ئەو فکر و پەژارە ڕۆحیانەی دونیای سێبەر و نسێکان، کە لەوشەوەدا ڕۆحی وەبەر هەموویان هێنابوو، بەجارێ هەموویان تەفر و توونا ببوون و کاتێ کە تاو هەڵات و دوژمنەکانی هەموو ڕێزیان بەستبوو تا ڕۆحی بەرز و بەرهەڵستکاری لێ‌بستێنن، ئیتر ترسی لە هیچ شتێک نەمابوو. تەنانەت ئەو ترسە کۆنەی ژانوو بڕکی جەستەشی، کە جار جار ئازاریان دەدا ڕەوێ بوو.مەرگی چی،ترس لە مەرگ! لە مێژ بوو سنگی مەرد و ڕەندی قەڵغانی گوللە و ئاسن بوو.ئەو لە زومرەی کەسانێک بوو کە لە پێش مەرگەوە هەنگاویان بەرەو کۆشی ژیان دەهاویشت.

شەش‌تفەنگچی هەڵبژێردرابوون تا ئێعدامەکە بەڕێوەبەرن لەڕیزێکدا ڕووبەڕووی دیوارەکە ڕاوەستابوون کە بەدار و گوڵ داپۆشرابوو. هەر ئەودیوارەی کە لەوشەوەدا ئەو هەمووە هەوڵە بێ‌ئاکامەی بەخەرجدا و لێی هاتەخوارێ. سەربازەکان هەروا کە تفەنگ بەدەست لەپەنای یەکترەوە

ڕاوەستابوون زۆر بەزەحمەتەوە پێشی گریانی خۆیان دەگرت. لەبەر ئەوەی، کە بۆدەبێ ئەوان بۆ کوشتنی مێشەکەرانە هەڵبژێردرێن، لە هزر و زەینیاندا تابلۆیەکی زۆرناخۆش و ترسهێنەر نەخشێندرابوو . ئەو قسە لەڕوو بوون و حازرجواب بوونەی، پێکەنینەکانی و بوێری ڕوون و ئاشکرای کە کاریگەری لە سەر ئەوانیش دانابوو. کە ئەمانە هەموو وەکوو تیشکێکی نووورانی و سەرگەردان هاتبووە نێوژیانی سرڕوسارد و پڕلەخەم و چەرمەسەریی ئەوانەوە، لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە کە دەبێ ئەو بمرێت و ئەویش بەدەستی ئەوان، لەبەرچاوی ئەوان وەکوو کوژاندنەوەی هەموو ڕووناکایەکانی ئاسمانەکان وا بوو.

قەبرەکەی لە ژێر داری هەنجیرەپیرەکەی حەوشەدا ئامێزی کردبووەوە و چاوەڕوانی بوو. ئەم قەبرە بەدەستێکی داهێزراو و بێمەیل لەشەوی ڕابردوودا هەڵکەندرابوو کە بەقەدەرایی هەڵکەندنەکەنی فرمێسکی لە سەر ڕژابوو.کاتێ لەپەنایەوە گوزەرا بەبزەیەکەوە چاوێکی لەوچاڵەتاریکە کرد کە چیمەنی دەوروبەری بەژاکاوی کوزیلکەیان بەستبوو، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا تا بۆنی گڵەکە پڕ بە سییەکانی هەڵمژێ.

سەرپەلەکە لەنزیک دارەکە ڕاوەستا. مێشەکەرانەش بە شلەبزەیەکی زۆر شیرینەوە ئاوڕی داوە: «سەرپەل، دەبێ لێرە ڕاوەستم؟»

ستوان، بێدەنگ و مات، بەبزواندنی سەری گوتی: «بەڵێ، قوڵپی گریان چنگی لە ناخی گیر کرتبوو، زمانیشت ببڕیایە نەیدەتوانی تاقە وشەیەک قسە بکات. قایمەقام، برازاکەی، ستوانی فەرماندەی چەکدارەکان کە بڕیار وابوو ئەوفەرمانیان بداتێ، دوکتۆرێک و قەشەیەک کە هەموو لەحەساری بوون، کەموزۆرگەردی زەردی خەجاڵەتی دایگرتبوون. مێشەکەرانەش لە بەرانبەریاندا شکۆدار و مەزن و سەربەز ، بەچاوی پڕلەخەندە و بەقەڵافەتێکی نێرانە و مەردانەوە بە بێ هیچ شەرم و دڵە ڕاوکێی وترسێکەوە ڕاوەستابوو.

- بەیانیتان باش بەڕێزان! پاپای بەڕێزیش ئاوا زوو لەخەو هەستاوە! ملازم تۆچۆنی؟ دەرفەتی دیداری ئێستامان لەوەی ڕابردوو بڕێک خۆشترە وانییە؟

ئێستاش دەستت دەبینم کە بەگەردنتەوە هەڵتواسیووە، لەبەر ئەوەیە کە من تیر ئەنگێوێکی کارامە و باش نیم. بێشک ئەم کوڕە جوانکیلانانە دەبێ کارەکەیان زۆرباشتر بەڕێوەبەرن ـ وانییە کوڕەکان؟

چاوێکی لەڕوخساری داتەپیوی چەکدارەکان کرد کە دەتگوت ئاو و دۆت بەسەریاندا ڕژاندووە: «هەرچی بێ ئەمجارەیان پێویست ناکا بەپەت و دەسماڵ دەستم هەڵواسم بەملمەوە، باشە دەی باشە پێویست ناکا ئەوەندە مات و پەرۆش بن! پاژنەکانتان ڕێک لەلای یەک ڕاگرن و خۆتان نیشان دەن کە چەندە جوان و ڕێکوپێک تەقە دەکەن. هەروا پاش بەینێکیتر ئەلەوجۆرە کارانە هێندە زۆر دەبێ کە خۆشتان سەرتان سووڕبمێنێ کە چۆناوچۆن ئەنجامی دەن. هیچ شتێک لە ئەزموونی پێش کار باشتر نییە.»

ـ «کوڕم» قەشەکە هەروا کە دەهاتە پێشەوە قسەکەی ئەوی بڕی و ئەوانیتر کشانە دواوە تا ئەودووانە بەتەنیا بمێنەوە.

ـ تا چەندساتێکیتر دەگەڕێیتەوە لای خوڵقێنەری خۆت. ئایا بۆ ئەم دواساتانەی ژیانت کە دەتوانی تۆبە بکەی قسەیەکی دیکەت جیا لەوە نییە؟ بیر بکەوە، تکات لێدەکەم، بەمهەموو تاوان و گوناحانەی کە لە سەرشانی تۆ ڕیزبووە، مردن بەبێداخوازی لێبوردەیی شتێکی سامناک و ترسێنەرە. ئەودەم کە لەوێ ڕووبەڕووی نێوبژیکەری خۆت دەبیەوە ، دەرفەتی پەشیمان بوونەوەت نابێ. ئایا دەتهەوێ بەزمانێکی پڕلەتاوان و سەرزەنشتەوە لەقەلافەتی ترسێنەری نزیک ببیەوە؟

ـ تانە و تەشەری سەرزمان، پاپا؟ بەڕای من ئەوە لایەنی ئێوەیە کە پێویستی بەو موعیزەیە هەیە: ئەوکات کە نۆبەی ئێمە دێ، بەجێگای ئەوشەشتفەنگە کۆنەیە، تۆپی گەورەی دەشت و کێوان وەگەڕ دەخەین و ئەودەم تۆ دەبینی کە زمانی ئێمە چۆن سەرزەنشت و سەرکۆنەی ئێوە دەکات.

ـ تۆ تۆپی دەشت و کێو وەگەڕ دەخەی! ئەی هەژاری بێچارە! هێشتا لێت حاڵی نەبووە کە چ چاڵەڕەشێکی ترسناک چاوەڕوانتە؟

مێشەکەرانە بە سەرشانییەوە چاوێکی لەقەبرەکەی کرد: «هۆ پاپای بەڕێز، بۆ پێتوایە کە دوای ئەوەی منتان لەوقەبرەدا خەواند، ئیتر کارتان لەگەڵ من

تەواو دەبێ؟ ڕەنگە بتانەوێ کە بەردێکی قورس قورسی لە سەر دانێن تا پێشی هەستانەوەیەکی سێڕۆژە[1] بگرن؟ پاپای بەڕێز مەترسە! من بەمجم و جوولە دەست کردانە ، کە زۆرمندالآنەیە قەت هێرش نابەمە سەر مافی هیچ کەسێک، من وەک مشکێک لەوجێگایەی کە دامدەنین ئارام و ڕاست و بێگرێ دەخەوم، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئێمە تۆپەگەورەکان وەگەڕ دەخەین.»

قەشەکە نەڕاندی: «خودای بەخشەندە، ئەم پیاوە بەدبەختە ببەخشە!»

ستوانی فەرماندەری چەکدارەکان بەدەنگێکی کە بەحاستەم دەبیسترا گوتی: «ئامین!» سەرهەنگ و برازاکەشی وەک کەسایەتییەکی پاقژی ئایینی لە سەرسینگی خۆیان خاچیان کێشا. چونکە پێداگرتنێکی بێئاکام و بێ سوودە .قەشەکەش ئیتر لەوەزیاتر تێوە نەچوو سەرێکی لێڕاوەشاند و دۆعای کرد و چووە ئەولاوە.ئیش وکاری فەرمی پێش ئێعدام کردنەکە لە بازنەیێکی بێدەنگیی پڕ هواردا زۆر بە سادەیی بە ڕێوە چۆ. مێشەکەرانە لە شوێنی دیاری کراوە ڕاوەستا و کەمێ سەری وەرسووڕاند تا ساتێک تیرێژی سوور و زەردی ڕۆژ ببینێ. جارێکی دیکەش داوای لێ کردبوون تا چاوەکانی نەبەسترێت. ڕوخساری دوژمنتەزێنانەی وای نیشان دەدا کە ڕق و قینێکی تایبەتی وای لە سەرهەنگ نییە. هەردووکیان لەوکاتەدا فەرامۆشیان کردبوو کە بەزۆری ئەوکارە بەسەربازەکان دەکەن.

مێشەکەرانە بەزەردە خەنەییەکەوە ڕووبەڕووی ئەوان ڕاوەستا، دەستیان بەتفەنگەکانەوە دەلەرزی.

مێشەکەرانە گوتی: «تەواو حازر و ئامادەم.»

ستوان کە بە هۆی دڵەکوتێوە کەمێک دەلەرزی چووە پێشەوە. ئەو، تا ئێستا فەرمانی تیربارانی نەدابوو.لە حەیبەت ئەو ئەرکە قورس و گوانە تربەی دڵی خەریک بوو ڕکەی سینگی بدڕینی .

- لە سەر جێگای خۆتان - حازر - دەسڕێژ بکەن!

مێشەکەرانە کەمێ لاتراسکەی بەست، بەڵام خۆی ڕاگرت و نەکەوت. گوللەیەک ڕوومەتی ڕووشاندبوو. پەڵەیێک خوێن بەسەر کڕاواتە سپیەکەیەوە

---

[1]. ئاماژەیەکە بەزیندووبوونەوەی عیسی دوای سێڕۆژە.

دیاربوو. گوللەیەکی دیکە لە سەروی ئەژنۆیەوە کەوتبوو. کاتێ کە دووکەڵی باڕووتەکە تەواو بوو، سەربازەکان دیتیان کە پێدەکەنێ و بەدەستەبرینداره‌کەیەوە خوێنی سەر گۆنای دەسڕێ.

مێشەکەرانە گوتی: «دەستڕێژێکی زۆرخراپ بوو!» دەنگی زۆر ڕوون و بێگرێ بوو و ئەوەندەی دیکە سەربازە بێچارە و بێدرەتانەکان داهێزران ، بە نرکەیێکی شێرانەوە گوڕاندی: «جارێکی دیکە تاقی کەنەوە.»

ناڵەیەک و لەرزینێکی گشتی هەموو ئازای تفەنگچییەکانی داگرت. هەرکام لە سەربازەکان هیواخواز بوون کە گوللەی مەرگ لە دەستی هاوڕێکەی پەنایەوە بتەقێندرێ،هەر بۆیە هەرکامەیان بەم‌لاولایی‌دا سیلەیان دەگرت. نەکا بە دەستی ئەو بکوژرێ، مێشەکەرانەش هەروا توندوتۆڵ بە بزەی سەر لێوییەوە ڕووبەڕووی ئەوان ڕاوەستابوو. ئەوان ئەو ئیعدام و گوللەبارانەیان وەک قەسابییەک هاتبووە پێش‌چاو، دوای ئەوە! دەبوو هەموو ئەو کارە ناخۆش و جەرگبڕەیان لە سەرڕاوە دەست پێبکردایەتەوە، ترسێکی سەیر دایگرتبوون، تفەنگەکانیان هێنابووە خوارێ، هەروا کە گوێیان لەجنێو و سەرزەنشتی ئەفسەرەتووڕەکان بوو، بەترسێکی سەیرەوە دەیانڕووانییە پیاوێک کە کوشتبوویان، بەڵام هێشتا زیندوو بوو و وەک دار هەنجیرە پیرەکە پێ قاییم ولێو بە بزە ڕاوەستابوو.

قایمەقام مستی خۆی هەڵێنا و پیشانی دان و وەک شێت گوڕاندی کە ئامادە ببنەوە، چەکەکانیان ئامادە و تەیارکەنەوە، پەلەبکەن و کارەکە تەواوبکەن.

سەرهەنگیش وەک سەربازەکان ورەی بەردابوو و نەیدەوێرا چاو لەوپەیکەرە خوێناوییە بکات کە کێو ئەسا خۆی بەسەرپێوە ڕاگرتبوو و نەدەکەوت. کاتێ مێشەکەرانە قسەی لەگەڵ کرد، بەبیستنی ئەودەنگە پڕ تین و پڕهەیبەتە کە پڕبوو لە تەشەر و توانج و سووکایەتی،سەرهەنگ بە جارێ دارما و داچڵەکی و لەرزی.

- سەرهەنگ، ئەمرۆبەیانی گرووپێکی بێئەزموونت هێناوە! ڕاوەستە بزانم ئەتوانم ئەوان باشتر ڕێکوپێک و تەیارکەم، دەی سەربازەکان! تۆ تفەنگەکەت

بەرزتر ڕاگرە، تۆ کەمێ بەلای چەپەوە، دڵتگەوەرەبێ پیاو، ئەوەی لەنێو دەستتدایە تفەنگە خۆ قالۆرە نییە! هەمووتان باش سیلەتان گرتووە؟ تەواوە! لە سەر جێگای خۆتان ـ حازر...

سەرهەنگ خۆی ڕانەگرت و خێرا چووە پێشەوە و پەڕیە نێوفەرمانەکەوە: «دەستڕێژ بکەن!» شتێکی چاوەڕوان نەکراو دەبوو ئەگەر ئەم کابرایە فەرمانی مردنی خۆی بدایەت جارێکی دیکە دەستڕێژێکی شێواو وتێکەڵو پێکەڵ بەڕێوە برا، ئەوهێڵە زەنجیریە کە لەگەڵ ترس و خۆف ڕووبەڕوو ببووەوە بەلەرزینی یەکەیەکی ئەوپەیکەرانە تێکشکا. یەکێ لەوسەربازانە تەنانەت تەقەشی نەکرد و تفەنگەکەی فڕێدا ئەولاوە، دانەوییە سەرئەرزی و بەناڵە و هاوارەوە گوتی: «ناتوانم ـ ناتوانم!»

دووکەڵی تفەنگەکان بەئارامی و بەناقابیلییەوە بەلایەکدا ڕۆیشت و وردەشەپۆلی بێتین و کەمهێزی تیشکی بەیانی وردەوردە خۆی نیشان دا و بە ئارامی مێشەکەرانە کەوتە ئەرزی، کە باش لێیوردبوونەوە دیتیان هێشتا نەمردووە. سەرباز و ئەفسەرەکان بەدیتنی ئەودیمەنە لەجێگای خۆیان وشک ببوون ، وەک دارێکی وشکەڵی بێجووڵە ڕاوەستابوون و چاویان لەوبوونەوەرە ترسناکە دەکرد کە لە سەر ئەرزی کەوتبوو و لەحەیبەتا خۆی بادەدا و لەگیانەلادا بوو، دوای دوکتۆر و سەرهەنگ بەهەڵەداوان و هەراو گورەوە چوون بۆلای، چونکە ئەو خۆی لە سەر ئەژنۆیەک ڕاگرتبوو و هەوڵی ئەدا کە هەستێتەوە و پێیان نیشان دات کە مەرگ چۆک بە شۆڕشگێڕ دانادات . دیسانەوە لە سەربازەکانی دەڕوانی و پێدەکەنی:

ـ خەتی دووەم: تاقی کەنەوە ـ سەربازەکان جارێکی دیکە تاقی کەنەوە ـ چاو لێکەن ـ ئەگەر نەتوانن...

لەپڕێکدا لاتراسکەی بەستوو بە سەرشانێکیدا کەوتە سەرچیمەنەکە.

سەرهەنگ لە ژێر لێوییەوە گوتی: «مردووە؟» دوای ئەوەی دوکتۆر لە سەر ئەرزیی ئەژنۆی دادا و دەستی لە سەر کراسەخوێناویەکەی دانا بەهێواشییەکەوە گوتی: «پێموایە کە مردووە ـ خودایە شوکرت!»

سەرهەنگ دووپاتی کردەوە: «خودایە شوکر! ئاخرەکەی تەواو بوو!»

برازاکەی دەستی لە سەرباسکی دانا: «مامە، کاردینال هاتووە! لەبەر دەروازەکەیە و دەیهەوێ بێتە ژوورەوە.»

- چی؟ نابێ بێتە ژوورەوە - نایەڵم! ئەی یاساوڵەکان چیدەکەن؟

قوربان...

دەروازەکە کراوە و مونتانلی لەحەساری ڕاوەستابوو. بە چاوی زەق و ترسهێنەرەوە دەیڕوانییە ڕووبەڕووی خۆی.

- قوربان! دەبێ داواتان لێبکەم کە... دیتنی ئەم دیمەنە بۆ ئێوە باش نییە! مەراسمی ئیعدامەکە هەرئێستا کۆتایی هات. تەرمەکە هێشتا...

مونتانلی گوتی: «هاتووم کە بیبینم.» تەنانەت لەوکاتەشدا وا بەزەینی قایمەقام گەیشت کە قسە کردن و جۆری ڕێگاڕۆیشتنەکەی وەک کەسێک وایە کە بەدەمخەوەوە بڕوات. یەکێ لە سەربازەکان لەپڕێکدا گوڕاندی وهاواری کرد: «ئای خودایە!» قایمەقام بەپەلە ئاوڕێکی داوە بێگومان...

جەستەیێکی شەلاڵی خوێنی ئاڵ کە لە سەر چیمەنەکە کەوتبوو، جارێکی دیکە بزواوە و نالاندی و هەوڵی دەدا کە هەستێ. دوکتور بەچۆکەوە خۆی بە ئەرزدا دا و سەری لە سەر ئەژنۆی خۆی دانا.

وەک سەرلێشێواوێک نەڕاندی: «زووکەن! شاغییەکان زووکەن! کارێ بکەن با نەجاتی بێ، بۆخاتری خودا زووکەن! دیمەنێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێنە!»

کفارەی خوێن هەروا بەسەر دەستیدا دەڕژا، تەقەلا و لەرزینی پەیکەرەی ناوباوەشی، ئازای ئەندامی وەلەرزین خستبوو.ئەوە ڕژانی خوێنی لەشی کەسێک نەبوو،شەپۆلانی سووری دەریای گەشی گەلێکی چەوساوە بوو.ئەوە قورسایی لەشی مرۆیێک نەبوو ،کێوی ورەی هێزی بە هێزێ گەلێک بوو .

کاتێ کە دوکتور وەک شێت و هار هاواری دەکرد و یارمەتی دەخواست ، قەشەیەک لە سەر شانی ئەوەوە دانەوی و خاچەکەی نایە سەرلێوی ئەوپیاوەی کە لەگیانەلادا بوو: «بەنێوی باوک و کوڕەوە...»

مێشەکەرانە لە سەرئەژنۆی دوکتور کەمێ خۆی ڕاست کردەوە و بەچاوی دەرپەڕیوەوە ڕێکڕووانییە خاچەکە.

ئارام لەمەودای نێوان بێدەنگی و خامۆشییەکی بەستەڵەکدا دەستی ڕاستی هەڵێنا و خاچەکەی لادا. پەڵەیەکی سووری گەشی خوێن بەسەر ڕوخساری مەسیحی سەرخاچەکەوە دەبیندرا.

- پاپا - بڵەی خوداکەی تۆ - تێر - بووبێ؟

سەری لە سەر دەستی دوکتۆر کەوت بەپشتا.

- قوربان!

چونکە کاردینال هێشتا هەروا حەپەسابوو، سەرهەنگ فێراری دەنگی بەرزتر کردەوە: «قوربان!»

مونتانلی سەری هەڵێنا: «مردووە.»

- بەڵێ مردووە و تەواوی کرد. قوربان واوە نایەی؟ دیمەنێکی سامناک و تۆقێنەرە.

مونتانلی دووپاتی کردووە: «مردووە.» و دیسانەوە لەڕوخساری ئەوی ڕووانی: «دەستم لێدا، مردووە.»

ستوان بەتەوسێکەوە لە ژێر لێویەوە گوتی: «ئەی بەتەمای پیاوێک شەشگوللەی وێکەوێت و هیچی لێنەیەت؟» دوکتۆریش بەهێواشییەکەوە وەڵامی داوە: «پێموایە خوێن گرتوویەتی.»

قایمەقام باسکی مونتانلی توند گوشی: «قوربان، واباشترە کە ئیتر لەوەزیاتر لێیورد نەبیەوە. ئەگەر ئیزنمان بدەی با ئەو قەشەیە هەتا ماڵێ بەڕێت کاتەوە؟»

- بەڵێ، ئەڕۆم.

ئارام لەودیمەنە خوێناوییە ڕووی وەرگێڕا و دوورکەوتەوە. قەشە و سەرپەل بە شوێنییەوە کەوتنە ڕێ. لەنزیک دەروازەکەی دەرەوە ڕاوەستا بەپەشۆکاویەکی ئارام و سەیرەوە ئاوڕی داوە بۆدواە: «مردووە.»

دوای چەندکاتژمێرێک مارکون چووە نێو ئەوماڵەی کە لەداوێنی کێوەکەدا بوو، تا بەمارتینی بڵێ کە ئیتر پێویست ناکا ئەو گیانی خۆی بەخت کات.

هەموو شتێک بۆ مسۆگەربوون و پراگتیزە بوونی گەلاڵەی دووهەم لەمەڕ ڕزگار کردنی ئەو ئامادە کرابوو. چونکە ئەم گەلاڵەیە زۆر سادەتر لەئەوەی پێشوو بوو. بڕیار وابوو کە هەر بۆ سبەینێی ئەو ڕۆژە کە گرووپی Corpus Dommini لەبەردەم قەڵاکەوە دەگوزەرێت، مارتینی لەنێو جەماوەرەوە دەرپەڕی و لەنێو جلوبەرگەکانییەوە دەمانچەیەک دەرهێنێ و ڕووبە قایمەقام تەقە بکات. لەئاڵۆزی و شێواوی ئەوجەنگەیەدا، دوایە بیست پیاوی چەکدار، لەپڕێکدا هێرش بەرنە سەر دەروازەکەی قەڵا و خۆبکەن بەژووریدا، بەزۆر کلیلدارەکەیان ببردایەت و بچوایەنە ژووری بەند کراوەکە و بەدەستی خۆیان ئەویان بهێنایەتە دەرەوە، و هەرکەسێکیش کە ببوایەتە کۆسپ و تەگەرە یان بیانکوشتایە یان برینداریان بکردایەت. بە قوونەشەڕیش لەدەروازەکەوە بچووبایەنە دەرەوە ؛ لە پاشەکشێشدا دەستەیەکی دیکە لە قاچاخچییەکان کە چەکدار و سوارکاربوون ، دەبوو ئەویان ببردایەت بۆ حەشارگەیەکی دوور لەمەترسی لەو چیا و بەندەنانە . تەنیا کەسێک لەوگرووپەچکۆلەیەدا ئاگای لەوکارە نەبوو جما بوو، ئەم کارەش بە هۆی ویستی تایبەتی مارتینییەوە بوو کەدەبووجما بێئاگابێ.

ئەو گوتبووی: « زۆر ناخایەنێ و هەر لە سەر ئەو کارە شوشەی دڵی دەچرژێ.»

هەرکە قاچاخچییەکە لەدرگای باخەکەوە هاتەژوورەوە مارتینی درگا شووشەییەکەی کردەوەو بۆ دیتنی ئەو چووە هەیوانەکە: «مارکون چ خەبەرە؟ ئایش!»

قاچاخچییەکە کڵاوە حەسیرییە لێوپانەکەی سەری خستبوو بەپشت سەریدا.هەردووکیان لە هەیوانەکە دانیشتن. بێدەنگو مات. مارتینی هەر لەوکاتەدا کەچاوی بەڕوخساری ژێرکڵاوەکە کەوت لێیحاڵی بوو کە چباسە. دوای بێدەنگییەکی درێژخایەن، پرسیی: «کەی ئەو کارەیان کرد؟» دەنگێ لەگوێی خۆیدا دەنگدانەوەیەکی ناخۆش و پەرێشانی هەبوو.

ـ بەیانی ئەمڕۆکە، لەدەمەدەمی بەیاندا. سەرپەلەکە پێی گوتم. خۆی لەوێ بووە و بەچاوی خۆی دیتوویەتی.

مارتینی سەری دانەواند و دەزوویەکی کە لەقوڵی کوتەکەیەوە شۆڕ ببووە لەپرێکدا و بە توورەییەوە پچڕاندی.

لەخۆڕا، لەخۆڕایی بوو، ئەمەش هەر لەخۆوە بوو. ئەو دەبوو سبەینێ بمردایەت، بەڵام ئێستا دونیای هیواو ئاواتەکانی ئەو وەکوو دونیای ئەفسانەیەک کە پڕلەئاوات و خولیای گەش و ڕوونی ئاسۆیە و بە هاتنی چنگی ڕەشی مەفحەوە دەبێ، ئەویش کەوتە گۆمی مردن و نەمان و چووە دونیای شەوان و ڕۆژانی شۆڕشگێڕانی قەدیمی و دڵکەیلی ئازادی و ئەشق و خۆشەویستی ـ دونیای گراسینی و گالی، دونیای ڕەمزنووسین و چاپی بڵاڤوگ، دونیای بەربەرەکانی نێوان هاوڕێیانی حیزبی ئەو لەلایەک و پیلانی پیس و گڵاوی سیخوڕە ئوتریشییەکان لەلایەکی دیکەوە. هەروەها لەناخی دڵیدا و لە کۆشک و تەلاری ویژدانیدا جێگایەکی دڵفەریح و خۆش خاڵی بوو کە هیچ کەسێک نەیدەتوانی ئەوێ داگیرکات.مارکون پرسیاری لێدەکرد و ئەویش پەرێشان و سەرگەردانی ئەوفکرە بوو کە دوای ئەو چی بەجێماوە کە بایەخی قسە لە سەر کردنی هەبێ، سەری هەڵێنا: «چیت گوت؟»

ـ گوتم بێشک تۆ ئەم خەبەرەی پێدەدەی.

گوڕاندی: «چۆن دەتوانم پێی بڵێم؟ ئەگەر وایە داواشم لێبکەن با خەنجێرێکیش لێ سەر دڵی بدەم. ئای هاوار چۆن دەتوانم پێی بڵێم؟ چۆن دەتوانم!»

بە هەردوو دەستی توند هەردوو چاوی داپۆشی، بەڵام بێئەوەی کەجێگایەک ببینێ، وای هەست کرد کە قاچاخچییەکە لەپەنایەوە بزوا، ئەوجار سەری هەڵێنا. جما لەبەردرگاکە ڕاوەستابوو.

جما گوتی: «سزار بیستووتە؟ هەموو شتێک تەواو بوو. ئەویان گوللەباران کردووە.»

# ٨

مونتانلی لەبەر میحرابەگەورە و بڵیندەکە لەنێوان "Introdio ad alter dei"[1] هاوکارانی خۆی و خزمەتکارانی کلیسادا ڕاوەستابوو، بەدەنگێکی بڵیند و یەکمیزان زبووری پێش عیشای ڕەبانی دەخوێندەوە. سەرتاپای کلیسا لەئامێزی ڕەنگ و گەشەی نووردا بوو. لەپارچە و کۆتاڵەکانی جێژنی جەماوەرەوە هەتا ئەوسەری کۆڵەکەکان، هەمووی بەوشاڵ و پارچەجوانانە و چەپکەگوڵە زێڕینانە نەخشێندرابوون. لە سەروی درگاکەوە پەردەی مەخمەری گەورە شۆڕکرابوونەوە. کە تیشک و شەوقی گەرمی هەتاوی مانگی ژوئێن لەچینی پەردەکەی دەدا و دەدرەوشاوە، هەروەکوو ئەوەی کە لەنێوان مەزرایەکی گوڵاڵەسوورەی کەسک و سووردا چراخان بێت. قاتە ئایینییەکان بەمۆم و مەشخەڵەکانیانەوە، قەشەکانی کلیسا بەخاچ و ئاڵاکانیانەوە نوێژگەکانی دەوروبەریان بە تەوژاوەگیی ڕووناک کردبوو، لەڕێڕەوەکاندا پارچەی هەوریشمی ئاڵای هەڵواسراو و شۆڕەوە کراو، چێوی پێکەوگرێدراو بەگوڵینگ و متومووړووی ڕەنگاوڕەنگەوە کە بەژێر بنمیچەکەوە دەدرەوشانەوە. عەبای گرووپی کۆڕ، کە بەشێوەی کوڵکەزێڕینە نەخشێندرابوو لە ژێر پەنجەرە ڕەنگاوڕەنگەکەدا سەدجۆری دەنواند. چەپکچەپک تیشکی هەتاو بەڕەنگی نارنجی و ئەرخەوانی و ئاڵوکەسک

---

١. لاتینیە: «یانی بەرەو میحرابی خودا هەنگاو هەڵدێنمەوە.»

دەڕژایە ناو کلیساوە. لەپشت میحرابەکە پەردەیەکی درەوشاوەی لێهەڵواسرابوو کە بەهێڵی جۆراوجۆری نوقرە ڕازێندرابووەوە. جوانکاری سەرپەردەکان و چراکانی میحرابەکە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک وەبەرچاو دەکەوت. کاردینال لەناو عابا و هاودامێنێکی سەرتاپا سپی شۆڕدا کە لە دوواوە لەئەرزی دەخشا، وەک پەیکەرە و مجەسەمەیەکی مەڕمەڕین، کە ڕۆح و گیانی تێزابێ دەهاتە بەرچاو. بەپێی ڕەسم و عادەتی ڕۆژەکانی دەستەوڕێژە، دەبوو ئەو بۆخۆی سەرپەرشتی ئایینی عیشای ڕەببانی بکردایەت، ئەوەک ئەوەی بەتەنیا پێشنوێژی بکات . هەربۆیە دوای تەواوبوونی خوێندنەوەی دۆعای تۆبە و پاڕانەوە زۆر بەئارامییەوە لەمیحرابەکەوە بەرەوجێگای ئۆسقۆفی کەوتەڕێ و بە بەردەم پێش نوێژخوێنان و خزمەت گوزارانی کلیساوە دەگوزەرا و ئەوانیش بەڕێزەوە سەریان بۆ دادەنەواند.

یەکێ لەکانوونەکان ئارام چرپاندی بەگوێی ئەوکەسەی پەنای خۆیەوە: «بەداخەوە بەڕێز مونتانلی تەندروستی لەباش ناچێ، پیس پەشۆکاوە، سەر و پۆتراکی وانیشان دەدا.»

مونتانلی سەری دانەواند تا تاجی ئۆسقۆفی لەعل و دوڕنیشانی لە سەرنێن. قەشەیەک کە وەک شماسێکی ئیفتیخاری۱ کاری دەکرد تانجەکەی لە سەر سەری دانا، کەمێ لەوی ڕووانی، دوایە بڕێک دانەوی و ئارام گوتی: «قوربان، خوای نەکەردە ناساخی؟»

مونتانلی کەمێک بۆلای ئەو وەرچەرخا، هیچ ناسیاوییەک لەهێلوەکانیدا بەدی نەدەکرا.

قەشەکە بەگوێیدا چرپاند: «ببوورە قوربان!» دوای ئەوەی کە دانەویە سەرئەژنۆی، هەستا و گەڕاوە، لەوەی کە ببوە هۆی پچڕانی ڕازونیازەکانی ئەو لەگەڵ خودادا، خۆی سەرکۆنە دەکرد.

ڕەسم و عادەتی ئاسایی هەروا بەردەوام بوو، مونتانلی بێجووڵە و ڕاست دانیشت، تاجە درەوشاوەکەی و عەبا زێڕنیشانەکەی تیشک و شەوقی

---

1 شماس: کەسایەتی ئایینی کلیسایە کە پلە و پایەی لە قەشە لەخوارترە(و).

هـەتاویـان دەگـەڕانـدەوە. چـینچـین عابـا سـپی و فـەرمیـەکـەی لـە سـەر فەرشەسوورەکە درێژ ببوو و لە عەرزی دەخشا.

یاقووتەکانی سەرسنگی لەنێوان ڕۆشنایی سـەدان مۆمدا دەدرەوشانەوە و دەرژایە نێونیگا و چاوی بەقوولداچوو و بێهێزی. هـەرکە دانەوی تا بەو وشـەگـەلـە "Benedicite Pater eminentissime" بـخـورەکـە متـەفـەڕک کـات، درەوشـاوەیی و شـەوقی هـەتـاو لـەنێو ئـەڵماسـەکاندا یاریـان دەکرد.ڕەنگە مونتانلی ،بە دیتنی قەڵافەتی خۆی، شێرەبەفرینەیەکی زۆر گەورە و پڕشکۆ و ترسناکی کوێستانەکانی بێتەوە یاد، کە بە تاجێک لـە شـێوەی کوڵکەزێڕینـە و هاودامێنێکی بەفری باهێنـەر، بـەدوودەسـتی ئاواڵـەوە، کۆشـێک بـەرەکـەت یـان کۆشێک لە نەفرەت و جنێو بڵاوبکاتەوە.

کاتی ڕێزلێنان و سـوپاس کردنـی نـانی پیـرۆز ، لـە سـەر کورسـیەکە هاتـە خوارێ و لە بەرانبەر مێحرابەکەدا چۆکی دادا. لەهەموو هەڵس و کەوتەکانیدا سڕوساردی و داهێزرانێک دەبیندرا، دوای ئەوەی هەسـتا و گـەڕاوە جێگاکـەی خۆی، سەرگوردی سـوارکاری سـەربازی کـە بـەجلوبـەرگی فـەرمـی خۆیـەوە لـەپشت سـەری قایمـەقـام دانیـشتبوو، بـەگـوێی ملازمـەبرینـدارەکـەی پـەنـای خۆیـەوە چرپانـد: «بێگومـان کاردینـال بـەباشـی کـارەکـەی بـەڕێوە دەبـات و لـەکـاری خۆیـدا لـەکـڵ دەردێ، وەک مـەکینـەیێکـی چـاک بـێ ڕاوەسـتان کـار دەکات.»

ملازم بەهێواشییەکەوە وەڵامی داوە: «چاکتر! تا ئێستا ئەم لێبووردنە گشتیە ناخۆشە وەکوو بارێکی لاسەنگ و نابار لە سەرشانی ئێمە قورسایی دەکرد.»

ـ بەڵام هەرچی بێ، لەمەڕ دادگا لەشکریەکە ملکەچ بوو.

ـ بەڵێ ئاخریەکـەی ڕازی بـوو، هـەرچـەنـد زۆری خایانـد تـا مـل کـەج بـوو . ئای خودایە، هەوای ئێرە چەندە ناخۆش و خەفەیە! هەمووماں لە ژێر گەرمای هەتاودا نەخۆش دەکەوین. حەیف کە ئێمەش کاردینال نەبووین، تا لە بەر ئەو سـوورەتـاوە چـەترێکمـان بـە سـەرمانـەوە بگرتایـە ـ سسـ ـ س! مـامم چاومـان لێدەکا!

---

٢. لاتینە بەمانای: «پاپای بەڕێز و پیرۆز، متفەڕکی بکە.»

سەرهەنگ فێراری ئاوڕی دابووەوە تا مۆرەیەکیان لێبکات. ئەو دوای ئەو ڕووداوە ناخۆشەی دوێنێ بەیانی، کەوتبووە کەش و هەوایەکی تایبەتی ڕۆحی و خواپارێزانەوە ،هەربۆیە داخی دڵی خۆی بە سەر کۆنە کردنی ئەوان دەردەبڕی،ئەویش بە هۆی«هەست نەکردنی ئەوان، بەو وەزعە ناخۆش و دڵتەزێنە»وە بوو.

سەرۆکانی بەرپرسی تەشریفات وردەوردە لەدەوریەک کۆبوونەوە، لە ڕیزێکدا ڕاوەستان کە بۆڕێژە ڕۆیشتن ئامادە دەبوون.

سەرهەنگ فێراری هەستا سەرپێ و بەرەو میلەئاسنکانی میحرابەکە کەوتە ڕێ و ئاماژەی بۆ ئەفسەرەکانی دیکە کرد تا بەدووای ئەودا بکەونە ڕێ. کاتێکی کە خوێندنەوەی عیشای ڕەببانی تەواو بوو و نانەمفەڕەکەکە خرایە نێوقاپە شووشە بلوورینەکەی دەستە سەربازییەکەوە، قەشەی پێشنوێژ و هاوکارەکانی چوونە ژووری کلیساوە تا جلوبەرگەکانیان بگۆڕن. لەهەموو کلیسادا دەنگێکی زۆر نەرم و هێدیت بەرگوێ دەکەوت، مونتانلی کە وەک مقەبا بێجووڵە لەڕووبەڕووی خۆی دەڕوانی، هەروا لە سەر کورسیە تایبەتیەکەی خۆی دانیشتبوو. دەتگوت هەر لەوێش نییە و دنیا لە سەر سەری دەگەڕێ و زەریای ژیان و هەڵسوکەوتی مرۆڤ لە ژێر پایدا لە شەپۆلاندا بوو و لە بێدەنگی و وسکووت بوونی دەوروبەری ئەودا ون دەبوو؛ قاپی بخور سوتانەکەیان بۆ لای هێنا و ئەویش بێئەوەی سەرنج بداتە ئەم لا و ئەولای بەبێزاری و بەتەپلۆسیەوە دەستی هەڵێنا بخورەکەی خستە نێو قاپەکەوە. قەشەکان لە ژوورەوە گەڕانەوە و لە سەروی کلیساوە چاوەڕوانی مونتانلی بوون تا بێتەخوارەوە ، بەلام ئەو هەروا بێهەست و خوست دانیشتبوو. شماسی ئیفتیخاری کاتێ دانەوی تا تاجە ئیسقوفیەکە لەسەر سەری هەڵگرێ، دیسانەوە بەدوودڵیو بەهێورییەکەوە پێی گوت: «قوربان...»

کاردینال چاوێکی لێ کرد: «چیتگوت؟»

- ئەرێ دڵنیای کە بەشداری کردنت لەڕێوڕەسمی دەستەدا زۆرت ئەزییەت ناکا؟ چونکە هەواێکی زۆر گەرمی هەیە.

---

٣. کاسەیەکی شووشەییە لە سەر شێوازی هەتاو دروست کراوە کە نانەپیرۆزەکەی لەنێودا دادەنێن.

- هیچ نییە، گەرمی هەوا چبایەخێکی هەیە؟
مونتانلی بە سپ وساردیو بەپچرپچریەوە قسەی دەکرد. بۆیە قەشەکە وای هەستپێ کرد کە پێی ناخۆش بووە: «قوربان بمبوورە، پێموابوو کە حاڵ و وەزعت باش نییە.»
مونتانلی بێئەوەی وەڵامی بداتەوە هەستایە سەرپێ. کەمێک لە سەر پلیکانی سەرەوەی کورسیەکە ڕاوەستا هەر بەو شێوە قسە کردنەی ئەوجارەیەوە پرسی: «ئەمە چییە؟»
درێژایی عەباکەی لە سەر پلیکانەکان و سەرئەرزی کلیساکەدا دەخشا و مونتانلی پەڵەیەکی سووری لە سەر عەباسپییەکەی خۆی دیبوو.
- قوربان هیچ نییە، تەنیا زایەڵەی تیشکی هەتاوە کە لەپەنجەرە ڕەنگاوڕەنگەکانەوە رژاونەتە ژووریّ.
- تیشکی هەتاو و ئەوەندە سوور؟
لەقەندرمەکەوە هاتەخواریّ. لەبەردەم میحرابەکەدا ئەژنۆی دادا و قاپە بخورەکەی بەئارامی بردە پێشێ وهێنایە دواوە ، کاتێ کە هێنایەوە لای خۆی. شەوقی هەتاوی پەنجەرە ڕەنگاوڕەنگەکە کەوتە سەرسەری رووتاوە و دەموچاوی، چەپکە تیشکێکی سوور کە ڕەنگی شووشەی پەنجەرەکەی گرتبوو کەوتە سەرعەباکەی کە خزمەتکارەکانی چینەکانیان ڕاست و ڕێک دەکرد. کاسەزێرینەکەی لەدەست قەشەکە وەرگرت و ئەوکات کە گرووپی کۆڕ و ئورگەکە ئاهەنگێکی زۆر بەشکۆ و خۆشیان دەست پێ کرد هەستایە سەرپێ.
خزمەتکارەکان هێواش هاتنە پێشێ و پارچە.چەترییە هەوریشمە ئاسمانییەکەیان بەسەر سەریەوە ڕاگرت، شماسەکانیش لەم لا و ئەولایەوە ڕاوەستان و چینی عەبادرێژەکەیان بۆ کۆدەکردەوە، کاتێ خزمەتکارەکانی کلیسا دانەوین تا عەباکەی، کە بەسەرئەژنۆیدا دەخشا کۆیبکەنەوەو ئەندامانی ئەنجومەن و کەسانی ئایینی کە لەپێش دەستەکەوە بەدوورپیزی زۆر جوان و تەیارەوە کە مۆمە هەڵ کراوەکانیان لەچەپ و ڕاستەوە هەڵێنابوو، لە سەروی کلیسا و سێنی لای سەرەوەبوون، ئارام هاتنەخواریّ.

مونتانلی لەنزیک میحرابەکە و لە ژێر پارچە چەترییە هەورێشمەکەدا بە سەر ئەوانەوە ڕاوەستابوو و نان و شەڕابەپیرۆزەکەی توند بەسەر دەستیەوە گرتبوو و بە نیگای چاوی ڕەوانەی دە کردن کە جووت جووت دەڕۆیشتن. ئەوان کە مۆم و مەشعەڵ و خاچ و ڕەسمەکان و ئاڵاکانیان و تاجە گوڵینەیان پێبوو؛ زۆر ئارام و ڕێک وپێک، لە سەروی کلیساوە بەرەوهۆڵی پان و گەورەی کلیساکە هاتنەخوارێ، کە تەنرابوو بە کۆڵەکەی زۆر ئەستوور کە بە جوانی ڕازێندرابوونەوە . لە ژێر پەردە مەخمەریەکان کە هەڵدرابوونەوە گوزەران و لەوگەرمایەدا وەک سێڵاو بەرەو شەقام شۆڕ بوونەوە و وردەوردە دەنگی سروودی بە کۆمەڵیان لەنێو دەنگەکانی دیکەدا ون بوو.بەڵام هێشتا لەنێو کلیسادا دەنگی هەنگاوەکانیان دەنگی دەداوە.

لەپێش‌دا گروپە جۆراوجۆرەکانی قەشە بەکفنی سپیبەریان و ڕوخساری دەمامک لێدراویان ، دوایە برادەرانی Misericordia٤ بوون کە سەرتاپای ڕەشیان لەبەردابوو و تەنیا چاویان لەنێو دەمامکی ڕەش‌دا دەبریساکایەو و بەدوای ئەوانیش‌دا مریدەکانی ئایینی کلیسا لەڕیزێکی گەورەدا گەیشتن:

دەروێشەکانیش بەسەرتاپایەکی بۆریلەی ئەستوور و بە پێخاوسیەوە کەوتنەڕێ لەگەڵ خەڵکی دومینەکانی سەرتاپا سپی و لە سەرەخۆ ؛ بەدوای ئەوانیش‌دا کارمەندەکانی ئاسایی ناوچە، سوارکاران، تفەنگچییەکان و کارمەندانی پۆلیسی ناوچەکە و قایمەقامیش کە لەجلوبەرگی فەرمی‌دا بوو هاوڕێ لەگەڵ ئەفسەرەکانی هاوکاری خۆی کە لەپەنایەوە بوون تیکەڵی ڕێژەکە و ڕێپێوانەکە ببوون، دوو نەفەر لە پێش‌نوێژکارەکانیش مۆمی هەڵکراویان پێبوو و ئاڵاهەڵگرێکیش خاچێکی گەورەی لەبەین ئەوانەوە بەرز کردبووەوە . کاتێ کە پەردەکان لادران تا ئەوجەماوەرە لەدرگاکەوە بڕۆن‌دەرێ و بکەونە ڕێ، مونتانلی لە ژێر چەترە هەورێشمەکەی سەرسەریەوە بەخێرایی چاوێکی لەهەتاو و شەقام و دیوارە ڕازاندراوەکان کرد کە بەئاڵا و قوماشی جۆراوجۆر ڕازێندرابوونەوە و منداڵانێکیش بەجلوبەرگی هاودامێنی سەرتاپا سپی کە گوڵی سووریان بەسەر ئەوخەڵکەدا

---

٤. ئەوکەسانەی کە مردوو گۆڕەوشار دەکەن.

هەڵدەخستەوە مونتانلی گوتی: «تیاح، ئەوگوڵە سوورانە چەندەجوانن دەڵێی پێی خوێنن.»

جەماوەر هەروا بەڕێکوپێکییەوە دەڕۆیشتنە پێشێ، هەردەستە و گرووپێک بەجۆرێک و بەڕەنگێکی تایبەتی. عەبای سپی و درێژ، ئارام و لە سەرخۆ ؛ بەدوای ئەواندا جلوبەرگیی فەرمی و جوان و زۆرشییکی قەشەیەک کە قەراغەکانی بەشێوەیەکی جوان چندرابوون، خاچێکی زێڕینی باریک و درێژ کە لە سەروی مۆمە هەڵکراوەکانەوە گەردنی هەڵێنابوو. دوای کەمێکیتر قەشەکانی کلیسای جامیعەکان بەباڵاپۆشێکی سپی مەیلەوزەردەوە بەخۆڕانانێکەوە هاتن و گوزەران. پێشنوێژێک بەگۆچانێکی ئۆسقۆفیەوە لەنێوان دوومەشخەڵ بەدەستەوە هاتوچووە نێوکلیساوە، ئەوجارخزمەتکارەکانی کلیسا کە لەڕێزێکدا ڕاوەستابوون و کاسەی بخوریان بە دەستەوە بوو و لەهەوای موسیقاکە دەستیان دەبزواند و وردەوردە دەڕۆیشتنە پێشەوە، هەڵگرانیی چەترە هەورێشمیەکەی سەر مونتانلی چەترەکەیان بەرزتر کردەوە و دەستیان کرد بە بژاردنی هەنگاوەکانی خۆیان: «یەک، دوو، یەک، دوو» مونتانلیش دەستی کرد بەدۆعا و پاڕانەوە لە بەرانبەر ڕەسمەکان و بەرەو ڕوی خاچەکە٥.

لە سەر قەندەرمەکانی ناو کلیساوە هاتەخوارێ و بەرەو سەرسەراکە و هەمووی گەڕا ؛ لەو جێگاوە کە دەنگی ئورگەکە هەموو کلیسای داگرتبوو، لە ژێر ئەوپەردە هەڵدراوانەوە گوزەرا کە ڕەنگێکی سووری توند - سوورێکی وا کە پیاو لێی دەترسا - هەبوو و بەرەو ناوشەقام هەنگاوی هەڵێناوە کە زۆر ڕووناک بوو، ئەوشەقامە کە پڕ بوو لە گوڵاڵە سوورەی کەسک و گەش و ڕەنگ خوێن کە لە سەر فەرشی ڕاخراوی سەرشەقام و لە ژێر هەنگاوی ڕێڕەواندا دەپلیشانەوە. کاتێ کە کارمەندەکانی ئاسایی بۆ هەڵگرتنی هەورێشمەکەی سەرسەری مونتانلی هاتنە پێشەوە، لەبەردرگا کەمێ ڕاوەستان و دوایە کەوتنەوە ڕێ و مونتانلیش لەگەڵ ئەوان، قاپەکە و نانەپیرۆزەکەی بە هەردوو دەستی توند گرتبووی، دەنگی بێژەرانی کۆڕ

---

٥. ڕەسمەکانی مەسیح لەکاتی چوون بەروخاچ ، لەشێوە تایبەتی و جۆراوجۆرەکانیدا

لەگەڵ لەنجەی هەڵگرانیقاپە بخورەکە و دەنگی تێکەڵ و پێکەڵی هەنگاوەکان لەدەوروبەری مونتانلیدا بەرز دەبووەوە و جارجاریش دەمەیی: «هەموو جێگایەک پڕلەخوێن و خوێن هەموو جێگایەکی داگرتبوو، فەرشی بەرپێی ئەو وەکوو چۆمێکی سوور سنگی داخستبوو، گوڵاڵەسوورەکان هەروەکوو خوێن بەسەر بەردی شەقامدا ملیان بەلارەو نابوو ـ ئای خودایە! کەسک و سوورایی ئاخرەکەی سەرانسەری ئەرز و ئاسمانی تۆ دادەگری؟ ئەرێ خودایە ئەم کارە بۆ تۆ چقازانجێکی هەیە؟ هۆ خواوەندی بەتوانا ـ تۆیەک کە لێوەکانت خوێنی لێدەتکێ!»

لەوبەری کاسە شووشەیەکەوە، چاوێکی لەنان و شەرابەپیرۆزەکە کرد. ئەوە چیبوو کە لەنانەپیرۆزەکەوە دەچۆڕا ـ تکتک دەتکایە نێوپەردەی زێڕینی هەتاو ـ و دەرژایەوە سەرعەبا سپیەکەی؟ ئەوە چی بوو ـ تەنانەت لەودەستە بەرزکراوەوە دەچۆڕا؟

چیمەنی حەسارەکە لە ژێر هەنگاوی جەماوەردا شڵەژابوو و یەکسەرە سووری دەنواند ـ هەموو جێگایەک سووراوی لێدەتکا ـ خوێنێکی یەکجار زۆر لەوێ کۆببوومەوە، لەوگۆنایە تکتک دەهاتەخوارێ، لەودەستەڕاستە بەگوللە کون کراوە خوێن دەڕژا و لەکەلەکەی بریندار و پێکراویی بەلێشاو خوێن بڵقی دەدا تەنانەت قژیشی خوێناوی بوو، ئەوقژانەی کە لەخوێندا تەڕ ببوون و بە هەنیەیەوە نووسابوون ـ ئای ئەوە جوانـاوی مەرگبوو، کە لەگانگای ژانێکی جەرگبڕەوە سەرچاوەی دەگرت.

دەنگی وێژەرانی کوڕ سەرمەستانە بەرز بووەوە.

ئاخ هیچکەس ناتوانێ لە بەرانبەریدا خۆی ڕاگرێ! ئەی خودایە کە بێخەم لەو ئاسمانە سپی و ئارامە لە سەر تەختی خۆت دانیشتووی! بەلێوی خوێناویەوە بزەت دێتە سەرلێو و لەشەڕ و مەرگی مرۆڤ دەڕوانی ، ئیتر بەس نییە؟ دنیایەکی جیا لە شانۆی سوپاس و دوعا و پاڕانەوە درۆیینانە، بەس نییە؟ هۆ جەستەی عیسی کە لەبەر ڕزگاری مرۆڤایەتی ئەو هەمووە ئازار و ئەشکەنجەت کێشت ، هۆ خوێنی مەسیح کە لەبەر بەخشین و لێبووردنی تاوانەکان ئەو هەمووە ڕژایتە سەرئەرزی، ئیتر بەس نییە؟

ئاخ بەدەنگێکی بەرزترەوە بانگی لیبکە، بەشکێکم خەوتبێ!

ڕۆڵەی خۆشەویستم، بەڕاستی خەوتووی و قەتیش بەخەبەر نایەیتەوە. ئایا ئەوقەبر و گۆڕە ، بەوهەمووە ئێرەییەوە لەوخەزێم و دەستکەوتە بەنرخەی خۆی پارێزگاری دەکا: هۆ بەندی دڵم ! ئایا ئەوچاڵەڕەشەی ژێرداره‌کە بۆساتێکی زۆرکەمیش بێ ئەوکت بەرنادا؟

دوایە ئەوشتە لەنێو ئەوقاپە بلوورین و شووشەییەدا وەڵامی داوە و هەروا کە وەڵامی دەداوە، خوێنیشی لێ دەچۆڕا: «ئایا تۆ خۆت هەڵیدەبژێری و لەهەڵبژاردنی خۆشت پەشیمانی؟ ئایا خواست و ویستی تۆ نەهاتوتە دی؟ چاو لەوپیاوانە بکە کە لەڕووناکاییدا هەنگاو هەڵدەگرن و جلوبەرگی هەورێشمی بەرێز چندراویان لەبەردایە: لەبەر ئەوانە بوو کە ئێستا لە دووتوێی ئەم خاک و خۆڵەدا گوڕەوشار کراوم. چاوێک لەو منداڵانە بکە کە گوڵی سوور دەبەخشنەوە، ئەگەر پێتخۆش بێ ساتێکیش گوێ ڕادێرە بۆ ئاواز و دەنگیان: هەر لەبەر ئەوانەیە کە دەمی من بەخاک و خۆڵ ئاخنراوە . سوورایی ئەوگوڵەسوورانە لەچاوگەی دڵی منەوە سەرچاوە دەگرێ، سەرنجێک بدە سەر ئەوخەڵکەی کە ئەژنۆیان داداوە بۆخواردنەوەی ئەوخوێنەی کە لەلێوی ئەوجامەی دەستەوە دەتکێ: بۆ دامرکانی توونییەتی دڵی کەیلی پڕئاواتی ئەوان بوو کە ئەوخوێنە ڕژایە سەرئەرزی. چونکە ئاوایان گوتووە: «بۆمرۆڤێکی ئاشق و ئازادیخواز، هیچ شتێک لەوە خۆشەویستتر و هیچ ئەشقێک لەوە بەرزتر و بەرێزتر نییە کە لەبەر هاوڕێیان و هاوبیرانی خۆت گیانی ئازیزت بەختکەی.»

- هۆ ئارتور، ئارتور، ئەرێ ئەشق و خۆشەویستییەک لەوەش بەرزتر هەیە! کە کەسێک ژیانی ئازیزترین خوڵقێنەری خۆی بەخت بکا؟

ئەو شتە نادیارەی ناو قاپە شووشەیەکە وەڵامی داوە: «خۆشەویستترین خوڵقێنەری تۆ کێیە؟ ئیشەڵا خۆ من نیم!»

کاتێ کە قسەی دەکرد وشەکان لە سەر لێو و زمانی لە گۆ نەدەهاتن وسڕ وسارد دەبوون ودەمردن ؛ چونکە دەنگی سروود و ئاوازی گرووپی کۆڕ، هەروەکوو سەرمای بای باکوور کە لە سەر ئاو و گۆمیلکە سەهۆڵبەندەکانەوە دادەبارێ، کپ و بێدەنگی دە کردن.

هۆ خاچپەرستان، لەوە بخۆنەوە، هەمووتان لەوە بخۆنەوە، مەگەر هی ئێوە نییە؟ ئەو جۆگەلە خوێنە لەبەر ئێوە ئەو چیمەنەی نەنەخشاندووە. مەگەر ئەو جەستە گیانلەبەرە، لەبەر ئێوە نەژاکا و هەڵنەوەریە سەر ئەرز.هۆ شاغیە ئینسانخۆرەکان، کەڵپە لەجەستەی ئەو گیر بکەن، هەمووتان لێی بخۆن! ئەمە کۆڕ و جێژنی بادەنۆشی ئێوەیە، بخۆن و بخۆنەوە ئەمڕۆ ڕۆژی شادمانییە. ڕاکەن و لەم جێژنەدا بەشداری بکەن، خۆتان بگەیێنە ئەم دەستە ڕێپێوانە و لەگەڵ ئێمە هەنگاو هەڵێنەوە، هۆ ژنان و منداڵەکان، هۆ لاوان و بەساڵەچووان وەرن بۆ بەشبەش کردنی ئەم جەستەیە! وەرن بۆ ئێرە کە شەڕابی خوێنی لیدەڕژێ، هەتانێ گەش و سوورە لێیبخۆنەوە و لەو جەستەیەشدا بەشی خۆتان هەڵگرن و بیخۆن.

ئای، خوایەگیان! ئەوقەلایە؟ سوور و مرومۆچە، بەودیوارە بەرز و نەوی و برجە شکاوانەیەوە کە ڕەنگتاڵ و بۆڕن و لەنێوان ئەوگردە وشکانەدان و ڕووی گرژو مۆن کردووە لەودەستەیەی کە لە سەر ئەوشەقامە خاکیەدا ڕێژە دەڕۆن. ددانی میلەئاسن ئاسنینەکە بەسەر دەروازەگەورەکەدا شۆڕ ببووەوە و قەلاکەش هەروەکوو دالاشێک و حەیوانێکی دڕندە کە لەداوێنی کێوێکدا دانەوی بێت و پاسەوانی لە نیچیری خۆی بکات وابوو، بەلام سەرەڕای ئەوەش ئەم ددانە ئاسنینانە هەرچەندە تیژیش بن ئاخرەکەی دەشکێن و لێکهەڵدەبڕێن و خاک و خۆڵی نێوحەسارەکەش ،مردووەکەی خۆیان تەسلیم دەکەن و خۆ دەدەن بەدەستەوە، چونکە گرووپە خاچپەرستەکان دەڕۆنە پێشێ، دەڕۆنە پێشێ لە گرووپێکی بەهێزدا بۆ جێژنی ئاینی، هەروەکوو لەشکری مشکی برسی بەربەدەبنە گیانی وردکە و پرتکە و ئاواش دەڵێن: «بێنە!بێنە!» و ناڵێن «بەسە، بەسە.»

ـ هێشتا ڕازی نەبووی؟ من لەبەر ئەوئینسانانە بوومە قۆچی قوربانی، تۆ منت لەبەین برد تا ئەوان بژین، ئەوە ئێستاش هەرکامەیان ڕێگای خۆیان گرتووەتە بەر و ڕیزەکەشیان تێکنادەن و نایەڵن خەوشیشی تێکەوێ. ئەمە هێز و سپای خاچپەرەستانە، لایەنگران و پەیرەوانی خوداکەی تۆ، جەماوەرێکی گەورە و بەهێزە. ئاگرێک لەپێشدەمیانەوە دەمی کردووەتەوە و گڕوکڵپەکەشی لەدوایانەوە بڵێسە دەستێنێ، دەشت و زەوی ڕووبەڕوویان وەکوو باخی شەداد و لە پشت

سەریشیان بیابانێکی ڕووتەڵە و وشک و کاکی بەکاکی، نە ئەتۆ و نەهیچ کەسێکی دیکە لەچنگ ئەوان ڕزگاریتان نایەت و ناتوانن خۆ دەربازکەن.

ـ دەنگەروایە وەرەوە بۆلای من ئەی خواوەندی من، بگەڕێوە بۆلام، چونکە من لەفکری خۆم و لەهەڵبژاردنی خۆم پەشیمانم! وەرەوە باپێکەوە بچینە ناوگۆڕێکی تەنگ و تاریکەوە، دەخزێینە جێگایەکەوە کە شەوپەرستانی خوێنڕێژ نەماندۆزنەوە. لەوێدا بەئاسوودەیی لەئامێزی یەکتردا دەڕازێین و خرپ لێیدەخەوین تا فەرداهی ئاوات و ئارەزوو.

خاچپەرەستانی برسیش لەترسی تێرێژی ڕۆژ بەقەد بالآی سەرما و سووڵدا هەڵدەزنێن و ئەوکات کە ئەوان بە هۆی خواردن و خواردنەوەی گوشت و خوێنی ئەوجەستەیەوە دەکەونە لوورەلوور، وردەوردە دەنگی ئەوان بەرەوکزی و نەمان دەڕوات و ئەوجار لێدەگەڕێن کە ئێمە ئاسوودە و ئارام بژین.

شتەکە دیسانەوە جارێکی دیکە وەلآمی داوە: «لەکوێدا خۆم بشارمەوە؟ مەگەر نەنووسراوە کە ئەوان لەهەموو کون و قوژبنێکی شاردا بڵاوبوونەتەوە، خۆیان بەسەر شوورە و دیوارەکاندا هەڵدەسپێرن و لەدیواری ماڵەکاندا وەسەر دەکەون، هەروەکوو دز و جەردە لەپەنجەرەکانەوە وەژوور دەکەون؟ ئەگەر لە سەر لووتکەی چیایەک قەبرێک بۆخۆم هەڵکەنم ئایا لێیدەگەڕێن یان دەیدەنەوە؟ ئەگەر لەنێو دڵی چۆمێکدا گۆڕێک بۆخۆم چێ بکەم ئایا سنگی هەڵنادڕن؟ ئەوانە بۆکاری خۆیان ئەوەندە وشیار و وریان وەکوو تاژی و تووڵەی ڕاوی، نیچێری خۆیان دەدۆزنەوە، هەر لەبەر ئەوانەیە کە زامەکانی من گوڵخونچەی خوێنیان لێدەڕوێ و کانیاوی سوور و خوێنیان لێ دەزێ ؛ تا ئەوان بەباشی بتوانن لێیبخۆنەوە. مەگەر گوێت لێنییە کە ئەوانە چیان دەوێ.

ئەوانیش هەروا لەم لاولای پەردەمەخمەریەکانی کلیسای جامیعەوە دەگوزەران و سروود و گۆرانیان دچڕی، ئیتر ڕیزەی دەستەکە کۆتایی هاتبوو و گوڵاڵە سوورەکانیش پرش و بڵاو کرابوونەوە و هەڵوەریبوون.

کە دەستیان لەگوتنی گۆرانی و سروود هەڵگرت. مونتانێلیش لەدرگاکەوە هاتەژووری و لەبەین دووریزی مریدان و قەشەکانەوە گوزەرا کە بە بێدەنگییەکەوە ڕێک هەرکامەیان کە لە سەر جێگای خۆیاندا بەمۆمێکی داگیرساوی

بەرز کراوەوە ئەژنۆیان دادابوو، دیتی کە چاوەبرسیەکانیان دەڕوانێتە سەرجەستەیەکی پیرۆزی سەرشانی ئەو، زانیشی کە لەبەرچی کاتی ڕۆیشتنی ئەو، سەریان دانەواند چونکە هێڵێکی خوێنی مەیيو وردەوردە لەچینی عەباکەیەوە دەهاتەخوارێ و لە سەر بەردەکانی ئەرزی کلیساکە جێپێکانی پەڵەیەکی سووری لێبەجێدەما و هەموو سەرنجیان چووبووە سەری.

بەو شێوەیە بەرەو میلەئاسنکانی سەرێی کلیسا کەوتە ڕێ، هەڵگرانی چەترە هەورێشمەکەی سەرسەری ڕاوەستان و ئەو لە ژێریەوە هاتەدەرێ و لەقەندەرمەکانی مێحرابەکەوە چووە سەرێ. لەم شانەو شانییدا، خزمەتکارەکان بەبەرگی سپیەوە کە قاپە بخورەکانیان بەدەستەوە بوو و پێشنوێژکارەکانیش مەشغەڵ بەدەست ئەژنۆیان دادابوو و چاوەکانیان کە دەیڕوانییە سەرجەستەی قوربانییەکە٦ لەبەر شەوقی مۆم و مەشغەڵەکاندا دەدرەوشانەوە.

کاتێ کە لە بەرلنبەر مێحرابەکەدا ڕاوەستا و بەو دەستە خوێناویانەیەوە جەستەی ئاژنئاژن کراو و هەڵدڕاوی خوڵقێنەرە کوژراوەکەی هەڵێنا، دەنگی ئەومیوانانەی کە بۆجێژنی نان و شەڕابیپیرۆز بانگهێشتن کرابوون بەشێوەیەکی دیکە دەنگی دەداوە.

ئاخ، ئێستا ئەوانە دێن کە تەرمەکە بەرن ـ هەرگا وایە برۆ ئازیزەکەم، برۆ بەرەوئاکامی ژیانی خۆت و لێگەڕێ با دەروازەکانی بەحەشت لە سەر گازەرەی پشت بکرێتەوە بۆ ئەوگورگە برسیانە کە بەباوەشێکی ئاوالاوە وەریان دەگرن. ئەودەروازانەی کە بۆمن کراوەتەوە دەروازەی قوڵترین جێگای جەهەندەمە. کاتێ کە شماسە ئایینیەکە کاسە پیرۆزەکەی لە سەر مێحرابەکە دانا، مونتانلی هەروا لەوێ ڕاوەستابوو. هاتەخوارێ و لە سەر قەندەرمەکە ئەژنۆی دادا، لەمێحرابە سپیەکەی سەرووی ئەوەوە خوێنڕژایە خوارێ و تکتک کەوتە سەرسەری، دەنگی سروودی کۆڕ شەپۆلی دەدا و بەدرێژایی بنمیچە درێژ و قووڵەکاندا دەنگی دەداوە.

---

٦. ئامازەیەکە بۆ جەستەی عیسی.

## ٩

"Sine termino _ Sine termino" خۆزگەم بەومەسیحە بەختەوەرەی کە دەیتوانی لە ژێر خاچەکەیدا بکەوێتە سەر ئەرزی ،بەڵام نەیکردا ، خۆزگەم بەومەسیحە بەختەوەرەی کە دەیتوانی بڵێ: «ئیدی تەواو بووە!» ئەم ڕۆژە ڕەشییە قەتدوایی نایەت، هەر وەکوو ڕێپێوانی هەسارەکان. ئەوە کرمێکە کە نامرێ و ئاگری گڕکانێکە کە کڵپە و بڵێسەکەی دانامرکێ.

لە سەرەخۆ و تێکشکاو، بەپێی عادەتی دێرینی خۆی و بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێ لەدرێژەی پرۆگرامەکەدا ڕۆڵی خوی بەباشی گێڕا، ڕەسم و ئایینێکی کە ئیتر لەلای ئەو هیچ بایەخێکی نەبوو. دوای خوێندنی دوعا کۆتایی جێژنەکە، دیسانەوە لە بەرانبەر مێحرابەکەدا ئەژنۆی دادا و ڕوخساری خۆی داپۆشی، و دەنگی قەشەکان کە دۆعای سەبارەت بەگوناحە بەخشراوەکانیان دەخوێندەوە، وەکوو ورێنەیەکی ژێرلێوی دووری دوور دەبیستزا، دەنگێکی دوورەدەستی دنیایەک کە ئیدی ئەو خۆی بە بەشداری نەدەزانیی‌و لێی دوورە پەرێز بوو . دەنگێکی کە دایمە لەهەڵکشان و داشکاندا بوو.

دەنگەکە تەواو بوو و ئەویش هەستایە سەرپێ و دەستەکانی بەنیشانەی بێدەنگ بوون لە یەکتری کردەوە و ئاواڵای کرد. لەجەماوەرەکە بڕێکیان

---

١. لاتینییە، بەمانای «بێکۆتایی و هەتاهەتایی»

بەرەولای درگاکان ڕۆیشتن و چونکە لەکلیسادا دەنگێکی ئارام گەیشتە گوێ کە : «بەڕێز مونتانلی بەتەمایە قسە بکات.» بەپەلە و بەخشەخشەوە گەڕانەوە.

هاوکارانی ژێردەستی ئەو پێیان سەیر بوو و بە ڕامانێکەوە لێی نزیک بوونەوە و یەکێکیان خێرا، بەڵام ئارام گوتی: «قوربان ئایا بەتەمای کە ئێستا بۆخەڵکی قسە بکەی؟»

مونتانلی بەبێدەنگییەوە ئەوی لادا. قەشەکان کە لەگەڵ یەکتری کەوتبوونە پرتەپرت ڕۆیشتنە دواوە. کارێکی نائاسایی، تەنانەت دژی ڕەسم و عادەتیش بوو، بەڵام ئەگەر کاردینال دەیوست کارێکی وا بکات، بێگومان دەبووە خاڵێکی بەهێز و بەرچاو، دەیویست سەبارەت بە شتگەلێکی تایبەتی قسە بکات، ڕیفورمخوازییەکی نوێ کە دەبوو لەلایەن ڕۆمەوە بڵاو بکرایەتەوە یان ڕاگەیەندراوێکی تایبەتی لەلایەن پاپای پیرۆز و بەڕێزەوە بڵاو بکرایەت.

مونتانلی لە سەر پێپلیکانی مێحرابەکەوە چاوێکی لەدەریای شڵەژاوی ئەوروخسارانە کرد. ئەوان بەتامەزرۆییەوە چاوەڕوانی بیستنی وتەکانی بوون کە لە سەرووی ئەوانەوە ڕاوەستابوو و بەبێدەنگی و ڕەنگ هەڵبزرکاوییەوە لێی دەڕوانین.

ڕێبەرانی گرووپ و دەستەکە زۆر بەئارامی ڕایانگەیاند: «سس ـ س! بێدەنگ!» پرتەپرت و چپەچپی جەماوەر هەروەکوو هاژە و گڤەی بایەکی توند کە لەنێو دارەکانی جەنگەڵدا ونددەبێ، ئاوا وسکووت بوو. تەواوی ئەوجەماوەرە بەبێدەنگییەکی سەیرەوە یەکڕاست دەیانڕوانییە سەر ئەو ڕوخسارە ڕەنگپەڕیوەی کە لە سەر پلیکانەکانی مێحرابەکەوە دەیڕوانییە ئەو جەماوەرە.

ئارام و یەکهەوا دەستی بەقسە کردن کرد: «لەقەولی یووحەناوە لە ئینجیلدا ئاوا هاتووە: «خوداوەند ئەوەندە خۆشەویستی و دڵۆڤانی بۆجیهان هەبوو کە تاقانە کوڕەکەی خۆی قوربانی کرد تا دنیا ڕزگاری بێت.» ئەم جێژنە جێژنی جەستە و خوێنی ئەوقوربانییەیە کە لەبەر ڕێخۆشکەری بۆ ئێوە و بۆ ئاسایشی ئێوە کوژرا، بەرخی خودا کە بووە هەڵگری تاوانەکانی گشت دونیا، کوڕی خودا کە لەبەرخاتری گوناحەکانی ئێوە مرد، ئێوەش بەڕێکوپێکی و سەنگینی بۆ ئەوجێژنە لێرە کۆبوونەتەوە تا لەوقوربانییەی کە لەڕێگای ئێوەدا گیانی بخەت کرد بخۆن و سوپاسی ئەو بەخشینەرە گەورەیە بکەن، من دەزانم کە ئەمڕۆکە بەیانی،

کاتێ بۆ بەشداری کردن لەم جێژن و کۆبوونەوەیەدا - خواردنی جەستەی قوربانییەکە - هاتن، بەوەبیرهێنانەوەی ئازاری مردنی کوڕی خودا بۆئەوەی ئێوە بە بەختەوەری بگەن، دڵەکانتان کەیلی شادی بوو.

«بەڵام پێم بڵێن بزانم، لە نێو ئێوەدا کێ بیری لەئازار و ژانێکی دیکە کردەوە، ئازار و مەینەتی خودا کە کوڕەکەی کردە قوچی قوربانی! کامەتان ئەومەینەتیەی خوداتان وەبیرهێنایەوە کاتێکی کە ئەو لەئاسمانەکانەوە دانەوی و لەوخاچدراوانەی رووانی؟ هاوڕێیانی من ئەمڕۆکە هەروا کە لەڕیزەکانی خۆتاندا و لەودەستە مەزنانەدا هەنگاوتان هەڵدەگرت، لەهەمووتانم رووانی دیتم کە دڵی نێوسنگتان چۆن بە هۆی بەخشرانی گوناحەکانتانەوە چەند بەکەیف و لەگەشە و نەشەدایە، لەڕێڕەوبوونی خۆی دڵخۆشە. هەربۆیە داواتان لێدەکەم کە سەرنج بدەنە سەرئەوەی کە بزانن ئەم ڕزگارییە بە چقیمەتێک کڕدراوە. بێگومان زۆر بەنرخ و گرانە و نرخی ئەو زۆر لەگەنج و گەوهەر گرانترە، لەقیمەتی خوێندایە.»

تەزوویێکی ئارام و درێژخایەن جەماوەری گوێبیستی داگرت. لە سەرووی کلیساوە قەشەکان کەمێ بۆپێشێ دانەوین و لە گەڵ یەکتریدا کەوتنە چپەچپ، بەڵام وێژەرەکە هەروا درێژەی بەقسە کردنی خۆیدا و ئەوانیش هێور و بێدەنگ گوێ بیستی بوون.

- هەر لەبەر خاتری ئەو ڕووداوەشە کە من ئەمڕۆکە لەگەڵ ئێوە قسە دەکەم: من ئەوەم کە هەم. چونکە بێدەرەتانیی و خەمەکانی ئێوە و منداڵەکانتانم بینی کە لەبەردەمتانەوە بوون و لەوبابەتەوەی کە دەبێ ئەوانە بمرن بەزەییم پێیاندا هاتەوە. دوایەڕووانیمە چاوەکانی خۆشەویستەکەم، زانیم کە کەفارە و جەزای خوێن لەوێدایە و منیش بەبێسەرنجدان بەئەو، ڕێگای خۆمم گرتەبەر و ئەویشم لەوزەلکاوەدا بەتەنیایی بەجێهێشت.[۲]

ئەمەیە لێبووردن و سڕینەوەی تاوانەکان و گوناحەکان. ئەو بۆ ئێوە و لەبەر خاتری ئێوە مرد و تاریکایی و تەمتومان، ئەوی لەئامێزی خۆیدا گرێدا، ئێستا ئەو مردووە و گەڕانەوە و ڕاسانێکیشی بۆ نییە، ئەو مردووە و ئێتر من لەوە بەدواوە کوڕم نییە، ئاخ جگەرگۆشەکەم، کوڕە شیرینەکەم! ئاخ!

---

۲- وتەی خودایە سەبارەت بەمووسا.

دەنگی کاردینال بوو بەناڵە و هاوار و گلەیی و گازندە وزایەڵەی دەنگی ترس‌تێزاوی خەڵکی بووە وەڵامی قسەکانی.

مەلاکان هەموو هەستابوونە سەرپێ و شماسەکانیش هەموو بەرەو پێشێ هەڵاتن تا باسکی کارووس بێژمکە بگرن، بەڵام ئەو خۆی ڕاتەکاند و بەچاوێکی وەک درندەیەکی تووڕە لێیان مۆڕ بۆوە، چیە ئەوە؟ لەوێ بەشی هەمووتانی خوێن لێ نییە؟ هۆ چەقاڵ و کەمتیارەکان بەنۆبەی خۆتان ڕاوەستن. پەلە مەکەن هەمووتان تێر دەخۆن!»

ئەوان گەڕانەوە دوواوە و بەترس و لەرزێکەوە ڕیزبەند لەپەنای یەکتری‌دا ڕاوەستان هەناسەیان لێ‌بڕابوو و ڕوخساریشیان وەک گەچ سپی هەڵگەڕابوو.

مونتانلی دیسانەوە ڕووی لەخەڵکەکە کرد و جەماوەرەکەش هەروەکوو مەزرایەکی گەنم و جۆ چۆن بەدەس با و تۆفانەوە کەروێشکە دەکات، ئەوانیش ئاوا کەوتنە جموجۆڵ.

ئێوە ئەوتان کوشت! ئێوە ئەوتان کوشت! و منیش هیچم نەگوت و ئازارەکەیم بەشان هەڵگرت، چونکە نەمدەویست کە ئێوە بمرن. کەچی ئەوە ئێوەش ئێستا بە پێداهەڵگوتنە درووینەکانتان و نوعاپیسەکانتان بەرەولای من دێن، پەشیمانم . لەوکارەی کە کردم پەشیمانم! واباشتر بوو هەمووتان لەزەلکاوی گوناح و تاوان و لەچاڵی‌ڕەش و قووڵی گەندەڵی‌دا بگنخێن، ڕۆح و گیانی تاعوون لێ‌دراوتان چ بایەخێکی هەیە کە دەبێ ئاوا نرخێکی گەورە و گرانی بۆدانرێ؟ بەڵام ئێستا ئیدی زۆر درەنگ بووە ـ زۆر! من بانگی دەکەم، بەڵام ئەو نابیسێ، لەدرگای گلکۆکەی دەدەم، بەڵام ئەو وەخەبەر نایەت، بەتەنیایی لەوێرانەییەکدا ڕادەوەستم و لەدەوروبەری خۆم دەڕوانم، دەڕوانمە ئەو ئەرزەخوێناویە، ئەوجێگایەی کە گلێنەی چاوی منی تێدا نێژراوە، دەڕوانمە ئاسمانی خاڵی و ترس‌هێنەر کە بۆمن بیابانێکی چۆڵ و قاقڕە. من بەدەستی خۆم ئەومدا بەدەستەوە و بە کوشتمدا، ئەای مارتی‌زاوەکان، ئەوم لەبەر ئێوە تەسلیم کرد!

بەرزگاربوونی خۆتان ـ ئەگەر هی خۆتان بێ ـ پێی‌بچارێن! هەروەک ئینسانێک کە دەیخەنە بەردەم سەگەلێک و ئەوانیش دەنووزێنن منیش ئەورزگاربوونەم ئاوا خستە بەرلمبۆزتان! نرخ و بایی خواردمەنییەکانتان دراوە، دەوەرن گەدە و سکتانی لێ‌پرکەن، هۆ پیاوخۆرەکان خوێن‌مژەکان، ئێوەی مردارەوەبووخۆر کە

خۆراکتان گوشتی مردووەکانە! چاو لەمێحرابەکە بکەن کە خوێنی لێ‌دەچۆڕێ، ئەوە خوێنی گەرم و هەڵقولاوی جگەرگۆشەکەی منە - ئەوخوێنەی کە لەبەر ئێوە ڕژایە سەرئەرز! وەرن بیخۆنەوە، بیلێسنەوە و دەم و لەوستانی پێ‌بڕەنگێنن! وەکوو سەگەل ئەو گۆشتە لەدەستی یەکتر بڕفێنن، لە سەر ئەو گۆشتە دەستەویەخەی یەکتربن و قووتی‌دەن و ئیتر لەوەزیاتر ئازارم مەدەن! ئەوەجەستە و لەشێکە کە لەبەر ئێوە بۆتە قوربانی، چاوی لێ‌بکەن، لەتلەت و خوێناویە، هێشتا لەدەست ژیانی پڕ کارەسات و پڕ چەرمەسەرێی هەڵدەبەزێتەوە، بەدەمگیانەلایەکی جەرگبڕەوە دەناڵێنێت و دەلەرزێت، هۆ خاچپەرەستەکان :ها، ئەم پتەگۆشتە وەرگرن و بیخۆن!

قاپ و نانە پیرۆزەکە کە بەسەر سەریەوە ڕایگرتبوو لەپڕێکدا بەتوندی بەئەرزی‌دا دا. بە هۆی لەئەرزدرانی ئەوقاپەئاسنەوە مەلاکان پێکەوە هێرشیان هێنایە پێشەوە و بیستدەست بەتوندی ئەوکابرا شێتەیان گرت.

دوای ئەوە و تەنیا ساتێک دوای ئەوە، ئەو بێدەنگیەی خەڵکەکە بوو بە دەریایەکی خرۆشاوو هەراوهوریایەکی شاغیانە، دوای فڕێدانی کورسی و کورسیلەکان بەملاولادا و بەشەق بەربوونە داروديوار و درگاکان و کەوتنە دراندنی پەردەکان و بڵاو کردنەوەی گوڵەکان و بەسەریەکدا هەنگاونان و ژێرپێ‌کەوتنی کەسانێک ، دوایە شەپۆلانی سێڵاوێکی تووڕە و تۆسنی ئەو حەڵکە بەگریان و لەخۆدانەوە ڕژانە ناو شەقامەوە.

سەرئەنجام

- جما، پیاوێک لەقاتی هەوەڵەوە دەیەوێ کە تۆ ببینێ.

مارتینی بەشێوەیەکی ئارام قسەی دەکرد بەجۆرێک کە هەردووکیان لەم دەڕۆژەی دوایی‌دا بێ‌ئانقەست ئارام و لە سەرەخۆ قسەیان دەکرد. مات بوون و بێ‌دەنگ، لەقسە کردن و ڕەفتارەیان‌دا وا دەردەکەوت کە خەم و ماتەمینێکی دەروونی زۆر گران دایگرتوون.

جما بەقۆڵی‌ڕووت و بە بەرهەڵبێنەیەکەوە لەپشت مێزێک ڕاوەستابوو؛ فیشەکە بەستراوەکانی بۆ دابەش کردن ئامادە دەکرد، لەبەیانی زووەوە کەوتبووە ئیش کردن و ئێستاش لەم پاش‌نیوەڕۆیە خەفەتاوییەدا ماندوویەتی بەسەر ڕوخساریەوە جوان دیاربوو: «سێزار، پیاوێک؟ چی‌دەوێ؟»

- ئازیزم نازانم چیدەوێ. پێم نالێ. دەڵێ تەنیا لەگەڵ تۆدا قسە دەکات.
- زۆرباشە، (بەرهەڵبێنەکەی لێ کردەوە و قۆڵەکانی داداوە) دەبێ بچم بۆلای، بەڵام زۆر وایدەچێ کە تەنیا سیخوڕێک بێ.
- دەیباشە. من لەودیوەی پەناتەوەم. واباشترە هەرکە کارکەت لەگەڵ ئەوپیاوە تەواو بوو، بچی کەمێک ڕاکشێی و پشوویەک بدەی. ئەمڕۆکە یەکبین بەسەرپێوە ڕاوەستاوی.
- نا! وامپێباشە کە درێژە بەکارەکەم بدەم.
بەهێوری لەقەندەرمەکانەوە هاتەخوارێ، مارتینی بەبێدەنگی بەشوێنییەوە بوو. لەم دەرۆژەدا جما بەقەدەرایی دەساڵ پیرتر بووە، ئەوهێڵە سپیەی نێوقژەکانی بەجارێک لەم چەندەرۆژەدا زۆر دیار و بەر چاو بوو. ئێستا ئیدی زۆرتر چاوەکانی دادەخست و لەبەردەم خۆی دەڕووانی، بەڵام کاتێ لەپڕێکدا چاوەکانی بەرزدەکردەوە،نیگای ئەو چاوانە تەزووی دەخستە لەشی.
جما لە ژوورە چکۆلەکەی پێشوازی کردن لە میوان، پیاوێکی ناشیرینی دیت کە قیت ڕاوەستابوو و پاژنەکانی لە یەکتر جووت کردبوو و لەنێوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو. کاتی هاتنی جما کابراکە بەترسیەکەوە داچڵەکی و سەری بەرزکردەوە و جما وا تێگەیشت کە ئەوپیاوە دەبێ لەیاساولێکی سوئیسی بێ. ئەو کراسێکی وەرزێری لەبەردابوو کە بەڕواڵەت وادیاربوو هی خۆی نییە ،لە ترسی ئەوەی کەسێکی بە شوێنە وە بێت و بناسرێت هەر بەملاو ئەولای خۆیدا دەیڕوانی. بەشێوە زمانی پاراوی خەڵکی ناوچەی زوریخ پرسی: «ئاڵمانی دەزانی؟»
- کەمێک دەزانم، بیستم کە دەتهەوێ من ببینی.
- تۆ سینیورا بولای؟ نامەیەکم بۆ هێناوی.
- نامە - یەک؟
تەزوویەکی پێداهات و دەستی بەمێزەکەوە گرت تا خۆی پێڕاگیر کات.
- من لە پاسەوانەکانی ئەوێم. (لەپەنجەرەکەوە ئاماژەی بۆقەڵاکەی سەرگردەکە کرد.)

نامەکە هێن ـ ئەوپیاوەیە کە حەوتەی ڕابردوو گوللەباران کرا. ئەم نامەیەی شەوێک پێش‌گوللەباران کردنەکەی نووسیویە. قەول و بەڵێنیم پێدا کە بۆخۆم بە دەستتی بگەیێنم.

جما سەری داخست. ئاخرەکەی نووسیویەتی.

سەربازەکە درێژەی پێدا: «هەر بۆیەش ئەوەندەی خایاند گوتی تەنیا دەبێ بگاتە دەستی تۆ و بەس.لەئەمڕۆش زووتر نەمدەتوانی بێمە دەرێ ـ وەک بڵەی لێم‌بەشک بوون ـ لە ژێرچاوەدێرییەکی توندداد. بۆئەوەی بێم بۆئێرە ناچاربووم ئەم جل‌وبەرگە بەئەمانت وەرگرم.» لەنێو سنگی خۆیدا کەوتە پشکنین و گەڕان. هەوای گەرم بوو و ئەوقاقزە قەد کراوەی کە هێنایە دەرێ، نەتەنیا چڵکن و پڕگنج و لۆچ بوو بەڵکوو بە هۆی ئارەقەی سەرسنگیەوە کەمێکیش نمدار و تەڕ بوو. کەمێ ڕاوەستا و دوایە بە پەرێشانییەوە ئەم پاوئەوپای کرد، ئەوجارە دەستێکی هەڵێنا و پشت‌سەری خوراند: «خۆ لای‌کەس دەنگ ناکەن؟» و دیسانەوە بەدزیەوە چاوێکی لە جما کرد و گوتی: «ئەگەر بزانن کە هاتووم بۆئێرە بێ‌گومان دەکوژرێم.»

ـ ئارخایەن‌بە بێ‌گومان دەنگ نلکەم، نا، کەمێ ڕاوەستە...

کاتێ کە ویستی بڕوات و بگەڕێتەوە، جما هەرواکە بەشوێن کیفی‌پارەکەی‌دا دەگەڕا سەربازەکەی ڕاگرت، بەڵام ئەو بەناڕەحەتییەکەوە کەمێک کشاوە دوواوە. بەتووڕەییەوە گوتی: «من پارەی تۆم ناوێ، من لەبەر ئەو ئەم کارەم کرد ـ چونکە تکای لێ کردم. ئەگەر داوای لێ کردبایەم و بمتوانیایە کاری زۆر لەوە گەورەتریشم بۆ دەکرد. لەگەڵ من زۆرباش و دڵۆڤان بوو ـ ئای خودایە!»

بە هۆی گریانەوە دەنگی لەگەرویدا پەنگی خواردەوە و جماش بەوهۆیەوە سەری هەڵێنا، سەربازەکە بەقوڵی چڵکنی‌کراسەکەی هێواش چاوی سڕی.

لەژێر لێویەوە درێژەی بەقسەکەی‌دا: «من و سەربازەکانی‌تر ناچار بووین کە تەقە بکەین، سەرباز ناتوانێ لە ژێر فەرمانەکان دەرچێ. ئێمە ئەومان کردبووە هێمای گەورەیی و بەرزی خۆمان، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ناچار بووین کە تەقە بکەین ـ ئەویش بە ئێمە پێکەنی ـ بە ئێمەی گوت هەی گرووپی ناشی و دەسەوەستان ـ لەگەڵ من زۆرباش بوو»

بێدەنگییەک ژوورەکەی داگرتبوو. ساتێکی‌تر سەربازەکە قیت‌ڕاوەستا سڵاوێکی سەربازی ناڕێک و ناشیانەی کرد و ڕۆیشتە دەرەوە. جما هەروا کە قاقزەکەی لەنێودەستابوو، وەک حەبەسرابێ کەمێ بێ‌جووڵە ڕاوەستا، ئەوجار لە سەر لێواری پەنجەرەکە کە کرابووەوە دانیشت تا نامەکە بخوێنێتەوە. نامەکە بەقەڵەم نووسرابوو و هێڵەکانیشی لەپاڵ یەک ترنجێندرابوون و جێگاجێگاشی زۆر بەزەحمەت دەخوێندراوە، بەڵام دووشەی هەوەڵ کە لە سەرووی قاقزەکەوە نووسرابوو زۆر بەجوانی دەخوێندراوە، ئەم دوو وشەیە بەزمانی ئینگلیسی بوو: «جیم ئازیزم»

لەپڕێکدا بەرچاوی ڕەش‌بوو و نووسراوەکەی بەرچاوی ڕەش و لێڵ بوو. ئەوجارێکی دیکەش ئارتوری لەدەست دەرچووبوو -بۆئەو جارێکی دیکەش ئارتور مردبوو! بەدیتنی ئەونێوە ئاشنا و منداڵانە و خۆمانەیە، هەموو ئابلۆقە هومێدکوژە جەرگ‌بڕەکان دەوریان دا، دەستەکانی بەهێوابڕاویەکی بێ‌پایانەوە بردە پێشەوە، دەتگوت خاک و خۆڵی ساردی ناوگلکۆکەی ئارتور لە سەر دڵی ئەوقورسایی دەکات و دڵی دەگوشێ.

ئەوجار جارێکی دیکەش نامەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بەخوێندنەوەی: «لەگزنگی سبەینێ بەیانیدا تیرەباران دەکرێم، جابۆیە بەپێی ئەو بەڵێنییەی کە پێمدابووی و دەبوو هەموو شتێکت پێ‌بڵێم، دەبێ هەرئالەئێستەوە دەست‌پێ‌بکەم، بەڵام بەگشتی بۆمن و تۆ پێویستی بە شیکارییەکی زۆر و بەربڵاو نییە. ئێمە هەمیشە بەباشی لە یەکتری حاڵی بووین بێ‌ئەوەی تاقە وشەیەکیشمان درکاندبێ و قسەیەکمان کردبێ؛ تەنانەت ئەو دەمانەی کە مرۆڤانێکی زۆرچکۆلە و وردیلە بووین. ئازیزم هەربۆیە کە خۆت دەیبینی و دەبێ بزانی کە نابێ لەبەر ئەورووداوە کۆنەی ڕابردوو و زللەکەی کە لە منتدا خەم دات‌بگرێ و خۆت سەرزەنشت‌بکەی. هەڵبەتە نکوڵی لەناخۆشی و قورسایەکەی ناکرێ، دەبێ بڵێم ئاشی گەردوون بەلای زۆر ناخۆشتر و قورستر لەوەی بەسەر هێناوم، بەڵام لە بەرانبەر هەرکامێکیان‌دا بەشێوەیەک خۆڕاگربووم - تەنانەت وەڵامی پێویستیشم بەبڕێکیان داوەتەو - و ئەوە ئێستاش هەروەکوو ئەو ماسیە خاڵدارەی نێو کتێبەکەی دەورانی منداڵیمان (نێوەکەییم لەبیر چووەتەوە) زیندووم و پلەزیقانمە! ئەگەرچی ئەمە

دوایین خۆشی و کلکبزواندنمە و دوایە تا دەمەوبەیانی سبەینێ،ئیتر گوللەی دوژمنانی گەل وسنگی ئازن کراوی منیش.

Finita la comedia! من و تۆ ئابەو شێوەیە مانای دەکەینەوە: «شانۆی سیرکی کۆچەر کۆتایی هات.» و سوپاسی ئەو خودایانەش دەکەین کە لانیکەم دڵیان بۆمان سووتاوە و ڕەحمیان پێ کردووین،شتەیێکی زۆر بەرچاو نییە، بەڵام کەمێ بایەخدارە. قەیناکە لەبەر ئەوە و هەموو پێداویستیەکانی دیکە کە پێمان دراوە با بەدڵ سوپاسیان بکەین.

بەڵام سبەینێ کاتی ڕۆژهەڵات و دەرکەوتنی گزنگی زێڕینی خۆر، من داوا لەهەردووکتان دەکەم لە تۆ و لەمارتینی، پێمخۆشە جوان لەوە تێبگەن، کە من زۆربەختەوەر و ڕازیم و ناتوانم شتێکی لەوەچاکتر و باشتر بایەخ دارترم لەگەردوون بوێ. بەجێگای من ئەم پەیامە بەگوێی مارتینی بگەیێنە، پێی بڵێ ئەو هاوڕێیەکی زۆر باش و زۆر مەرد و ڕەندە. بۆخۆی تێدەگا دەڵێم چی. ئەوخەڵکە دەبینی ئازیزم، من دەزانم کە خەڵکی لەقوڕ دیکتاتۆری‌دا چەقیون . لەوەی کە ئاوا زوو، دادگا نهێنییەکان و ئێعدامەکان ئەوکی گرتوون، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هێشتا لەخزمەتی شۆڕشڤانان‌دان گەرچی خۆیان تووشی زەرەر و زیانیش دەبن، و ئەوەش دەزانم ئەگەر ئێوە بە هەر شێوەیەک بێت یەکگرتوو بن و بەرەیێکی قورس و قایم پێکبێنن و ئەگەر زەبرێکی گورچووبڕ لە پەیکەرەی لەرزۆکی ئەوان بدەن، ڕووداوی زۆر گەورە و مەزن دەخوڵقێنن، بەڵام من، وەکوو منداڵێک کە بۆ ڕابواردنی پشوودان چۆن بەرەوماڵەوە دەڕوات،شایی شۆڕشم لە دڵدا دەگەڕێ وبەستەو سروودی ئازادیم لە سەر لێو هەڵدەپەڕێ . منیش ئاوا بەشادی و خۆشی و ڕۆحسووکیەوە بەرەو داری ئێعدام سەربڵیندانەبەرۆمەپێشێ.

من بەش بە حاڵی خۆم کار و تێکۆشانم کردووە، ئەوەتا باشترین شاهید حوکمی مەرگمە کە نیشان‌دەری ئەوەیە کە لە ڕووی دڵسۆزی و ویژدانەوە هەڵسووڕاوم. ئەوان من دەکوژن، چونکە لێمدەترسێن، ئایا گەورەترین و

---

١. ئیتالیاییە و بەمانای کۆتایی کۆمێدیە.

٢. بەسووکایەتی تێروانینە بۆ دۆعای پرۆتستانەکان کە لەپێش‌خواردنی خواردەمەنیەکان‌دا دەیڵێن.

خۆشەویستترین ئاوات و هیوای مرۆڤێکی ئازادیخواز جیا لەوەیە یان لەوە زیاترە؟

سەرەڕای ئەوەش ئینسان هەمیشە ئاواتێکیتریشی هەیە. پیاوێک کە بەتەمایە ماڵئاوایی لەم دونیایە بکات ئارەزوو و ئاوەزێکی نەفسانی هەیە و ئیشتیا و کوڵ و کۆی منیش بەوە دادەمرکێ کە تۆ بەدڵ تێبگەی لە هۆ و خوڵقانی ئەو ڕووداوانەی ژیانی من کاتێکی کە من هەمیشە لە بەرانبەر تۆدا وەک شاغییەکی مرومۆچ وابووم و هەمیشە دابووم بەیەکدا و بەئاسانی نەمدەتوانی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی ڕابردووی ژیانی خۆم فەرامۆش کەم. هەرچەندە لەوە دڵنیام کە تۆ لێی حاڵیت و نایانخەیتە پەراوێزەوە، منیش تەنیا لە بەر گەورەیی ئەو بیرەوەریانە نووسیمنەوە.

جما، ئەو کاتانەی کە تۆ کچۆڵەیەکی ناشیرین بووی و ڕوپۆشێکی کەتانیت لەبەر دەکرد و سەرپۆشێکی ئەستوور و زبرت لە سەر دەکرد و پەلکە بەستراوەکانت بەپشتدا شۆڕ دەکردەوە خۆشمدەویستی و ئێستاش هەرخۆشمدەوێی. ئایا ئەو ڕۆژەت لەبیرە من دەستم ماچ کردی و تۆش بەدڵسۆزییەکی نەرم و نیانەوە تکات لێ کردم: «ئیتر قەت کاری وامەکە» ئەرێ ئەو ڕۆژەت فەرامۆش نە کردووە؟ من دەزانم ئەوکارەی من کارێکی بێشەرمانە و فێڵبازانە بوو، بەڵام تۆ دەبێ بمبوورێی، ئێستاش ئەم نامەیە ئەوشوێنەی کە نێوی تۆم لێنووسیوە ماچی دەکەم. ئەبەو شێوەیە دیسانەوە ماچم کردیەوە، هەردووجاریش بەبێ ڕەزامەند بوونی تۆ. ئیتر قسەیەکی دیکەم نەماوە، خودا ئاگادارت بێ ئازیزم.»

لەکۆتایی نامەکەدا ئیمزایەکی لێنەدرابوو، بەڵام شێعرێکی لێنووسرابوو کە کاتی منداڵی هەردووکیان پێکەوە فێری ببوون:

جا گەر وایە دڵ خۆش دەبم
چون پەپوولەی بەختەوەریم
چبمێنم یان نەمێنم
لە خەمو دەردان بێ بەریم.

دوای نیوسەعات مارتینی هاتە ژوورەوە و لەو بێدەنگیەی کە نیوەی تەمەنی لەودا گوزەرابوو هاتە دەرەوە. تراکتە دیواریەکەی کە پێیبوو فڕێیدایە سەرئەرز

و باوەشی کرد بەجمادا: «جما! تۆخودا پێم بڵێ چیبووە؟ مەگری -تۆ قەت نەدەگریای! جما، ئازیزەکەم!»

- سیزار، هیچ نییە، دوایە پێتدەڵێم - من - ئێستا ناتوانم سەبارەت بەئەو قسەت لەگەڵ بکەم.

جما بەپەلە نامەفرمێسکاویەکەی خستەوە گیرفانی، هەستایە سەرپێ و لەپەنجەرەکەوە سەری بردە دەرەوە تا ڕوخساری خۆی بشارێتەوە.

مارتینی هەروا بێدەنگ بوو و بەددانی لێوی خۆی دەگەزی. دوای ئەو هەموو ساڵە دووروودرێژە، ئێستا وەک منداڵێکی ساوای قوتابخانە خۆی دۆڕاندبوو -و جما تەنانەت سەرنجیشی نەدەدایە.

جما دوای قەدەرێک کە پشوی هاتەوە سەرخۆ برێک بەسەرخۆیدا زاڵ بووەوە و چاوێکی لێ کرد و گوتی: «زەنگی گەورەی کلیسای ناوەندی لێدرا دەبێ کەسێک مردبێ.»

مارتینی بەدەنگە تایبەتیەی خۆی وەڵامی داوە: «ئەم پرسە نامەیەم هێناوە کە نیشانتی بدەم، لە سەرئەرزی هەڵگرتەوە و دایە دەستی جما. ئەمە ڕاگەیەندراوێکی قەراخڕەش بوو کە بەپیتی گەورە و بەپەلە چاپ کرابوو: «بەڕێز کاردینال، منیسینیور لورێنزو مونتانلی، ئوسقوفی خۆشەویست و ڕێزدارمان ، لەپڕێکدا بە هۆی جەڵغەی دڵەوە لەڕاونا فەوتی کرد.»

جما بەپەلە سەریهەڵێنا و مارتینی بەهەڵتەکاندی شانییەوە فکری جمای لەچاوەکانیدا خوێندەوە و وەڵامی داوە: «دەڵێی چی مادونا، جەڵغەی دڵیش وشەیێکە وەک وشەکانی دیکە.»





2011

ڤینیچ لەم کتێبەدا کۆمەڵێک مرۆڤی
وێناکردووە کە بۆ وەدیهێنانی ئازادی و
سەربەخۆیی و مافە کۆمەڵایەتییەکانی
خۆیان قۆڵ بۆ خەبات هەڵدەماڵن و
لەو ڕێگەیەشدا هیچ ترسێکیان لە
دڵ نانیشێ.
عەشق لەو کتێبەدا پێگەیەکی بەرزی
هەیە. ئارتۆر بێرتەن پاڵەوانی
ئەو کتێبە
بەریتانییەکی دانیشتووی ئیتالیایە
لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتیی
نەمساییەکان لەو وڵاتەدا.
ئارتۆر دوای ئەوەی
خۆشەویستییەکەی بێ ئاکام و ناکام
دەکەوێتەوە، دەگەڕێتەوە ئیتالیا و
دەکەوێتە گەڵ گرووپێکی
شۆڕشڤان و لە پێناوی ئازادیدا
خەبات دەکا.



چاپخانەی ڕۆشنبیری